زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی ٤٤

# چیرۆکی پێشینان لە قورئاندا




## لەبارەی ئیمان و بانگەوازی و جیهاددا

نووسینی
دکتۆر صلاح عبدالفتاح الخالدي

وەرگێرانی
کاوە هاوڕاز



## مەبەست لە زنجیرەی هزرەکانی پەروەردەی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی نووسینی کەسایەتییە گەورەکانی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.
- ئاشناکردنی خوێنەری لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی نووسینی کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ بیروڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری بزاوتی ئیسلامین.
- شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کوردە بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیان لە گشت کۆت و بەند و بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و دەمارگیرایی.
- بانگەشەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامیی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسڵمانی کورد، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گوزارە کارانەی هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردووە.

دەگەڵ رێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرج نییە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین.

با دەستوورمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت،

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ الزمر

# چیــرۆكی
# پێشــینـان له قورئـاندا

## چه‌ند وانه‌یه‌ك له ئیمـان‌و

## بانگـه‌وازو جیهـاد دا

### به‌شی یه‌كه‌م

نووسـینی

**د.صلاح عبدالفتـاح الخـالدي**

وه‌رگـێرانی

**كـاوه هاوراز**



ناوی کتێب بە عەرەبی: مع قصص السابقين في القرآن (١)
ناوی نوسەر: د.صلاح عبدالفتاح الخالدي
ناوی کتێب بەکوردی: چیرۆکی پێشینان لە قورئاندا
ناوی وەرگێڕ: کاوە مصطفى (هاوراز)
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر
کۆمپیوتەرو نەخشەسازی: جومعە سدیق کاکە
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ : ئەمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣١ك – ٢٠١٠ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبری هونەر هەولێر ژمارەی سپاردن (٣٠٩) ساڵی ٢٠٠٤ ی پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

# بەشی یەکەم

## لە چیرۆکەکانی ( بنو اسرائیل ) لە قورئاندا

إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ
ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ النمل

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهد الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له. وأشهد أن لا إله الا الله، وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، صلوات الله و سلامه عليه، وعلى اله وصحبه.. أما بعد..

(سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە، سوپاسی دەکەین و داوای کۆمەك و ڕێنمایی لێ دەکەین و، پەناش بەخوا دەگرین لە خراپەکانی دەروونمان و چەوتی و خراپی کردەوەکانمان، هەر کەسێك خودا ڕێنمایی بکات ڕێ لێتێکدەرێکی نییەو، هەر کەسێکیش گومڕاو ڕێ لێ تێك چوو بێت ڕێنمایی و ڕێ پیشاندەرێکی نییە..

هەروەها شایەتی دەدەم ((بە دڵ و زمان)) لەسەر ئەوەی کە جگە لە (الله) هیچ خودایەکی پەرستراو نییە، هەر خۆی تاك تەنیایەو هیچ هاوبەش و هاوڕێیەکی نییەو، شایەتیش دەدەم لەسەر ئەوەی کە (محمد) بەندەی خوداو پێغەمبەریەتی (دروودو سلاوی خودا) لەسەر خۆی و خانەوادەو هاوەلانی بێت)

بێگومان خودای پەروەردگار لە قورئان دا چەندەها چیرۆکی کەسان و گەلانی پێشینی بۆ گێڕاوینەتەوەو ئەم چیرۆکانەش بەو هەق و ڕاستیە وەسفی کردووە کە هیچ شك و گومانێکیان تێدا نییەو لە هەمان کاتدا وەسفی: باشترینی چیرۆکەکان (احسن القصص)یشی بۆ داناون.

خودا بۆیە ئەم چیرۆکانەمان بۆ دەگێڕێتەوە تاکو بیر بکەینەوەو وانەیان لێ وەربگرین، فەرمانیشی پێ کردووین کە ئەم چیرۆکانە بۆ خەلکی باس بکەین تاکو ئەوانیش بیر بکەنەوە.

هەروەها خودا ئەوەشی پێ ڕاگەیاندووین کە ئەم چیرۆکانەمان بۆ دلنەوایی و

جـێگیر بـوونو ئـارام گـرتن لەسـەر تێکۆشـانو نارەحـەتیو ڕووبەڕووبوونـەوەی کۆشپەکانی ژیان بۆ دەگێڕێتەوە.

پاشان بڕیاری خودا وایـە کـە لـە چـیرۆكو بەسـەرهاتی پێـشینەکان دا دەرسو ئامۆژگاری بۆ کەسانی ژیرو عاقڵ هەیە، بۆ ئەو کەسـانەی هەڵوەسـتە لـە ئاسـت چیرۆکەکاندا دەکەنو پەی بە پەندو وانەکانی دەبەنو چەندین ئامۆژگـاریو دەرسـی لێ دەردەهێنن.

هەر بۆیە خودا فەرمانی پێ کردووین کە شوێن پێی چاکانو چاکسازانی پێـشین هـەڵگرین، ئـەو پێـشینانەی چـیرۆکەکانیان بـاس کـراونو، ڕێبـازی بانگـەوازو چاکسازیو ڕووبەڕوو بوونەوەو جیهادو ئارامیو خۆڕاگریشیان پیشان داوین. جگـە لەوەی پێویستی کردووە لەسەرمان کە شارەزای قورئان بینو لە مانـاو حوکمـەکانی ورد بینەوەو لێی تێ بگەینو بزانین چ بڕیارو مەبەستێك لە عیبرەتو دەرسەکانیو لە هێماو ئاماژەکانیو لەڕێی بەدیار خستنی چیرۆکی پێشینەکانەوە دەخوازێت.

ئێمەش وەك پەی بردنێك بە مەبەسـتەکانی قورئـان لـە چـیرۆکەکانی داو، وەك ئاوڕدانەوەیەکیش بەلای حەقیقەتو بنەماو ئاڕاسـتەکانی نێـو ئـەو چـیرۆکانەداو، پاشان وەك ملکەچیمان بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خودا سەبارەت بە ووردبوونـەوە لە ماناکانی قورئانو تێفکرینو پەند لێ وەرگرتنو وەك حەزو پەرۆشییەکیشمان بۆ خزمەتکردنی کتێبی خوداو هێندەی بتوانین زانستو زانیاریو وانـەو لێکدانـەوەی دیـاری بکـەین، دەسـتمان کـرد بـە ئامـادەکردنی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە لەسـەر (بەسەرهاتو داستانی پێشینەکان لە قورئاندا).

* * *

موسڵمانان لەم سـەردەمەدا لـە قۆنـاغێکی بەربـەرەکانیی گـەورەی جیهانیـدا دەژینو شـالاوی دوژمنانیـشیان ڕۆژبـەڕۆژ بـەگوڕترو تونـدترو دڕندانـەتر دەبێـت لەسەریانو تەنانەت شالاوێکی هەمەلایەنەو جۆربەجۆریشە.. هەرچـەندە دوژمنـان

لە واقیعی هاوچەرخی موسڵماناندا گەلێك دزەیان کردووەو چەند مەوقیعو سەنگەرێکی پێشەوەشیان لێ داگیر کردبن، بەڵام نەگەیشتوونەتە مەڵبەندی سەرکردایەتییانو (بەیارمەتی خوداش) هەرگیز ناگەن.

دیارە چەندین بانگەوازکارو چاکەخوازو پەروەردیار ئەرکی خۆیان بەرانبەر ئەم نەتەوە موسڵمانی بەجێگەیاندووەو ئامۆژگاریو ڕێنماییی تەواویان کردوونو ڕێی ڕاستیان نیشانداونو هەموو سیماو تایبەتمەندییەکی ڕێگەکەشیان پێ ناساندوونو، بەکردەوەش لە مەیدانی بەرەنگاری جیهاددا سەرکردایەتیان کردوون.

لەبەرامبەردا چەندین کەسی چاكو ڕاستیخواز لە سەربازانی خودا بە پیاوو ئافرەتەوە بەدەم ئامۆژگاریو ڕێنماییەکانیانەوە هاتوونو ڕێی ڕاستو ڕەوانیان گرتۆتە بەرو ڕوبەڕووی هێزە شەڕخوازو بەدکارو (باطل)ەکان بوونەتەوەو، بە باوەڕی پتەوو گیانی بڵندو، ئارامیو خۆڕاگریو، ورەو هیممەتو، ڕاستگۆییو دڵسۆزیو، متمانەو دڵنیاییو، هەوڵو هۆگری بۆ پاداشتی خوداو حەزکردن لە ڕەزامەندییەوە چوونەتە مەیدانی جیهادو بەرەنگاریو بەربەرەکانییەوە.

هەموو جارێکیش ڕێگا ڕاستەکە زیاتر دەدرەوشێتەوەو چاکەخوازانیش بە پیاوو ئافرەتەوە زیاتر ڕووی تێدەکەن پەیڕەوی دەکەنو پێوەی پابەند دەبن. بە پشتیوانی خوداش هەر دەگەنە ئاکامی ئەو ڕێگا ڕاستو هیوا بۆ خوازراوەو، فەرمانی خوداو خواستو یارمەتیی بەدەست دێنن. هەر بە یارمەتی خوداش ئەو واقیعە ناهەموارەی نەتەوەو ژیانە شێوێنراوەکەی دەگۆڕنو نەخۆشییە ترسناکەکانیشی چارەسەر دەکەنو، بەسەرکەوتوویی بەربەرەکانیی هێزەکانی شەڕخوازیو ناهەقیو تێکدان دەکەنو، هەموو فڕوفێڵو تەڵەکەیەکیان پووچەڵ دەکەنەوەو، ڕاویان دەنێنو دەیانبەزێنن، چونکە ئەمە بڕیارو ڕێسای خودایەو، بەڵێنی خوداشە بۆ ئەم نەتەوەیە کە بە نەتەوەی حوکمی خەلافەتو شەهادەت خوازیو سەرکردایەتیو پێشڕەوایەتی ناسراوە.

ئێمە تەواو دڵنیاین لەوەی کە ئەم هەورە نا ئاساییەی بەری ئاسمانی نەتەوەی موسڵمانی گرتووە —ان شاء الله- هەر دەڕەوێتەوەو، دوژمنانیش سەرشۆڕو ریسوا دەبن و، نەتەوەش تەندروستیی خۆی بۆ دەگەڕێتەوەو خوێنی بزوێنەری جەستەی تێدا نوێ دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ سەر سەکۆی پێشڕەوایەتی و پەیامی ڕێنماییی بە دەستەوە دەگرێتەوەو حوکمی خەلافەتە (راشیدی)یەکەشی دادەمەزرێنێتەوە..

بەڵام هەموو ئەم هیواو ئاوات و خەونە راستەقینە عەمەلی و واقیعی و هوشیارانەیە ئاتاجیان بە زیادکردنی هەوڵ و تەقەللاکان و، پەیڕەویکردنی ئیددیعاکان و گرتنەبەری ئەو مەرج و سیفەت و خەسڵەتانەشە کە خودا خستوونییە بەردەمی ئەو نەتەوە ئازاو سەرکەوتوانەی کە تەنیا سوننەت و رێسای خۆی سەریان دەخات و سوننەتی خوداش جێگیرەو دواناکەوێت.. باوەڕیشمان وایە ئەم نەتەوەیەو ئاقاری مرۆڤایەتی بەرزو شکۆداری پێ بەدی دێنرێت، چونکە هەر بەرنامەی ئەم قورئانە بوو نەتەوەی موسڵمانی لە نەبوو(عدم)ەوە هێنایە ئاراوەو کردی بە باشترین نەتەوەی هەڵکەوتوو بۆ خەڵکی و، جڵەوی سەرکردایەتیی بەشەریشی پێسپارد، جا هەر قورئانیشە بتوانێت سەرلەنوێ نەتەوەی موسڵمان بخاتەوە سەر ئەو ئاقارەو سەرکردایەتیی ژیانی خۆیی پێ بسپێرێت و جارێکی تریش بە سەنتەری سەرکردایەتی و پێشڕەوایەتیی بگەیەنێتەوە.. نەوەی پاشینەی ئوممەتیش تەنها بەو بەرنامەیە چاك دەبێت کە پێشینەی پێ چاك بووە.

منیش بە ئەرکی سەر شانی خۆمی دەبینم کە بەشداری بکەم لەو هەوڵ و تەقەللایانەدا کە بۆ هاتنەکایەی سەرلەنوێی نەتەوەی ئیسلامی دەدرێت، ئەمەش بەپێی بوارو ماوەو توانام لە کات و هەوڵ و، لە کردارو گفتارو، لە فیکرو بانگەوازو روون کردنەوە. لەو بڕوایەشدام هەرچییەکم هەبێت هەر کەمەو جێی باس نیە، بەڵام هەوڵی کەم دەستێکە، هەروەك لەو بڕوایەشدام کە هەر پێویستەو واچاکە تەنها لە قورئانەوە پێهەڵگیرێت بۆ زیندووکردنەوەی حاڵەتی ئیسلامی و، بەو پێودانگەش کە هەر قورئان پێگەو خاڵی دەستپێکردنی ئەو هەوڵانەیە..

هەر بۆیەش ئەو کتێبخانە قورئانییەی کە بەتەمام بەناوی (لەگەنجینەکانی قورئانەوە) پێشکەشی خۆشەویستانی بەڕێزی بکەمو کە تا ئێستا چوار کتێبی لێدەرچووەو ئەمەش پێنجەمیانە، بەردەوام بم لە کارکردن تێیدا بۆ بەجێگەیاندنی ئەو پرۆژە قورئانییە، لەم رووەوە هەرچی بە گونجاوی بزانم وەك چەند ئەڵقەیەكو چەند لێکۆڵینەوەیەکی لەمەولام لەسەر قورئان دەیخەمە رووو داوای کۆمەكو یارمەتییش هەر لە خودا دەکەمو نزای لا دەکەم کە مەبەستەکانم راستی بپێکنو جێی پەسندی هەموان بێت.

بێگومان قورئانی پیرۆز روانگەی هەموو تێڕوانینەکانەو هەوڵو کاتو تەمەنیش هەر لەودا بەسەر دەبرێتو لێکۆڵینەوەو دیراسەکانیش هەر دەربارەی قورئان ئامادە دەکرێنو، هەر لەوێشەوە بنەماو بەرنامەو تیۆرو رێساکان دەردەهاوێژرێن.

دیارە قورئانیش بەسە بۆ شکاندنی تینوێتیی هەرکەسێك کە رووی تێبکاتو هەموو بیروباوەڕو رێسایەکی جوانی پێ ببەخشێتو بەهانای دەردو کێشەکانیەوە بێتو پێویستییە رەواکانی بۆ پڕکاتەوەو نیازە گرنگەکانی بۆ بخاتە روو.. چونکە قورئان کارێزێکی شیرینەو تینوان تێرئاو دەکاتو، مەڵبەندێکی دەوڵەمەندی پشتگیرییەو بەشی هەموو میوانەکانی دەکات، هەروەها گەنجینەیەکی بێشوماری پاشەکەوت کراوە کە هەموو خوازریارانو رووتێکەرانی دەوڵەمەند دەکات.

خۆ ئەگەر هەموو هەوڵەکان رووەو ئەم گەنجینە قورئانیانە بچن هیچی لێ کەم ناکەنەوەو دوایی بە بەخششەکانیشی ناهێنن،.. خۆ ئەگەر هەموو لێکۆڵیارانیش بە گشت جۆرە بیروبۆچوونو دیدو تێڕوانینو توێژینەوە هەمەڕەنگەکانیشیانەوە رووەو قورئان بڕۆن ئەوا هێشتا ناتوانن تێکڕای زانستو زانیاریو، فەرمانو رێساو، پەندو ئامۆژەو، سەرگوزەشتەو ئاڕاستەکانی باس بکەن، پێشینانیش چەندەها زانستو حوکمو رێسای دیکەیان تێدا هێشتۆتەوەو دایانناوە بۆ کەسانی دوای خۆیان تا ئەوان بتوانن باسیان لێوە بکەن.

فەرماندەی باوەڕداران (علی کوڕی ابوطالب)خودا لێی رازی بێت لە وەسفکردنی ئەم قورئانەدا فەرموویەتی:

"لەمەولا فیتنەو کارەسات روو دەدات، دەروازەی لێدەرچوونیشیان تەنها کتێبەکەی خودایە، لەم کتێبەدا هەواڵی گەلو نەتەوەکانی پێش خۆتانو دوای خۆشتان پێدراوە، حوکمو دادوەریی نێوانیشتان بۆ دیاریکراوە، قورئان بەرنامەی جێگیرو بێهاوتایە، نەك سستو لەرزۆك بێت، هەرکەسێکی خۆ بەزل زانو دەسەڵاتدار پشتگوێی بخات خودا پشتی دەشکێنێت، هەرکەسێکیش لە بەرنامەیەکی تری غەیری قورئاندا بەدوای رێی راستدا بگەڕێت، هەرگیز بەدیی ناکاتو خوداش گومڕای دەکات.

قورئان ئایینی بەهێزی خوداو، فەرمایشتی دانایی‌و، رێگەی راستیەتی‌و، ئەو رێبازە تۆکمەیەشە کە بەهەواو ئارەزوو لارنابێتەوەو بە زمانو قسەوباسی ناڕاست گومانی لەسەر پەیدا ناکرێتو، زانایانیش هەرگیز لێی تێرنابن، هەروەها ئیعجازو لایەنە سەرسوڕهێنییەکانیشی کۆتاییان پێ نایەتو، لەبەرامبەر زۆریی وەڵامو بەرپەرچدانەوەشدا شکستو دەستەوسان نابێت.

هەرکەسێك بە زمانی قورئان بدوێت راست دەبێژێت، هەر کەسێك کاری پێ بکات، سوودمەندە بە پاداشتو بەختەوەریەکانی، هەرکەسێك حوکمو دادوەریی پێ بکات دەخرێتە سەر رێی راستو ڕەوان".

چیرۆکەکانی قورئان زۆرو هەمەچەشنو جۆراوجۆرن، زۆربەی سوورەتو ئایەتەکانیان گرتۆتەوە، هەندێك چیرۆکیان کورتنو، هەندێکیشیان درێژن، لە چیرۆکە کورتەکانیش دا چیرۆکی وایان تێدایە کە برگەیەکی خێرایە یان چەند برگەیەکی خێرایە، لە چیرۆکە درێژەکانیش دا چیرۆکی وای تێدایە کە مام ناوەندیو یەك دیمەن (مشهد)ی هەیە یان چەند دیمەنێکی کورتی هەیە، هەروەك چیرۆکی زۆر درێژیشی تێدایەو دیمەنەکانیشی زۆرە، جگە لەو چیرۆکانەش کە بەچەند شێوازێکی هەمە جۆر دووبارە بوونەتەوە..

چیرۆکی (ئیلیاس) لەگەڵ گەلەکەی لە سوورەتی (صافات)دا نموونەی چیرۆکی کورتە، چیرۆکی (سولەیمان)یش لەگەڵ (مێروولەو پەپوو سلێمانکەکە)و شاژنی (سەبەء)و تەختو تاراجەکەی دا کە لە سوورەتی (النمل)دا باسکراون نموونەی چیرۆکی مام ناوەندین لە گێڕانەوەو درێژیدا.

بەڵام (چیرۆکی یوسف) لە سوورەتی (یوسف)دا نموونەی چیرۆکی درێژە کە بەدرێژیو لەیەك جێگەی قورئاندا هەموو بەسەرهاتەکە گێڕدراوەتەوە. هەروەها چیرۆکی (موسا) لەگەڵ (فیرعەون)و پاشان لەگەڵ گەلەکەی (بنی ئیسرائیل) کە لە چەندان سوورەتی قورئاندا گێڕاوەتەوە، نموونەی چیرۆکی درێژە کە بە چەندان شێواز دووبارە بووەتەوە یان بەچەندان شێواز لە هەر جێگەیەك دا بەشێکی لێ گێڕراوەتەوە.

دەشێت بەشێوەیەکی تریش چیرۆکەکانی قورئان لە ڕووی ناوەڕۆكو کەسەکانو ڕووداوەکانیەوە پۆلێن بکرێت، ئەم پۆلێنکاریەش زیاتر پەیوەستە بەم کتێبانەوە.

چیرۆکەکانی قورئان دوو بەشن:-

بەشی یەکەم:- چیرۆکی پێغەمبەرانو نێرراوانی خودا.

بەشی دووەم:- چیرۆکی کەسانی تر کە پێغەمبەرانو نێرراوان نین.

دیارە جۆرە پەیوەستیو لێك چوونو تێهەڵکانێکیش لە نێوان هەردوو بەشەکەدا هەیەو ناتوانرێت لە یەکتریان جیا بکەینەوە، وەك ئەوەی هەندێك لە بەشی دووەم تێکەڵی بەشی یەکەم دەبێت، ئەمەش وا لە لێکۆڵیار دەکات کاتێك لەبەشی دووەم (واتە لە چیرۆکی کەسانی غەیری پێغەمبەران) دەکۆڵێتەوە بچێتە سەر باسی هەندێك لایەنی بەشی یەکەمیشو چاو بەڕووداوو بەسەرهاتەکانی دا بگێڕێتەوە.

من بەشی دووەمیش (چیرۆکی غەیری پێغەمبەران) دەکەم بە دوو بەشەوە:-

یەکەم:- چیرۆکەکانی (بنواسرائیل)

دووەم:- چیرۆکی پێشینەکانی غەیری (بنو اسرائیل)

نموونەی جۆری یەکەم، چیرۆکەکانی (قاروون، طالووت، أصحاب السبت، البقـرة، التیه)ە.

نموونەی جۆری دووەمیش، چیرۆکەکانی (أصـحاب الکهـف، ذوالقـرنین، لقمـان، هەر دوو کوڕەکەی ئادەم)ە.

سەبارەت بە چیرۆکی پێغەمبەران لە قورئانـدا چـەندین کتێـبو لێکۆڵینـەوە نووسراونو بڵاوکراونەتەوەو -بەڕای من- باشترینیشیان کتـێبی (مـع الأنبیـاء في القرآن)ی مامۆستا (عفیف عبدالفتاح طبارة)یە. لـەو کتێـبو لێکۆڵینەوانـەش دا چەندەها واتـاو پەنـدو وانـەی بەسـوود دیـاری کـراونو خـودا باشـترین پاداشـتی خاوەنەکانیان بداتەوە، لەبەرئەمە (من ئێستا) هیچ نیازێکم نیە دەربارەی (چیرۆکی پێغەمبەران لە قورئاندا) بنووسم لەگەڵ باوەڕی تەواویشم بەوەی کـە هێـشتا مـاوە زۆرەو دەشێت چەندین بۆچوونو وانەو ڕێنمایی تازەو بەسوودی دیکەیان لێ بخرێتـە ڕوو، بە تایبەتیش دەربارەی ئیمـانو بانگـەوازو جیهـادو خـۆڕاگریو سـەرکەوتنو دەمەزراندنی حوکمی ئیسلام لەسـەر زەوی، واش هەسـت دەکـەم لـەم بـوارەدا بـە یارمەتی خودا چەند زیادکاریەکم لەلا دروست بوو بێت، بەڵام تا ئێـستاش بەتـەما نیم لە دیراسەیەك دا لێیان بدوێم، هەڵبەتە لە مەڕ ڕۆژانی داهـاتووش نـازانم چـۆن دەبێت، خێـرو چـاکەش لەوەدایـە کـە خـودا سـەر پـشکی دەکـات، لـە خـوداش دەپاڕێمەوە هەر خێرو چاکەمان بـۆ هەڵبـژێرێتو قـەدەری لەسـەر بێـت بۆمـانو، ڕازییمان کات پێیو، لە بەجێ گەیاندنیشی دا ئاراستەو ڕێنموونیمان بکات.

من کاتێك دەستم دایە مەسەلەی چـیرۆکی پێـشینەکانی غـەیری پێغەمبـەران، بەهۆی (کەمیی دیراسە شـیکاریە بابـەتیو زانـستییەکانەوە لەسـەری)و (ئاتـاجی زۆرمان بە لێووردبوونەوەیان و) ، (دەرهێنانی ئەو چـەند وانـەو ڕێنماییانـەش کـە خودا پێویستییان دەکات بۆمان) بوو. وام بەباش زانی ئەم دیراسەیە بکـەم بـە دوو بەشەوە تاکو لە دوو کتێبدا دەربچێتو بۆ خوێنەرانیش ئاسانتر بێت.

بەشی یەکەم: چیرۆکەکانی (بنو اسرائیل) لە قورئاندا، کە خودی ئەم کتێبەیە.
بەشی دووەم: چیرۆکی پێشینەکانی تر لە غەیری (بنو اسرائیل).
ئەم کتێبەش لە نۆ (بەند) (فصل) پێك هاتووە:
بەندی یەکەم/ لێدوانی قورئان دەربارەی چیرۆکەکانی، کە تیای دا گرنگترین سیمای چیرۆکەکانی قورئانم (وەك قورئان خۆی چۆنی خستۆتە ڕوو) تۆمار کردووە، ئینجا نیازو ئامانجی خستنە ڕوویم ڕوون کردۆتەوەو مەودای سوود لێ دیتنیشم دیاری کردووە، لەگەڵ ڕادەی وەرگرتنی پەندو ڕێنمایی لێوەی.. هەموو ئەمانەشم لە ئایەتەکانی قورئانەوە وەرگرتووە.
بەندی دووەم/ بەرنامەی چاوگێڕان بە چیرۆکەکانی پێشینان (قصص السابقین)دا.
ئەم بەرنامەیەشم لە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوداوە ﷺ دەر هاویشتووە، هەروەها لە دیدو بۆچونی ئەو زانا دادپەروەرانەشەوە کە بە شێوەیەکی وردو بابەتیانە لە چیرۆكو بەسەرهاتەکانیان کۆڵیوەتەوە. هەر بۆیە لەسەر ئەم بەرنامەیە سوورین، تاکو هەق بەهەوڵیانەوە دیار بێتو هەقیش بخەنە بەردەم خەڵکیو هەوڵەکەیان لە هەقەوە بۆ ناهەق(باطل) دەرنەچێت، هەروەها لە عیلمو زانستەوە بۆ بانگەشەو گریمانکاری دەرنەچێت.
بەندی سێیەم/ چیرۆکی دایکی (موسا) –سلاوی لێ بێت- کە لە هەردوو سوورەتی، طەو، القصص دا باسکراوە.
بەندی چوارەم/ چیرۆکی ئەو پیاوە باوەڕدارەی کە لە خێڵی (فیرعەون) بوو–خودا لێی ڕازی بێت- کە لە سوورەتی (غافر)دا باس کراوە.
بەندی پێنجەم/ چیرۆکی (قارون) لە سوورەتی (قصص)دا.
بەندی شەشەم/ (چیرۆکی ڕێ ون بوونی (بنو اسرائیل) لە سوورەتی (مائدە)دا.
بەندی حەوتەم/ (چیرۆکی مانگاکەی (بو اسرائیل ) لە سوورەتی (بقرە)دا.
بەندی هەشتەم/ چیرۆکی (اصحاب السبت) لە سوورەتی (اعراف)دا.

بەندی نۆهەم/ چیرۆکی (طالووت) لە سوورەتی (البقرة)دا.

واش بە تەمام -إن شاء الله- بەشی دووەم تایبەت بکەم بۆ هەر چوار چیرۆکەکەی نێو سوورەتی (کهف)} (چیرۆکی -اصحاب الکهف-و، چیرۆکی کابرای خاوەنی هەردوو باخەکەو، چیرۆکی موسا) سلاوی خوایان لیّ بیّت-و، ذو القرنین-).

لە خوداش داواکارم لەلایەن خۆیەوە کۆمەکم بکاتو هەر خوداش خۆی پشت پیّ بەستراوە.

بێگومان تیڕوانینی هەمە لایەنەو گشتگیرانە لە چیرۆکەکانی نێو ئەم کتێبەدا هەیەو، پەندو وانەو واتای هەمە جۆریشی لێوە دەرهاوێژراوە.. منیش لە دراسەو لێکدانەوەی ئەو چیرۆکانەدا ئەم لایەنە گرنگانەم گرتۆتە بەر:-

١) لە خستەڕووی چیرۆکەکاندا پابەندی کەشی دەقە قورئانییەکە بومو بەهیچ لایەکدا دەرنەچووم تەنها بۆ لای ئەو فەرموودە راست (صحیح)انە نەبێت کە بەشێکی نادیار، یان نەزانراوو تەم لەسەر نیشتوویان ڕوون کردبێتەوە، واتە تەنها پشتم بەو دوو سەرچاوە راستو دروستەی (قورئانو حەدیسی صحیح) بەستووە.

٢) سووربوونم لەسەر پەسند نەکردنی هەر هەواڵ یان هەر شیکارو رونکردنەوەیەکی گومان لێکراوی دەسهەڵبەستی جوولەکەکان (اسرائیلیات)و، هەر (أخبار)و (روایات)ێکی پووچەڵو ئەفسانەکاری، هەروەها سووربوونم لەسەر رەتکردنەوەی هەر وتەو روونکردنەوەیەك کە لە هەر مرۆڤێکەوەو (هەر کەسێك بێت) وەرگیرابێت ئەگەر لەو وتەو روونکردنەوەیەیدا پشتی بە قورئانو حەدیس نەبەستبێت. ئەمەش لەبەر بوونی باوەڕی تەواوم تەنها بە پێویستیی روونکردنەوەی قورئانو سوننەتو بە پێویستیی بیّدەنگ بوونیش لەو رووداوو شیکارسازییانەی کە هەردووکیان (قورئانو سوننەت) لێیان بیّدەنگ بوونو بە پێویستیی ڕێزگرتن لە گوتاری راستی خودا کە ئەو راستییە لە گێڕانەوەو بەسەرهاتەکان (روایات وأخبار)دا بەدینەکراوە، هەروەها ڕێزگرتنیش لەو

گوتاره‌ی كه‌ ده‌رباره‌ی نادیاری(غیبی)ی پێشینه‌كان له‌ قورئاندا هاتووه‌و، كه‌وا له‌ وته‌ی جووله‌كه‌كاندا نییه‌، واته‌ ئه‌و جووله‌كانه‌ی كه‌ به‌خراپی ده‌ستكاری رووداوو به‌سه‌رهاته‌كانیان كردوه‌و مێژوویه‌كی ناڕاست و پڕ له‌ ساخته‌كارییان نووسیوه‌ته‌وه‌و له‌ هێنانی هه‌ر باس و گوته‌و به‌سه‌رهاتێكیشدا درۆ ده‌كه‌ن.

٣) ئاوڕدانه‌وه‌ له‌ ڕه‌هه‌نده‌ واقیعییه‌كانی ئه‌و چیرۆكانه‌و، ئاماژه‌كردن بۆ گونجانی هه‌ندێك بڕگه‌و دیمه‌ن و نموونه‌یان له‌گه‌ڵ سه‌رده‌می نوێدا، به‌گونجانی ئه‌و ره‌هه‌نده‌ واقیعی و عه‌مه‌لییه‌ زیندووه‌ش ده‌شێت په‌ندو واتا له‌ چیرۆكه‌كانه‌وه‌ وه‌رگرین.

٤) قه‌ناعه‌تی ته‌واو به‌وه‌ی كه‌ ئه‌و چیرۆكانه‌ چه‌ند گه‌نجینه‌یه‌كی به‌نرخی پاشه‌كه‌وت كراون و ژماره‌یه‌كی زۆر له‌ په‌ندو وانه‌و رووداوی راسته‌قینه‌و، بیروباوه‌ڕو، سه‌رنج و بیروڕایان له‌ ناخ دایه‌، هه‌موو ئه‌م شتانه‌ی ناخی گه‌نجینه‌كانیش بۆ لایه‌نه‌ هه‌مه‌جۆره‌كانی مرۆڤایه‌تی ده‌ست ده‌ده‌ن، وه‌ك لایه‌نه‌كانی (ئیمانداری و بانگه‌وازو، ره‌وشتمه‌ندی و فێركاری و، سیاسی و ئابووری و، سه‌ربازی و جیهادی و، شارستانی و مرۆڤایه‌تی...).. من له‌م رووه‌وه‌ ئاماژه‌م بۆ هه‌موو ئه‌و ره‌هه‌ندو لایه‌ن و واتایانه‌ كردووه‌و به‌ یارمه‌تی خوداش ئه‌وه‌ی په‌یم پێبردبێت و سه‌رنجم بۆی چووبێت تۆمارم كردووه‌.

٥) چه‌ق خستنه‌ سه‌ر وانه‌كانی باوه‌ڕداری و بانگه‌وازكاری و جیهادكاری و، ده‌رهاویشتنی شێوازو نه‌ریت له‌و چیرۆكانه‌ به‌و پێودانگه‌ی گرنگترین ئاتاجی بانگه‌وازكارو چاكسازانی ئه‌م سه‌رده‌مه‌یان تێدایه‌.

٦) باوه‌ڕی ته‌واوم به‌وه‌ی كه‌ هه‌رچیم له‌ په‌ندو وانه‌و رێنماییه‌كان باس كردووه‌ هێشتا كه‌من و به‌ به‌راورد له‌گه‌ڵ ئه‌و گه‌نجینه‌ زۆره‌ حه‌شاردراوه‌ی نێو چیرۆكه‌كان جێی باسێكی ئه‌وتۆ نین و لانی كه‌م وه‌ك دڵۆپه‌ ئاوێكه‌ له‌ ئۆقیانووسێك، یان ده‌نكه‌ لمێكه‌ له‌ گردۆڵكه‌یه‌كی لمینی بیابان دا..

له‌به‌ر ئه‌مه‌ ئیددعای ئه‌وه‌ بۆ خۆم ناكه‌م گوایه‌ سه‌رجه‌م وانه‌و ده‌رس‌و په‌نده‌كانی نێو ئه‌و چیرۆكانه‌م كۆكردبێته‌وه‌، یان زۆرترینیانم ده‌رهاویشتبێت، به‌ڵكو ته‌واو دانی پێداده‌نێم كه‌ به‌بێ مه‌به‌ستێك‌و، له‌ ئه‌نجامی ده‌سته‌وسانی‌و كه‌م تواناییمه‌وه‌ گه‌لێكیانم له‌یاد كردووه‌و جێم هێشتوون بۆ ئه‌وانه‌ی له‌ ئایه‌ته‌كانی قورئان ورد ده‌بنه‌وه‌و له‌ چیرۆكه‌كانی راده‌مێنن. به‌راستی زۆرم بۆ به‌جێ‌هێشتوون‌و، دیاره‌ ئه‌وانیش زۆر په‌ندو انه‌ی تری نێو چیرۆكه‌كان بۆ كه‌سانی دوای خۆیان ده‌هێڵنه‌وه‌، به‌ڵام هێشتا پەی به‌ هه‌موو ئه‌و گه‌وهه‌ره‌ حه‌شاردراوانه‌ی ناخیان نابه‌ن.

له‌م ڕووه‌وه‌ حه‌زده‌كه‌م له‌گه‌ڵ (سید قطب)دا -خودا لێی خۆش بێت- ئه‌و وته‌یه‌ی بڵێمه‌وه‌ كه‌ گوتوویه‌تی: "ئێمه‌ ئه‌و ڕێنمایی‌و ئاماژه‌ سرووش به‌خشانه‌ی نێو ئه‌م چیرۆكه‌مان پێ ده‌رنایه‌ت، چونكه‌ وه‌ك تاقیكردنه‌وه‌ش فێریكردووین ده‌قه‌ قورئانییه‌كان بۆ هه‌ر دڵ‌و ده‌روونێك ڕێنمایی‌و ئاماژه‌ی سرووشبه‌خشی تایبه‌تییان پێ ده‌گه‌یه‌نن‌و راده‌ی ئاتاجی ده‌ركه‌وتووی بۆ ده‌خه‌مڵێنن. ئیدی پاشماوه‌ی ته‌واوی گه‌وهه‌ری پاشه‌كه‌وت كراوی هه‌ڵده‌گرێت بۆ دڵ‌و ده‌رونه‌كانی ترو له‌ هه‌موو بوارو هه‌ڵوێستێكی هه‌مه‌جۆری تردا ڕێنماییان به‌ گوێره‌ی راده‌ی دابه‌شكراو پێ ده‌به‌خشێت."



ئیتر منیش به‌م كاره‌و هه‌ر كارێكی ترمه‌وه‌ رووی نزا ته‌نها ده‌كه‌مه‌ خودای تاك‌و بێ‌هاوه‌ڵ‌و، داواكارم به‌ چاكی لێم په‌سندكات‌و بیكاته‌ توێشوو و-رصید-ێك له‌ ته‌رازووی كرده‌وه‌كانداو سه‌رفرازی‌و رزگاریم له‌ رۆژی لێپرسینه‌وه‌دا بۆ بنوسێت. لاریم له‌وه‌ش نییه‌ كه‌ هه‌ر هه‌ق‌و چاكه‌و راستییه‌ك له‌و كاره‌م دا ته‌نها له‌ خودا خۆیه‌وه‌یه‌تی‌و، سوپاسی ده‌كه‌م له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ ڕێنموونیی كردووم بۆی‌و، داوای زیاتریشی لێده‌كه‌م. هه‌روه‌ها لاریم له‌وه‌ش نییه‌ كه‌ هه‌ر هه‌ڵه‌و كه‌م‌و كورتی‌و درێغییه‌ك له‌ كاره‌كه‌مدا هه‌بێت (كه‌ بێگومان هه‌ر هه‌یه‌) ئه‌وه‌ له‌ نه‌فسی خۆم‌و

لە-شەیتان-ەوەیە، بۆیە تەوبە لەلای خودا دەكەمو داوای لێخۆشبوونی لێدەكەم.. بۆیە تكام لە خوێنەری بەڕێزیش ئەوەیە گەر هەر شتێكی لەو جۆریان بەدی كرد داوای لێخۆشبوونم لە خودا بۆ بكاتو، خۆیشی چاوپۆشیم لێبكاتو ئامۆژگاریشیم لەسەری بكات.

ئیتر سوپاسی زۆریش بۆ ئەو خودایەی كە هەموو چاكەیەك بە نیعمەتەكانی تەواوو بەجێ دەگەن.. دروودی خوداش لەسەر گەورەمان (محمد)ی پێغەمبەری سەرجەم بەشەریەتو هەموو خانەوادەو هاوەڵانو شوێنكەوتوانی.

دكتۆر صلاح عبدالفتاح الخالدی

صویلح

١٤٠٧/١٢/١ك

١٩٨٧/٧/٢٦ز

# باسێکی قورئان لەبارەی چیرۆکەکانی‌یەوە

قورئـــان ژمارەیـــەکی زۆری چـیرۆکی پێـشینەکان لــە پێغەمبــەرانو غــەیری پێغەمبەرانی بۆ گێڕاوینەتەوە کە هەندێکیان لە چیرۆکی بـاوەڕدارانن‌و، هەنـدێکی تریشیان لە چیرۆکی بێ‌باوەڕانن.

هــەروەها باســی ئــەو چـیرۆکانەی بــۆ کــردووین‌و حیکمــەت لــە هێنانــەوەو گێڕانەوەیشیان بۆ دیاری کردووین، لەگەڵ دیاریکردنی ئەو سودانەی پیشان داویــن‌و ئــەو جێگایانــەی پەنــدو عیبرەتیــان تیادایــەو، پاشــان بەرنامــەی لێتێگەیـشتن‌و لێبوردبوونەوەو چۆنیەتی مامەڵە لە گەڵیاندا.

ئێمە لێرەدا هەڵوێستەیەکی خێرا لەئاست قورئان‌و چیرۆکەکانیدا دەکەین، تـاکو رێخۆشکارییەك بێت بۆ باس‌و خواسمان لەمەڕ چیرۆکی پێشینەکان لە قورئــان داو، دەروازەیەکی سەوداکاریش لەگەڵ خودی چیرۆکەکان دا بێت.

## زاراوەی (قصص) لە قورئاندا:

قورئـــان زاراوەی چـــیرۆکەکان (القــصص)ی لـــە چـــەندین حاڵــەت‌و شـــێوازی بەکارهێنان‌و رێکخـستن دا هێناوەتــەوە، وەك لــە رووکــاری (فــەرمانی رابــردوو)و (فەرمانی رانەبردوو)و (فەرمانی داخوازی)و رووکاری (چاووگ)یش دایە.

ئیمام (راغبی اصفهانی) لە (مفردات)یدا دەربارەی ئەم زاراوەیە گوتویەتی:

"چیرۆك گێڕانەوە، واتە بەدواداچوونی شوێنەواری رووداو، بۆ نموونە دەگوترێـت: بەدوای شوێنەواریدا چووم. جا (قصص)یش واتە (أثر).. (القص-تتبع الأثر، یقـال: قصصت أثره) خودا فەرموویە: ﴿...فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا﴾(الکهف-٦٤)

واتە: هەردوکیان-کە مەبەست بە موساو خزمەتکارەکەیەتی- گەڕانەوە بۆ هەمان شوێنی پێشوویانو بە شوێنەواری ڕێگەکەیاندا دەگەڕانەوەو ئاسەوارەکەیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە).

هەروەها خودا فەرموویە: ﴿وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ...﴾(القصص-١١)، واتە: (دایکی موسا بە خوشکەکەی موسای گوت: شوێنەواری منداڵەکە دەستنیشان کەو بەدوای هەواڵەکەیدا بچۆ). هەمدیسان (قصص) مانای (هەواڵو بەسەرهاتە یەك لەدوای یەکەکانیش دەگەیەنێت، وەك لەم ئایەتانەدایە:

- خودا فەرموویە: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ...﴾(آل عمران-٦٢).

- هەروەها فەرموویە: ﴿...فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ ...﴾(القصص- ٢٥).

- هەروەها فەرموویە: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ...﴾(یوسف-٣).

بەڵام (قِصاص) مانای سەندنەوەی خوێن بە تۆڵەسەندنەوە لە تاونبار دەگەیەنێت".[1]

## چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینەن:

چیرۆکەکانی قورئان چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینەو واقیعیی پێشینەکانن کە بەوپەڕی ڕاستیو ڕاستگۆیی ڕووداوەکانیان تێدا گێڕراوەتەوە، چونکە خودا خۆی لە قورئاندا ئەم چیرۆكو بەسەرهاتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە.. دیارەو بێگومان خودای مەزن هەر خۆیشی ئاگاداری ئەو ڕووداوانە بووەو قەدەری لەسەریان هەبووەو رادەو مەودای بۆ داناون، واتە هەر بە زانستو خواستو قەدەری خۆی هاتوونە ئاراوەو ئیتر فەرمایشتی خوداش هیچ نارێکییەکی تێدا نیەو هیچ گومانێکیشی لەسەر

١) المفردات في غريب القرآن: (٤٠٤) للإمام راغب الأصفهاني.

دروست ناکرێت..

﴿...وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا﴾(النساء-٨٧)، ﴿...وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾(النساء-١٢٢)، کێ لە خودا ڕاستگۆترە، کێ وتەی لە وتەی خودا ڕاستترە؟! بێگومان هیچ کەسێك.

هەروەها چیرۆکەکانی قورئان بە (قصص الحق) وەسف کراون.. لە سورەتی (آل عمران)دا دوای ئەوەی چەند ئایەتێك دەربارەی مرۆڤبوونی(بەشەرییەتی) عیسای کوڕی مەریەم-سلاّوی لێبێت- هاتووەو پڕوپاگەندەی ئەو کەسە درۆزنانە پووچەڵ دەکاتەوە کە دەیاندایە پاڵ خوداو دەیانکرد بە (کوڕی خودا)، پاشان ئەم ئایەتانە ڕووداوی سکپڕبوونی (مەریەم)ی دایکی-خودا لێی ڕازیبێت- دەگێڕنەوەو چۆنیەتی منداڵ بوونیو لەدایك بوونی (عیسا) لەو ئایەتانەدا. ئایەتێك هاتووە کە وەسفی ئەم چیرۆكو ڕووداوانە بە چیرۆکە ڕاستەقینەکان (قصص الحق) دەکات، واتە ئەو چیرۆکانەی کە هەر خۆیان ڕاستنو کە هیچ هەڵەو درۆو ناهەقیو پووچەڵییەکیان تێدا نیە، وەك خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَـٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ...﴾ (آل عمران -٦٢).

لە سورەتی (نمل)یشدا قورئان لایەنێکی بەسەرهاتی (موسا-سلاّوی خوای لێبێت) لەگەڵ (فیرعەون) دەگێڕێتەوە بۆمان، پاشان لایەنێکی چیرۆکی (داود-سلاّوی خوای لێبێت)..

بەلاّم لە هەمان سورەت دا بە شێوەیەکی نەختێك زیاتر لەبەردەم چیرۆكو بەسەرهاتەکانی (سولەیمان-سلاّوی خوای لێبێت)دا هەڵوێستەی کردووە، واتە بەسەرهاتی سولەیمان لەگەڵ هەریەکە لە (مێرووڵەکان)و (سوپاکە)و (پەپوسلێمانکەکە)و (شاژنی سەبەء)و هەوڵو تەقەللای سولەیمان لەگەڵ ئەو شاژنەدا بۆ باوەڕهێنانیو چوونە نێو ئاینەکەی خوداوە..

ئینجا قورئان دوای ئەم بەسەرهاتانە ئـەم ئایەتـەی هێنـاوە کـە خـودا تیایـدا فەرموویـــە: ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾(النمل– ٧٦)، واتە: بێگومان ئەم قورئانـە زۆربـەی ئـەو مەسـەلانە دەربارەی (بنو اسرائیل) دەگێڕێتەوە کـە لەسـەریان ناتـەبانو کێـشەیان لەنێوانـدا دەربارەیان هەیەو روونی دەکاتەوە.

لە سورەتی (کهف)یشداو لە سەرەتای گێڕانەوەی داستانی (أصحاب الکهـف)دا ڕێگە بۆ وەسف کردنی چیرۆکەکان بە (چەند چیرۆکێکی راستەقینە) خۆش دەکـات، وەك لە فەرمایـشتەکەی خـوادا هـاتووە: ﴿نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى﴾ (الکهف/١٣) واتە: (ئێمە بەراسـتیو بەهـەق بەسەرهاتی ئەو لاوانەت بۆ دەگێڕینەوە کە بێگومان ئەوان لاوانێکی وەهابوون، کە باوەڕیان بە پەروەردگاریان جێگیرو دامەزراو بوو، ئێمەش زیاتر بـە نـوری ئیمـانو هیدایەت بەهرەمەندمان کردن.

کەواتە قورئـان لەکاتێکـدا چـیرۆکەکانی بـە (چـیرۆکە راسـتەقینەکان) وەسـف دەکاتو هەواڵی ئەوەشمان پێ دەدات، کە چیرۆكو داستانی پێشینەکان بە (هـەق)و بەڕاستی دەگێڕێتەوە، ئەوا لە هەمان کاتـدا سرووشـی ئـەو شـێوازە تونـدو تۆڵـە زانستییەمان لـە تێگەیـشتنی چـیرۆکەکانو لێوردبونـەوەو لێکۆڵینـەوەیان دا پـێ دەبەخشێت.

## باشـترین چیـرۆك:

لە سورەتی یوسف دا خودا وەسفی چیرۆکەکان بە باشترینی چـیرۆکەکان (أحـسن القـــصص) دەکـــات، هـــەروەك فەرموویـــەتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ۝٢ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا

ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ۝٣ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ...﴾ (یوسف: ٢-٤).

داخۆ بۆچی چیرۆکەکانی قورئان باشترینی چیرۆکەکان بن؟ ئەی بۆچی ئەم وەسفە بەتایبەتی لە سوورەتی (یوسف)دا هاتووه.. بێگومان تەنها لە سوورەتی (یوسف)دا بەتەواوەتی هەموو چیرۆك‌و بەسەرهاتەکانی (یوسف-سڵاوی خوای لێبێت) گێڕراوەتەوە کە سەد (١٠٠) ئایەتی لەو سەدو یازده ئایەتەی سورەتەکە بۆتەرخان کراوه. ئایەتەکانی دوایش هەندێکیان بۆ لێکدانەوەو بۆ پاشکۆی چیرۆکەکەی یوسف هاتوون.

چیرۆکەکەی یوسف لەوەوه دەست پێدەکات کە لە تەمەنی مێردمنداڵیدا خەونێك دەبینێت‌و، بەوەش کۆتایی دێت کە بە عەمەلی خەونەکەی دێتە دی‌و لە جیهانی واقیع دا لێك دراوەتەوه.

(داستانی یوسف)یش لە چاکترینی داستانەکانه (دیاره هەموو داستانەکانی قورئان باشن) چونکه مزگێنی‌و هیواو ئاوات بە لێقەوماوان‌و مەینەتباران دەبەخشێت‌و، چەوساوان‌و ستەم لێکراوانیش دڵنیا دەکات لەوەی کە رزگاری هەر دێت‌و ئامانج بەدی دێت‌و مەینەتیش لادەچێت، بۆیە گرنگ ئەوەیە باوەڕو پشت بەستنیان بە خودا چاکتر بکەن‌و لەسەر رێبازەکەی خۆڕاگر بن وەك چۆن (یوسف)یش ئاوابوو.

بێگومان چیرۆکەکانی قورئان باشترین چیرۆکن‌و، قورئان لەڕێی ئەم وەسفەیەوه وامان پیشان دەدات کە تەنها بەو داستان‌و رووداوه گێڕراوانەی خۆیەوه قەناعەت کەین‌و بازنەدەین بۆ ئەو سەرچاوه بەشەرییە دەسکردانەی وەك (ئیسرائیلیات)و ئەفسانەو داستانە دەسهەڵبەستەکان‌و داوای شیکارو درێژە پێدانی چەند لایەنێکی تری چیرۆکەکانیان لێ بکەین کە قورئان باسی نەکردوون. بەداخەوه هەندێك کەس ئەم رەفتارە دەنوێنن‌و زانیاریی سەیرو سەمەرە لەو سەرچاوە دەسکردانەوه

وەردەگرن، ئەمەش بەپێی ئارەزوویەکی خۆیان بۆ پڕکردنەوەی ئاتاجی بیسەران لە چیرۆك‌و پێشکەشکردنی تام‌و چێژێکی هونەری پییان بەو بیانووەی گوایە ئەوەی بۆیان دەگێڕنەوە شتێکی باشەو ئەو ئاتاجەیان بۆ پڕدەکاتەوەو ئەو چێژەشیان پێدەدات.

وەسف کردنی چیرۆکەکانیش بە (باش) لەبەر ئەوە نیە کە درێژەیان پێدرابێت‌و رووداوی زۆریان تێدا گێڕرابێتەوەو کەسێتی‌و ناوی جێگەو ناوچەی زۆری تێدا هێنرابێت، چونکە ئەم هۆکارانە لایەنی (باشی‌و جوانی)ی چیرۆك نین بەتایبەتیش ئەگەر پشت بە سەرچاوە ناڕاستەکان بەسترابێت. بەڵکو کاتێك چیرۆکەکان بەباش وەسف دەکرێن ئەگەر پێش سیفەتی (باشییەکە) سیفەتی حەق‌و راستگۆیی‌و راستییان تێدابووبێت، چونکە (باشی)یش لەسەر (حەق) بنیاتنراوەو ئەگەر سیفەتی حەقیان لەدەست دا ئەوا یەکسەر بەدوایدا سیفەتی (باشی‌و جوانکاری)یشیان تێدا نامێنێت. هەر بۆیەش هیچ سیفەتێکی (باشی‌و رێك‌و پێکی) لە دەسهەڵبەستی ئیسرائیلیات)و ئەفسانەکاندا نین، چونکە سیفەتی هەقبێژی‌و راستگۆیی‌و راستییان لە دەست داوە. تەنها چیرۆکەکانی قورئانیش ڕاستەقینەو باشن‌و بە (القصص الحق)و (أحسن القصص) دادەنرێن. دیارە هەر لەبەر ئەم واتا بەرزانە قورئان چیرۆکەکانی بە باشترین داستان‌و چیرۆکان وەسف کردووە، والله أعلم.

## خودا چیرۆکی پێشینەکان دەگێڕێتەوە:

خودای مەزن لە قورئاندا چیرۆکی پێشینانی بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ گێڕاوەتەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا﴾(طه- ٩٩)، واتە: (ئێمە بەم رەنگە چیرۆك‌و هەواڵ‌و بەسەرهاتی رابردووی پێشینەکانت بۆ دەگێڕینەوەو بەو شێوەیەش کە لەلایەن خۆمانەوە کتێبێکی روون‌و ئاشکرای وەك قورئانمان بۆ ناردوویت).

خودا دوای گێڕانەوەی داستانی گەلانی پێشینو چارەنووسیشیان، فەرمووییە: ﴿تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ...﴾ (الأعراف- ١٠١)، واتە: (ئێمە بەسەرهاتو رووداوی دانیشتوانی ئەو شارو گوندانەت بۆ دەگێڕینەوە کە چییان بەسەرهاتو کە بێگومان پێغەمبەرانیان بۆ رەوانە کراوەو بەڵگەی رۆشنو پەیامی روونو ئاشکرای خوداشیان پێ گەیاندبوون).

هەروەها خودا لەپاش گێڕانەوەی تێکڕای ئە چیرۆكو بەسەرهاتانەی نێو سورەتی (هود)یش فەرموویە ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ۝ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ۝ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ (هود: ١٠٠-١٠٢)، واتە: (ئێمە هەواڵو بەسەرهاتی ئەو گوندو شارۆچکانەت بۆ دەگێڕینەوە کە هەندێکیان شوێنەواری بیناو ساختمانەکانیان ماوەو هەندێکیشیان وەها خاپوور بوون کە هیچ شوێنەوارێکیان نەماوە. خۆ ئێمە ستەممان لێیان نەکرد، بەڵکو ئەوان خۆیان بەهۆی بێباوەڕیو سەرکەشیو یاخیبوونیانەوە ستەمیان لەخۆیان کرد. ئیتر لەوەدا ئەو بتو کەرەسە داتاشراوو بەخودا دانراوانەشیان سودێکیان پێنەدان کاتێك فەرمانی سزادانی خودایان لەسەر جێبەجێکراو جگە لە زیانو لەناوچوون هیچ شتێکی تری پێنەبەخشین. جێبەجێبوونی سزای خودای پەروەردگارت لەسەر دانیشتوانی ئەو گوندو شارانە بەم رەنگەیە کاتێك ستەمکار بوون، بەراستیو بێگومان لە سزای خوداو دابەزاندنو جێبەجیکردنی ئەو سزایانەدا ئازارێکی توندو تیژ هەیەو ئەشکەنجەی تەواویان لە دنیاو رۆژی دواییدا پێدەگەیەنێت).

جا بێگومان خودا بە گێڕانەوەی چیرۆکی پێشینان بۆ ئێمە لـە قورئانـدا مانـای وایە ئەوە ڕێزلێنانێکە لە ئێمەو لایەنێکی ڕەحمەتو بەزەیی‌و چاکەو فەزڵیـەتی لـە سەرمان، چونکە چـاومان بـەوە ڕۆشـن دەکاتـەوە کـە دەبێتـە چـاکەو چاکـسازی بۆمانو، ڕێگای خۆشویستنو ڕازیکردنی خۆیشیمان پیشان دەدات، لە هەمان کاتدا لەڕێی پیشان دانـی ڕقو تـوڕەیی‌و سـزاکانیەوە ئاگادارمـان دەکاتـەوە، ئەمانـەش هەمووی لە دەروازەی گێڕانەوەی ئەو چیرۆكو سەرگوزشتەی پێشینانەوەیە. ئێمەش پێویستە لەسەرمان نیعمەتی نێو چـیرۆکە گێرراوەکـانی قورئـان وەرگـرینو تـەنها بەوەندەش قەناعەت کەین کە خودا گێڕاویەتیەوەو، نابێت واز لەو شـیکارە ڕاسـت بێژی‌و ڕاستییەی خودا بێنینو ڕوو بکەینە چەند شێوازێکی نادروستی گریمانکـاری‌و پڕوپاگەندەی ریوایاتی وەرگیراو لە ئەفسانەگەری‌و (ئیسرائیلیات).

ئیتر چۆن ئەو کەسانە هەڵسەنگێنین کە چیرۆکەکانی خودا پشتگوێ دەخەنو لـە جیاتی ئەوە پەنا دەبەنە بەر ئەو سەرچاوە مرۆڤکردانـەی تووشـی دەسـکاری‌و درۆ هۆنینەوە بوون؟

## چیـرۆکەکان بگـێڕەرەوە:

خودا فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کردووە کە چیرۆکەکان بۆ خـەڵکی بگێڕێتـەوەو هـۆی ئەمەشـی بـەوە روون کردۆتـەوە کـە گێڕانـەوەیان دەبێتـە هـۆی پاڵنـەری بیسەرانیان بۆ تێفکرینو پەند لێوەرگرتن. ئەم فەرمانەی خـوداش بەڕاشـکاوی لـە ئایەتێکی سورەتی (الاعراف)دا هاتووە، ئـەویش دوای ئـەوەی چـیرۆکی پیـاوێکی تێدا گێڕراوەتەوە کە خودا زانستێکی پێ بەخشیوەو کەچی ئەو وازی لێهێناوەو بـۆ مەبەستی باش بەکاری نەهێناوە، بەڵکو لـە خراپەکاریـدا بـەکاری هێنـاوەو دوای شەیتان کەوتووەو ئیدی لە حاڵـەتێکی بـەردەوامی (زمـان دەرهێنـانی وەك سـەگ دابووە)، خودا لەبارەی ئەم کابرایەوە فەرموویە:

﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ﴾(الأعراف: ١٧٥-١٧٧)

واتە: ئەی پێغەمبەر بەسەرهاتی ئەو پیاوەیان بۆ بگێڕەرەوە کە زانستمان دەربارەی زانینو تێگەیشتنی ئایەتەکان پێبەخشیبوو کەچی پۆشاکی زانستو تێگەیشتنی لەخۆی دادڕی وەك چۆن (مار)-کاژی خۆی فڕێدەدات-، ئینجا شەیتانیش کە بەوەی زانی خۆی پێگەیاندو بووە هاوڕێیو بەتەواوی لە خشتەی برد، ئیدی ئەو پیاوە بووە یەکێك لە کەسانی گومڕاو سەرگەردان. خۆ ئەگەر بمانویستایە ئەو کابرایە بەو زانستە پایەبڵندو سەرفراز بکەین ئەوا دەمانتوانی، بەڵام بەهۆی نەشیانی بۆ ئەو پلەیەو بەهۆی ئەوەی باوەشی بە ژیانی سەر زەویو هەواو ئارەزووی دنیاپەرستیدا کرد، ئێمەش بەو حاڵەمان گەیاند، نموونەی ئەم پیاوەش وەك ئەو سەگەیە کە لە هەموو کاتێکدا زمان دەردەهێنێت، ئەگەر لێیدەیتو تەنگی پێهەڵچنیت زمان دەردێنێتو زمانی لە ماندوێتیو تەنگەنەفەسیدا دەردێنێت، ئەگەر وازیشی لێ بێنیت هەر لەو حاڵەتی زمان دەرهێنانەدایە. ئەمەش نموونەی ئەو گەلەیە کە ئایەتو بەڵگەو نیشانە زانستییەکانمان بەدرۆ دەخەنەوە.. جا تۆ ئەی پێغەمبەر ئەم چیرۆكو بەسەرهاتانەی نێو قورئانیان بۆ بگێڕەرەوە تاکو بیربکەنەوەو لێیان وردبنەوە. بەراستی خراپترین حاڵەتو نموونەی سەرگەردانی، حاڵەتی ئەو گەلو کەسو تاقمانەیە کە ئایەتو بەڵگە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەدرۆ خستۆتەوەو هەر خۆشیان ستەمکار بوون.

بەدواداچوونی قورئان لەسەر چیرۆکی ئەو پیاوەی کە خۆی لە زانستی خودا دامالّی، واتە دوای ئەوەی قورئان چیرۆکەکەی دەگێڕێتەوە، فەرمانی خودا بەدوایدا دێت بۆ پێغەمبەر ﷺ لەسەر پێویستی گێڕانەوەی ئەو چیرۆکەو (هەموو چیرۆکێکی تری قورئان) بۆ خەڵکی.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگیی چیرۆكو بەسەرهات لەلای خەڵکیو، لەسەر گرنگیی ئەو چیرۆکانەش بۆ بانگەوازو بڵاوکردنەوەی پەیامی راستو، چەسپاندنی واتاکانی بیروباوەڕو، خستنەڕووی نموونەی جوانی مرۆڤایەتی لەسەر ئەو چەمكو مانایانەی کە بانگەوازکاران بانگەوازیان بۆ دەکەن. نووسەرانو وتاربێژانیش کاتێك ئەو چیرۆکانە بۆ موسڵمانان باس دەکەن پێویستە هەروەك نیازێکی بنچینەیی باسیان نەکەن، بەڵکو بیشیان کەن بەو ئامڕازە کاریگەرەی کە نیازێکی ڕەسەنی ئیسلامی پێ بەدی دێت.

ئێمەش پێویستە لەسەرمان لەکاتی باسکردنی چیرۆکی پێشیناندا تەنها مەبەستمان چێژ پێدانی بیسەران نەبێتو وایان لێبکەین بە بیستنی بەسەرهاتو سەرگوزەشتەکان هەست بە رابواردنو کەیفو سەفای دنیایی بکەنو هەستو ئارەزووی هونەرییان پێ دامرکێننەوە، بەڵکو دەبێت مەبەستمان ئەوە بێت بیر لە راستی بکەنەوە تێیان رامێننو، ئینجا هەوڵ بدەن چەندان وانەی لەسەر باوەڕو بانگەوازو تێکۆشانو خۆڕاگریو قەرارگیریی لێ دەربێنن. بێگومان هەر دەبێت باسکردنی ئەو چیرۆکانە لە ئامڕازەکانی بانگەواز بێتو شێوازێکی پێویستی بەدیهێنانی هەقو بەرەنگاری ناهەق بێت.

دیارە بیسەرانیش جیاوازی دەکەن لەنێوان دوو جۆرە کەسدا کە بە دوو شێوازی لێك جودا قسەیان بۆ دەکەن، جۆرێکیان بیروباوەڕو پەیامی خواییان لەرێی چیرۆکەکانەوە پێ دەگەیەنێت، جۆرێکی تریشیان بیروباوەڕەکانی خۆی تەنها بە تیۆرێکی وشکی ئایدیالی دەگەیەنێت پییان. ئیدی بیسەران کاردانەوەیان لەگەڵ یەکێکیان دا دەبێتو تەنها بە یەکێکیان دەخرۆشێنو پشتگیری یەکێك لەو دوو

جۆرە پیاوانە دەکەنو هۆگری دەبن.

ئێمەی بانگەوازکاریش دەبێت فەرمانی خودا (فأقصص القـصص) بـەو رەنگـە جێبەجی بکەین کە شێوازی راستو دروستی پەروەردگاری دانای تێدا بەکار بێـنین. بەڵام پێویستە زۆر وریابینو لە رێنماییەکانی (قورئانو سوننەت) دەرنەچین لـەکاتی چوونە نێو قوڵایی شیکاری چیرۆکەکان داو لە جیـاتی ئـەو دوو سەرچـاوە راسـتو متمانەپێکراوە لەهیچ سەرچاوەیەکی تر شتی زیادە وەرنەگرین.

## بۆ ئـەوەی بیـربکەنەوە:

قورئانی پیرۆز لەکاتی باسـکردنی چـیرۆکەکانیدا ئامـاژەی بـۆ سـێ مەبەسـتی گێڕانەوەیان کردووە:-

١) بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە.

٢) بۆ جێگیربوونی دڵو دەرون لەسەر هەق.

٣) بۆ وەرگرتنی پەندو وانە.

جا دوای ئاماژە بـۆ ئـەم سـێ مەبەسـتە خـودا داوامـان لێـدەکات سـەرنجیان لێبدەینو بەدییان بهێنینو لێیان وردبینەوەو سەوداو مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین.

سەبارەت بە مەبەستی یەکەمیش: (تاکو بیربکەنـەوە/ لعلـهم یتفكـرون) ئـەوە دیـارە کـە بیـستنی چـیرۆکەکانی قورئـانو هەڵوێـستەکردن لـە ئاسـتیانداو لـێ وردبوونـەوەیان دەبێتـە هـۆی تێفکـرینو بیرکردنـەوە. تێفکـرینیش کردارێکـی هۆشمەندییە کە مرۆڤ تیایدا فیکری دەخاتە کارو عەقڵو هۆشـی بەگـەڕ دەخـاتو خانەکانی پەند لێوەرگرتنو وانەی بەسوودی تێدا دەدۆزێتـەوە. قورئـان تێفکـرینو هۆشیاریمان لێ دەخوازێتو لە چەندەها ئایەتدا بانگمان دەکـات بـۆ بیرکردنـەوەو پەند وەرگرتن، وەك لەم فەرمایشتەی خوادا هاتووە:

﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ﴾

(سبأ- ٤٦)، واته: ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: من یەك ئامۆژگاری ئێوه دەکەم، ئەوەیه که بۆ خوداو لەپێناوی خوادا بەدووکەس (دووقۆڵی)و یان هەرکەس بە تەنهایی، دابنیشنو پاشان بیربکەنەوه.

واته بیر له قورئانو پێغەمبەرو ڕێبازەکەی بکەنەوه.

بێگومان بیرکردنەوه ئەرکێکی قورئانیو، پێویستییەکی فەرزبووی ئیسلامیو، زەرورەتێکی ژیانیشه.

جا ئەو کەسانەی ئەم ئەرکه بەجێ ناهێننو ئەو فەرزەش پەك دەخەن، ئەوا ئەو نیعمەته گەورەیەی که خودا پێی داون بەفیڕۆ دەدەنو ئەو وزه زۆرەی پێشی بەخشیون ونی دەکەن.

بیرکردنەوەو هۆشمەندبوونو تێگەیشتن لەبەروبوومی خوێندنەوەی چیرۆکی پێشینەکانن له قورئانداو ئەنجامێکه له ئەنجامەکانی بیستنی چیرۆکەکانو، ئامانجێکی بەرزیشه که دەبێت هەر کەسێکی خوێنەر یان بیسەر خاوەنی بێت، یان هەرکەسێکیش که بۆ خەڵکیی تری دەگێڕێتەوه.

خودای مەزن فەرموویە: ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ۝ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ﴾(الحج: ٤٥-٤٦)

واته: چەندەها شارو شارۆچکه هەبوون ماوەمان پێدان لەکاتێکدا دانیشتوانەکانیان ستەمکار بوونو خانووبەرەکانیان بەسەر یەکتردا تەپیو، بیری ئاوی چۆڵو بێکەسو بێنازو، کۆشكو تەلاری بەرزو بڵندو بێخاوەن، ئەوانەمان بەهۆی ستەمەکانیانەوه لەناوبرد. دەی ئایا ئەوانه بەسەر زەویدا نەڕۆیشتوونو ئایا

-کافرانی قورەیش‌و خەڵکانی دوای خۆیان- لەکاتی تێپەڕبوون بەسەر کەلاوەکانیاندا بە دڵو دەروونێکی هۆشدارەوە بیریان لێ نەکردۆتەوەو لێکیان نەداوەتەوە کە -کوان خەڵکانی رابوردوو، ئەو شارانە بۆ وێران کران؟ کێ ئێمەی دروست کردووە؟ مەبەست لە ژیانمان چییە-؟! یان وا دیارە گوێ‌و دەزگای بیستنیان نییە، بەلام خۆ دەزگای دیتنیان کوێر نییە، بەڵکو ئەو دڵانەی نێو سینەکانیان کوێر دەبن.

هەروەها خودا فەرموویە: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ۝١٣٧ وَبِاللَّيْلِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾(الصافات: ١٣٧-١٣٨)، واتە: کاتێك ئێوە لە(شام) دەگەڕێنەوە، لە بەرەبەیاندا چاوتان بە ئاسەواریان دەکەوێت‌و پێیدا تێدەپەڕن‌و، بەشەویش -هەندێك جار لەوێوە تێدەپەڕن- و ئایا بە دیتنی ئاسەواری ئەو سزایانە بیر ناکەنەوەو عەقڵتان ناخەنە کار؟

ئەم دوو ئایەتەی سورەتی (الصافات) کە تیشك دەخەنە سەر چارەنووسی گەلەکەی (لوط)و ئاماژە بۆ ئاسەواری خاك‌و ژینگەیان دەکەن، لە هەمان کاتدا رووی گفتاریشیان تێدا کراوەتە هۆزی (قورەیش)و بە بیریان دەهێنێتەوە کە کاتێك قورەیش بەهۆی هات‌و چۆو بازرگانییانەوە رۆژانە بەیانیان‌و ئێواران بەلایاندا تێدەپەڕن، با پەندی لێ وەرگرن..

قورئان بەم ئایەتانە سەرزەنشتی قورەیش دەکات لەبەر ئەوەی عەقڵیان بەکار نەهێناوەو فیکریان نەخستۆتە گەڕو بەوردی سەرنجیان لەسەر کارەساتی گەلی (لوط) رانەگرتووە، تا بەم رەنگەش عەقڵ‌و فیکرو سەرنجیان بیانگەیەنێت بە کرداری باوەڕهێنان بە خوداو وازهێنانیان لە هەرکارێکی هۆی تورەبوونی خوداو پاشان کەوتنە بەر سزای سەختی خودا..

## بۆ جێگیر بوونی دڵ و دەروون لەسەر هەق:-

جێگیر بوونی دڵ مەبەستی دووەمی قورئانە لە چیرۆکەکانی دا.. وەك خوداش فەرموویە:- ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾(هود- ١٢٠)، واتە: هەموو ئەو چیرۆکانەی لەبەسەرهاتی پێغەمبەرانەوە بۆمان گێڕاویتەوە بۆ ئەوەیە دڵی تۆی پێ جێگیر بکەینو دڵنیات کەین، بەڕاستی لەم سوورەتەشدا هەقو ڕاستیت بۆ ڕوون کرایەوەو ئامۆژگاریو بەیاد هێنانەوەشی بۆ ئیمانداران هەیە.

جێگیر کردنی دڵو دەروون لەسەر هەق، واتە بڵند بوونیەتی بەهەق لەسەر هەر هێزێکی ناهەقو، گۆش کردنیەتی بۆ ڕوانینی پاداشتی خوداو دڵنیایی تەواو بە بەڵێنی خوداو، پاشان بەردەوام بوونی ئەو دڵو دەروونە لەسەر ئەم بەرنامەو ڕێڕەوە پاکە هەتا ئەو کاتەی بەخودای خۆی دەگاتەوە.

مرۆڤی ئیمانداریش هەموو ئەم واتا جوانانەی لە چیرۆکی پێشینەکانو داستانی پێغەمبەرانەوە دەست دەکەوێت.

ئەم ئایەتەی پێشوو گوتارێکە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ کە دوای گێڕانەوەی چەند داستانێکی پێغەمبەران (نوح، هود، صالح، ابراهیم، لوط، شعیب، موسا) درووديان لێ بێت لە سوورەتی (هود)دا ئاڕاستەی کراوە، بێگومان سوورەتی (هود)یش لە بارودۆخێکی زۆر تاڵو ناخۆش دا لە (مەککە) بۆ پێغەمبەر ﷺ نێرراوەتە خوارەوەو ئەم جۆرە دۆخەش لە ناهەموارترینی ئەو دۆخانەیە کە بانگەوازی ئیسلامی پێدا تێپەڕیوە.. دیارە لەو ساتە خەمناکەدا پێغەمبەرو هاوەڵانیشی پێویستیان بە دڵنەواییو هاوسۆزیو جێگیر بوونی دڵو دەروون بووە.. ئیدی چیرۆکەکانی قورئانیان بۆ هاتووەو ئەو پێویستییە زۆرەیان بۆ پڕ کردوونەوەو ئەو ئامانجە مەزنە قورئانیەشیان بۆ بەدی هێناون..

بێگومان گوتاری نێو ئایەتەکە سەرجەم موسڵمانانیش دەگرێتەوە لەهەر شوێنو دەقـەرو سـەردەمێك دابـن ئەگـەر چـی لـە بـنجو بنـاوان دا ئاراسـتەی خـودی پێغەمبەریش ﷺ کرابێت، چونکە گوتاری پێغەمبـەر ﷺ بـۆ هـەر موسـڵمانێکی نەتەوەکەشیەتی ئەگەر بەڵگەیەك نەبێت لەسەر تایبەت بوونی گوتارێـك تـەنها بـۆ خودی پێغەمبەر ﷺ .. بۆیە هەموو هاوەڵێك (صحابی) لـەو رۆژگـارەدا هۆکـاری جێگیربوونی دڵو دەروونی لەو چیرۆکانەدا بەدی کردووەو هـەر موسـڵمانێکیش بـە چاکی ڕەفتارو مامەڵەی لەگەڵ چیرۆکی پێشینەکانی نێـو قورئانـدا کردبێـت ئـەوا ئامرازی جێگیر بوونی دڵو دەروونی تێدا بەدی کردوون.

موسڵمانانی ئەم سەردەمەش لە موسڵمانانی هەر کـاتو زەمـانێکی دی زیـاتر ئاتاجیان بە بەدی هێنانی ئەم مەبەستە قورئانییەی چیرۆکەکان هەیە، ئێمە ئـەمڕۆ زیاتر ئاتاجمان بە چیرۆکەکانی قورئان هەیە بۆ ئەوەی دڵو دەرونمـانی پـێ جـێگیرو دامەزراو کەینو، ئارامیو خۆشی پێ بخەینـە دڵەکانمانـەوەو، مـەوقیعی خۆمـانی لەسەر ڕێگەی ڕاست پێ پتەو کەینو، پێیەکانیـشمان بـەڕێکی لەسـەری ڕاگـرین. بۆیە ئەمڕۆش زیاد لەهەر کاتێکی دی ئاتاجمان بەوەیـە، چـونکە لـەم سـەردەمەدا کۆسپو تەگەرەو هۆیە فریو دەرو سەر شێوێنەکان هێجگـار زۆرنو، شـەڕی نێـوان هەقو ناهەقیش لەو پەڕی توندیو دژواری دایەو، هێرشی شەڕ خوازانەی گومڕایانو شوێنکەوتوانی ناهەق لـە دژی سـەربازانی خـودا بـە شـێوازێکی زۆر دڕندانەیـەو، وجودی واقیعیانەی ئیسلامیش لە کۆمەڵگەو سیستەمو قەوارەی دا دیار نیە.

هەروەها ئایەتەکەی سوورەتی (هود) ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ ۚ وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾(١٢٠)، مـژدەی ئـەوەمان پـێ دەگەیـەنێت، کـە لـە چـیرۆکەکانی قورئـان دا (هـەقو، ئامۆژگاریو، یادخستنەوەی بۆ باوەڕدارانیش) تێدایەو، گـرنگ ئەوەیـە بـە چـاکی تێبینی ئەو مانا هەڵگیراوانەی نێویشیان بکەین.

## پەندو وانە بۆ کەسانی ژیر:

سێیەم ئامانجه له چیرۆکەکانی قورئانداو خوداش دیاری کردووەو فەرمووییە:-

﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (یوسف- ۱۱۱)، واته:- (بێگومان لەسەر گوزشتەو چیرۆکەکانیان دا پەندو ئامۆژگاریی بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند هەیە، ئەم چیرۆکانەش وتارو قسەو باسی هەڵبەستراو نین، بەڵکو بۆ بەڕاست دانانیو پەسند کردنیانە لەلایەن کتێبەکانی پێشووەوەو بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو مەسەلەیەكو، بۆ ڕێنماییو ڕەحمەتیشە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕ دێنن).

ئەم ئایەتە دوایین ئایەتی سوورەتی (یوسف)ەو بەزمانی حاڵ بانگمان دەکات بۆ تێبینی کردنی مەبەستو نیاز له داستانی (یوسف) -سڵاوی خوای لێ بێت- کە بەیەك جار لەو سوورەتەدا هەموو بەشو بەسەرهاتەکانی گێڕراونەتەوە. لە سەرەتای ئەم سوورەتەش دا بە ئایەتێك (مەنهەجی قورئان لە چیرۆکەکانی دا) ڕوون کراوەتەوە، وەك خودا فەرموویە:-

﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ﴾

(یوسف- ۳)، واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە چاکترین چیرۆكو بەسەرهاتت بۆ دەگێڕینەوە لەڕێی سرووش (وحی)یەوە کە بەم قورئانە پێت دەگەیەنن).

جا کاتێك سەرنجی هەردوو ئایەتەکەی (سەرەتا)و (کۆتایی)ی سوورەتی (یوسف) دەدەین، وێستگەیەکی قەشەنگ بەدی دەکەین.

ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتەکە، چیرۆکی (یوسف)مان وەك سەرچاوەی چیرۆکەکانی قورئان بۆ دەردەخاتو، بە باشترینی داستانان (احسن القصص)یشی وەسف دەکاتو، مەنهەجی جوانکاریی قورئانیشمان لە ئیلقای ئەم چیرۆکانەو

وەرگرتن‌و لێبووردنەوەو سەودا لەگەڵ کردنیان دا پێ دەناسێنێت.

ئینجا ئایەتی کۆتاییش دێت‌و، وەها پەنجەی ئاماژە بۆ نیازو مەبەستی لە هێنانەوەی چیرۆکەکانی قورئان درێژ دەکات وەك ئەوەی داوامان لێ بکات کە ئەو نیازو مەبەستە لە خۆماندا بەدی بکەین، نەك خودی چیرۆکەکان بکەینە ئامانجە دەستنیشان کراوەکە.

(ئایەتی سەرەتا)ی چیرۆکەکە شێوازو مەنهەجەکە دەناسێنێت، بەڵام (ئایەتی کۆتایی)ی چیرۆکەکە ئامانج‌و مەبەستەکەی دیاری دەکات.. جا (یا لیت قومی یعلمون...) خۆزگە گەلەکەم دەیانزانی.

بۆچی لە چیرۆکەکانی قورئان دا پەندو وانە هەیە؟

(وشەی پەند) لە عەرەبی دا (عیبرەت/العبرة)ی پێ دەگۆترێت.. وشەی (عبرة) لە (عبور)ەوەیە کە بە کوردی مانای (پەڕینەوە)ی پێ دەگوترێت.. جا کە دەگوترێت لە چیرۆکەکان دا پەندو عیبرەت‌و (پەڕینەوە) هەیە، واتە خەڵکی دەپەڕێنێتەوە بۆ ڕابردووو بۆ پێشینان، ئەمەش وەك ئەوەی لە هەموو کۆتێکی کات‌و شوێن دەرباز بێت‌و لە پێوەندی (واقیع)یش رزگار بێت‌و بچێتە سەر سەکۆیەکی ڕوانینی کورتی ساتە وەختی‌و لێیەوە بڕوانێت بۆ ڕووبەرێکی بەر فراوانی مێژووی گەلانی دێرین‌و، بەسەرهاتی کەسانی پێشین‌و، لە ژیانیان دەکۆڵێتەوەو چاودێری ڕەفتارو هەڵس‌و کەوتیان دەکات‌و پێیان تەمێ دەبێت.

ئەوەش چەند نموونەیەکی دووبارە بوونەوەی سیمای بەشەریەتن‌و، چیرۆکی پێشینەکان لە قورئان دا دەیانخاتە بەر دیدەمان.. چەند نموونەیەکی باوەڕداران‌و، چەند نموونەیەکی بێ باوەڕانیشن. چەند نموونەیەکی کەسانی بێ هێزو سەر کزن‌و، چەند نموونەیەکی پیاوانی ڕاستگۆو بەهێزن.. هەروەها چەند بەهایەکی هەمیشەیین کە چیرۆکی پێشینەکان پێشانمانی دەدەن، بەهاکانی هەق‌و، بەهاکانی ناهەقن، بەهاکانی جوامێری‌و، بەهاکانی نامەردین.

ئەمە شەڕێکی بەردەوامی نێوان هەق‌و ناهەقیشە کە مێژووش هەمیشە زۆربەی

مەیدانەكانی ئەم شەڕەو شێوازو ڕوخسارو بوارەكانیمان بـۆ دووبـارەو چـەند بـارە دەكاتەوەو، هیچ جیاوازیەكیشیان تیادا نییە تەنها كەسەكان دا نەبێت.

بەڕاستی چیرۆكەكانی قورئان گەلێك وانەو ڕێنمـاییو پەنـدو، چـەندین بـەهاو ڕێساو حەقیقەتو، گەلێك توێشووو كەرەسەو چـەكو، چـەندین كەشـی ئـارامیو متمانەو بەختیاریو جێگیربوونیمان پێشكەش دەكەن.

چیرۆكەكانی قورئان له وانەو ڕێنماییو پەندەكانی داو، له ئیمانو عەقیدەو، له كارو بانگەوازو، له جیهادو بەرەنگار بوونەوەو، له ڕەوانبێژیو هـەڵسو كـەوتو، له ئارام گرتنو خۆ ڕاگریو، له پێـوەرو ڕاسـتییەكان دا (گەنجینەیـەكی نـەبڕاوە)و (كانییەكی وشك نەكردوو)ە.. خوداش ڕاستی فەرموە كه لـەو چـیرۆكانەدا پەنـدو عیبرەت بۆ كەسانی ژیرو هۆشمەند هەیە.. ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الْأَلْبَابِ...﴾(یوسف- ١١١).

بێگومان خەڵكی هەموویان سوود له چیرۆكی پێـشینەكانی قورئـان وەرنـاگرنو هەمووشیان وەك یەك ناتوانن سەرنجی وانەو پەنـدو ڕێنماییـەكانی ئـەو چـیرۆكانە بدەن، بەڵكو تەنها كەسانی ژیـرو خـاوەن عـەقڵی بێـدارو، هۆشمەنـد سـوودی لـێ دەبینن، ئەوانەی كه بە وردی له واتاكانی ڕادەمێننو بایەخی عەمەلی پـێ دەدەنو ئەزموونی بانگەواز كارییان تێیاندا هەیەو هەوڵو تەقەللای جیهادكاریـشیان تێـدا دەخەنەگەڕ، هەروەها هەندێك كەس تەنها له كاتی خوێندنەوەی قورئان یان بیستنو گوێ ڕاگرتندا سەرنجی وانەو پەندو ڕێنماییـەكانی دەدەن، هەنـدێك كەسـی تـریش تەنها له ڕوانگەیـەكی زمانـەوانیو هونـەریی ڕەوانبێژیـەوە سـەر قاڵیـان دەبـن.. هەندێك كەسی تریش له ڕوانگەی ئەفسانەو ئەو چیرۆكە خەیاڵییـە نـا ڕاسـتە بـێ بناغانەوە سەر قـاڵی پەنـدو وانـەو ڕێنماییـەكانیان دەبـن كـە لـە سەرچـاوەكانی (اسرائیلیات)و چاوگە نەسەلمێنراوەكانەوە وەریان دەگرن.

بەڵام كەسانی خاوەن عەقڵ (اولی الالباب) شـێوازێكی تریـان لـە تێگەیـشتنی

چیرۆكەكانی قورئاندا هەیەو هەر بەو شێوازەش ئامانجە گەورەكەی قورئان بەدی دەهێنن‌و پشكی خۆیانی لە وانەو پەندو ڕێنماییەكان لێ دەردەهێنن‌و، قایل نابن بە هیچ ڕێوشوێنێكی تری نابەجێ كە خۆیان‌و كەسانی تریش بەخۆڕایی سەرقاڵكەن‌و، پاشان وانەو پەندو ڕێنماییەكانیان لێ ون ببێت، جا داخۆ ئەو شێوازە ڕاست‌و دروستەی كەسانی ژیرو خاوەن عەقڵ بۆ دەرهاویشتنی وانەو پەندو ڕێنماییەكانی نێو چیرۆكەكانی قورئان چی بێت؟ وەرن با پێكەوە لەم بەندەی داهاتوودا ئەو شێوازە بناسین..

## شێوازی لێكۆڵینەوەی چیرۆكی پێشینەكان

هەندێك كەس لە لێكۆڵیاران‌و نووسەران‌و وتاربێژانی موسڵمان بە هەڵە لە چیرۆكی پێشینەكانی نێو قورئانیان كۆڵیوەتەوەو دیارە هەر لە نیازپاكیی(حسن النیة)ی خۆشیانەوە بە شێوازێكی ناڕاست و(پێچەوانەی شێوازی ڕاست‌و پتەو) لە چیرۆكەكان دەكۆڵنەوەو بڕێكی هێگجار زۆر لە وتەو هەواڵ‌و ریوایات‌و شیكاری ناڕاست هەڵدەڕێژنە بەردەمی خوێنەران‌و بیسەران كە هیچیان لە ئەفسانەو داستانە پووچەڵ‌و دروستكراوەكان بەدەر نین‌و لە سەرچاوە تێكدەرو بەتاڵەكانەوە وەرگیراون، وەك (ئیسرائیلیات)و هەواڵ‌و بەسەرهاتی نێو كۆمەڵی (أهل الكتاب).

بۆیە دەبێت لێكۆڵیاری چاوساغ‌و بەرچاوروون بەرنامەیەكی ساغ‌و ڕاستی هەبێت تاكو بتوانێت پەندەكانی نێو چیرۆكی پێشینەكان دەستنیشان بكات‌و، نەكەوێتە نێو گێژاوی ئەفسانەو داستانە پڕوپووچەكانەوەو، پاشان تاكو نە خۆی‌و نە خوێنەر یان بیسەرانیشی سەرقاڵی بەربەستەكانی بەردەم ئەو پەندو وانە جوانانەی نێو چیرۆكەكان نەكات.

ئه‌م به‌رنامه‌و شێوازه‌ش ته‌نها له‌ (قورئانو سوننه‌ت) وه‌رده‌گیرێت.. بێگومان له‌ قورئانی پیرۆزدا چه‌ندین رێسا بۆ لێکۆڵینه‌وه‌ له‌ چیرۆکی پێشینانو بۆ به‌رنامه‌ی زانستیانه‌ وبابه‌تیانه‌ی راستو دروست دیاری کراوه‌.. لێره‌شدا هه‌ندێك له‌و رێساو ئاڕاسته‌ زانستیانه‌ی قورئان ده‌خه‌ینه‌ روو:

## ١) له‌ نادیاره‌كانی رابردوو (من غیب الماضي):

چیرۆكه‌كانی پێشینان له‌ قورئاندا له‌ژێر رێساو له‌چوارچێوه‌ی (أنباء الغیب) واته‌ (هه‌واڵو داستانی رابردوو)دان، چونكه‌ له‌ به‌رنامه‌ی ئیسلامدا نادیاره‌كان ده‌كرێن به‌ سێ به‌شه‌وه‌:

١- نادیاری رابردوو (الغیب الماضي): وه‌ك چیرۆكی پێشینه‌كان، بۆ نمونه‌ (چیرۆكی ئاده‌م-سلاوی لێبێت- له‌گه‌ڵ ئیبلیسو خواردنی له‌ دره‌خته‌كه‌و ده‌ركردنی بۆ سه‌ر زه‌وی)و (چیرۆكه‌كانی گه‌لی نوحو عادو ثمودو مدین)و (چیرۆكه‌كانی به‌نیئیسرائیل له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ره‌كانیاندا).. هه‌موو ئه‌م چیرۆكانه‌ له‌ هه‌واڵو به‌سه‌رهاته‌ نادیارو نه‌زانراوه‌كانی رابردوون، چونكه‌ له‌ سه‌رده‌مێكی رابردوودا روویان داوه‌و كۆتاییان پێهاتووه‌و بوون به‌ چه‌ند هه‌واڵێكی رابردوو. ئه‌وه‌ش لای ئێمه‌ به‌ نادیار(غیب) داده‌نرێت، چونكه‌ ئاگاداری رووداوه‌كانیان نه‌بووینو هیچمان له‌ خۆیان نه‌بیستووه‌و هاوچه‌رخیشیان نه‌بووین.

٢- نادیاری ئێستا: وه‌ك ئه‌و بوونه‌وه‌رو مه‌خلوقاته‌ی كه‌ ئێستا هه‌نو قه‌واره‌و ژیانو وجودی خۆیان هه‌یه‌و كه‌چی ئێمه‌ نایانبینینو گوێمان له‌ ده‌نگیشیان نیه‌.

بۆ نمونه‌ش (مه‌لائیكه‌ته‌ به‌رێزه‌كان)و (جنو شه‌یتانه‌كان).. ته‌نانه‌ت وجودی خوداش له‌ نموونه‌ی نادیاری ئێستادایه‌، چونكه‌ خودا هه‌ر هه‌یه‌ ئه‌گه‌رچی ئێمه‌ له‌م دنیایه‌دا نایبینین.

٣- نادیاری ئاینده‌: وه‌ك ئه‌و ئایه‌تو فه‌رمووده‌ ڕاست (صحیح)انه‌ی ده‌رباره‌ی

چــەند رووداوو مەســـەلەیەکی ئاینـــدەی مێــژووی مرۆڤایـــەتین، بــۆ نمونـــەش (نیشانەکانی رۆژی دوایی) وەك هاتنەخوارەوەی عیسا -سلاوی خــودای لێبێــت- و، دەرچوونی جادووگەرەکە(دجال)و (یــأجوج و مــأجوج)، هــەروەها دیمەنــەکانی قیامەت)یش هەر لــە فــووی زیندووکردنــەوە (نفخة البعث) تــاکو خرانــە نێــو بەهەشتی باوەڕداران‌و خرانە نێو دۆزەخی بێباوەڕانیش بــە هەواڵــە نادیارەکــانی ئاینده دادەنرێت.

هەرکەسێکیش لە شەش روکنەکەی ئیمان وردبێتــەوە دەبینێــت هــەموویان لــە جیهانی نادیارن.. رۆشنترین‌و دیارترین ســیفەتی بــاوەڕدارانیش باوەڕهێنانیانــە بــە نادیــار(غیــب).. هۆشمەنــدیی (عقليــة)ی ئیــسلامیش (هۆشمەندییــەکی زانــستیی نادیارییــە)، بــەلام عەقلێــەتی ماددەگــەریی رەتکــەرەوەی نادیــار (عەقلێــەتێکی ماددیی نەفامییە).

قورئانی پیرۆز بەراشکاوی‌و بێپەردە هەموو چیرۆکەکانی کەسان‌و گەلانی پێشین بە بەشێك لە جیهانی نادیار لە قەڵەم دەدات.. وەك لە ســورەتی (هــود)دا هــاتووە دوای ئەوەی قورئان چیرۆکی پێغەمبەری خودا (نوح)-سلاوی لێبێــت- دەگێڕێتــەوە هەر لە سەرەتای بانگ کردنی گەلەکەیەوە بۆ سەر رێبازی خــودا، تــا ئــەو کاتــەی خودا بەلافاوەکە سەرنگوومیان دەکات‌و (نوح)یش لەگەڵ باوەڕداراندا لە پاپۆڕەکەدا رزگار دەکات‌و بەهێمنی دەیانگەیەنێتــەوە بــۆ ســەر زەوی، جــا لــەدوای شــیکاری رووداوەکانی ئەو بەســەرهاتە، چــیرۆکەکە وا وەســف دەکــات کــە لــەو هەوالانــەی رابردووە (من أنباء الغيب) کە خودا بە سروش بۆ پێغەمبــەر ﷺی نــاردوون، وەك خودا فەرموویــە: ﴿تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَـٰذَا...﴾(هــود- ٤٩)، واتە: ئەم چــیرۆك‌و بەســەرهاتانە لــەو هەواڵ‌و دەنگ‌و باسە نادیارو نەزانراوانەی گەلانی رابــردووە کــە بــە ســروش بــۆتی دەنێرین‌و کە خۆت‌و گەلەکەشت لەمەوبەر نەتاندەزانی‌و هیچتان لێنەبیستبوو.

لە کۆتایی چیرۆکی (یوسف)یشدا قورئان ئاماژە بۆ ئەو لایەنە دەکات کە ئەو چیرۆکەو رووداوەکانی لە هەواڵو دەنگو باسی نادیارەو پێغەمبەریش ﷺ ئەگەر خودا زانیاری لەبارەوە بۆ نەناردایە هیچی لێنەدەزانی، وەك خودا فەرموویە: ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۖ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ﴾(یوسف- ١٠٢)، واتە: ئەم رووداوانەی بەسەر یوسفدا هاتووە لە هەواڵو بەسەرهاتەکانی نادیارن کە ئێمە بە سروش بۆت دەنێرین، چونکە خۆ تۆ لەلای براکانی یوسف نەبوویت کاتێك هەموو بڕیاریان داو رێك کەوتن لەسەر پیلانگێڕان لە براکەیان، تا هەڵی دەنە نێو بیرەکەوەو باوکیشیان فریو بدەن.

هەمان فەرمایشتی خوداو هەمان بەدواداچوون لەبارەی بەسەرهاتی (مەریەم) -خودا لێی رازی بێت- هاتووە، ئەویش لەو کاتەوەی لە سکی دایکیدایەو، دوای ئەوەش کە مێردی خوشکەکەی (واتە زەکەرییا -سلاوی لێبێت) لە خۆی دەگرێتو سەرپەرشتیی دەکات، وەك خودا فەرموویە: ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۚ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يُلۡقُونَ أَقۡلَٰمَهُمۡ أَيُّهُمۡ يَكۡفُلُ مَرۡيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ﴾(آل عمران- ٤٤)، واتە: ئەم رووداوانەی بەسەر مەریەمدا هاتووە لە هەواڵو دەنگوباسی نادیارن کە بە سروش بۆتی دەنێرین، تۆش ئاگاداریان نەبوویتو لەلای زاناو خواپەرستەکانی (بيت المقدس) نەبوویت کاتێك تیروپشکیان ساز کردبوو لەسەر ئەوەی کامیان سەرپەرشتیاری (مەریەم) لەئەستۆ بگرێت، هەروەها لەلایان نەبوویت کاتێك ململانێو پێشبڕکییان لەسەر ئەو کارە لەنێواندا دروست ببوو..

لەم ئایەتەشەوە ئەو زانیاریەمان دەست دەکەوێت کە عابیدو خواناسانی ئەو سەردەمە لە پێشبڕکێی یەکتردا بوون بۆ وەرگرتنی شەرەفی لەخۆگرتنی (مەریەم) کاتێك بە تەنها ماوەتەوە، لەدواییدا (زەکەرییا) لە پێشبڕکێی تیروپشك(قورعە)دا ئەو شەرەفەی بەدەست هێناوە..

## ٢) تۆ لەلایـان نەبوویــت (وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ ):-

بێگومان ئەمە لە نادیارەکانی رابردووەو هـەر تـەنها خـودا خـۆی زانیویـەتیو ئاگاداری رووداوەکانیو وردو درشتی لایەنەکانی بووە.. هەروەها تەنیا خودا خـۆی زاناو ئاگاداری هەرسێ جۆرەکەی نادیاری (رابردووو ئێستاو ئاینده)یە..

خــودا لــەم بارەیــەوە فەرمویــە: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ...﴾(الأنعام- ٥٩).

هــەروەها فەرموویــــە: ﴿فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ﴾(یونس- ٢٠).

هــەروەها فەرموویــە: ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ﴾ (هود- ١٢٣).

خودای مەزن زانستی نادیار (علم الغیب)ی بە هیچ مرۆڤێك نەبەخشیوە تـەنها ئەوەندە نەبێت کە خۆی فێری کردووەو ئاگاداری کـردووە لێـی، وەك فەرمویـەتی: ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾(النمل- ٦٥).

هەروەها فەرموویـە: ﴿عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ...﴾(الجن: ٢٦-٢٧).

پێغەمبەریش ﷺ بـە ڕاشــــکاوی رایگەیـاندووە کـە ئـەو هـیچ لـە نادیـار نازانێت، تەنها لە ڕێی ئەو زانیاریانەوە نـەبێت کـە خـودا پـێی گەیانـدووەو کـە

فێریشی کردبوو هەردەم به خـەڵکی بفـەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ ...﴾ (الأعراف- ١٨٨).

جا لەبەر ئەوەی هەر خودا خۆی له هەموو وردو درشتییەکی شـیکاری چـیرۆکی پێشینەکان ئاگادارەو زانستی تەواو هەر لەلای خۆیەتی، ئەوا هـیچ کەسـێك بـۆی نییه لەخۆیەوه تێیدا رۆبچێت‌و پڕوپاگەنـدەی زانـستی تێـدا بکـات.. خـۆ ئەگـەر پێغەمبەری خوداش ﷺ ئەو وردەکارییانـەی چـیرۆکەکانی بـۆ روون نەکردینایـەوە، ئەوا دوای خۆی کێ شایانی روونکردنەوەو شیکاریان بـوو؟ نەخاسمـه لـه کاتێکـدا سرووش (وحی) تەواو ببوایەو خوداش (دوای ئەو)-واته دوای پێغەمبەر- پەیوەندی به هیچ کەسێکی ترەوه نەکردایەو زانیاری لەسەر ئەو بەسـەرهاته نەزانراوانـه پـێ نەگەیاندایه؟

ئەم فەرمایشتەی قورئـان بـۆ پێغەمبـەری خـودا ﷺ (وَمَـا كُنـتَ لَـدَيْهِمْ) کـه چیرۆکەکانی پێشینانی وەك ئامرازێك پێ دەگێڕێتەوەو که به تـەواوی نکـووڵی لـه زانین‌و زانیارییەکانی پێغەمبەر دەکات‌و که ئەو خۆی هیچی لێیان نەزانیوەو لێیـان ئاگادار نەبووەو، خۆ ئەگەر پێغەمبەرێکی خوداش نەبوایـه ئـەوا خـودا هـەواڵ و- ئەخبار-ی ئەو رووداوانەی رابردووی پێ‌نەدەگەیاند. هەر ئەم فەرمایشته (وَمَا كُنتَ لَـدَيْهِمْ) نکووڵی لەوەش دەکات که پێغەمبەری خوا —محمد ﷺ لەو کات وشـوێنەدا لەگەڵ کەس‌و رووداوەکانی چیرۆکی پێشینناندا ژیابێت‌و چاوی پێ‌کەوتبێ.

راسـته مەبەسـتی قورئـان لـەم نکووڵییانـه بـۆ سـەلماندنی راسـتیی پـەیام‌و سرووشەکەیه که بۆ دواین پێغەمبەری خودا ﷺ هاتووەو، بـۆ روونکردنـەوەی ئـەو راستییەشه که هەموو هەوڵ‌و بەسـەرهاتەکان لـەلای خـودا خۆیەوەیـەو، ئەگـەر- موحەمەد-یش ﷺ پێغەمبەر نەبوایه ئەوا زانیارو ئاگادار نەدەبوو لێیان، بەڵام لـه

هه‌مان كاتدا ڕێنموونییه‌كی تری قورئـان لـه‌ ده‌سـته‌واژه‌ی (وَمَـا كُنـتَ لَـدَيْهِمْ)ه‌وه‌ وه‌رده‌گـرین كـه‌ ڕێگـای به‌رنامـه‌ی لێكۆڵینـه‌وه‌ لـه‌ چـیرۆكی پێـشینه‌كانو، لێوردبوونه‌وه‌و، به‌ده‌ستهێنانی سه‌رچاوه‌كانیمان پیشان ده‌دات.

دیسان هـه‌ر ئـه‌و (نكوولییـه‌ی ده‌سـته‌واژه‌كه‌ له‌مـه‌ڕ بێئاگـاییو بێزانیـاریی پێغه‌مبه‌ر له‌ ڕووداوو به‌سه‌رهاته‌كان) ده‌خه‌ینه‌ به‌ر دیدی هه‌ركه‌سێك كه‌ ده‌یـه‌وێت بچێته‌ نێو قووڵایی شیكارو لێكۆڵینه‌وه‌ی ئه‌و چیرۆكو داستانانه‌وه‌و كـه‌ سه‌رچـاوه‌ی ناڕاسـتی ڕیوایـاتو وتـه‌و هـه‌واڵو به‌سـه‌رهاته‌ ده‌سهه‌ڵبه‌سـته‌كان دێنێـتو، بـه‌ زمانێكی قورئانیانه‌ پێی ده‌ڵێت: (ئایا جـه‌نابتان لـه‌وێ بـوونو لـه‌لای ئـه‌و گـه‌لو هۆزانه‌ بوونو چاوت پێیان كه‌وت، كه‌ چی ده‌كه‌نو چی ده‌ڵـێنو هـه‌ڵس وكـه‌وتیان چۆنه‌؟ ئایا هیچت لێیان بیستو بـینی لـه‌و شـتانه‌ی ئێـستا بۆمـان گێڕایتـه‌وه‌؟! به‌ڕاستی تۆ (وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ) له‌لایان نه‌بوویت، تۆ له‌گه‌ڵیاندا نه‌بوویت، ئیدی چۆن ئه‌و شتانه‌یان ده‌خه‌یته‌ پاڵ، كه‌ لێیان ئاگادار نه‌بوویت ؟)..

له‌وانه‌یه‌ له‌ وه‌ڵامدا بڵێت: (منیش له‌ كه‌سانی تره‌وه‌ ده‌یگێڕمه‌وه‌، له‌ كه‌سـانی پێش خۆمه‌وه‌ وه‌رم گرتووه‌و، ده‌گه‌ڕێمـه‌وه‌ سـه‌ر ئـه‌و سه‌رچـاوانه‌ی، كـه‌ له‌وانـه‌وه‌ وه‌رگیراوه‌و دراوه‌ته‌ پاڵیان)..

ئێمه‌ش پێی ده‌ڵێین: (ده‌ی ئایا ئه‌وانه‌ی كه‌ تۆ لێیانه‌وه‌ وه‌رده‌گریت، له‌گه‌ڵ ئـه‌و كه‌سانه‌ی نێو ڕووداوو به‌سه‌رهاته‌كاندا بوون؟ ئایا له‌گه‌ڵیاندا ژیاون؟! بێگومان ئـه‌و حیكایه‌تخوانانه‌ی، كه‌ تۆ ئاماژه‌ بۆ ڕیوایه‌ته‌كانیان ده‌كه‌یت له‌ جووله‌كه‌كانی-بـه‌نو ئیسرائیل-نو متمانه‌شیان پێ نه‌كراوه‌ له‌سه‌ر گێڕانه‌وه‌ی به‌سـه‌رهاتی پێـشینه‌كان. به‌م پێیه‌ سه‌رچاوه‌كانیش ئه‌و درۆو قسه‌ڵۆكه‌ هه‌ڵبه‌ستراوانه‌ی (ئیسرائیلیات) بوون، كه‌ چه‌نده‌هات ده‌سكاریو زیاده‌ڕۆییو ئاڵو گۆڕیان به‌سه‌ردا هێنراوه‌.

## ٣) تەنها خـودا دەیانزانێـت ( لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ):

قورئان هەواڵی ئەوەشی پێداوین، کە هەندێك رووداوی چیرۆکەکانی پێشینانو کەسەکانیشیان، هیچ کەس نایانزانێت، تەنها خودا خۆی نەبێت.. ئەمەش مانای وایە هیچ مرۆڤێك زانستی ئەو لایەنەی لەلا نییە، تەنها خودا خۆی نەبێت.. وەك خودا فەرموویە: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ...﴾(إبراهيم- ٩).. لەم ئایەتەدا رستەی (لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ) دەقێکی روونە لەسەر نەبوونی زانست لەلای هیچ مرۆڤێك بەو وردەکارییانەیەوەو، لەسەر بوونی زانست تەنها لەلای خودای پاكو میهرەبان خۆی.

لەم ئاماژە قورئانییەشەوە چاوێکی وردبینیی قورئان بەرجەستە بووە لە تێڕوانینی مێژووو دیراسەکردنیو سەودا لەگەڵ کردنیدا. لە راستیشدا مێژووی مرۆڤایەتی، کە لە ژیانی بەشەریی کۆڵیوەتەوەو، کە مرۆڤ خۆی نووسیوێتیو دایڕشتووەو هێناوێتی، بەرهەمێکی نوێیەو برێکی هێجگار کەمی لە رووداوو وردەکارییەکانی ئەو مێژووە لەخۆ گرتووە، بەم رەنگەش برێکی هێجگار زۆری ئەو رووداوو وردەکارییانەی لەدەست چووە، ئەمە جگە لەوەی پرۆسەیەکی رووتی مێژوویی مرۆڤکردانەیەو لە سەرچاوە ئاسمانییە ڕاستگۆکان دابڕاوەو جێی رەخنەی تەواوەو، گومانی تەواویشی لە ڕاستیی مادەو کەرەسە مێژووییە گێڕراوەکانیشی دەکرێت.

هەروەها لەو ئایەتەوە وجودی زنجیرەیەك بە ناوی (ئەڵقە ونەکان)ی مێژووی پێشینەکان هەست پێ دەکەینو وەریان دەگرین، ئەم ئەڵقانەش لە مێژووی دەسکردی مرۆڤایەتیدا تۆمار نەکراونو، هیچ ئادەمیزادێکیش زانستی لەسەریان

نەبووە. کەوابوو دەبێت زانستەکەشیان تەنها بۆ خودا بگێڕینەوەو، نابێت وردەکاریو شیکارییان تێدا دروست بکەین، بەڵکو پێویستە بە ئەدەبەوە لەگەڵ فەرمایشتی خوادا رەفتار بکەینو تەنها بەوەوە پابەند بین کە خستوێتییە بەردەممانو، ئینجا بە رێبازێکی پوختی (زانستیو مەنهەجیو بابەتیانە)ش دان بنێین بەبێئاگایی خۆمان لە نەزانینی ئەو ئەڵقانەو لە نەبوونی زانستمان لەسەریان مادام خودا هیچ هەواڵێکی لەسەر هەندێکیان پێ نەگەیاندبین.

نازانم چۆن هەندێك کەس لە نوسەرانو وتاربێژان رێگە بەخۆیان دەدەن، کە سەرپێچی لەم ئایەتە روونو ئاشکرایە بکەنو گومانیشیان وایە گوایە هەندێك کەس لە پێشینەکانی (جوولەکەو دیانەکان)، کە بە (أهل الکتاب) ناودەبرێن زانستیان لەسەری هەبێت؟! واتە لەسەر چەند ئەڵقەیەکی نەزانراوی چیرۆكو داستانە کۆنەکانی پێشینانی پێش (بنو اسرائیل) وەك گەلانی (نوح و عادو سەمود).. قورئانی پیرۆز بەروونی ئەم ڕاستییەی بۆ خستووینە ڕوو، کە ﴿...وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ...﴾، واتە (ئەو کەسو گەلو هۆزانەی لەدوای ئەو گەلە لەناوچوانەی (نوحو عادو سەمود) ژیاون، هیچ شتێکیان لەبارەوە نازانن.) کەچی جوولەکەکان دەڵێن: (ئێمە دەیزانین)و بیانووو بەڵگەشیان ئەوەیە، کە چەند بەسەرهاتێکی درۆو هەڵبەستراو لەسەریان دێننەوە. ئیدی چۆن بڕوا بەوانە بکەین، کە بەپێچەوانەی دەقی رۆیشتنی قورئانەوە، چیرۆکەکان دەشێوێننو ئیدیعای ئەوەش دەکەن گوایە زاناو ئاگاداری ئەو مەسەلە نادیارو نەزانراوانەن، کە قورئان بە ڕۆشنیو ڕاشکاوی، نکوولیی لە ئاگاداربوونیان کردووەو نەفیی (نەژادناسی)و مێژووناسی هەرکەسێکی لەو جۆرەشی کردووە.

(عبداللەی کوڕی عباس) ﷺ هەرکاتێك وتەیەکی پێشینەکانی لە کەسانی بە (نەژادناس دانراو)ەوە پێ بگەیەنرایەو (دەربارەی مێژووی پێشینان بوایە) یەکسەر دەیگوت: (کذب النسابون) واتە (نەژادناسان درۆیان کردووە).

هەروەها (عبداللە-ی کوڕی-مسعود)(ﷺ) بۆ بەدرۆخستنەوەی نەژادناسان ئەو ئایەتەی دەکردە بەڵگە، واتە ئایەتی ﴿...وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُ...﴾.

هەر لەمبارەیەوە، جارێکیان پیاوێك هاتە لای (علی کوڕی أبوطالب) ﷺ و پێی گوت: (من بنەچەو رەچەڵەکی خەڵکی دەزانم)، بەڵام (علی) ﷺ پێی گوت: (ئەی ئەو فەرمایشتەی خودات نەبیستووە کە فەرموویەتی: ﴿وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَأَصۡحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونَۢا بَيۡنَ ذَٰلِكَ كَثِيرٗا﴾(الفرقان- ٣٨). واتە (لەدوای گەلانی عادو سەموودو هۆزی سەر بیری (ڕەس) کە بە (أصحاب الرس) ناوبراون، چەندان هۆزو گەلو نەتەوەی تر هاتوونو ژیاون).

کەچی هێشتا ئەو پیاوە لەسەر قسەی خۆی سوور بووو گوتی: (من نەژادو مێژووی بنچینەی زۆر گەلو هۆز دەناسم)..

ئینجا (علی)یش پێی گوت: (ئەی ئایا ئەم فەرمایشتەی تری خودات نەبیستووە کە فەرموویەتی: ﴿أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُ...﴾(ابراهيم-٩).

ئیتر پیاوەکەش بێدەنگ بووو وەڵامێکی پێنەما.

## ٤) لەبارەیانەوە پرسیار لە کەسیان مەکە (وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا):

قورئانی پیرۆز بە ڕاشکاوی موسڵمانانی ئاگادار کردۆتەوە کە هیچ پرسیارێك دەربارەی بەسەرهاتو سەرگوزەشتەی پێشینەکانو، شیکاری داستانەکانیانو، ناوی کەسو ناوچەو رووداوەکانیان، لە مەسیحیو جوولەکەکان نەکەن.. ئەم

ئاگادارکردنـەوەو ڕێلێگرتنـەش لـە بۆتـەی باسـکردنی چیرۆکی هاوڕێیـانی نێـو ئەشکەوتەکە(أصحاب الکهف)دا هاتووە کە ئاماژە بۆ ناکۆکیی نێـوان پێـشینەکان دەکات لەسەر ژمارەیان، وەك خودا فەرمووییە: ﴿سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا﴾ ﴿الکهف- ٢٢﴾.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕستەی داخـوازی (وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم) واتـای ئەوەیـە کـە دەربارەی (هاوڕێیانی نێو ئەشکەوتەکەو ژمارەیانو، سەرگوزەشتەو بەسـەرهاتیان) پرسیار مەکە، (پرسیار لـەکێ نـەکات)؟-مِّنْهُم أَحَدًا- بـە مانـای لەبارەیانـەوە پرسیار لـەهیچ کەسـێك نـەکات، واتـە پرسـیار لـەو جـۆرە کەسـانە نـەکات کـە لەخۆیانەوەو بێ بەڵگەی ڕاستو دروست دەچـنە نێـو بـاسو خواسـی بەسـەرهاتی پێشینەکانەوەو لقو پـۆی زۆر لـە سـەر ژیانیـان دێننـەوە بێـئەوەی زانـستێکیان هەبێت، بەڵکو تەنها بە گومان لەنادیار (رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ) دەم بادەدەن.

جا لێرەدا وشەی (منهم) دەگەڕێتەوە بۆ ئەم جۆرە کەسانە، دیارترینیـشیان کـە ئەم وشەیە دەیانگرێتەوە (أهل-ی-کتاب)ن کە (جوولەکەو نەصارا) بوون، چـونکە ئەوان خۆیان بە زانستو زانیارییەوە بادەداو وا خۆیان دەردەخست گوایە شـارەزایی تەواویان لە بەسەرهاتی پێشینانیدا هەیە.. فەرمانی داخوازیی پرسیارنەکردن لەوانە کە لە ئایەتەکەدایە (لاَ تَـسْتَفْتِ...) ئاڕاستەی گشت موسڵمانێك کراوە، وەك چـۆن یەکەم جار ئاڕاستەی پێغەمبەری خودا ﷺ کراوە، چـونکە گوتـاری پێغەمبـەر ﷺ گوتارە بـۆ هـەموو نەتەوەکـەی.. ئاڕاسـتەی هـەموو نووسـەرو دانـەرێك کـراوەو ناهێڵێت پەنا بەرێتە بەر دەسهەڵبەستی (ئیسرائیلییەکان)و لە ریوایاتو سەرچـاوە

ناڕاستەکانی تایبەت بە چیرۆکی پێشینەکانیان لێ وەرگرێت.. هەمدیسان ئەم فەرمانەی قورئان ئاڕاستەی گشت وتاربێژو پەروەردیارێك کراوەو، ڕێیان پێنادات هیچ شتێك لەو ڕیوایەتە نادروستانە تێکەڵی وتارو ئامۆژگارییەکانیان بکەن.

بەراستی زانایانی سەردەمی پێشینە چاکەکان (السلف الصالح) لە هاوەڵانی (صحابە)و شوێنکەوتوان(تابعین)یش تەواو لەم ئایەتە گەیشتبوونو دەیانزانی ڕێیان پێنادات لە مەسەلەی بەسەرهاتی پێشینانو گەلانی دێریندا پرسوڕا بە (أهل-ی کتاب) بکەن، یاخود تۆزقاڵێك لە وتەو ریوایاتیان وەرگرن.

(ابن عباس) ﷺ دەربارەی مانای فەرمایشتی خودا (**فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا**) گوتوویە: (واتە:تەنها ئەوەت بەس بێت، کە بۆم گێڕاوێتییەوە لە قورئانداو، ئیدی مونافەسەو گفتوگۆ لەسەر ژمارەو بەسەرهاتی (أصحاب الکهف) لەگەڵ کەسانی دیدا مەکە.

(قتادە)ش لەبارەی مانای ئەم رستە قورئانییەوە دەڵێت: (تەنها ئەوەندەت بەسە کە لەمەڕ ئەو لاوانە بۆمان گێڕاویەوە).

(ابن زید)یش دەربارەی مانای (**وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا**) گوتوویە: (ئەوانەی کە نابێت پرسیاریان لێبکرێت، هەر-أهل الکتاب-ن).

(مجاهد)یش لەبارەی واتای ئەم ڕستەیەوە دەڵێت: (مەبەست لە جوولەکەکانەو، نابێت پرسیار لەوان بکەیت دەربارەی چیرۆکی (أصحاب الکهف(تەنها بەوەندە قایل بیت، کە خودا لەبارەیانەوە پێی ڕاگەیاندوویت)[1] .

ئیمام (ابن کثیر)یش لەبارەی تەفسیری هەمان ئایەتەوە (**وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا**) گوتوویەتی: (کە خودا ئەم فەرمانە ئاڕاستە دەکات لەسەر ئەوەی

---

١) بۆ زانیاری زیاتر لەم وتانەی زانایان بڕوانە (تفسیر الطبري) کە لە پەراوێزەکانییەوە (تفسیر القمی)یشی تێدایە.. بەرگی (١٥) لاپەڕە (١٥٠-١٠١).

پرسیار لە کەسیان نەکرێت بۆ ئەوەیە چونکە هیچ زانستێکیان لەلا نییە تەنها ئەوە نەبێت کە لەخۆیانەوە بەبێ بەڵگەو (رَجْمًا بِالْغَيْبِ) دەیڵێن، بێئەوەش کە پشت بە وتەیەکی راستو پارێزراو ببەستن، جا ئیتر ئەی-محمد- تۆش ئەو سەرچاوە راستەقینەت بۆ هاتووە کە هیچ گومانو مشتو مڕێك هەڵناگرێتو کەس ناتوانێت گومانی لێبکات)[1] .

(سید قطب)یش لەمبارەیەوە گوتوویەتی (قورئان پێغەمبەر ﷺ رادەسپێرێت بەوەی واز لە مشتو مڕ لەسەر ئەم کێشەیە بێنێتو هیچ پرسیارێك لە مشتو مڕ کاران لە بارەیانەوە نەکات، تا ئەم شێوازەش هاو رەوتی مەنهەجی ئیسلام بێت لە پاراستنی وزەی عەقڵ داو لە شتی بێسووددا بە فیڕۆ نەدرێت، پاشان تاکو مرۆڤی موسڵمانیش بەبێ زانیاریەکی تۆکمە حوکم بەسەر هیچ شتێك دا نەدات)[2].

## ٥- بەبێ زانست حوکم مەدە..( وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ):-

ئەم رِستەیەش (وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ) ئایەتێکە لە کتێبەکەی خوداوەو مەنهەجی قورئانمان لە توێژینەوەو وەرگرتنی زانیاری دا پیشان دەداتو رێنموونیشمان دەکات بۆ پاراستنی وزەی عەقڵ لەوەی کە لەکاری بێ سوددا بەفیڕۆی نەدەین.

خودای پەروەردگار فەرموویە:- ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾(الإسراء-٣٦)..

واتە: (دوای حوکمی شتێك مەکەوە کە هیچ زانستو زانیاریەکت لە بارەیەوە نییە، چونکە بێگومان گوێو چاوو دڵ هەر یەکە مرۆڤ لێیان بەر پرسیارەو لەسەر

١) تەفسیری (ابن کثیر)- بەرگی (٣). لاپەڕە (٧٨).
٢) تەفسیری (في ظلال القرآن)ی -سید قطب-، بەرگی (٤)، لاپەڕە (٢٢٦٥).

کرداری هەر یەکە لەو ئەندامانەی جەستەی لێی دەپرسرێتەوەو دادگایی دەکرێت).

مامۆستا (سید قطب) ڕەحمەتی خوای لـێ بێـت- لـە تەفـسیری ئـەم ئایەتـەدا دەڵێت:-

(ئەم ئایەتە بەرنامەیەکی تێرو تەسەلی وەها بۆ عـەقڵو دڵ دادەنێـت کـە ئـەو مەنهەجە زانستییە تازەیەی چەرخی نوێی مرۆڤایەتیش دەگرێتەوەو (ڕاگیر بـوونی دڵ )و (هەست بە چاودێری خودا)شی دەچێتە سەرو بەرنامەکە تەواو ترو تەسـەلتر دەکات. جا بێگومان ساغکردنەوەی هەر هـەواڵو، هـەر دیـاردەو جـمو جووڵێـك (پێش حکم لەسەر دانی)، بانگەوازی قورئانی پیرۆزو بەرنامەی وردو بـێ خەوشـی ئیسلامە. هەر کاتێکیش دڵو عەقڵ لەسەر ئەو بەرنامەیە جێگیر بێت، ئـیتر هـیچ بوارێك بۆ خەیاڵو ئەفسانە لە جیهانی باوەڕ (عەقیدە)دا نامێنێت، هـەروەها هـیچ بوارێکیش بۆ گومانو دوو دڵی لە جیهـانی حـوکم دانو دادوەریو سـەودا کردنـدا نامێنێت، هەمدیسان لە جیهانی توێژینەوەو تەجرەبەو زانستەکانیشدا بوارێـك بـۆ حوکمە ڕووکەشەکانو فەرمانە خەیاڵییەکان نامێنێـت... (وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ).. واتــە: دوای هــیچ وتەیــەکی گــوتراوو هــیچ ڕیوایــەتێکی نــامۆی گێڕراوەو، هیچ دیاردەیەکی تەفسیر کـراو یـان ڕووداوێکـی بەکـەم دانـراوو، هـیچ حوکمێکی شەرعی، یان مەسـەلەیەکی عەقیـدی مەکـەوە هـەتا زانـستی تـەواوو (یەقین)ت لەسەری نەبێتو، باری ڕاستییەکەیت بۆ ساغ دەبێتەوە)[1].

بە پێی فەرمانی ئایەتەکەو ڕێگرتنی ڕۆشنی لە حوکم دانی بێ بناغەو، بە پێی ڕێنماییی ڕوونی بەرنامەی قورئانیش سەبارەت بە لێکۆڵینەوەو زانـستو زانیـاری، ئـەوا نابێـت ئێمـە هـیچ شـتێك لـە بـارەی چـیرۆکی پێـشینەکانەوە لـە ئـەهلی کیتاب(جوولەکـەو نەصـارا) وەربگـرین، نەخاسـمە گـەر هـیچ فەرمایـشتێکی لـە

---

١) في ظلال القرآن، (٤: ٢٢٢٧)

قورئانو سوننەتەوە لەسەر نەبوو.

هەر لەو ئایەتەشەوە بەڵگەیەك لەسەر داستانی دەسهەڵبەستی (ئیسرائیلیات)و نەگونجانی بۆ ساغ کردنەوەی چیرۆکی پێشینەکان بەدی دەکەین، چونکە ئەم داستانە هەڵبەستراوانەی کە بە (ئیسرائیلیات) ناوبراون هیچ زانستێکیان تیادانییەو تەنها بە ئەفسانەو شتی پووچەڵو گریمانکاریی دادەنرێن. ئیتر پێویست نییە هیچ توێژەرەوەو لێکۆڵیارێك جەخت لەسەر ڕاستییەکی بکاتەوە، یان بەدوای بنجو بناوانو لایەنی راستبێژیی ریوایەتەکانیدا بگەڕێت.. جا مادام ئاوابن، ئەوا بەهیچ شێوەیەك ئێمە نابێت دانیان پیّدا بنێین، یان بەدوایدا بچین یان لێیان بکۆڵینەوە، یاخود بیانگێڕینەوە، چونکە لەو چیرۆکانەن کە هیچ زانستو زانیاریەکمان لەبارەیانەوە نییە.

## ٦) سەلماندنی مەسەلەی گرنگ (إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ ):

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ﴾(الحجرات- ٦)...

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر کەسێکی نەناسراو کە (لەدەستو زمانو دادپەروەرییەکەی دڵنیا نین) هەواڵی مەسەلەیەکی گرنگو جێی بایەخی خەڵکیی بۆ هێنان، ئەوا لەباری راستیو ناڕاستییەکەی بکۆڵنەوە تاکو راست لە درۆ جیابکەنەوە، نەبادا بەهۆی نەزانینو بێئاگاییتانەوە کەسانێکی دی تووشی زیانو نارەحەتی بکەنو، پاشان لە سەرەنجامی کردارە ناڕاستەکەتان پەشیمانو نیگەران بن..)

ئەم ئایەتە بەرنامەیەکی زانستیی قورئانمان لە ساغکردنەوەی هەواڵەکانو سەلماندنیاندا پێشکەش دەکات، ئەگەر ئەو هەواڵانە لە کەسانی خراپو

به‌دڕه‌فتاره‌وه‌ سه‌رچاوه‌یان گرتبێت، چونكه‌ ئه‌م جۆره‌ كه‌سانه‌ جێی متمانه‌ نین‌و هه‌ر هه‌واڵ‌و قسه‌وباسێك كه‌ بڵاویده‌كه‌نه‌وه‌ درۆو ده‌له‌سه‌و ساخته‌كاری‌و شێواندنی زۆری تێدایه‌، بۆیه‌ هه‌ر ده‌بێت كه‌ گومان له‌ ڕیوایه‌ت‌و قسه‌و هه‌واڵه‌كانیان بكرێت‌و هه‌ر ده‌شبێت ئه‌و هه‌واڵ‌و ده‌نگ‌و باسانه‌یان به‌ ته‌رازووی ره‌خنه‌و هه‌ڵسه‌نگاندن‌و ساغكردنه‌وه‌ بكێشرێت. ئێمه‌ گه‌لێك جار هه‌واڵ‌و ده‌نگ‌و باسی سه‌رزاری كه‌سانی خراپ‌و به‌دڕه‌فتاری نێو ڕیزی موسڵمانانیش ده‌ده‌ینه‌ به‌ر نه‌شته‌ری لێكۆڵینه‌وه‌و هه‌ڵسه‌نگاندن، ئیدی چۆن ده‌بێت له‌و هه‌موو هه‌واڵ‌و قسه‌وباسه‌ نامۆیانه‌ی بێباوه‌ڕان نه‌كۆڵینه‌وه‌ كه‌ رۆژانه‌ بۆمان دێت؟!

گومانی تێدا نییه‌ كه‌ جووله‌كه‌كان هونه‌رو شاره‌زاییه‌كی زۆریان له‌ درۆوده‌له‌سه‌و ساخته‌كاریدا هه‌یه‌و، نه‌ له‌ بواری مێژووو، نه‌ له‌ سه‌رگوزه‌شته‌و، گێڕانه‌وه‌ی به‌سه‌رهاته‌كاندا متمانه‌یان پێناكرێت، هه‌ر شتێكیش له‌وانه‌وه‌ ده‌رچووبێت مۆركی هۆنینه‌وه‌و پڕوپاگه‌نده‌و ساخته‌كاری‌و ئه‌فسانه‌چێتیی هه‌ڵگرتووه‌، ئیتر چۆن ئه‌و سه‌رچاوه‌ ئیسرائیلیانه‌و هه‌واڵ‌و سه‌رگوزه‌شته‌كانیان وه‌ر ده‌گرین؟ چۆن سه‌ره‌ڕای خه‌وش‌و نه‌نگییه‌كانیان به‌بێ تێفكرین‌و لێوردبوونه‌وه‌یان په‌سه‌ندیان بكه‌ین‌و پاشان وایان بگێڕینه‌وه‌ گوایه‌ چه‌ند راستییه‌كی جێگیرن‌و، ئه‌و فه‌رمایشته‌ جێگیره‌ی خودایشیان پێ لێك بده‌ینه‌وه‌ كه‌ ﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ﴾(فصلت- ٤٢). واته‌: (فه‌رمایشتی خوداو كتێبی خودا له‌سه‌ر هه‌ر بارو رووكارێك هیچ ده‌سكاری‌و خواركردنه‌وه‌یه‌ك هه‌ڵناگرێت‌و هیچ ئاڵ‌و گۆڕو زیادكردن‌و لێكه‌م كردنێكی به‌سه‌ردا ناهێنرێت)..

پێویسته‌ زۆر زۆر وریاو ئاگادارو ورده‌كار بین له‌كاتی بیستنی ریوایات‌و قسه‌وباسی بێباوه‌ڕانداو هیچیان لێ وه‌رنه‌گرین ته‌نها ئه‌وه‌ نه‌بێت كه‌ باری راستییه‌كه‌ی له‌لامان زانراو بێت‌و ئه‌و راستییه‌ش له‌ قورئان‌و سوننه‌تدا هاتبێت.

بەڕاستی هەدوو ئایەتەکەی پێشوو (وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ) لەگەڵ (إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ) مەنهەجێكی بێوێنەی قورئانییمان لە توێژینەوەی زانستیو مەعریفیدا بۆ دیاری دەكەنو، ڕێنماییەكی گرنگیشمان لە سەوداو مامەڵە لەگەڵ (چیرۆكەكانی پێشینان)دا پێشكەش دەكەن.. ئایەتەكەی سورەتی-اسراء- (وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ) ڕێگە لە گێڕانەوەی هەواڵو بەسەرهاتەكان دەگرێت تەنها (دوای سەلماندنی زانستیانە نەبێت)، هەروەها ڕێگە لە هێنانو وەرگرتنی هەر شتێكیش دەگرێت تەنها دوای (متمانە پێكردنو پەیدابوونی زانیاری) نەبێت. ئایەتەكەی سورەتی-حجرات-یش (إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ) پالاوتنو روون كردنەوەی قسەی كەسانی تر پێویست دەكات.

## ٧) وەك ئەوانەیان لێهاتووە كە نازانن.. (كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ):

جوولەكەكان گەلێكی بێزانیارین، زانیارییە رواڵەتیەكەشیان تەنها چەند درۆیەكی هەڵبەستراوو گومانو بۆچوونو ئیددعایەكە، وەك خوداش لەبارەیانەوە فەرموویە: ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ (البقرة- ٧٨).. واتە: (لەنێو جوولەكەكاندا چەندین كەسی نەخوێندەوارو بێئاگا لە كتێبی خۆیان (تەورات) هەیە كە هیچ لەو كتێبە نازانن تەنها چەند درۆو دەلەسەیەكی هەڵبەستراو نەبێت كە لە سەركردەو پێشەوا ئایینییەكانیانەوە وەریانگرتووەو تەنها ئەو گومانو بۆچوونە ناڕاستانەشیان بۆ نكوولی كردن لە پێغەمبەرایەتیی (محمد ﷺ) گرتۆتە بەر)..

هەروەها جوولەكەكان ئەوەندە درۆزنو بوختان چین كە درۆ لەسەر خوداش دەكەنو قسەی ناڕاستی بۆ هەڵدەبەستن، ئیدی چۆن لە خەڵكی سڵ دەكەنەوەو

درۆیان بۆ هەڵنابەستن‌و بوختانیان بۆ ناکەن؟ ئەی ئایا واز لـە پێشینەکان دێنن‌و درۆیان لەسەر هەڵنابەستن؟ ئایا خۆیان دەپارێزن لـە درۆکـردن لـە سـەر زانست‌و مێژوو؟ هەر بۆیەش لـە چەندان جێگـەدا قورئـان درۆ و بوختانـەکانیانی دیـاری کردووە، وەك خودای زاناو پـەروەردگار لەبارەیانەوە فەرمووییـە: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ ۗ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾(آل عمران: ١٨١-١٨٣)، واتە: (بێگومان خودا وتەی ئەو جوولەکانەی بیست، کـە وتیـان خـودا هـەژارەو ئێمـە خۆمان دەوڵەمەندین، ئێمە هەموو ئەو قسەو گفتارو رەفتارانەیان تۆمـار دەکـەین لەگەڵ تۆمارکردنی ئەو تاوانە گەورەیەشیاندا، کە پێغەمبەرانی خودایان بـە زوڵـم‌و زۆرداری کوشتووەو لـە رۆژی دواییـدا سـزای سـەختی دۆزەخیـان دەدەیـن‌و پێیـان دەڵێین: دە بچێژن ئەو ئەشکەنجە پڕ لە ئازارو واوەیلایەی نێو ئاگری کڵپەسـەندووی دۆزەخ. ئەم ئەشکەنجە هەمیشەیی‌و نەبڕاوەیەش بەهۆی کـردەوە دڕندانـەکانی نێـو دنیاتانەوەیە، کە پێغەمبەرانتان بە درۆ دەخستەوەو نکووڵێتـان لـە هـەق دەکـردو درۆتان هەڵدەبەست، ئەو خودایەی کە سـتەم لـە بەنـدەکانی ناکـات‌و بـە خـۆڕایی سزایان نادات. -پاشان جوولەکەکان لە وتەیەکی بێ‌شەرمانەی تریاندا- گوتوویانـە: خودا رایسپاردووین، کە باوەڕ بە وتەو بانگەوازی هیچ پێغەمبەرێك نەکەین، هـەتا ئەو کاتەی قوربانییەك دێنێت‌و خۆی پێ لـەخودا نزیـك دەکاتـەوەو-ئەمـەش وەك بەڵگەیەك لەسەر ڕاستگۆیی خۆی-. تۆش ئەی پێغەمبەر، پێیان بڵێ: ئەدی باشـە، خۆ پێش من چەندین پێغەمبەری ترتان بۆ نێـرراو، هەمووشـیان بەڵگـەی ڕاسـت‌و

بنەبڕیان لەسەر راستگۆیی خۆیانیان بۆ دەخستنە ڕوو، -وەك ئەو قوربانییەی کە ئاگر دەیخوارد- ئەی بۆچی دەتان کوشتنو سوور بوون لەسەر لووتبەرزیو گومڕایی خۆتان، ئەگەر ئێوە لەم ئیدعایانەتاندا ڕاست دەکەن؟).

هەروەها جوولەکەکان درۆ لەسەر پێغەمبەرانو خۆشەویستانو عەبدە صالحەکانی خوداش (بە پیاوو ئافرەتیانەوە) دەکەنو درۆو دەلەسەو قسەی پڕوپووچیان بە دەمەوە دەکەنو تەنانەت کەمو کووڕیو ئاکاری خراپیشیان دەخەنە پاڵ.. داخۆ دەربارەی (مەریەم)ی کچی بێمێردو دایکی عیسا -سلاویان لێبێت- چ بوختانێکیان هەڵبەست؟!

قورئان لەبارەی ئەم بوختانەیانەوە فەرموویە: ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ ..﴾ (النساء: ١٥٦-١٥٧). واتە: (خودا بەوەش سزای نەفامیو گومڕاییان دەدا کە باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتیی (عیسا) نەهێناو بەوەش کە بوختانێکی گەورەو درۆیەکی گەندەڵیان بۆ(مەریەم)ی دایکی دروست کردو پاشان دەشیانگوت ئێمە پێغەمبەری خودا(عیسای کوڕی مەریەم)مان کوشت.

هەروەها ئەوان ئێرەیی(حەسوودی) بە باوەڕدارانیش دەبەنو ئەوپەڕی حەزو هیواو ئاواتو پەلەقاژەو سووربوونیان لەسەر ئەوەیە کە موسڵمانان لە ئاینەکەی خۆیان هەڵگێڕنەوە.

جا ئەگەر ئەمە نەریتو هیواو ئاواتیان بێت، چۆن ئێمە وتەو ریوایاتو بەسەرهاتەکانیان لێ پەسندکەین کە بەم ئارەزووو ئامانجانەیان ئاوێتە کردوونو کە بەهۆی ئەو ریوایاتو بەسەرهاتە ناڕاستانەشیانەوە خوازیاری بەدیهێنانی ئەو حەزو ئارەزووە ژەهراویانەن؟!

لەم ڕووەشەوە خودا فەرموویە: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ

يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ....﴾(البقرة- ١٠٩). واتــە: زۆربــەی ئــەهلی کیتــاب -لەوانــەی کــە جوولەکەکانن-، هیواو ئامانجیــان ئەوەیــە دوای باوەڕهێنانتــانو موســڵمانبوونتان هەڵتانگێڕنــەوەو بتانکــەن بــە کــافران، ئەمــەش لــە حەســودیی دەروونــە شــەڕخوازەکانیانەوەو دوای ئــەوەش کــە هــەقو ئــایینی ڕاســتی ئیــسلامیان بــۆ دەرکەوتووە.

هــەروەها ئــەوان هــەق دەشــارنەوەو، لــە جێگەیــدا ناهــەقو درۆو دەلەســە بڵاودەکەنەوە، تاکو کەسانی تری پێ تــەفرە بــدەن، وەك خــوداش فەرموویــە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۙ أُولَـٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(البقرة- ١٠٩).

هەروەها ئەوان کاتێك هەق دەشارنەوە دەشزانن کە ئەوە ناڕاســتەو لــە هــەموو خوارو خێچییەکی کردارەکانیان ئاگــادارن، وەك خــودا دەفــەرمووێت: ﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا۟ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾(البقرة- ٧٥). واتە: ئەرێ ئەی موسڵمانان، ئێوە حــەز دەکەن ئەوان ئیمان بێنن، لە کاتێکدا کۆمەڵێك لە زاناو شــارەزایانیان گوێبیــستی فەرمایشتی خودان لە-تەورات-داو پاشــان ئــەو دەقانــەی-تــەورات- دەشــێوێننو دوای ئەوەی لە ڕاستییەکەی تێگەیشتوون دەسکاری دەکەنو دەشزانن کــە کــارێکی ناڕەواو ناهەموار دەکەن؟!

بێگومــان ئــەوان زانیارییــەکی بنــچینەییان لــەبارەی ئــەو بــەدرەفتاریو تاوانــە چــەپەڵانەیانەوە نییــە، چــونکە زانیــاریی راســت دەبێــت ســوود بــە خاوەنەکــەی

بگەیەنێتو بەختیاریی پێ ببەخشێتو چاكو راستی بکاتـەوەو بیخاتـە نێـو ریـزی هەقو خاوەنانی هەقەوە..

جا ئەگەر زانیارییەك خاوەنەکەی بـەم ئاقـارە نەگەیـەنێت وەك ئـەوە وایـە کـە نەبێت.. لە راستیشدا هەڵسو کەوتی جوولەکەکان وەك هـەڵس وکـەوتی ئەوانەیـە کە نازانن و کە هیچ زانـستو زانیارییـەکیان لـەخوداوە بـۆ نەچـووبێت، هـەروەها رەوشتو وتەکانیشیان وەك رەوشتو وتەی ئەو کەسانەیە کە نـازانن، هـەر بۆیـەش قورئان بڕیاری ئـەوەیان لەسـەر دەدات کـە ئەگـەر بیانزانیایـە ئـەوا ئـەو هـەموو بەدکاریو لادانو خراپەکاریەیان ئەنجام نەدەدا، کەوابوو بەهۆی ئەو ڕەفتارو گفتـارە ناشیرینانەیانەوە وەك ئەوانەیان لێ بەسەر هاتووە کە هیچ نازانن..

خودا لەبارەیانەوە فەرموویە: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ نَبَذَ فَرِيقٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ كَأَنَّهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٠١﴾ وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَمَثُوبَةٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ خَيۡرٞۖ لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾(البقرة: ١٠١-١٠٣).

واتە: دوای ئەوەی ئەم پێغەمبەرە خودا ناردوویەتە ناویان، بڕوای بـەو کتێبـەش هەیە کە لایانە" دیسان هێنـدێك لەوانـەی ئـەهلی کتـێبن، لـە کتـێبی خـودا خـۆ

دەبوێرنو ڕووی تێ ناکەن. هەر دەڵێی نەشیان زانیوە.. کەوتوونەتە شوێن ئەو شتانەی شەیتانەکان لە زەمانی پاشایەتی سولەیمان دا بە ورتە دەیان خوێندەوە. سولەیمان خوانەناس نەبوو" شەیتانەکان خوانەناس بوون" خەڵکیان فێرە جادوو دەکرد. ئەو زانستەش کە هاتبووە سەر هارووتو مارووتی جووتە فریشتە لە بابلدا، هەر کەسێکیان فێری جادوو بکردایە، پێشەکی تێیان دەگەیاند: ئێمە هەر بۆ جەڕباندنین، نەکەی خودات لەبیر بچێ" هەر هێندەشیان لێ فێردەبوون ژنو مێرد لێك جیابکەنەوە" کە توانای ئەوەیان نەبوو -بێ ئیزنی خودا- زیان لە هیچ کەسێ بدەن. هەر شتێکی وا فێر دەبوون کە زیان لە خەڵك بداو بۆ خۆیان سوودێکی نەبێ" دەشیانزانی کڕیارانی جادووگەری لەو دونیادا هیچ بەشیان نیە. ئای ئەگەر تێگەیشتبان دەیانزانی چۆن خۆیان خراپ دەفرۆشن.. ئەمانە ئەگەر بڕوایان بە خودا هەبوایەو پارێزکار بان، دەیانزانی کە پاداشی چاکتر لەلای خودایە.

لەم ئایەتانەی پێشووەوە تیشکی سەرنج دەخەینە سەر ئەم رستانەی کە دەربارەی زانینو زانیاری جوولەکەکان هاتوون:

١- زانیارییەکەیان وای لێکردوون کتێبی خودا پشت گوێ بخەن: نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾.

٢- زانیارییەکەیان وای لێکردوون لەگەڵ ئەو شەیتانانەدا بن کە خەڵکی فێری سیحربازی دەکەن: ﴿يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ﴾.

٣- زانیارییەکەیان وای لێکردون فێری شتە زیانبەخشەکان بن: ﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ﴾.

٤- هەموو ئەو رەفتارانەیان نواندو بەهۆی زانیارییەکەشیانەوە دەیانزانی هیچ پاداشتێکی چاکی لێ بەدەست ناهێنن: ﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ﴾.

جا لە ئەنجامی ئەو هەموو تاوانەیانەوە قورئان بڕیاری ئەوەیان لەسەر دەدات گەر بێتو ئەوان بیانزانیایەو بیانویستایە بزانن هەموو ئەو تاوانانەیان ئەنجام نەدەدا، کەوابوو ئەوان نازانن: ﴿وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾... ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾..

زانستی ڕاستو سوودمەند ئەو زانستەیە کە مرۆڤ بەرەو باوەڕهێنان دەباتو تەقواو لەخواترسانی بۆ بەرهەم دێنێت، جا ئەگەر زانستەکە ئەم بەروبوومە نەدات ئەوا وەك ئەوە وایە نەبێت.

جا لەبەر ئەوەی زانیاریی جوولەکەکانیش بەم ئاکامە چاكو سوودمەندەی نەگەیاندبوون وەك ئەوە وابووە کە هەر نەبووبێت، تەنانەت زانیاریی ئەوان بەرەو ئاکامێکی پێچەوانەی بردبوون، بەرەو خراپەو بەدکاریو لادانو ناهەقو درۆو دەلەسەی بردبوون..

جوولەکەکان ئەو گەلەن کە هیچ زانیارییەکیان نییە تەنها زانیاریی درۆو دەلەسەو گومانکاریو ئەفسانەچێتی نەبێت، پاشان ئەوان لەگەڵ ئەوانە دادەنرێن کە نازانن، واش ڕەفتار دەکەن کە نازانن، گەر بیانزانیایە نەدەبوو وا بکەن..

ئەمە بڕیاری قورئانە لەسەر زانینو زانیارییان.. ئیتر چۆن متمانە بەخۆیانو سەرچاوە مێژووییو ئایینییەکانیان بکەین؟ چۆن پڕوپاگەندەی ئەوەیان بۆ بکەین گوایە ئەوان دەزانن؟ ئەی چۆن بەو سەرچاوە پووچەڵو درۆو دەلەسانەیان فەرمایشتی پاكو بێگەردی خودا تەفسیر بکەین لەو قورئانەیدا کە هیچ شیکارو لێکدانەوەیەکی نامۆو ناڕاستی ئەملاولا قبوڵ ناکات؟؟

# حوکمی گێڕانەوەی (ئیسرائیلیات)

زانایانی ئیسلام بیروڕای جیاجیایان لەسەر حوکمی گێڕانەوەی داستانە ئیسرائیلییەکان هەیە:-

بۆ نمونە هەندێکیان بە ڕەهایی (مطلق) گێڕانەوەیانیان قەدەغە کردوەو لەوەشدا پشتیان بە چەندین ئایەتی رۆشنو چەندین فەرموودەی راست(صحیح) بەستووەو، پەیڕەوی مەنهەجی ئیسلامیان لە توێژینەوەی زانستیو دەستخستنی زانیاریدا کردووەو، تێبینیی هەر فەرموودەو وتە (أحادیث وأقوال)ێکیشیان کردووە کە هاتبێتە بەرچاویانو دەلالەتی شیاوی گێڕانەوەی هەندێك ریوایەتیان تێدا بینیبێت.

کەچی هەندێك زانای تر بەڕەهایی ڕێگەیان بە گێڕانەوەی ئەو ریوایەتانە داوەو بە راستو چەپدا دەرگایان بۆ خستوونە سەرپشتو چەندەها لاپەڕەی کتێبەکانی تەفسیرو مێژووو داستانەکانیان پێ رەش کردوونەوەو، قورئانی پیرۆزی خوداشیان پێ تەفسیر کردووە.

بەڵام هەندێکی تر لە زانایانی ئیسلام چەند مەرجێکیان بۆ گێڕانەوەی ئەو داستانانە داناوەو تەنها چەند جۆرێکی تایبەتیشیان لێ دەستنیشان کردوونو بە چەند بوارێکی دیاریکراویشەوە پەیوەستیان کردوون.

دیارە لێرەدا ماوەی هێنانەوەی بەڵگەکانی ئەو بیروڕایانەو ماوەی موناقەشەو لێدوانیانمان نییەو، بە یارمەتی خودا هەوڵ دەدەین لە کتێبێکی ترمانو لە باسێکی تردا بە ناوی (مبهمات القرآن بین التبیین والإبهام)دا باسیان لێوە بکەین.

ئێمە سەرنجی ورد لە کارو لێکۆڵینەوەی زانایان دەدەین کە هەڵوێستیان لە ئاست داستانە ئیسرائیلییەکاندا چی بووەو چ دیدو تێڕوانینێکی خۆیان لەسەریان هەبووەو، لە ئاکامی ئەو سەرنجو بەدواداچوونانەشدا تەنها ئەو هەڵوێستو بیروڕایە بەڕاست دادەنێت کە دەربارەی قەدەغەکردنی هێنانی هیچ شتێکی ئەو

داستانو ئەفسانە ئیسرائیلیانەیەو نابێت بۆ (وتە هێنانەوەو بەڵگە پێدانـان)یـش بگێڕرێنەوە، یان تەنانەت بۆ گەواهی پێدانو مۆڵەت خواستنیش بێت، خۆ ئەگـەر بمانەوێت لە بوارێکی پێویـستدا شـتێکیان لـێ وەرگـرین، ئـەوە تـەنها لـە بـواری (ئاگادارکردنو ورياکردنـەوەو تێگەیانـدنو ڕێنمـایی)دا واتـە تـەنها لـەو بـوارەدا دەگێڕرێنــەوە کــە بــە ڕۆشــنی کــەمو کوڕییــەکانیانو بنــچینەی پووچــەڵیو ئەفسانەکانیان ڕوون بکرێتەوەو خەڵکیان لێ وریاو ئاگادار بکرێتەوە.

ئێمە بۆ ئەم ڕایەمان چـەند بەڵگەیـەك دێنینـەوە، بـەڵام دوای ئـەوەی سـەرەتا جۆرەکانی داستانو ریواياتی (ئیـسرائیلیات) بـەو شـێوەیەی کـە زانایـان باسـیان کردوە، دیاری دەکەین..

## جۆرەکـانی (ئیسـرائیلـیات)

بۆ ئەم بڕگەیـە باسـێکی بـەپێزی مامۆسـتای شـەهید، دکتـۆر (محمـد حسێن الذهبی)م لەبەردەم دابوو بـە ناونیـشانی (الإسـرائيليات في التفـسير والحـديث) کـە تیایدا مامۆستا(خودا بەشەهیدی دابنێت) دەربـارەی جۆرەکـانی (ئیـسرائیلیات)و حوکمو گێڕانەوەیان دەدوێتو، بەڵگەکانی (زانایانی ڕێدەرو، زانایانی ڕێگر)ی ئـەو ریواياتانەی دیاری کـردووە، منـیش لـەو باسـە بـەپێزەی مامۆسـتای نـاوبراوەوە پوختەی جۆرەکانی وەردەگرم.

"ئەفسانە ئیسرائیلییەکان سێ جۆریان هەیە، وەك:

١- جۆرێکیان بە پێودانگی راستیو ناڕاستیی.

٢- جۆرێکیان بە پێودانگی گونجانی لەگەڵ ئاینەکەمان یان نەگونجانی.

٣- جۆرێکیان بە پێودانگی بابەتەکەی.

**١- لە ڕووی ڕاستیو ناڕاستێتییانەوە بۆ دوو بەش دابەش دەکرێن:**

(أ) راست (صحيح): وەك ئەو دەقانەی لەسەر بەراستگۆدانانی قورئـان هـاتوون

كه‌ ده‌رباره‌ی سیفه‌ته‌كانی پێغه‌مبه‌ری خودا محمدن ﷺ.

له‌مباره‌یه‌وه‌ خودای مه‌زن فه‌رموویه‌: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ۝٤٥ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا﴾(الأحزاب: ٤٥-٤٦).

واته‌: (ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر(ئه‌ی محمد) ئێمه‌ تۆمان وه‌ك شاهید له‌سه‌ر ئه‌وانه‌ی بۆیان ره‌وانه‌كراویت‌و، وه‌ك مژده‌پێده‌ریان‌و ترسێنه‌ریشیان، ناردووه‌و، وه‌ك بانگه‌وازكارێكیش بۆ رێبازی خودا، كه‌ هه‌ر به‌یارمه‌تی‌و ئاسانكاریی خوداش بانگه‌وازیان بكه‌یت‌و، وه‌ك چرایه‌كی به‌تین‌و رۆشنیش، كه‌ تاریكییه‌كان ده‌ڕه‌وێنێته‌وه‌و ڕووناكی داده‌هێنێت‌و رێنماییی خه‌ڵكی ده‌كات).

ئه‌م سیفه‌تانه‌ له‌ ته‌وراتیشدا هاتوون‌و ئه‌وانه‌ی ته‌وراتیان دیوه‌و خوێندۆته‌وه‌ به‌ راشكاوی باسیان كردووه‌، له‌م باره‌یه‌وه‌ (بخاری) له‌ (عطاء كوڕی یسار)ه‌وه‌ ئه‌م وته‌ به‌نرخه‌ی گێڕاوه‌ته‌وه‌: ((**لَقِيتُ عَبْدَاللهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ فَقُلْتُ أَخْبِرْنِي عَنْ صِفَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي التَّوْرَاةِ. فَقَالَ: أَجَلْ وَاللَّهِ إِنَّهُ لَمَوْصُوفٌ فِي التَّوْرَاةِ كَصِفَتِهِ فِي الْقُرْآنِ" ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ وَحِرْزًا لِلْأُمِّيِّينَ، وَأَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي، إسمك الْمُتَوَكِّلَ، لَيسَ بِفَظٍّ، وَلَا غَلِيظٍ، وَلَنْ يَقْبِضَهُ الله حَتَّى يُقِيمَ بِهِ الْمِلَّةَ الْعَوْجَاءَ، بِأَنْ يَقُولَ: لا إِلَهَ إلاَّ الله. وَيَفْتَحَ اللَّهُ بِهَا قُلُوبًا غُلْفًا، وَآذَانًا صُمًّا، وَأَعْيُنًا عُمْيًا.. قَالَ عَطَاءٌ: لَقِيتُ كَعْبًا -كعب الأحبار- فَسَأَلْتُهُ عن ذلك فَمَا اخْتَلَفَ حَرْفًا**))[1]. واته‌: (به‌دیداری (عبدالله كوڕی عه‌مر) گه‌یشتم‌و پێم گوت: باسی سیفه‌تی پێغه‌مبه‌ری خودام ﷺ له‌ ته‌وراتدا بۆ بكه‌.. ئه‌ویش گوتی: "به‌ڵێ" ده‌سا به‌خوا چۆن له‌ قورئاندا وه‌سف كراوه‌، ئاواش له‌ ته‌وراتدا وه‌سف كراوه‌، وه‌سفه‌كه‌ش به‌م شێوه‌یه‌ بووه‌: (ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر، ئێمه‌ تۆمان به‌ شاهیدو مژده‌به‌خش‌و ترسێنه‌ری ئه‌وانه‌ی بۆ لایان ڕه‌وانه‌ ده‌كرێیت، ناردووه‌، هه‌روه‌ها وه‌ك په‌ناگه‌یه‌كی ڕووناك‌و

---

١) رواه البخاري في كتاب التفسير، رقم ٦٥، باب (إنا أرسلناك شاهداً ومبشراً ونذيراً) رقم ٣، حديث رقم ٤٨٣٨.

پتەو بۆ بێدەسەلاٌتو ڕێ لێتێکچوان... تۆ بەندەی منو پێغەمبەری منیشت، ناوت (متوکل)ەو، توڕەو دلٌڕەق نییت، خودا ئەو ڕووناکییە لانابات هەتا ئەو شەریعەتە خوارکراوەی پێ ڕاستو ڕاگیر دەکات تەنها ئالاٌی-لا الـه الا الله- دەچەسپێتو چەندان دلٌی داخراوو چەندان گوێی کەڕو چەندان چاوی نابینای پێ دەکرێتەوە).

(عطاء) گوتی: دوای ئەمە بە دیداری (کەعب)ی زانای جوولەکەکان گەیشتمو پرسیارم دەربارەی ئەو سیفەتە لێکچوانەی نێو قورئانو تەورات لێکردو ئەویش لاریی لەسەر تاکە پیتێکیان نەبوو.

(ب) هەلٌبەستراو (موضوع): وەك ئەفسانەی چیای (ق) کە بە ئیدعای درۆزنەکان وا هاتووە گوایە ئەم چیایە چواردەورەی ئاسمانەکانو زەوی گرتووە.

**٢- لە ڕووی گونجانی یان نەگونجانی لەگەلٌ دینەکەی ئێمە. بەم پێودانگەش دەکرێن بەسێ بەشەوە:**

(أ) ئەو دەقانەی لەگەلٌ دەقەکانی ئایینی ئێمەدا وەك یەكو گونجاون:

نموونەش لەمبارەیەوە ئەو فەرموودەیەیە کە (بخاری) لە (ابو سەعیدی خدری)یەوە ﷺ گێڕاویێتییەوەو کە پێغەمبەر ﷺ تیایدا فەرموویە:

**((تَكُونُ الأَرْضُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُبْزَةً وَاحِدَةً، يَتَكَفَّؤُهَا الْجَبَّارُ بِيَدِهِ، كَمَا يَكْفَأُ أَحَدُكُمْ خُبْزَتَهُ فِي السَّفَرِ، نُزُلاً لِأَهْلِ الْجَنَّةِ.. فَأَتَى رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ: بَارَكَ الا للهُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، ألا أُخْبِرُكَ بِنُزُلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: تَكُونُ الأَرْضُ خُبْزَةً وَاحِدَةً-كَمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ-، فَنَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَيْنَا ثُمَّ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ))**[1]. واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا زەوی وەك گونکە هەویرێکی لێدێت کە خودای بەدەستەلاٌت لە چنگیدا هەلٌی دەگرێت وەك چۆن یەکێك لە ئێوە گونگە هەویرەکەی لەسەفەردا دەخاتە چنگییەوە، ئەوەش خودا بۆ خەلٌکی بەهەشتی داناوە..

١) رواه البخاري في كتاب الرقاق رقم ٨١، باب: يقبض الله الأرض، رقم ٤٤، حديث رقم ٦٥٢٠.

لەوکاتەدا پیاوێك لە جوولەکەکان هاتو گوتی: ئەی (ئەبالقاسم)، بەرەکەتی خودات لەسەر، ئایا هەواڵی ئەوەت پێ بدەم کە چ نشینگەیەك بۆ خەڵکی بەهەشت لە رۆژی قیامەتدا ئامادەکراوە؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتی: زەوی لەو رۆژەدا وەك گونگە هەویرێکی لێدێت ــ وەك پێغەمبەری خواش ﷺ وای فەرمووبوو. کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەو وتەیەی لە کابرای جوولەکە بیست، تەماشایەکی ئێمەی کردو پێکەنیو زەردەخەنەیەکی درێژ گرتی هەتا خرێکانی نێو دەمی دەرکەوتن.

(ب) ئەو دەقانەی پێچەوانەی دەقەکانی شەریعەتی ئێمەن:

نمونەی ئەمەش دەقی ئەو بەسەرهاتەیە کە جوولەکەکان لە بەشێکی تەورات بەناوی (سفر الخروج)دا داویانەتە پاڵ (هارون)ی پێغەمبەر-سڵاوی خوای لێبێت-و کە گوایە (هارون) خۆی گوێرەکەکەی بۆ (بنو اسرائیل) دروست کردووەو داوای لێکردوون ئەو گوێرەکەیە بپەرستن.

هەروەها وەك ئەو دەقە پووچەڵەشیان کە لە (سفر التکوین/کتێبی پێکهاتن)دا خستوویانەتە پاڵ (خودا) کە گوایە لە ماوەی شەش رۆژدا ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووە، ئیدی ماندوو بووەو لە رۆژی حەوتەمدا پشووی داوە کە (رۆژی شەممە) بووە.

(ج) بەشی سێیەم: ئەو دەقانەیە کە ئاینی ئێمە لە ئاستیاندا بێدەنگ بووەو هیچ نموونەیەکی لەسەر پشتگیریکردنیان یان بەدرۆخستنەوەیان تێدا نییە، وەك چەند بەسەرهاتێکی گێڕراوەی (بەنی ئیسرائیل) دەربارەی شیکاری چیرۆکی مانگاکەی (بەنی اسرائیل) لەو کاتەوەی پیاوەکە مامی خۆی دەکوژێتو، پاشان کەسانی تر داوای خوێنەکەی لێدەکەنو، سەربڕینی مانگاکەو زیندووکردنەوەی کوژراوەکە پێیو، پێناساندنی بکوژەکەی.

**٣- پێودانگی سێیەم/ لە رووی جۆرو چەشنی بابەتەکەیەوە، ئەم پێودانگەش بۆ سێ بەش دابەش دەبێت:**

(أ) بەشی یەکەم پەیوەستە بە مەسەلەکانی بیروباوەڕەوە:-

نموونەی ئەمەش ئەو فەرموودەیەیە کە (بخاری) لە (عبداللە کوڕی مسعود)ەوە ﷺ گێڕاویێتییەوە کە: زانایەك لە زانایانی جوولەکە هات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺو پێی گوت: (ئەی محمد، ئێمە دەبینین خودا ئاسمانەکان دەخاتە سەر پەنجەیەك‌و، خاك‌و زەوییەکانیش دەخاتە سەر پەنجەیەك‌و دارو درەخت‌و ڕووەکەکانیش لەسەر پەنجەیەك‌و ئاوو خۆڵیش لەسەر پەنجەیەك‌و، سەرجەم دروستکراوانی تریش لەسەر پەنجەیەك‌و ئینجا دەفەرموێت (من خاوەنم -أنا الملك).. پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی هەتا خرێی دانەکانی دەرکەوت، ئەمەش وەك بەراست دانانی وتەی زانا جوولەکەکە.

بەڵام دوایی ئەو فەرمایشتەی خودای خوێندەوە کە فەرموویە: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾(الزمر- ٦٧).. واتە: (ئەوان بە تەواوی خودایان بە گەورە نەگرتووەو بە ناسینی تەواو نەیانناسیوە. زەویش لە رۆژی قیامەتدا لەژێر دەستیدایەو ئاسمانەکانیش بەکۆمەڵ ملکەچ‌و بەندەی ژێر دەسەڵاتیی خودان، پاك‌و بەرزو بێگەردە خودا لەو شتانەی کە دەیکەنە هاوەڵی)[1] .

(ب) بەشی دووەم پەیوەستە بە مەسەلەی حوکم‌و فەرمانەکانەوە:

نموونەش ئەو فەرموودەیەیە کە (بخاری) لە (عبداللە کوڕی عەمر)ەوە ﷺ

١) الحديث رواه البخاري في كتاب التفسير:٦٥، باب قوله تعالى ﴿وما قدروا الله حق قدره﴾ رقم ٢، حديث رقم: ٤٨١١.

گێراوێتییەوە کەوا جوولەکەکان پیاوێكو ژنێکی خۆیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە زینایان کردبوو تاکو حوکمێکیان بەسەردا بدات، ئەویش فەرمووی: (گەر کەسێك لە ئێوە زینا بکات چیی لێ دەکەن)؟ گوتیان: (رووی هەردوو کەسە زیناکەرەکە رەش دەکەینو لێیان دەدەین).. پێغەمبەر ﷺ لێی پرسین: (ئایا لە تەوراتدا حوکمی بەردباران کردنیان-رجم- بەدی ناکەن)؟ لە وەڵامدا گوتیان: (هیچ حوکمێکی لەو جۆرە لە تەوراتدا بەدی ناکەین)، لەوێدا (عبداللە کوڕی سلام) گوتی: (ئێوە درۆ دەکەن، دە بچن تەورات بێننو بیخوێننەوە گەر ئێوە راست دەڵێن).

خوێنەرەوەی تەورات دەستی خستە سەر ئایەتی (بەردباران کردن) لە تەوراتداو دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئایەتی سەروو خوارووی دەستی، بەڵام ئایەتەکەی (بەردباران کردن)ی نەخوێندەوە. دەستی لەسەر ئایەتی (بەردباران کردن) لاداو لێی پرسی: (ئەمە چیبوو)؟ کاتێك هەموویان بینییان گوتیان: (ئەوە ئایەتی تایبەت بە بەردباران کردنە).

ئینجا فەرمانی جێبەجێکردنی بەسەریانا داو پیاوو ژنە زیناکەرەکە لە جێیەکی نزیك جێی مردوو لەلای مزگەوت بەردباران کران.

(ابن عمر) دەڵێت: (لەکاتی بەردباران کردنیان دیتم پیاوەکە خۆی بەسەر ژنەکەدا شۆڕ دەکردەوەو دەیویست لە بەردەکان بیپارێزێت)[1].

(ج) بەشی سێیەم/ پەیوەستە بە ئامۆژگارییەکانو، بەندەو کۆیلەکانو، چیرۆکەکانو، مێژووەوە: نمونەی ئەمەش (ئەو داستانە ئیسرائیلیاتانەیە کە سەبارەت بە درێژەی چیرۆکی دروست کردنی کەشتی (نوح)-سلاوی خوای لێبێت-و تەختەی کەشتییەکەو درێژیو پانیو رووداوەکانیەتی))[2] .

---

١) رواه البخاري: في كتاب التفسير، رقم٦٥. باب قوله تعالى: (قل فأتوا بالتوراة فأتلوها) رقم٦، حدريث رقم٤٥٥٦.

٢) الإسرائيليات في التفسير والحديث، للدكتور محمد حسين الذهبي: ٤٧-٥٤ بتصرف واختصار.

جا کاتێك لە بەشەکانی ئەفسانەکانی (ئیسرائیلیات) بە هەرسێ پێودانگەکانییانەوە دەکۆڵینەوە، ئەم چەند خاڵەمان لەلا گەڵاڵە دەبێت:

١- ئێمە پێ لەسەر ڕاستیی هیچ کامێکیان داناگرین تەنها مەگەر لە قورئانو سوننەتدا دەقی هاوواتایان هەبێت. بۆیەش پێی لەسەر دادەگرین چونکە مانای هاوشێوەی لەلای ئێمە هاتووە، نەك لەبەر ئەوەی لە خانەی (ئیسرائیلیات) بێت.

٢- بێگومان ئەم ڕاست(صحیح)ەی کە لە سەرچاوە ڕاستەقینەکانمانا هەیەو کە لێك گونجاوی شەریعەتی ئێمەیە، لەخانەی (ئیسرائیلیات)دا نامێنن، بەڵکو مۆرکی شەرعی ئێمەو سیفەتی حوکمەکانمان وەردەگرێتو، دەبێتە بەشێك لە دینو کلتووری ئیسلامیمان.

٣- ئەو دەقانەی ناڕێکن لای ئێمەو پێچەوانەی شەریعەتەکەمانن، ریوایەتو گێڕانەوەیان شیاو نییە تەنها لە دەرووی ئاگادارکردنەوەو هۆشیارکردنەوەی خەڵکییەوەو بۆ دەرخستنی درۆو دەلەسەو چاوبەستییەکانیان نەبێت. جێی باسیشە هەندێك لە موسڵمانە پێشینەکان ئەو دەقانەیان لە بواری پەسندکردنو پێقایل بوونەوە خستۆتە ڕوو.

٤- دەقی تری (ئیسرائیلیات) لە پلەی (موضوع) و (ضعیف)دا لە دەروی زانستدا دانانرێت، چونکە ناوەڕۆکەکانیان ڕاستو واقیعی نیین. خۆ ئەگەر وەك چیرۆکی پێشینەکان باس بکرێنو ئایەتەکانی قورئانیشیان پێ تەفسیر بکرێت ئەوە مانای وایە قورئان بە شتی ناڕاستو هەڵبەستراو و(موضوع) ڕاڤە کراوە، هیچ کەسێکیش بڕیاری دروستیو شیاویی ئەو جۆرە ڕاڤەکردنەی نەداوە.

٥- ئەو دەقانەش کە لەلای ئێمە بێدەنگیی لێکراوەو کە بەرهەڵستیی شەرعەکەمان ناکاتو بە مەسەلەکانی عەقیدەو حوکمو فەرمانەکانیشەوە پەیوەست نییە، ڕێی گێڕانەوەیان لەلایەن هەندێك زانای ڕێپێدەرەوە (بۆ

نمونـــە هێنانـــەوەو وەبیرخـــستنەوە) دراوە، ئێمـــەش تـــەنها لـــەبواری ئاگادارکردنەوەدا شیاویی دیاری کردنو گێڕانەوەیان بەدی دەکەین، لەمەشدا پـەیڕەوی زانایـانی لێکۆڵیـارو توێـژەوەرەوە دەکـەین چـونکە خـودی ئـەو دەقانەش پێچەوانەی مەنهەجی قورئانی پـیرۆزن لـەو توێژینـەوەو زانـستو زانیاریانەدا کە ئاماژەمان بۆ کردن.

* * *

## بەڵگەکانی قەدەغەبوونی گێڕانەوەی دەقە ئیسـرائیلی‌یەکان:

١- چونکە جوولەکەکان فەرمایشتی خودایان لەجێی خۆی لە تەوراتدا گۆڕیوە یـان بە هەڵە لێکیـان داوەتـەوە، بـەم ڕەنگـەش وا ناسـراون کـە بەرامبـەر مێـژوو دەسپاكو سەرڕاست نـین، وەك خـودا لـە بارەیانـەوە فەرموویـە: ﴿...وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ۛ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُواْ ۚ ...﴾(المائدة- ٤١).

واتە: (لەنێو جوولەکەکاندا گەلێك کەس هەن کـە هەمیـشە گـوێدەگرن لـەو درۆو دەلەسانەی کە پێشەوا ئایینییەکانیان هەڵی دەبەستنو بڕوایـان پێدەکـەنو بەم ڕەنگەش لە جیاتی ئـەوەی گـوێ لـەتۆ بگـرن ئـەی پێغەمبـەر، گـوێ لـە کەسانێکی دی دەگرن لە دەرەوەی کۆڕو کۆمەڵی تۆ، ئەوان کـە(جوولەکـەکانی خەیبەر بوون) فەرمایشتی خودا بە هەڵە لێـك دەدەنـەوەو ئـەحکامی تـەورات دەشێوێننو دەیـشارنەوە (بەتایبـەتی حـوکمی تـاوانی زینـا)و جێبـەجێکردنی لەسەر ئەو پیاوو ژنە زیناکەرەیان کە لە خانـەدانو دەسڕۆیـشتووەکانی خەیبـەر

بوونو کە حوکمی خودایان بەسەردا جێبەجێ نەدەکردنو دەشیانگوت: (ئەگەر محمد ﷺ حوکمێکی سوکتری وەك شەللاق لێدان(جلد)ی بۆ بڕیاردان ئەوا پەسندی بکەن، بەڵام ئەگەر فەتوای تری حوکمی بەردبارانی بۆ دەرکردن وریابن لەوەی پەسندی بکەن).)

هەر لەم بارەیەوە خودا فەرموویە: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ۙ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ...﴾(المائدة- ١٣). واتە (جولەکەکان بەهۆی شکاندنی ئەو پەیمانەی لێیانمان وەرگرتبوو نەفرەتمان لێکردبوونو کەوتنە بەر ڕقو نەفرەتی ئێمەو، ئێمەش دڵیانمان ڕەقو توندو وشك کردەوە کە هیچ پەندو ڕێنماییەکی بەسوود کارایی لەسەریان نەبێتو شایانی ڕێی ڕاست نەبن، چونکە ئەوان فەرمایشتی خودایان لە تەوراتدا گۆڕیوەو بەشێکی زۆری ئەو دەقە بەیادخەرەوانەی نێو تەوراتیان لەبیر خۆیان بردۆتەوە وەك ئەو دەقانەی داوای پەیڕەویکردنی ئاینی-محمد-یان لێ دەکەن، هەروەها جوولەکەکان بەردەوام بێپەیمانو بێوەفانو پەیمان دەشکێنن).

٢- چونکە جوولەکەکان لە هەر وتەو سەرگوزشتەیەکیاندا شتی ناڕاستو هەڵبەستراو دەهێننەوە، وەك خوداش فەرمویە: ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾﴾ النساء. واتە: (جوولەکەکان بەهۆی ئەوەی کە باوەڕیان بە-عیسا-ش نەهێناو، بەهۆی ئەو بوختانە گەورەیەش کە خستیانە پاڵ مەریەم-ی دایکی عیساو بەهۆی ئەو سەرگوزشتە پڕ لە درۆو ناڕاستانەیانەوە کەوتنە بەر سزاو نەفرینی خودا).

٣- جوولەکەکان حەزدەکەن موسڵمانان لە ئاینەکەیان لابدەن، ئەمەش لەڕێی دەقە

ناڕاسته ئیسرائیلییەکانیانەوە بەدی دێنن، خودا لەم بارەیەوە فەرموویە: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ البقرة﴾. واتە: (زۆر کەس لە شوێنکەوتوانی کتێبەکانی پێشوو بەتایبەتی لە پێشەوا ئایینییەکانی جوولەکە حەزو ئاواتیان ئەوەیە کە ئێوەی موسڵمان دوای باوەڕهێنانتان لە دین هەڵگێڕنەوەو بتانکەن بە کافران، ئەمەش بەهۆی ئەو دەروونە پڕ لە حەسوودیو رقو دژایەتییەیانو لەدوای ئەوەی ئایینی هەقی ئیسلامیان بۆ روون بۆتەوە).

٤- جوولەکەکان هەق دەشارنەوە لەکاتێکدا دەزانن هەقەو، دەیشیگۆڕن بۆ ناهەقو دەشزانن کە ئەوە ناهەقە. ئەفسانەو بەسەرهاتە ئیسرائیلیاتەکانیشیان دیاردەیەکە لە دیاردە هەمەجۆرەکانی ئەو (هەق حەشاردان)و (ساختەکاری)یانە. لەم رووەوە خودای مەزن فەرموویە: ﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا۟ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ البقرة﴾. واتە: (ئایا ئێوە-ئەی کۆمەڵی باوەڕداران- بەتەمانو هیوای ئەوە دەخوازن کە جوولەکەکان باوەڕ بە ئاینەکەی ئێوە بێنن لەکاتێکدا تاقمێك لە شارەزاکانیان فەرمایشتی خودایان لە تەوراتدا دەبیستو دواتر دەسکارییان دەکرد دوای ئەوەی لێی تێگەیشتبوونو دەیانزانی بنجو بناوانی راستییەکەی چییە ؟!)

٥- زانستی جوولەکەکان تەنها چەند هیواو ئاواتو بۆچوونو وەهمێکە، هەروەك خودا لەبارەیانەوە فەرموویە: ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّآ أَمَانِىَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ البقرة. واتە: لەنێو ئەواندا هەندێك کەس نەشارەزاو نەخوێندەوارنو، وا دەزانن کتێبی تەورات جگە لە چەند هیواو

ئاواتێك هیچی دی نییه، ئەوانه هەر گومانیان کردۆته پیشەو نەریتی خۆیان).

٦- جوولەکەکان بە ئانقەست هەق پشت گوێ دەخەنو، بەنیازو مەبەستی ناهەمواریشیانەوه دوای ناهەق دەکەون. ئەم خراپەو بەدکارییەشیان لە دەقە شێواوه ئیسرائیلیاتەکانیاندا رەنگ دەداتەوه، هەروەك خودا خۆی فەرموویە:

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ... ﴿١٠٢﴾ البقرة﴾. واته: (جوولەکەکان کاتێك پێغەمبەرێکیان لەخوداوه بۆ رەوانەکراو هاته لایان-کە مەبەست پێغەمبەری ئیسلام محمده ﷺ و، کە سەرەڕای ئەوەی کتێبەکەی لای خۆیان-تەورات-یش پشتگیریی ئەو راستییه دەکات کەچی تاقمێك لەو خاوەن کتێبانەی جوولەکەکان کتێبی خودایان خسته پشت گوێو خۆیان لێ گێل کرد وەك ئەوەی گوایه بەسەرهاتی وایان نەزانیوەو نەیانبیستووه. هەروەها هەندێك له جوولەکەکان دوای ئەوه کەوتن کە شەیتانەکان دەربارەی پادشایی‌و دەسەڵاتی سولەیمان دەیانخوێندەوه)....

٧- جوولەکەکان گەلێکی نەفامو تێنەگەیشتوونو واش هەڵس‌وکەوت دەکەن کە گوایه دەزاننو تێگەیشتوون، خۆ ئەگەر زانستیان هەبوایه ئەو هەموو ئەفسانەو درۆو دەلەسەیەیان بڵاو نەدەکردەوه. لەم بارەیەشەوه خودا فەرموویە:

﴿...وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ البقرة﴾. واته: (بێگومان جوولەکەکان دەزانن ئەوەی کاڵای وا بکڕێتو شتی جادووگەرانەی وایان فێر ببێت ئەوا له رۆژی دواییدا هیچ پشکی پاداشتێکی نییەو، ئەو

شتەی ئەوان خۆیان پێی فرۆشتووەو كەوتوونەتە داوییەوە شتێكی زۆر بێنرخ‌و خراپە ئەگەر بزانن‌و تێبگەن. خۆ ئەگەر ئەو جوولەكانە ئیمان‌و باوەڕیان بهێنایەو پارێزكارو بە تەقوابوونایە، ئەوا لەلایەن خوداشەوە پاداشتێكی چاكتریان لەوە دەبوو ئەگەر بزانن‌و بیروهۆشیان بەكار بێنن).

٨- بێگومان چیرۆكەكانی پێشینان بەشێكی هەواڵ‌و زانستی نادیار (غیب)ی رابردووە، غەیبی رابردووش تەنها بەخودای تاك‌و تەنیاوە پەیوەستەو هەر خودا خۆی دەیزانێت. جوولەكەكانیش ئاگادارو بینەری رووداوەكانی گەل‌و نەتەوەكانی پێش خۆیان نەبوون، وەك خودا دەفەرموێت: ﴿...وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓاْ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ﴾(یوسف- ١٠٢)، واتە: (ئەی پێغەمبەر، ئەو بەسەرهات‌و چیرۆكانە لە هەواڵ‌و دەنگ‌و باسە نەزانراوەكانەو تۆش لەلای كەسانی نێو چیرۆكەكان نەبوویت، كاتێك بڕیاریان داوەو پیلانیان دارشتووە).

٩- قورئانی پیرۆز موسڵمانانی فێری ئەوە كردووە، كە چۆن مشت‌و مڕ لەگەڵ جوولەكەكان بكەن‌و چۆن درۆو دەلەسەو بەندو باوو ئەفسانەی ئیسرائیلیاتیان پووچەڵ‌و رەت بكەنەوە، ئەویش بەو جۆرەی بە دەقی قورئان پێیان بڵێن: ﴿أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمْ اللهُ﴾؟ ئێوە زاناترن یان خودا؟، هەروەك خوداش فەرموویە: ﴿قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ البقرة﴾. واتە: (ئەی پێغەمبەر، بەو جوولەكانە بڵێ: (ئایا رەوایە ئێوە مشت‌و مڕو پڕتەو بۆڵەمان لە ئایینی خوادا لەگەڵدا بكەن!! خۆ خۆتان چاك دەزانن كە ئەو خودایە پەروەردگاری ئێمەو ئێوەشەو، ئێمە كاروباری خۆمان هەیەو، ئێوەش كاروباری

خۆتان هەیە وهەر بۆ خۆتانە، ئێمە دڵسۆزو ملکەچی ئەو پەروەردگارەین، یاخود ئێوە دەڵێن کە گوایە ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقوبو نەوەکانی جوولەکە یان گاور بوون" تۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە چاکتر دەزانن یان خودا، جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە راستییەك دەزانێتو دەیشارێتەوەو شایەتییەك دەزانێتو نایلێت؟ بێگومان خوداش بێئاگا نییە لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن؟!)

١٠- وجودی چەند ئەڵقەیەکی (ون بوو) لە مێژووی پێشینەکاندا: خودا لەم ڕووەوە زانستی بە کەس نەداوەو تەنها خۆی بە زاتی پاکی لێیان ئاگادارە، بەڵام سەرگوزشتە دەسهەڵبەستە ئیسرائیلییەکان کاتێك پڕوپاگەندەی زانینو لێئاگاداربوونیان دەکەن ئەوا بە ئاشکرا سەرپێچی لە قورئان دەکەن کە تەنها ئەم فەرمایشتەی خودا لەم ئایەتەدا بەدرۆیان دەخاتەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ ... ﴿٩﴾ إبراهيم﴾. واتە: ئایا هەواڵو بەسەرهاتی گەلانی پێش خۆتان پێ نەگەیشتووە وەك گەلەکانی (نوح)و (عاد)و (سەموود)و ئەوانەی لەدوای ئەو گەلانە هاتوونو کە تەنها خودا دەزانێت چەند بوونو چییان بەسەر هاتووە؟!

١١- قورئان بە ئاشکراو بەڕاشکاوی ئەوەی قەدەغە نەکردووە کە دەربارەی بەسەرهاتی پێشینەکانو چیرۆکی گەلانی پێشوو پرسیار لە (ئەهلی کتاب) واتە لە جوولەکەو دیانەکان بکرێت.. ئەم قەدەغەکردنەش بەروونی لەم فەرمایشتەی خوادا هاتووە: ﴿...وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا﴾﴿الكهف-٢٢﴾. واتە: هەرگیز لەبارەی پێشینەکانەوە پرسیار لە کەسیان مەکە.

١٢- قورئان بە ڕاشکاوی ئەوەشی لە موسڵمانان قەدەغە کردووە کە بەبێ زانستو

زانیاری هیچ وتەیەك لـەبارەی چـیرۆکی پێـشینەکان نـەڵێن، دیـارە ئەفـسانەو بەسـەرهاتە ئیـسرائیلییەکانیش هـەموویان وتـەو ریوایـەتی بێزانیـارین‌و خاوەنەکانیـشیان بـەبێ زانـست‌و زانیارییـەك ڕێـچکەی خۆیـان لـەو لایەنـەوە گرتۆتەبەر، وەك خوداش فەرموویە: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ... ﴿٣٦﴾ الإسـراء﴾. واتـە: (بـەبێ زانست‌و زانیاری دوای هیچ وتەو بەسەرهات‌و ڕێچکەیەك مەکـەوەو تـەنها بـە دیدو بۆچوون حوکم مەدەو دانی پێدا مەنێ، چونکە بەراستی گـوێ‌و چـاوو دڵ هەموویان بەرپرسیارن لێی).

١٣- قورئـان ئـەوەی لەسـەر پێویـست کـردووین کـە لـەکاتی بیـستنی هـەواڵ‌و بەسەرهات لە کەسانی بەدکاردا داوای ڕوون کردنەوە بکەین‌و بچینە نێـو بـنج‌و بناوانی هەواڵەکانەوەو، نابێـت هـەواڵ‌و ریوایـەتی بـەدکاران‌و کـافران پەسـند بکەین، بەڵکو دەبێت بیخەینـە سـەر تـەرازووی ڕەخنـەی ڕاسـتەقینەو ئەگـەر شتێکی سـاغی تێـدابوو ڕاسـتی‌و دروسـتییەکەیمان بـۆ یـەکلا بـووەوە وەری بگرین‌و ئەوانی تری لێ پشت گوێ بخەین.. هەر بەم ڕەنگەش دەبێـت بەرامبـەر ڕیوایاتی جوولەکەو ئیـسرائیلیات بووەسـتین. وەك خـودا فەرموویـە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ ﴿٦﴾ الحجرات﴾. واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتـان هێنـاوە، ئەگـەر کەسـێکی نەناسـراو کـە لـە ڕاسـتگۆیی‌و دادپـەروەریی دڵنیانـەبون، هەواڵێکی بۆ هێنان، ئەوا خێرا لە ڕاستی‌و دروستیی هەواڵەکە بکۆڵنەوە تـاکو ڕاستییەکەی لە ناڕاستییەکەی دەرکەوێت بۆتان).

١٤- هـەروەها پێغەمبـەریش ﷺ بـە ئاشـکراو بـە ڕاشـکاوی ڕێی گرتـووە لـە وەرگرتنی هەر شتێك لە جوولەکەکان، وەك لە (بخاری)یـەوەو ئـەویش لـە (أبـو

هريره)ەوە گێڕاویەتیەوە کە (ابوهريره)ﷺ گوتویەتی: (ئەهلی کیتاب تـەوراتیان به زمانی عیبری دەخوێندەوەو، بەزمانی عەرەبیش تەفسیریان دەکرد بۆ ئـەهلی ئیسلام، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **((لا تصدقوا أهل الكتاب ولا تكذبوهم، وقولوا آمنّا بالله وما أنزل الينا))**[1]، واتە: (بڕوا بە ئەهلی کیتـاب مەکـەنو، بەدرۆشیان مەخەنەوە، بەڵکو بڵێن باوەڕمان بە خودا هێناوەو بەوەش، کە بـۆی ناردوینەتە خوارەوە).

١٥- نکووڵی کردنی پێغەمبەری خـودا ﷺ لـە (عومـەری کـوڕی خـەتتاب) ﷺ کاتێك دیتی کە (عومەر) لاپەڕەیـەکی لـە کتـێبی (ئـەهلی کیتـاب)ی پییـەو دەیخوێنێتەوە، ئەوەبوو وەك ئیمامی (ئەحمەد) لە (جابر کـوڕی عبـدالله)وە ﷺ گێڕاویەتییەوە، کە (عومەری کوڕی خـەتتاب) ﷺ هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺو نووسراوێکی پێبوو، کە لە هەندێك کەسـی شـوێنکەوتوانی کتێبـەکانی (اهـل الكتاب)ەوە وەریگرتبوو بۆ پێغەمبەریش دەیخوێندەوە، پێغەمبەری خـواش ﷺ لێی توڕەبووو پاشان فەرمووی: **((أَمُتَهَوِّكُونَ فِيهَا يَا ابْنَ الْخَطَّابِ! وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ جِئْتُكُمْ بِهَا بَيْـضَاءَ نَقِيَّـةً، لا تَـسْأَلُوهُمْ عَـنْ شَـيْءٍ، فَيُخْبِـرُوكُمْ بِحَقٍّ فَتُكَذِّبُوا بِهِ، أَوْ بِبَاطِلٍ فَتُصَدِّقُوا بِهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ مُوسَى كَانَ حَيًّا مَا وَسِعَهُ إِلاَّ أَنْ يَتَّبِعَنِي))**[2]، واتە: ئـەرێ ئـەی کـوڕی خـەتتاب، ئێـوە گومـانو دوودڵیتان لەسەر ئەم قورئانە هەیە، دەسا بەخودا بە سپێتیو بێگـەردی و بـێ هیچ گرێو گۆڵێك بۆم هێناون، جا ئێوەی موسڵمانیش پرسیار لە ئەهلی کیتاب لەسەر هیچ شتێك مەکەن، چونکە لەوانەیە وەڵامی ڕاستیشتان بدەنەوە، بـەڵام ئێوە -بەهەڵە- لەوانەیە بەدرۆیان بخەنـەوە، یـان لەوانەیـە وەڵامـی ناڕاسـتتان

---

١) رواه البخاري في كتاب التفسير، رقم٦٥، باب: (قولوا آمنا بالله وما أنزل الينـا)، رقـم١١، حديث رقم٤٤٨٥.

٢) فتح الباري بشرح البخاري، لأبن حجر ١٣: ٣٣٤.

بدەنەوەو ئێوەش بڕوایان پێبکەن.. دەسا بەو خودایەی کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئێستا موسا زیندووبوایە هیچ ڕێیەکی لەبەردەمدا نەبو تەنها ئەوە نەبێت کە ئەویش پەیڕەویی ئەم ئاینەی من بکات.

١٦- هەروەها هاوەڵانیش نکوڵییان کردووە لە هەرکەسێك بچێت بۆلای جوولەکەکانو بابەتە ئیسرائیلییەکانیان وەربگرێت.. نموونەش لەم ڕووەوە ئەوەی (بخاری) گێڕاویتییەوە لە (عبداللە کوڕی عبداللە کوڕی عتبە کوڕی مسعود)ەوەو ئەویش لە (ابن عباس)ەوە ﷺ کە گوتوویەتی: ((ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، ئێوە چۆن دەبێت پرسیار لە ئەهلی کیتاب بکەن؟ چونکە کتێبەکەی خۆتان کە خودا نادردوێتی بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ تازەترین هەواڵو زانیاریی لەبارەی خوداوە تێدایەو ئێوەش کاتێك دەیخوێننەوە هیچ شتێکی درۆو ناڕاستو لاری تێکەڵ نەبووە. هەر لەو قورئانەشدا خودا پێی ڕاگەیاندوون کە ئەهلی کیتاب کتێبی خودایان گۆڕیوەو دەسکارییان کردووەو بەدەستی خۆیان ئاڵو گۆڕیان بەسەردا هێناوەو گوتوشیانە: ئەمە لە خواوە بۆمان هاتووە.. تاکو بەم کارە خراپەیان دەسکەوتێکی کەمی دنیایان چنگ کەوێت، جا ئایا ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، ئەم قورئانە ڕێی ئەوەتان لێناگرێت کە بەو زانستەی بۆتان هاتووە پرسیاری هیچ شتێکیان لێنەکەن؟ دەسا بەخوا نەماندیوە پیاوێکی ئەوان جارێك پرسیارتان دەربارەی ئەوەی بۆتان هاتۆتە خوارەوە لێبکات))[1].

١٧- هەر لەم ڕووەوە لەسەر نکوولّیی هاوەڵانیش لە پرسیارکردن لە (ئەهلی کیتاب) ئەو وتەیەی (عبداللە کوڕی مەسعود) ﷺ نموونەیەکی ترە، کە تیایدا گوتوویە: (پرسیار لە ئەهلی کیتاب مەکەن، چونکە ئەوان ڕێی ڕاستتان پیشان

---

١) بڕوانە کتێبی البخاري: كتاب الأعتصام بالكتاب والسنة، ٩٦، باب قول النبّي عليه السلام: لا تسألوا أهل الكتاب عن شيء:٢٥، وحديث رقم (٧٣٦٣).

نادەن لەکاتێکدا خۆیان گومڕا کردووە، لەوانەشە شتێکی راستتان پێ بڵێنو ئێوەش بەدرۆی بزانن، یان بە پێچەوانەوە لەوانەیە بڕوا بەدرۆیان بکەن)[1] .

❊ ❊ ❊

## مانای فەرموودەی ( حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلا حَرَجَ ):

جا بۆئەوەی لە هەموو روویەکەوە باسی حوکمی (ڕەوایی‌و ناڕەوایی)ی گێڕانەوەی دەقە ئیسرائیلییەکان بکەین، لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو بەڵگەیە دەکەین کە ڕێپێدەرانی پشتیان پێ بەستووە لە ڕێگەدانو شیاوکردنی هەندێك دەقی دیاریکراوی ئیسرائیلیدا:

گرنگترین بەڵگەو بەناوبانگترینیشیان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودایە ﷺ کە (بخاري) لە (عبدالله کوڕی عەمر کوڕی عاص)ەوە رضي الله عنه گێڕاویێتییەوەو کە پێغەمبەرﷺ تێیدا فەرموویە: ((**بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً، وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلا حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ**))[2] . واتە: (لە بانگەوازدا گەر ئایەتێکیش بێت لە منەوە بیگەیەنن بە خەڵکیو، دەربارەی گەلی نەوەی ئیسرائیلیش هەندێك هەواڵو دەقو قسەو باسیان بگێڕنەوەو لەمەشدا هیچ شەرمەزارییەك نییە.. بەڵام هەرکەسێك بە ئانقەست بەهۆی دەقێکەوە درۆ بەدەم منەوە بکات ئەوا با بزانێت کە جێگەی خۆی لە ئاگردا هەیە).

لەم فەرموودەیەدا ئاراستەی دەلالەت لەلای ڕێگەپێدەران ئەوەیە کە فەرموودەکە ڕێگەی بە موسڵمانان داوە کە دەربارەی بەسەرهاتو ریوایاتی بنو ئیسرائیل بدوێنو بەربەستی شەرمەزاریشی لەبەردەم ئەو کەسانەدا لابردووە کە بە

---

١) فتح الباري بشرح البخاري ١٣: ٣٣٤.

٢) البخاري: كتاب أحاديث الأنبياء:٦٠، باب ما ذكر عن بني اسرائيل:٥، حديث رقم ٣٤٦١.

شێوازی لەبار سوود لە چەند دەقێك دەبینن. کەچی هەندێك کەسیان کتێبەکانی خۆیان پڕ کردووە لە بەسەرهاتو چیرۆكو ئەفسانە ئیسرائیلییەکان.

ئێمەش پێش ئەوەی باری تێگەیشتنی خۆمان لەم فەرموودەیە بخەینە روو، ئاماژە بۆ شیکارو لێکدانەوەی (ئیمام ابن حجر) دەکەین کە بەم شێوەیەی لای خوارەوە لێکی داوەتەوە:

جا داخۆ مانای فەرموودەی (**حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ**) چی بێت؟ (ابن حجر) بۆ لێکدانەوەی فەرموودەکە چەند وتەیەکی زانایانو بیروبۆچوونیانی دیاریکردووە، وەك:

١- گوتراوە مەبەست لە نەوە(بنی)ی ئیسرائیل لە فەرموودەکە کوڕانی خودی (ئیسرائیل)ن، واتە کوڕانی (یەعقوب)ن-سلاوی خودای لێبێ-، بەم رەنگەش مانای فەرموودەکە ئەوەیە (لە بەنی ئیسرائیل وتە وەرگرنو ئەو بەسەرهاتانەیان لێبگێڕنەوە کە دەربارەی یوسفی برایانە-سلاوی لێبێت-) ئەم مانایەش دوورترین ئەگەری راستێتیی تێدایە.

٢- هەروەها (مالك)یش-خودا لێی خۆش بێت- گوتوویە: (مەبەست لەم فەرموودەیە شیاویی لەبارەوە دوانیانە بۆ هەر لایەنێکی راستو تەواو، بەلام هەر لایەنێکی هەوالو بەسەرهاتیان درۆو ناڕاستیی تێدا زانرابوو، ئەوە ناشێت هیچ لەبارەیەوە بگوترێتو بگێڕدرێتەوە).

٣- گوتراویشە مانای ئەوەیە بە هەمان شێوازی نێو قورئانو فەرموودەی (صحیح)و بە رێنماییەکانی قورئانو سوننەت وتەو ریوایەتیان لێ وەرگرن.

٤- گوتراویشە مانای ئەوەیە کە گێڕانەوەی وتەو بەسەرهاتیان بە هەر رەنگێك بێت شیاوە، سا ئیتر بەهۆی بڕانو نەبوونی گەیەنەرێك لەوانەوە بووبێت یاخود راستەوخۆ لە خۆشیانەوە پێمان گەیەنرابێت، ئەمەش لەبەر گرانیی پەیوەندی لەکاری لێدوان لەبارەیانەوەو، پاشان کە بەپێچەوانەی حوکمو فەرمانە

ئیسلامییەکانیشەوەن، هەرچەندە لە ڕاستیو بنەڕەتدا دەبێت پەیوەندی لەوەدا هەبێت.

٥- ئیمامی شافیعی-خودا لێی خۆش بێت- گوتوویە: (وەك زانراوە پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگە بە وتەو ڕیوایەتی درۆ نادات. جا مانای (**وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلا حَرَجَ**) ئەوەیە ئەو وتەو بەسەرهاتانەیان لیٚ وەرگرنو بگێڕنەوە کە درۆو ناڕاستیی تێدا نابینن‌و، هەروەها ئەوەی بە شیاوی دەزانن لەوانەوە ئەوا هیچ شەرمەزاریو گریٚو گۆڵێکی بۆ ئێوە تێدا نییە گەر لێی بدوێن‌و بیگێڕنەوە.

پاشان (ابن حجر) بۆ مانای نەهێشتنی شەرمەزاری لەسەر لێدوان لەبارەی بەسەرهاتی ئیسرائیلییەوە چەند وتەیەکی هێناوە، وەك:

(١) واتە هیچ بارگرانییەکتان لەسەر نییە دەربارەی گێڕانەوەی وتەو سەرگوزشتەی ئەوان، چونکە پێشتر پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەی لەسەر وەرگرتنی قسەو باسیان‌و تەماشاکردنی کتێب‌و نووسراویان پیشان داوە، بەڵام دواتر جۆرە بەرفراوانییەکی تێدا دەرخستووەو ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو هەڕەشەو ریٚنەدانە پێش جێگیربوون‌و ڕەگ داکوتانی حوکمە شەرعییەکان‌و ڕێسا ئایینییەکان بووە نەبادا ئاڵۆزیو فیتنەی لێوە بڵاو بێتەوە. ئیدی کاتێك مەترسیی ئەو مەسەلانە لە ئارادا نەما مۆڵەت بەو کارە درا کە گویٚ بگرێت لەو وتەو ڕیوایەت‌و سەرگوزشتانەی ئەو سەردەمەی بەنی ئیسرائیل کە جیٚی باوەڕو پەسندیی موسڵمانانن.

(٢) گوتراویشە مانای فەرموودەکە، واتە (سینەتان تەسك نەبێت بەو وتەو ڕیوایەتە سەیرو سەرسامکارانەی (بنی ئیسرائیل) چونکە ڕووداوی زۆریان لەو بارەیەوە بەسەر هاتووە.

(٣) هەروەها گوتراوە مانای ئەوەشی هەیە کە (هیچ شەرمەزارییەکی تێدا نییە

گەر وتەو بەسەرهاتیان لەبارەوە نەگێڕنەوە، چونکە فەرموودەکە یەکەم جار لە وشەی (حدثوا)دا دارشتنەوەی ئەو فەرمانەیە کە پێویست بوون (وجوب) دەخوازێت، بەڵام ئاماژەشی کردووە بۆ (پێویست نەبوون)و فەرمانەکەشی ڕێپێدان (اباحة)ی بە وشەی (ولا حرج) تێدایە، واتە بە لێنەدوانو نەگێڕانەوەی وتەکانیان.

(٤) گوتراویشە مەبەست لەمەدا نەهێشتنی شەرمەزارییە لەسەر ئەو کەسەی کە هەمان چیرۆكو بەسەرهاتی لێکچووی بەسەرهاتی ئەوان دەهێنێت، لە بەسەرهاتی ئەوانیشدا بێژەو زاراوەی ناشیرین هەیە وەك ئەوەی بە موسای پێغەمبەریان گوتووە: (بڕۆ خۆتو خوداکەت بجەنگن) یان وەك ئەوەی گوتویانە: (خودایەك بۆ ئێمەش دروست کە وەك چۆن ئەو هۆزە خواوەندێکی لە مادە داتاشراویان بۆ خۆیان دروست کردووە).

جا ئایا لە چەمكو مانای (**وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ**) ئەوە بفامرێتەوە کە بگەڕێینەوە بۆ لای ئەوانو بەسەرهاتو چیرۆکەکانیان بگێڕینەوەو، لە کتێبە ئیسلامییەکانمان (لە تەفسیرو ژیاننامەو چیرۆکەکانو مێژوو)دا بیاننووسینەوە؟!

لە زمانی عەرەبیدا جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی بڵێین (رويت عن فلان)و (حدثت عن فلان)، کاتێك دەڵێیت (رويت عن فلان) واتە (لە فلان کەسەوە گێڕامەوە) بە مانای ئەوەی تۆ وتەی فلان کەست بۆ کەسانی تر گواستۆتەوەو، لێرەدا تۆ تەنها وتەگێڕەوە (راوی)ی ئەویت، هەر بۆیەش فەرموودەگێڕەوەکان (المحدثون) کاتێك فەرموودەیەکیان لە زاری زاناو پێشەوایانیانەوە گێڕابێتەوە گوتویانە (فلان کەس لە فلانکەسی ترەوە فەرموودەکەی بۆ گێڕاوینەتەوە).

بەڵام کاتێك دەڵێیت (حدثت عن فلان) دوو مانا هەڵدەگرێت:

یەکەم/ گێڕانەوە لەو کەسەوە بە گەیاندنی وتەکەی بە کەسانی دی.

دووەم/ گەیاندنی هەواڵ لەو کەسەوە، بەمانای ئەوەی تۆ هەر ڕووداوو

بەسەرهاتێكی ئەو كەسەت بە كەسانی دی گەیاندووەو، دەربارەی ژیاننامەو چیرۆكی ژیانی بۆ كەسانی دی دواویت.

جا كەوابوو فەرموودەكەی پێغەمبەری خودا ﷺ كە فەرموویەتی: (**وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ**) دوو مانا هەڵدەگرێت:

١- واتە: (أرووا كلام بني اسرائيل، وأنقلوه في كتبكم) (وتەكانی بنو اسرائيل بگێڕنەوەو لە كتێبو نوسراوەكانیشتاندا بینووسنەوە)، هەندێك لە زانا پێشینەكانمان ئاوا لێی تێگەیشتوونو، لە دەقە ئیسرائیلییەكانیان هێناوەتە نێو كتێبەكانیانەوەو خستوویانەتە بەرچاوی خوێنەرانی نەتەوەكەیان.

٢- واتە (أن تتحدثوا عن قصة بني اسرائيل...) واتە مانای ئەوەیە دەربارەی چیرۆكی (بنو ئیسرائیل) بدوێنو لێی بگێڕنەوە بۆ نەتەوەی خۆتان كە چییان بەسەرهاتووە لە مێژووی خۆیاندا، تاكو نەتەوەكەتان لەو ڕێبازو ڕەوتەی ئەوان وریاو ئاگادار ببنەوەو، بزانن بەهۆی خراپیو سەركێشیی خۆیانەوە چییان بەسەر هاتووە؟!!!

من خۆم پشتگیری مانای دووەم دەكەم، لەبەر ئەوەی چەند دەقێك هەیە لەنێو فەرموودەكانی تردا، كە ڕێی وەرگرتنی وتەو قسەو باسی جوولەكەكانو ڕێی گێڕانەوەی هەواڵو بەسەرهاتیانمان پێدەدات بەو ڕەنگەی، كە لە كتێبو فەرهەنگی خۆیاندا هەیە..

جا بە پوختی مانای (**وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلا حَرَجَ**): واتە (موسڵمانان ئاگاداركەن لە بەسەرهاتی نەوەو هۆزی بەجێماوی ئیسرائیل، كە بە جوولەكەكان ناوبراون، موسڵمانان شارەزا كەن لە مێژوویانو، بەدكاریو لادانیان بۆ روون بكەنەوە، هەروەها پەردە لەسەر ڕیسواییو ڕەنجەڕۆییو پیلانەكانیان هەڵدەنەوە، چونكە مێژووی ئەوان پڕە لە ڕیسواییو بەزینو بەدكاری، تەنها پێغەمبەرانیانو پیاوچاكانیان نەبێت.. دەنا چیرۆكو بەسەرهاتیان پڕە لە گومڕاییو لەڕێلادانو

بەدڕەفتارییەکانیان.. قورئانی پیرۆزیش بە تەنیا خۆی ئەرکی گێڕانەوەو دەرخستنی ئەو ریسوایی‌و گەندەڵی‌و بەدکارییانەیانی لەئەستۆ گرتووە.

ئیدی پێغەمبەریش ﷺ داوای ئەوە لە موسڵمانان دەکات، کە شارەزای بەسەرهاتی جوولەکەکان بن‌و، لە مێژوویان بکۆڵنەوەو ئاگاداری میزاج‌و سروشت‌و دەروون‌و حەقیقەتی کەسێتیان بن‌و، ئینجا هەموو ئەم زانیاریانەش بەشێوازێکی زانستیانەو بابەتیانەی قورئانی بە خەڵکی بگەیەنن‌و، لەمەشدا هەست بە هیچ شەرمەزاری‌و ئیحراجییەك نەکەن‌و گومانی ئەوەیان نەبێت، کە گوایە بەم کارەیان خودا تووڕە دەکەن، یان دژایەتیی باوەڕداران دەکەن، بەڵام ئەمەش بە مەرجێك، کە پێغەمبەران‌و پیاوچاکانی -بنواسرائیل- بە پاك‌و بەدووربگرن لەو بەدکرداری‌و گومڕایی‌و ریسواییانەیان.

جا ئەگەر ئەو نووسەرو بیریارە موسڵمانانەی، کە رێگای لێدوان‌و گێڕانەوەی دەقە ئیسرائیلییەکانیان بەخۆیان داوەو لە نووسین‌و لێکۆڵینەوەکانیاندا دەیانخەنە بەرچاوی موسڵمانان‌و ئاسۆی بیرو فیکریان پێ لەکەدار دەکەن، ئەگەر بەم رەنگە لەو فەرموودەیە تێبگەیشتنایە، ئەوا بێگومان سوودو کەڵکێکی زۆریان بە موسڵمانان دەگەیاندو، ئەو دەقی چیرۆکانەی ئیسرائیلییەکانیشیان بە شێوەیەکی لەبارو رێك‌و پێك بۆ پتەوکردنی ئاستی فیکری‌و رووناکبیری‌و زانستیی نەتەوەی ئیسلامی بەکار دەهێناو، هەروەها نەتەوەی ئیسلامیشیان هەر بەو دەقانەو بە ئیمان‌و ئەخلاق‌و مێژووو کلتوورییەوە لە نەتەوەکانی دی جیا دەکردەوە.

خۆ ئەگەر تەفسیرکارە بەڕێزەکان بەم تێگەیشتنەوە، تەفسیرو راڤەی ئەو فەرموودەیە بکەن، ئەوا فەرمایشتی خوداشیان بە پاك‌و بێگەرد دەگرت لەوەی، کە بە ئەفسانەو داستانە پووچەڵەکانی ئیسرائیلیات تەفسیری بکەن‌و، چەندین لاپەڕەی تەفسیرەکانیان بەو هەموو ئەفسانە نامەعقووڵ‌و شتە سەیرو سەمەرانەی ئیسرائیلییەکان ڕەش نەدەکردەوە.

خۆزگە بەوپەڕی ڕاستگۆیی‌و ئەمانەتەوە مێژووی جوولەکەمان بخستایەتە بەرچاوی موسڵمانان، خۆزگە بەوپەڕی ڕێسای زانستی‌و بابەتیەوە شیکاری باری دەروونی‌و دیراسەی کەسێتییانمان بکردایە، تاکو موسڵمانان وریا بوونایە لەوەی کە بە هەمان ڕێگەی جوولەکەکاندا نەڕۆیشتنایەو ئەم ئاکارەشیان بخستایەتە گەڕ بۆ دەرخستنی ڕووی راستەقینەی جوولەکەکان بۆ سەرجەم گەلانی دی، تاکو ئەمە ئامرازێك بوایە لە ئامرازەکانی شەڕی درێژخایەنمان لەگەڵیان‌و چەکێکیش بوایە لە چەکەکانی جەنگی دژواری نێوان ئێمەو ئەوان[1].

با ئێمەش لەگەڵ ئیمام (احمد شاکر) لە کتێبەکەیدا (عمدة التفسیر) هەمان وتەی (الحافظ ابن کثیر) بڵێینەوە کە دەڵێت: بێگومان ڕێگەدان بە گێڕانەوەی وتەو چیرۆکی بنی اسرائیل بێ‌ئەوەی بەڵگەیەکمان لەسەر راستی‌و ناڕاستییەکەی هەبێت، شتێکی ئاواو هێنانەوەی ئەو جۆرە وتەو بەسەرهاتانەش لە تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆزداو دانانیان بە وتەی پیاوچاکێك یان بە ریوایەت‌و گێڕانەوەیەك لە لێکدانەوەی مانای ئایەتەکاندا یان لە دەستنیشان کردنی ئەوەی هیچ شتێکی تیادا دەستنیشان نەکراوەو، یاخود لە درێژەدان بەوەی کە بە پاکی‌و پوختی هێڵراوەتەوە شتێکی دییە، چونکە هەر دەقێك لە تەنیشت فەرمایشتی خوداوە جێگیر بکرێت‌و ئەو ئەندێشەیەش بگەیەنێت کە باری راستی‌و ناڕاستیی نازانین‌و کەچی بەروون کەرەوەی فەرمایشتی خوداو شیکەرەوەی پوختەو کورتکراوەی دابنێیت.. حاشا بۆ خوداو قورئانە پیرۆزەکەی لەم ڕێچکە نالەبارە.

پێغەمبەری خوداش کاتێك ڕێی لێدوان‌و گێڕانەوەی هەندێك دەقی ئیسرائیلیەکانی داوە، فەرمانی پێ‌کردووین نە بڕوای پێ‌بکەین‌و نە بە درۆشی

---

[1]) من خۆم بە کردەوە هەندێك ئەرکم لەم ڕووەوە جێبەجێ کردووە، وەك نووسینی کتێبی (الشخصیة الیهودیة في القرآن) و، پاشان نووسینی (قصص بني اسرائیل في القرآن) کە لەم کتێبە دایە.

بخەینەوە، چونکە هەر بڕواکردنێك بە ریوایاتو وتەو بەسەرهاتیان بـەهێزتر دەبێـت لەوەی، کە بەراوردیان بکەین لەگەڵ قورئـانی خـواداو بیانخەینـە هـەمان جێگـای شیکارو تەفسیرو روونکردنەوە.. خودایە لێمان خۆشبە.[١]

هەروەها ئێمە لەگەڵ وتەی دکتۆر (محمد حسين الذهبی)داین-خـودا لێـی خـۆش بێت- کە لە شیکاری ئەو بیروڕایەدا گوتوویەتی: (منیش پشتگیری ئەو رایە دەکەم بۆ پاراستنی کتێبی خـودا لـە وتـەی بێکـەڵكو بێنـاوەرۆك، هـەروەها بـۆ زیـاتر پارێزگاریش لە خۆ تێهەڵقورتاندنی ئەو کەسانەی پەیوەندیان بەو بوارەوە نییەو بـۆ زیاتر رۆشن کردنەوەی ئەو سوودو کەڵکانـەش، کـە هـیچ سـوودو خێـرو بێرێکـی دیکەیان پێناگاتو هاوتایان نییە.)[٢]

١) بڕوانە کتێبی (عمدة التفسير عن الحافظ ابن كثير)ی أحمد شاكر. بەرگی (١) لاپەڕە(١٥).
٢) بڕوانە کتێبی (الإسرائيليات في التفسير والحديث)ی (د.محمد حسين الذهبـي) لاپەرە(٢٠٣).

# چیـرۆکی یەکـەم

## چیـرۆکی دایکی موسـا-سـلاوی خودای لێ بێت-

قورئانی پیرۆز ئەم چیرۆکەی بەم چەشنە خستۆتە روو کـە لـە چـەند ئایـەتێکی هەردوو سورەتی (طه)و (القصص)دا هاتووەو خودا تیایاندا فەرموویە:

﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ طه: ﴾.

واتە: ئەی موسا، بێگومان لەمەوپێش جـاری دیکـەش بـەدەم کێـشەو گـرفتی تۆوە هاتووینو منەتمان ناوەتە سەر تۆو لای رەحمـەتمان لـێ کردوویتـەوە، ئـەوەبوو کاتێك ئێمە بە سروش ئەوەی پێویست بوو بە دایکتمـان گەیانـد کـەوا-موسـا-ی کۆرپەت بخـەرە نێـو سـندووقو لانکەیـەکی تایبەتییـەوەو ئینجـا هەڵیـدەرە نێـو دەریاکەوە تـا دەریـاش بـەرەو کـەنار بیبـاتو، تـا سـەرەنجام دوژمنەکـەی مـنو دوژمنەکەی-موسـا-ش هەڵیدەگرێتـەوە، بەراسـتی هـەر مـن خۆشەویـستی تـۆم خستۆتە دڵی دەوروبەرتەوە تا لەژێر چاودێری خۆمدا گەورە ببیـت. هـەروەها ئـەی موسا، لەبیرت کرد کاتێك خوشکەکەت چاودێریی تۆی دەکـرد لـە نزیکـی کۆشـی فیرعەوەنەوەو کاتێك دیتی دەستەوسان بون لـە کـاری شـیر پێدانتـداو ئیـدی ئـەو

خوشکەت بەوانی گوت: ئایا کەسێکتان پێ نیشان دەم، کە بتوانێت کاری بەخێوکردنی ئەم منداڵە دۆزراوەیەتان بۆ لەئەستۆ بگرێت؟ ئەوانیش بەوە رازی بوون‌و، ئینجا بەو رەنگە تۆمان بۆ لای دایکت گەڕاندەوە، تا چاوی ڕوون بێت‌و دڵی ئارام بێتەوەو خەمبار نەبێت.. هەروەها ئەی موسا، ئەوەش بەبیر خۆت بێنەرەوە، کە کاتێك کەسێکت کوشت لە ئەنجامی شەڕێکی ئاساییدا، بەڵام ئێمە ڕزگارمان کردیت لە غەم‌و پەژارەی کەوتنە بەر چنگی خێڵی فیرعەون‌و، بە چەندەها جۆرو شێوەش تاقیمان کردوویتەوە، ئەوەبوو چەند ساڵێك لەنێو دانیشتوانی (مەدیەن)دا دەژیایت‌و بە شوانکارەیی ژیانی خۆتت بەسەر دەبرد، تا لە کات‌و وادەی دیاریکراودا هاتیت بۆ وەرگرتنی پەیامی ئێمە).

لە سەرەتای سورەتی (قصص)یشەوە خودا فەرموویە:

﴿طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾

وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَـٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ۖ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَـٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَـٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ القصص﴾.

واتە: (طا، سین، میم) ئەمانە ئایەتەکانی قورئانی روونو ئاشکران. ئێمە هەواڵی بەسەرهاتی موساو فیرعەونت بە حەقو دەقی راستەقینەی خۆیت بۆ دەگێڕینەوە تا ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەو قەومو گەلو کەسانەی کە باوەڕ دەهێنن. بێگومان فیرعەون لەسەر خاکی میسر خۆی بە دەسەڵاتدارێکی گەورەو بڵندو بە زەبروزەنگ دانابووو خەڵكو میللەتیشی کردبوو بە چەند جۆرو دەستەو کۆمەڵێکەوە لەکاری خزمەتکاریو سەرشۆڕکردنیاندا، هەندێکیانی دەچەوساندەوەو لاوازو بێهێزو نەداری دەکردنو منداڵە نێرینەکانیانی سەردەبڕیو کچانو ئافرەتانیشی بە زەلیلی دەهێشتەوە، بەراستی ئەم ستەمکارە لەتاوانبارانو خراپکاران بوو. لەلایەکی ترەوە ئێمەش دەمانەوێت دەرووی خێرو رەحمەت لە چەوساوان بکەینەوەو منەتی خێر بەسەر لاوازکراواندا لەسەر رووی زەوی ببەخشینو، دەمانەوێت بیانکەین بە پێشەوایانو پێشڕەوانی خەڵکیو بیانکەین بە میراتگرو جێنشینی زەوی. هەروەها دەمانەوێت پایەداریان بکەینو دەسەڵاتیان لەسەر زەویدا بچەسپێنینو ئەو کارەساتە پێشبینیکراوەی فیرعەونو (هامانو وەزیرو راوێژکارەکانیشی) لەدواییدا پیشانی فیرعەونو هامانو سەربازەکانیان بدەین کە لێی دەترسانو ئەم بەڵێنەش لە بارودۆخی پێویستدا بە ویستی خودا بەدی بێت. ئێمە سرووشمان نارد بۆ دایکی(موسا) کە لە شیر تێری بکاتو پێمان

گوت ئەگەر لەوەش دەترسایت، کە پـێی بزانن، ئەوا فڕێی بدەرە رووباری (نیل)ەوەو، مەترسە لەوەی تووشی بەڵا ببێتو، خەفەتیشی لێ مەخۆ، چونکە ئێمە دەیگێڕینەوە بۆ لاتو لە داهاتووشدا دەیکەین بە یەکێك لە نێرراوانو پێغەمبەران. ئەوساش دارودەستەی فیرعەون هەڵیانگرتەوە، تا ببێتە دوژمنو جێی خەمو پەژارە بۆیان. بەراستی فیرعەونو هامانو سەربازەکانیان گوناهکارو تاوانبار بوون. جا کاتێك فیرعەون موسای ساوای بینی، فەرمانی دایە کوشتنی، بەڵام هاوسەرەکەی فیرعەون نەیهێشت بیکوژێت، بەڵکو گوتی: (هیوادارم ببێتە مایەی خۆشیو شادی بۆ منیشو بۆ تۆش، مەیکوژن بەشکم لە ئاییندەدا سودمان پێ بگەیەنێت، یان دەیکەینە کوڕی خۆمانو ئیدی ئەوان (واتە بەنی ئیسرائیل) هەر پێیشی نەزانن و هەستی پێ نەکەن). ئینجا دڵو دەروونی دایکی موسا هەستی بە بێتاقەتیو بۆشاییەکی زۆری ژیانی دەکرد، وای لێهات خەریك بوو رازو نهێنییەکە ئاشکرا بکات، ئەگەر ئێمە دڵیمان پتەوو دامەزراو نەکردایە، تا لەو کەسانە بێت، کە باوەڕیان بە پەیمانو بەڵێنی خودا هەیە. پاشان بە خوشکەکەی موسای گوت: بڕۆ هەواڵێکی شوێنو نیشتگەو دەنگو باسی موسا بزانە.. خوشکەکەی موسا لە کەنارێکەوە چاوی بە موسا کەوت، کە ئەوان (خێڵی فیرعەون) هەستیان پێنەکرد. جا ئێمە پێشتر هەرچی دایەنو شیردەرە لە موسامان حەرام کرد، (خوشکەکەی بەمەی زانیو دانایانە لە کۆشکی فیرعەون نزیك بووەوە)و وتی: ئایا ناونیشانی ماڵێکتان پێ بڵێم، تا ئەو منداڵەتان بۆ بەخێو بکەنو، دڵسۆزو میهرەبانیش بن بۆی. بەم رەنگە موسامان بۆ لای دایکی گێڕایەوە، تاکو دڵنیاو دڵارام بێتو چاوی بە دیتنی ئاسوودە بێتو چیدی خەفەت نەخواتو لایشی ڕوون بێت، کە بەڵێنی خوا حەقو ڕاستە. بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە نازانن و هەستی پێ ناکەن)..

## گـێڕانەوەی چیـرۆکـەکە بە حــەق

چـیرۆکی دایکـی موسـا -سـلاّوی لێبێـت- تـەنها لـە دوو سـورەتدا هـاتووە، سوورەتەکانی (طه)و (قصص).. لـەم فەرمایـشتەی خـوادا ﴿ نَتْلُواْ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ ﴾ (ئێمە هەواڵی بەسەرهاتی موساو فیرعەونت بە حـەق‌و دەقی راستەقینەی خۆیت بۆ دەگێڕینەوە).

لەم فەرمایشتەی خوادا (شێوازێکی تێڕوانین لـە چـیرۆکەکەو، رێـسای مامەڵـە لەگەڵـداکردنی‌و، چـاوگی لێـوەرگرتنی)ی لـێ‌دەردێنین.. بێگومـان گێڕانـەوەی بەسەرهاتەکە (بەحەق) مانای وایە ئێمە دەبێت هەموو ئەو دیمەن‌و روداوانـەی تیـا بەدی بکەین کە وامان لێ دەکەن تەواو دڵنیابین لەوەی کە بێگومان بە واقیعی لـە چیرۆکەکەدا هاتوون‌و زادەی خەیاڵ نین، هەروەها ئەو دیمەن‌و رووداوانەی لـێ‌نەخەینە بەرچاو کە لەراستی‌و لە روودانی‌و لە واقیعێتییان دڵنیانین، چونکە پێچەوانەی ئـەو (بە حەق گێڕانەوە)و (بە حەق خوێندنەوە)یەیە کە لە ئایەتەکەدا بەمەرج گیراوە.

گێڕانەوە بە حەق مانای ئەوەش دەگەیـەنێت، کـە هـەردەم لەگـەڵ ئایەتـەکانی قورئان‌و فەرمودە ڕاسـتەکاندا بمێنینـەوە (ئەگـەر فـەرموودەی صـحیح لەسـەریان هەبوو)و تەنها بەو چەند رووداو دیمەنەی نێو بەسەرهاتەکان قایل بین‌و پەل نەهاوین بۆ قسەو باسی بێ‌بناغە، چونکە ئەوەی لە ئایەت‌و فەرموودەدا هـاتوە هـەر ئـەوە حەقە، کە هیچ شك‌و گومانێکی تێدا نییە.

گێڕانەوە بە حەق، واتە نابێت پەنا بەرینە بەر دەقـە ئیـسرائیلی‌و ئەفـسانەکان، چونکە تەواو دڵنیا نین لەوەی گوتوویانە، کە حەق بێت، هەروەك دڵنیاش نین لەوەی کە -باطل- بێت.

لەبەرئەوە بەیارمەتی خودا -إن شـاء الله- لەو دەقە بە حەق گێڕراوانە دەرناچین، کە بە حەق بەسەر پێغەمبەری خوداشدا ﷺ خوێندراونەتەوەو گێڕراونەتەوە.

## ئه‌و بارودۆخه‌ی كه‌ -موسا- ی تێدا له‌دایك بوو

فیرعه‌ون ده‌سه‌ڵاتدارێكی خۆ به‌زل زان‌و سته‌مكارو تێكده‌ر بووو، هه‌میشه توندترین‌و ناخۆشترین سزای به‌ گه‌لی (بنوئیسرائیل) ده‌گه‌یاند، كوڕه‌كانیانی به‌ منداڵی سه‌رده‌بڕی‌و كچه‌كانیشیانی به‌ زه‌لیلی‌و سه‌رشۆڕی ده‌هێشته‌وه‌.. به‌رده‌وام چاودێریی منداڵبوونی ژنه‌كانیانی ده‌كرد، ئه‌گه‌ر ژنێك كوڕی ببوایه‌ خێرا ده‌سته‌و تاقمه‌كه‌ی فیرعه‌ون لێیان ده‌سه‌ندو سه‌ریان ده‌بڕی، ئه‌گه‌ر كچیشی ببوایه‌ به‌ زیندوویی ده‌یانهێشته‌وه‌، وه‌ك خوداش له‌باره‌یانه‌وه‌ فه‌رموویه‌: ﴿... يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ القصص﴾.

.. جا وه‌ك ئه‌م ئایه‌ته‌ش بڕیاری له‌سه‌رداوه‌ فیرعه‌ون له‌ یاخی‌و به‌دكاران بووه‌و هه‌موو ره‌فتارو هه‌ڵس‌و كه‌وتێكی هه‌ر به‌دكاری‌و شێواندن بووه‌.. هه‌روه‌ها فیرعه‌ون نموونه‌ی حاكمێكی زاڵم‌و له‌ سته‌مدا رۆچوو (طاغي)یه‌.. ئه‌و له‌جیاتی ئه‌وه‌ی رۆح‌و خوێنی گه‌لی ژێرده‌سه‌ڵاتی خۆی بپارێزێت، ئه‌گه‌رچی له‌ هه‌رتیره‌و هۆزو ئاینێكیش بن‌و بیروڕاو قه‌ناعه‌تیشیان هه‌رچۆنێك‌و هه‌رچییه‌كیش بێت، كه‌چی ببوویه‌ ده‌ستدرێژكارێك بۆ سه‌ر ماڵ‌و سامانیان‌و، به‌خوێن ڕێژێك بۆ ڕشتنی خوێنیان به‌ناهه‌ق‌و، به‌ روح له‌ناوبه‌رێك كه‌ هه‌ر به‌ زوویی‌و له‌ منداڵییه‌وه‌ له‌ناوی ده‌بردن.

جا كاتێك حاكمی وڵاتێك، كه‌ ده‌سه‌ڵات‌و یاسای له‌ژێر ده‌ستدایه‌و به‌و شێوازه‌ دژی گه‌لی ژێرده‌سه‌ڵاتی خۆی ده‌جووڵێته‌وه‌، ئیدی ئه‌رك‌و به‌رپرسیارێتییه‌كانیشی پشتگوێ ده‌خات‌و ته‌نانه‌ت سیمای مرۆڤایه‌تیی خۆیشی پشتگوێ ده‌خات.

## لە نێوان خواستی خوداو، خواستی فیرعەوندا

خواست (ارادة)ی فیرعەونی زاڵمو بەدکار وابوو کە دەبێت موسا -سلاوی خودای لێبێت- بکوژێت. خواستی خوداش وابوو کە موسا بژیو لەماڵی فیرعەونیشدا بژیو هەر فیرعەون خۆیشی ئەرکی بەخێوکردنو سەرپەرشتیارێتیی ئەو منداڵە لە ئەستۆ بگرێت.

هیچ شتێکیش بەبێ خواستو ئیرادەی خودا لەئارادا نابێت!! ئەی داخۆ ئەو بەندەو مەخلووقەش کێبێت بتوانێت بەرامبەر خواستی خودا بوەستێتو پووچەڵی بکاتەوە؟! بێگومان خودا بۆ ئەنجام دانو بەدیهێنانی خواستو کاروباری خۆی بەتوانایە، بەڵام زۆربەی خەڵکی بەمە نازانن ﴿...وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ۝٢١﴾ یوسف.

ئەوا دایکی موسا خەریکە منداڵی دەبێتو لە هەمان کاتدا لە فیرعەونو سەربازەکانیشی دەترسێت، چونکە ئەگەر کوڕێکی ببێت نازی، لەبەر ئەوەی سەربازەکانی فیرعەون لێی دەسێنن تاکو بیکوژن، ئەی داخۆ ئەو کەسە کێبێت کە کوڕەکەی بۆ بپارێزێتو بتوانێت لەدژی فیرعەونو سەربازانی بوەستێت؟

خۆ ئەگەر ئەم دایکە بیەوێت کۆرپەکەی لەماڵەوە حەشاردات ئایا ژیانی بۆ مسۆگەر دەکات؟! لەڕاستیشدا ئەم منداڵە وەك کەلوپەلو کەرەسەیەکی نێو ماڵ نییە کە جووڵەو دەنگی گریانی نەیەت.. ئەمە کوڕێکەو هەر دەبێت جاروبار بگریو هاوار بکات، لەوانەشە هاوارو گریانی ببێتە هۆیەکی ڕێنیشاندەری سەربازەکانو بیدۆزنەوە.

تەنانەت گەر دایکیشی بیەوێت بەو مەترسییەی فیرعەون بیترسێنێت، ئایا ئەم کۆرپەیە لێی تێدەگاتو واز لە گریان دێنێت؟ ئەی ئایا منداڵێك کە لە چەند سەعاتێکی سەرەتای تەمەنیدایە هیچ شتێك لە ماناکانی ترسو سڵکردنەوەو

خۆپارێزی ده‌زانێت؟! ئایاو...؟! ئایاو... چه‌ندین ئایاو پرسیاری دی به‌هزری هه‌ر كه‌سێكدا له‌وانه‌ی سه‌رنج له‌م چیرۆكه‌ ده‌ده‌ن، گوزه‌ر ده‌كه‌ن.

به‌ڕاستی موسای ساوای بێده‌سه‌لات له‌ مه‌ترسییه‌كی كت وپڕی دڵته‌زێن دایه‌و، ماڵی باوكیو ئامێزی دایكیشی متمانه‌و ئاسایشی بۆ دابین ناكه‌نو، له‌م قۆناغه‌دا ناتوانن لێ دوور خه‌نه‌وه‌، ته‌نانه‌ت هیچ جێگه‌یه‌ك له‌ (میسر)دا ئه‌و مه‌ترسییه‌ی له‌سه‌ر لانابه‌نو ناتوانن لێی دوورخه‌نه‌وه‌و، ناتوانن ئارامیو ئاسایشی بۆ بڕه‌خسێنن، ته‌نها یه‌ك جێگه‌ نه‌بێت، ئه‌ویش كۆشكه‌كه‌ی فیرعه‌ونه‌.. به‌ڵام ئاخۆ كێ ده‌یگه‌یه‌نێته‌ ئه‌وێ.. بێگومان هه‌ر ئه‌و خودایه‌ی كه‌ خواستی وایه‌، هه‌ر ئه‌ویش ئامرازی گونجاوو ئاسانكارییی بۆ ده‌ڕه‌خسێنێت... مرۆڤه‌كانیش ته‌نها ئه‌و كاره‌یان له‌ ئه‌ستۆیه‌ كه‌ به‌ سروشی خودا ده‌بێت ڕایپه‌ڕێنن.

## مانای (سروشی خودا: وحی الله) بۆ دایكی موسا

خودای مه‌زن له‌ فه‌رمایشتیدا: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ..﴾ (ئێمه‌ سرووشمان نارد بۆ دایكی موسا كه‌ له‌ شیر تێری بكات)و پاشان گێڕانه‌وه‌ی ئه‌و به‌سه‌رهاته‌ش بۆ خودی موسا كاتێك گه‌وره‌ ده‌بێت له‌م فه‌رمایشته‌ی تریدا: ﴿إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ طه﴾. (كاتێك ئێمه‌ به‌ سروش ئه‌وه‌ی پێویست بوو به‌ دایكتان گه‌یاند)..

خودای مه‌زن له‌م فه‌رمایشتانه‌وه‌ ئه‌وه‌ ڕاده‌گه‌یه‌نێت كه‌ به‌شێوازی په‌روه‌ردگارێتیی مسۆگه‌ركاری خۆی موسای پاراستوه‌و مه‌ترسیی فیرعه‌ونی له‌سه‌ر لابردووه‌. به‌ڵام مانای سروشی خودا(وحی الله) بۆ دایكی موسا چی یه‌؟! بێگومان ئه‌وه‌ سروشێكی وه‌ك په‌یام ناردن نه‌بووه‌، واته‌ له‌ڕێگه‌ی (جیبریل)ی فریشته‌ وجێی متمانه‌ی خوداوه‌ نه‌بووه‌، چونكه‌ دایكی موسا پێغه‌مبه‌رو ڕه‌وانه‌كراوی خودا نه‌بوه‌،

پێغەمبەرێتیش لەنێو ژناندا دەرنەکەوتووە، بەڵکو ئەو کارە تەنها بە پیاوان سپێرراوەو قورئانیش بەڕاشکاوی ڕایگەیاندووە: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ ۚ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ النحل﴾. واتە: (ئەی پێغەمبەر، ئێمە لەپێش تۆشدا سروشمان بۆ پیاوانێك ناردووەو کردوومانن بە پێغەمبەران، جا ئەگەر (بێباوەڕانو خەڵکی دی) نازانن‌و بڕوا ناکەن با پرسیار لە شوێنکەوتوانی کتێبە ئاسمانییەکانی تری وەك (ئینجیل)و (تەورات) بکەن تاکو بزانن).

(جیبریل) فریشتەی خودا -سلاوی لێبێت- تەنها بۆ پێغەمبەرانو نێرراوانی خودا سرووشی هێناوەتە خوارەوە، جا لەبەر ئەوەی دایکی موساش پێغەمبەرێك نەبووە ئەوا سرووشەکەی خوداش بۆ ئەم ژنە لە ڕێگەی (جبریل)ەوە نەبووە. بەڵکو (والله أعلم) لەڕێگەی ئیلهامو نیگای خۆیی(فطری)یەوە بووە بەئیلهامو نیگایەکی (فیطری) خودا تێی گەیاندووە کە بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکات، واتە شیری پێبداتو لەنێو سندووقێکدا هەڵیداتە رووبارەکەوە.

نیگای (فیطری)یش بۆ مرۆڤ وەك زانایانی (زانستەکانی قورئان) دەڵێن: شێوەیەکە لە شێوە زمانەوانییەکانی سرووش).

## خودا چ سرووشێکی بۆ دایکی موسا نارد؟!

خودای گەورە فەرموویە: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ القصص﴾.

واتە: (ئێمە سروشو نیگامان بۆ دایکی موسا نارد کە تێر شیری بکاتو پێمان

راگه‌یاند ئه‌گه‌ر ترسایت له‌وه‌ی پێی بزانرێت، ئه‌وا فرێی بده‌ره‌ نێو رووباره‌که‌وه‌و مه‌ترسه‌ له‌وه‌ی تووشی كاره‌سات ببێت‌و بۆی خه‌مگین مه‌به‌، چونكه‌ ئێمه‌ بۆ لای تۆی ده‌گێڕینه‌وه‌و، له‌ ئاینده‌شدا ده‌یكه‌ین به‌ یه‌كێك له‌ پێغه‌مبه‌ران).

ئه‌م ئایه‌ته‌ له‌یه‌ك كاتدا (دوو هه‌واڵ)و (فه‌رمان به‌ دووكردار)و (قه‌ده‌غه‌كردنی دوو ره‌فتار)و (دوو مژده‌)ی به‌شێوه‌ ڕێكخستنێكی جوان‌و دانسقه‌و ڕه‌وانبێژی‌و ئیعجازه‌وه‌ پێكه‌وه‌ كۆكردوونه‌وه‌.. ئه‌ویش به‌م جۆره‌:

- ئه‌و دوو هه‌واڵه‌ له‌ ئایه‌ته‌كه‌دا: ﴿وَأَوْحَيْنَا﴾و ﴿إِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ﴾ كه‌ له‌ یه‌كه‌میاندا هه‌واڵی (موسا)و له‌ دووه‌میاندا هه‌واڵی له‌سه‌ر نیگه‌ران بوونیه‌تی.

- ئه‌و دوو كرداره‌ش كه‌ فه‌رمانی ئه‌نجام دانیانی پێ‌كردووه‌ ﴿أَرْضِعِيهِ﴾و ﴿أَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ﴾ كه‌ له‌ یه‌كه‌میاندا داوای شیرپێدانییه‌تی‌و له‌ دووه‌میشیاندا خستنه‌ نێو رووباره‌كه‌یه‌.

- ئه‌و دوو ره‌فتاره‌ش، كه‌ ئه‌نجامدانیانی لێقه‌ده‌غه‌كردوه‌ ﴿لاَ تَخَافِي﴾و ﴿لاَ تَحْزَنِي﴾ كه‌ له‌ یه‌كه‌میاندا ناهێڵێت له‌ به‌ڵاو كاره‌سات بترسێت‌و له‌ دووه‌میشیاندا ناهێڵێت خه‌مبار بێت‌و خه‌فه‌تی پێ بخوات.

- ئه‌و دوو مژده‌یه‌ش، كه‌ له‌ ئایه‌ته‌كه‌دا هاتوون ﴿رَادُّوهُ إِلَيْكِ﴾و ﴿وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾، كه‌ له‌ یه‌كه‌میاندا مزگێنی به‌ گێڕاندنه‌وه‌ی پێ‌ده‌دات‌و، له‌ دووه‌میشیاندا مژده‌ی بوون به‌ پێغه‌مبه‌ری پێ ده‌گه‌یه‌نێت.

بێگومان خودا له‌م به‌هاناوه‌ هاتنه‌ی دایكی موسادا، ته‌نها ژیانی كوڕه‌كه‌ی بۆ مسۆگه‌ر نه‌كردووه‌، به‌ڵكو ئه‌وه‌شی بۆ مسۆگه‌ر كردووه‌، كه‌ ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ لای‌و، ده‌ژی تاكو گه‌وره‌ ده‌بێت‌و، تا ده‌شبێت به‌ پێغه‌مبه‌ر.

## قسـەیەکی نەسـتەقی (أصمعي)

(أصـمعي)-عبـدالملك کـوڕی قریـب- خـاوەنی (أصـمعیات)- بـە (راویـە)و گێڕەرەوەی بەسەرهاتو سەرگوزەشتەو قسەی خۆش دادەنرێت. نـاوبراو چـەندەها شیعرو بەسەرهاتو قسەی نەسـتەقو دەگمـەنو نوکتـەی خـۆشو وتـەی زانایـانی گێڕاوەتـەوە، کـە لـە سەرانـسەری ناوچـەکانی دورگـەی عـەرەبیو لـەنێو هـۆزو تیرەکانیدا بلاوبۆتەوەو، لەزاری پیاوانو ژنانی ئەم دورگەیەوە بەسـەرهاتو قـسەی نەستەقی بیستووەو پاراستوونی.

(أصمعي) لە یەکێك لەو بەسەرهاتە خۆشـانەدا ئـەم ئاخاوتنـەی نێـوان خـۆیو کیژۆڵەیەکی دەوارنشینی عەرەب دەگێڕێتەوە، کە کاتێك خۆی لەبەردەم یەکێك لـە دەوارەکاندا گوێی لەو کیژۆڵە بچووکە بووە ئەم دوو دێڕەشیعرەی بەدەنگێکی بەرز گوتووە:

أسـتغفر الله لذنبـي كلّـه      قبّـلت انساناً بغير حِلّه

مثل الغزال ناعماً في دَلّه      فأنتسف الليل ولم أصلّه

(أصمعي) پێی گوتووە: بەڕاسـتی مـن زۆر سەرسـامم پێـت، ماشـاڵڵا چـەندە زمانپاراوو ڕەوانبێژیت!!

بەڵام کیژۆڵەکەش پێی دەڵێت: جا ئایا تۆ بلێی ئەم شـیعرانەی مـن لـە ئاست فەرمایشتەکەی خوادا هیچ ڕەوانبێژییەکی تیادابێت کە فەرموویـە: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ القصص﴾. کە هـەر لـەم ئایەتـەدا دوو هەواڵو دوو فەرمانو دوو ڕێگریو دوو مزگێنی کۆکردۆتەوە؟!! ئایـا لەئاسـت ئـەم ئایەتەدا من چ جوانکاریو ڕەوانبێژییەکم لەو شیعرەدا پیشان داوە؟![1]

---

١) تفسير القرطبـي، ١٣-٢٥٢.

## سـەرنجێك له ئایەتەکانی سورەتی ( طه ):

خودای مەزن لەو ئایەتەدا فەرموویـەتی: ﴿ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِي ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّي وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ... ﴿٣٩﴾ طه﴾.

واتە: (کاتێك ئەوەی پێویست بوو لە سروش بە دایکتمان گەیاند لەسەر ئەوەی، کە موسای کۆرپەت فڕێ بدە نێو سـندووقێکی تایبەتـەوەو پاشـان سـندووقەکەش فڕێدەرە دەریاکە، تا دەریاکەش بەرەو کەنار دەیبات‌و لەوێش دوژمنێکی من، کـە دوژمنێکی ئەویشە دەیگرێتەوە.

لەم ئایەتەدا خودا سروش‌و نیگای هەڵس‌و کەوتێك بە کۆرپەکەی دەخاتـە دڵـی دایکـی موسـاوەو ڕێگـەی چـۆنیەتی پاراسـتنیی پیـشان دەدات. بـەڵام بەراسـتی ڕێگەیەکی سەرسوڕهێنەرو، توندوتیژی‌و چاوقایمیی تێدایە.. منداڵێکی ساوا بخـەرە نێو سندوقێکی سەرگیراوەو، سندوقەکە فڕێ بدەرە نێو دەریاوەو، دەریاش بیبات بۆ کەنار..

فڕێی دەرە دەریاوە ﴿ٱقْذِفِيهِ﴾ بەراستی (قـذف)یش کارێکی قورس‌و توندتیـژە؟ کێ فڕێ دەدات؟ کـوڕێکی سـاوای تـازە لـەدایك بـووی بێدەسـەڵات‌و لاواز، کـە تەمەنی چەند سەعاتێکە، بە سندووقێکەوە فڕێی بدات، ئەمەش وەك ئەوەی پێی گوترابێت پاراستنی کوڕەکەت لەسەر تۆ نییە، بەڵکو لەسـەر خوایـە، لەبـەر ئـەوە فڕێی دەرە نێو سندووقەکەوە، واتە نەك بەهێواشی‌و بە نـەرمی بیخەیتـە نێـوی.. ئینجا سندووقەکەش فڕێبدە نێو دەریاکەوە.

هەردوو فـەرمانی (ٱقْذِفِيهِ: فـڕێی بـدە) لـەو ئایەتـەدا ﴿ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِي ٱلْيَمِّ ﴾ چەندین فێنکایی خۆش‌و چەندین ئاماژەی نیگـا بەخـشی جـوان‌و چەندەها ئاڕاستەی حەشاردراویش دەخەنە نێو زەین‌و خەیاڵەوە، کە زەین‌و هەسـتی

بینا تامی شیرینی دەچێژێت‌و هۆگری دەبێت، دیارە بەزمانی ئاخاوتن هیچ تەرجەمەو گوزارشتێکی پێ دەرنابڕێت. داوا لە خوێنەری بەڕێزیش دەکەین بەوردی سەرنج لەم ئایەتە بدات‌و هەموو ئەو سێبەری فێنکایی‌و ئاراستەو ئاماژەی نیگابەخشانەی تێدا بەدی بکات.

## موسا لەماڵی فیرعەوندا

خودا فەرموویەتی: ﴿..فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّي وَعَدُوٌّ لَّهُۥ..﴾ (٣٩) طه.

واتە: (با دەریاش بەرەو کەنار بیبات‌و با دواییش دوژمنێکی من‌و دوژمنێکی ئەو بیگرێتەوە).

هەروەها فەرموویە: ﴿فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ﴾ (القصص- ٧)، واتە: (ئینجا دارودەستەی فیرعەون هەڵیان گرتەوە).

بەراستی مرۆڤ لەم دیمەنەی نێو چیرۆکەکە سەرسام دەبێت کە خودا سزای فیرعەون لەسەر فڕوفێڵەکانی دەدات‌و لاوازی‌و بێتواناییشی پیشانی ئێمە دەدات. ئەمەش وەك ئەوەی پێی بفەرموێت: (تۆ ئەی فیرعەون، بەدوای مناڵە لەدایك بووە نێرینەکانی بەنو ئیسرائیلدا دەگەڕێیت تاکو بیانکوژیت، بەڵام خۆت بە گەڕان ماندوو مەکە، چونکە ئەوا ئێمە خۆمان یەکێك لەو مندالە نێرینانەت بۆ دەهێنین بێئەوەی بەدوایدا بگەڕێیت یان هەوڵ‌و تەقەلای دۆزینەوەی بدەیت، ئەوا مندالەکە هێنراوە بۆ لات‌و بچووك‌و بێدەسەلاتە‌و توانای بەرگریی لەخۆی نییە، جا تۆش ئەگەر دەتوانیت بیکوژە.. ئەو لەماڵی تۆدایەو لەبەردەستت دایە، تۆش توانای ئەوەت نابێت کە خراپەیەکی دەرهەق بکەیت یان ئازارێکی بدەین، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە تۆ دەبێت لە خزمەتیدا بیت‌و تەرخان دەکرێیت بۆ پەروەردەو سەرپەرشتیارێتیکردنی تاکو گەورە دەبێت‌و دەتکوژێت)

ئەم وتانە خوێندنەوەی ئەو بارودۆخە بوو کە وەك ئەوە وایە خودا بەو رەنگە بە فیرعەونی راگەیاندبێت.

کێ موسای گرتەوە؟ وەلاّم (دوژمنەکەی خوداو دوژمنەکەی موسا) واتە فیرعەون، واتە دوژمنی سەرسەختو تینوو بەخوێنی موسا، هەروەها دوژمنی خوداش.. واتە ئەو دوژمنەی کە ئیددعای هەردوو سیفەتی خوایەتیو پەروەردگارێتی (الألوهية والربوبية)ی دەکرد، کەچی سەرەڕای ئەمەش دەستەوسان بوو لە کوشتنی کوڕێکی تازە لەدایك بوو کە بە ئاسانی کەوتبووە بەردەستی خۆی.

## بێئارامیی دایکی موسا و پاشان هێوربوونەوەی

راستە خودا مژدەی ئەوەی بەدایکی دابوو کە کوڕەکەی لەژێر سەرپەرشتیو پارێزگاریی خۆیدایەو هیچ کەسێکیش ناتوانێت ئازارێکی بدات، چونکە خودا خۆی دەیپارێزێت، بەلاّم ئەم دایکە وای چاوەڕوان نەدەکرد کە دەریاکە لە کەنارەوە بۆ مالّی فیرعەونی هەلّدەگرێت. بێگومان هەموو جۆرە بیرو خەیالّو گومانو ئەندێشەیەك دلّی دایکی موسایان داگیرکردبوو، لەملاوە شەیتانیش هەولّی دەدا خورپەو وەسوەسەکانی بخاتە دلّیەوە، لەبارەی حالّەتەکەی دایکی موساوە خودا دەفەرموێت: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ القصص﴾.

واتە: (ئەوسا دوای ئەوەی دایکی موسا کۆرپەکەی هەلّدایە دەریاوە هەستی بە بۆشاییو بێئارامییەکی زۆر دەکردو خەریك بوو نهێنیی مەسەلەکەی ئاشکرا بکاتو بچێتو بلێت ئەوە مندالّی منە، ئەگەر ئێمە دلّیمان بەهێزو دامەزراو نەکردایەو وزەو ئارامیمان پێنەدایە تا لەو باوەڕدارانە بێت کە بڕوایان بە مژدەو بەلّێنی خودا هەیە).

لەم ئایەتەوە بەروونی ئەو حاڵەتەمان دێتە بەرچاو کە دڵی دایکی موسا بۆشاییی تەواوی تێکەوتووەو لەهەموو شتێك بەتاڵ بۆتەوە تەنها لە موسا نەبێت. هیچ خەیاڵو ئەندێشەیەك لەدڵی دا نەماوە تەنها چارەنووسی موساو بیرلێکردنەوەی ترسو نیگەرانی لەسەر موسا نەبێت. بەتاڵ بوونەوەی دڵی ئەم دایکە لە هەموو شتێك تەنها لە موسا نەبێت، هەر تەنیا وێنەگرتنێکی وردبینانە نییە، بەڵکو رەوانبێژییەکی رۆشنکارییشە، بگرە تەنانەت راستییەکی تێبینیکراوی دەروونیشە، هەر بۆیە کاتێك مەسەلەیەك دڵی مرۆڤ داگیر دەکات، هەر بیر لەوە دەکاتەوەو، هیچ شتێکی تر جگە لەوە لەدڵیدا نامێنێت.

دایکی موسا وای لێهات بوو خۆیشی خەتابار دەکردو گلەیی لە خۆی دەکرد: ئەرێ من چیم کرد؟ بۆچی وام لەم کوڕەم کرد؟ کێ ئەوەم بۆ دەسەلمێنێت کە ئەم کارەم بە نیگاو ئیلهامێك لەخوداوەیە؟ ئەرێ چۆن بەدەستی خۆم کوڕەکەم تەسلیمی دوژمنی خۆی (واتە فیرعەون) کرد کە هەر ئەوە دژیەتیو دەیکوژێت!! ئایا بەراستە من هێندە شێتم کە ئەم کارەم کرد؟!

﴿إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِۦ﴾ واتە خەریك بوو ئەم دایکە هەر خۆی رازو نهێنییەکەی خۆی ئاشکرا بکاتو پەردە لەسەر مەسەلەکەی لادات، خەریك بوو بچێتە دەرەوە بۆ لای خەڵکیو پێیان بڵێت: من گوناهکارم، من گوناهم دەرهەقی کوڕەکەم کردووە، ئەو منداڵە تازە لەدایك بووەی کە لای فیرعەونە ئەوە کوڕی منە، تکاتان لێ دەکەم رزگاری کەنو بۆ منی بگێڕنەوە.

خۆ ئەگەر دایکی موسا ئاوای بکردایەو ئەوەی بگوتایە، ئیدی کێبوو ئەو کەسەی بتوانێت بەرگری لە موسا بکاتو لە چنگ فیرعەونی رزگار بکات؟

خەریك بوو دایکی موسا هەواڵەکە ئاشکرا بکاتو نهێنییەکە دەرخات ئەگەر خودا هێورو دڵنیای نەکردایەو هەموو خورپەو خەیالاتو دڵەڕاوکییەکی بۆ لانەبردایەو دڵی جێگیر نەکردایە ﴿لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا﴾.

﴿ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا ﴾ دڵیمان جێگیرو دامەزراو کرد بەوەی، کە پڕمان کرد لە باوەڕو ئیمان بە خوداو، متمانە بە بەڵێنی خوداو بڕوای تەواو بە بەدیهاتنی بەڵێنەکە.

ئینجا بڕواو یەقینی بەوەش هەبوو، کە خودای پەروەردگار هەر خۆی سروش‌و نیگای ئەو کارەی پێداوەو بە سروشی خودا، منداڵەکەی هەڵداوەتە دەریاوەو، هەر خوداش حوکم‌و فەرمانی لەسەر گەیشتنی کوڕەکەی بۆ لای فیرعەون وا بووەو، پاشان هەر خوداش پارێزەری بووە لەلای فیرعەون.

خودا دڵی دایکی موسای دامەزراوو هێور کردەوە، ئەویش دڵنیابووەوەو دەروونی هێمن بووەوەو خورپەو خەیالاتیشی دامرکانەوەو، یەکێك بوو لە خاوەن باوەڕان‌و ئیمانی بەهێز بووو، بەهۆی ئەم ئیمانەوە بە بڕوای تەواوو هێمنی‌و دڵنیاییەوە چاودێری چارەنووسی موسای دەکرد.

با پێکەوە سەرنج لە وردی‌و زیندوێتی‌و کارایی وێناکردنی هونەریانەی ئەم فەرمایشتەی خودا بدەین ﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ... ﴿١٠﴾ القصص﴾. دڵی دایکی موسا تەواو بەتاڵ ببووو، هیچ شتێکی تێدا نەمابوو تەنها بیرکردنەوە لە کۆرپەکەی‌و خەریك بوو نهێنیی خۆیشی ئاشکرا بکات.

بێگومان گرتنی وێنەی دڵێك کە لە هەموو شتێك خاڵی بوویێتەوە تەنها لەیەك شت نەبێت، ئەوە لەڕاستیدا ئەو دڵە پڕ بووە لەو شتەی، کە تەنگی پێهەڵچنیوە، جا کاتێك ئایەتەکە وای دەردەبڕێت، کە خاڵی بۆتەوە، مەبەستی لەوەیە، کە پڕە. دڵی دایکەکە پڕ بووە لە گرنگیدان بە کوڕەکەی، پڕ بووە لەو نهێنییە ترسناکەی، کە بێگومان ئەو کوڕە تازە لە دایك بووەی ئێستا لەلای فیرعەونە کوڕی ئەم دایکە خۆیەتی، جا بۆ ئەوەی دایکەکە ئەم نهێنی یە ئاشکرا نەکات، خودا دڵی دایکەکەی‌و نهێنی یەکەی نێو دڵیشی بەهێزو دامەزراو کرد.

# رۆڵی ژنەکــەی فیــرعەون

خودای مەزن هەواڵی ئەوەی بە موسا گەیاند کە کاتی خۆی لە منداڵی دا لەنێو کۆشکی فیرعەون چی بەسەر هاتووەو ڕادەی ئەو خۆشەویستییەی خۆیشی بـۆ بـاس کردووەو ئەو هۆو ئامرازو بارودۆخەی کە ژیانیـشی پـێ پـارێزراوە بـۆ دەسنیـشان کردووە، وەك فەرموویەتی: ﴿...وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً ...﴾ (٣٩) طه:. واتە: لەلایەن خۆمەوە سۆزو خۆشەویستییەکم بۆ دەستەبەر کردیو ئـەو خۆشەویـستییەم خـستە دڵی کەسانی ناحەزتەوە بەرامبەر بەتۆ..

لەم دێڕەی ئایەتەکەدا وشەی هەواڵدەری (وَأَلْقَيْتُ) کە مانای ناردنو گەیانـدنو دەستەبەرکردنی خۆشەویستی یە بۆ موسا دیمەنێکی زۆر جوانی هونـەریی تێدایـەو بەمـەش خـودا دەیـەوێت قـەرەبووی ئـەو سـۆزو خۆشەویـستییەی دایکـیو ئـەو ئامێزەگەرمەیو بەخێوکردنیو سەرپەشتی کردنەی بۆ بکاتەوە کە لەدەستی دابوو، ئەوەش بەو ڕایەخە گەرمەی بۆی ڕاخرابووو بەو پێخەفە ئارامەی پیایدا دەدرا.

لـە ڕاستیـشدا ئـەو هـیچ زیـانێکی لـێ نەکـەوتبوو، چـونکە ئـەوەتا سـۆزو خۆشەویستی لە خوداوەو لەنێو ماڵەکـەی فیرعەونـدا بـۆ دەسـتەبەر کـراوەو هـەر بەوەش دادەپۆشرێتو، تا وای لێ دێت ئەم خۆشەویستی یەی خـودا لـە پێخـەفێك دەچێت کە پیێدا دەدرێت.

بەڵام جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان پێخەفەکەی دایکی کە لە کەلو پەلی دنیا دروست کراوەو کە بەرگری لە ئازاری فیرعەون پێ لێناکرێتو، لەنێوان ئەو پێخەفە دەستەبەرکراوەی خـوادا کـە لـە خۆشەویـستییەکی پوختـەکراوو پـاڵێوراوی خـۆی دروست کراوەو کە ئازارو ستەمی فیرعـەونیشی لێ دوور دەخاتەوە, بێگومان خـودا خۆی ئەرکی سەرپەرشتیو بەخێوکردنی موسای کۆرپەی ڕادەپەڕاندو بەڵێنی دابـوو کە لە ماڵی فیرعەوندا لە ئازاری فیرعەون بیپارێزێت، بەڵام چۆن؟

خودا بۆ ئەم مەبەستە ئامرازێکی هەڵبژارد کە بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا نەدەهات، ئەوەش خۆشەویستی بوو، بۆ وەدیهێنانی ئەم خۆشەویستییەش دڵێکی وای بۆ تەرخان کرد کە لە پێشبینیو بۆچونی هیچ کەسێك دا نەبوو، ئەویش دڵی ژنەکەی فیرعەون بوو، وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱمۡرَأَتُ فِرۡعَوۡنَ قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي وَلَكَۖ لَا تَقۡتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ القصص.

واتە: (هاوسەرەکەی فیرعەون نەیهێشت فیرعەون موسای منداڵ بکوژێتو گوتی: من ئومێدەوارم ببێتە مایەی خۆشحاڵی بۆ منو بۆ تۆش، جا مەیکوژن، بەڵکە لە ئایندەدا سودمان پێ بگەیەنێت، یاخود دەیکەین بە کوڕی خۆمان بەشێوەیەك کە ئەوان واتە بەنو ئیسرائیل هەر پێشی نەزانن و هەستی پێنەکەن).

ئیدی ژنەکەی فیرعەون موسای کۆرپەی خستە ژێر باڵی سۆزو خۆشەویستییەك، کە لەخوداوە خرابووە نێو دڵییەوە. هەر خودا فەرمانی بە دڵی ئەو ژنە کرد، کە موسای خۆش بوێت، هەروەها دڵیی تەرخان کرد بۆ بەرگری لێکردنی، ئەوەبوو داوای لە فیرعەونی مێردی کرد، کە نەیکوژێو پێی راگەیاند کە ئەم کۆرپە تازە لەدایك بووە جێی خۆشیو شادیی هەردووکیان دەبێت.

دیارە فیرعەونیش خێرا داوای هاوسەرەکەی پەسند کردووەو قایل بووە، هەر ئەوەی لەدەست هاتووە، کە قایلو رەزامەند بێتو داواکاریی ژنەکەی رەت نەکاتەوە.

دە توخوا تۆش ئەم حاڵەتە بخەرە بەر دیدی خۆت، بۆنمونە ئەگەر داوات لێبکرایە، کە موسا لە ستەمی دڕندانەی فیرعەون بپارێزیت لەکاتێکدا لەژێر چنگیدایەو کۆرپەیەکی بێدەسەڵاتەو ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات، فیرعەونیش سەرقاڵی تیژکردنەوەی چەقۆکەیەتی بۆ سەربڕینی، ئایا لەو حاڵەتەدا توانات هەبوو بەرگری لێبکەیت؟ ئەی ئەگەر توانای ئەوەت هەبوایە، ئایا ئەو ئامرازەت بەخەیاڵدا دەهات؟ ئایا دەتتوانی دڵی ژنەکەی فیرعەون بۆ ئەوە بخەیتە کار؟ ئایا بۆت دەکرا دڵی ئەو ژنە وا لێبکەیت، کە ئەو منداڵە ساوایەی خۆش بوێتو

بیکات بە کوڕی خۆی؟!

بێگومان هەر مرۆڤێك لە گرۆی ئادەمی لـە ئاسـت کـارێکی ئـاوادا شکـستو دەستەوسانە، بەڵام خودای پاكو دوور لە هـەموو خـەوشو لاوازییـەك هـەر خـۆی بەتواناو کردەی هەر کارو ئەرکێکە کە خوازیـاری بێـت، ئـەوەبوو ئـەم ئەرکەشـی راپەڕاند، چونکە دەسەڵاتی هیچ مرۆڤێك نەدەگەیشتە ئـەو پلەیـەی بتوانێـت دڵـی ژنەکەی فیرعـەون رابگرێـت، تەنانـەت خـودی فیرعـەونیش نـەیتوانی ئـەو دڵـەی هاوسەرەکەی بخاتە ژێر رکێفو فەرمانی خۆیـەوەو حـوکمی تیـادا بکـات، پاشـان تەنانەت خودی ژنەکەش هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر دڵی خۆیدا نەبوو.. تەنها خودای پەروەردگار خۆی دەسەڵاتو رکێفی لەسەر دڵـی ژنەکـە هـەبوو، خـودا فەرموویـە ﴿...وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ...﴿٢٤﴾ الأنفال﴾. واتە: (چـاك ئەو راستییە بزانن کە خودا زۆر بەئاسانی دەتوانێت مرۆڤ لە خواسـتو ئاواتـەکانی نێو دڵی دابڕێت، سا ئیتر بە کارەساتێك بێت یان بە مردنی کتو پڕی بێت)....

## خوشـکەکەی موسا بەدوای موسادا دەچێت

خـــودا فەرموویـــە: ﴿وَقَالَتۡ لِأُخۡتِهِۦ قُصِّيهِۖ فَبَصُرَتۡ بِهِۦ عَن جُنُبٖ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١١﴾ القصص﴾. واتە: (دایکـی موسـا بـە کـچی خـۆی، کـە خوشـکی موسایە، پێی گوت: بڕۆ بە شوێن هەواڵو ئاسەواریدا، ئەم کچەش دوای ماوەیەکی کەم لە کەنارێکییەوە بەدیی کرد لەکاتێکـدا دارودەسـتەی فیرعـەون هەسـتیان بـەم بەدواداچوونەی خوشکەکەی نەدەکرد).

لەم ئایەتەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە دایکی موسـا داوای لـە خوشـکەکەی (موسا) کـردووە شـوێن پـێو ئاسـەواری هـەڵگرێتو زۆر بـە وردیو وریاییيـەکی

هێمنانەوە چاودێریی سندووقەکە بکات کە موسای تێدایە تا بزانێت لەکوێدا دەگیرسێتەوەو چیی بەسەر دێت؟!!

دایکی موسا بەم کچەی خۆی (کە خوشکی موسایە) گوتووە: (قصیه) واتە بەدوای حەرەکەتو بزاوتو ئاسەواری کۆتاییدا بچۆو چاودێریی رۆشنی بکە.

خوشکە داناو ژیرەکەشی داواکاریی دایکی خۆی بەدانایی‌و وریاییەوە جێبەجێ دەکات، ئەوەبوو بەوردی چاودێریی هێڵی رۆشتنی سندووقەکەی بەدەریادا دەکرد. دیارە دوایین وێستگەی گیرسانەوەی سندووقەکەش (کە لەبەردەم کۆشکی فیرعەوندا بووە) ترساندوویەتی‌و، هەروەها بەوەش ترساوە کاتێك خزمەتگوزارانی کۆشکەکە سندووقەکە هەڵدەگرنەوە..

لێرەدا ئەوەی بەلامانەوە گرنگ بێت، کە ئاماژەی بۆ بکەین، وریایی‌و زیرەکیی خوشکەکەی موسایە، وەك ئایەتەکەش گوزارشتی لێ کردووە ﴿فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾. بە مانای (ئەم کچەش دوای تاوێك لەکەنارێکەوە بەدیی کرد، کە تاقمەکەی فیرعەون هەستیان پێ‌ی نەدەکرد)..

بەڕاستی ئەم خۆ پەنادانە وریاییەکی شارەزایانەو زیرەکانەیە، کە توانیویەتی بە کارامەیی‌و عاقڵانە هەڵس‌و کەوت بکات‌و بەچاکییش هونەری خۆ حەشاردان‌و چاودێریی کردنی هێمنانە بنوێنێت. ئەم خوشکەی (موسا) لەدوورەوە چاودێریی سندووقەکەی دەکرد، بێ‌ئەوەی سەرنجی خەڵکی دەوروبەر بەلای خۆیدا راکێشێت، ئەو، کەسانی تریشی دەبینی، بەڵام خۆی وا دەردەخست، کە گوایە خەیاڵی لەلای هیچ شتێکی تایبەتی نییەو، وەك تەنها رێبوارێکی گوزەرکاری سەر رێگەکەیە، هەر بۆیەش کەسێك ئەوەی بە خەیاڵدا نەدەهات، کە ئەم کیژە کەسێکی زۆر نزیکی ئەو منداڵەیە.

## لێوی موساو مەمکی ژنانی شیردەر

خودا بەڵێنی بە دایکی موسا دابوو کەوا کوڕەکەی بۆ دەگەڕێنێتەوە.. بێگومان بەڵێنی خوداش راستو بەدیهاتووە.. ئەوەبوو خودا کوڕەکەی بە شێوازێکی وەها دەگمەنو بێوێنە بۆ گەڕاندەوە، کە بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا نەدەهات. لەم رووەوە خودا فەرموویە: ﴿...وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ ﴿١٢﴾ القصص﴾. واتە: (ئێمە هەموو دایەنو شیردەرێکمان لێ حەرام کرد).

لەم فەرمایشتەدا مانای حەرام کردن (تحريم) ئەو قەدەغەکردنەیە، کە (نەویستن) بەدی دێنێت، واتە فەرمانمان بەم منداڵە شیرەخۆرەیە کرد، کە مەمکی هیچ ئافرەتێکی شیردەر نەگرێتە دەم، ئەویش فەرمانەکەمانی جێبەجێکردو شیری هیچ ژنێکی نەویست.

ئەم ئامرازە خوداییەش لە گرنگترینو سەرسوڕهێنەرترین کاری رێكوپێکی خوداو تەقدیراتیەتی، چونکە موسا منداڵێکی شیرەخۆر بووەو هێشتا لە چەند رۆژێکی کەمی تەمەنیدا بووە، بگرە لەوانەیە لە چەند سەعاتێکی سەرەتای تەمەنیدا بووبێتو منداڵی شیرەخۆرەش لەم تەمەنەدا جیاوازی لەنێوان ئافرەتێكو ئافرەتێکی دیو، لە نێوان مەمکێكو مەمکێکی تری شیردەردا ناکات، هەر بۆیەش هیچ توانایەکی هەڵبژاردنو جیاکردنەوەی بۆ دروست نابێت. بەڵام خودا بەشێوازێکی ئیعجازی بێوێنە ئەو توانای جیاکردنەوەیە لە موسای کۆرپەی شیرەخۆردا (وەك هەموو موعجیزەکانی تری، کاتی لەدایك بوونیو پاراستنیو سەرپەرشتی کردنی) پەیدا دەکات.

بێگومان ئەم کۆرپەیەش برسی بووەو، کۆرپەی شیرەخۆریش لەکاتی برسیەتیدا هەموو مەمکێك دەگرێتە دەمو، هەر شیرێك هەبێت دەیخوات. هەر بۆیەش چەندەها ئافرەتی شیردەر لەلای فیرعەون خۆیان بۆ ئەم کۆرپەیە تەرخان دەکەن تاکو

لە شیریان بخوات، هەریەکە لەوان مەمکی خۆی دەخاتە سەر دەمی، بەڵام موسای کۆرپەی شیرەخۆر هەموویان رەت دەکاتەوەو قایل نابێت بە مەمکی هیچ ئافرەتێك، چونکە دوای ئەوەی بۆنی هەر مەمکێکیان دەکاتو لە روخساری خاوەن مەمکەکە ورد دەبێتەوە بۆنی مەمکی دایکی خۆی لێ نایەتو ئافرەتەکانیش بۆنی دایکی خۆی لێ نایەت..

﴿...وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ ﴿١٢﴾ القصص﴾وەك ئەوەیە کە خودا فەرمانی بە هەردوو لێوی ئەم منداڵە کردووە، کە هیچ مەمکێك قبوڵ نەکەنو لەهیچ شیرێکیان نەخۆن.. ئەو دوو لێوەش فەرمانی خودایان بەجێهێناو هیچ رێگەیەکیان جگە لە بەجێهێنانی ئەو فەرمانە لەبەردەم دا نەبوو.ئەوکەسانەی لەوێ ئامادەبوون بە فیرعەونو تاقمەکەیو ئافرەتەکانی یەوە هەموویان کەوتبوونە حاڵەتێکی بێئارامیو سەرسوڕمانو سەرسامییەوەو، واقیان وڕمابوو لەم حاڵەتەی کە بۆ یەکەم جارە دەیبینن، منداڵێکی شیرەخۆرە لە برساندا دەگری، کەچی سەرەڕای ئەوەش مەمکەکانو شیرەکە ڕەت دەکاتەوە، وەك ئەوەی بە تەمای مەمکێکی تایبەتی ئافرەتێکی تەرخانکراو بێت، تاکو شیرێکی تایبەتی پێبدات.

هەروەها ئامادەبوانی نێو کۆشکەکەش دڵەڕاوکێو نیگەرانیان لەسەر ئەوە بوو، کە ترسی نەمانو مردنیان لێ ی هەبوو، ئەگەر لەسەر ئەم رەت کردنەوەو شیرنەخواردنە بەردەوام بێت. ئەوان دەیانەوێت ئەم کۆرپەیە بژیو بە هەموو شێوەیەك ئامادەبوون، کە هەرچی لە هەوڵو توانایان دایە بۆی بخەنە گەڕ، تاکو لە ژیاندا بیهێڵنەوە.

کەوابوو ئێستا کێن ئەوانەی پەرۆشن بۆ ژیانیو لە پەلەقاژەی رزگارکردنی دان؟ ئەوان ئەو کەسانەبوون، کە (ژیانی موسا) لەبەردەستیان لە مەترسیدا دەبوو، گەر بیانزانیایە داهاتوویان چۆن دەبێت..!! ئەمان ئەو کەسانەن کە وامان لێ چاوەڕوان کردوون ئەم کۆرپەیە بکوژن، چونکە لە نێرینەکانی (بنو اسرائیل)ە، کەچی ئەم

دوژمنانە بە تەگبیری خوداو بە قەدەری خودا وایان لیّ هات پەرۆش بن بۆ ژیـانیو پەلەقاژە بکەن بۆ رزگارکردنی.. ئای چەند جوانو بەجییە تەگبیرو قەدەری خـودا.. چەند گەورەیە پەروەردگار.. ئێمەش هەر ئیمانمان بەو خودایە هێناوە.

## حیکمـەت لە نەخـواردنی شـیری دایەنەکـاندا

گەر لەئاست ئەم تەگبیرو کارە ڕێكو پێکە دانایانەی خوادا هەڵوێستە بکەینو، هەوڵی زانینی هەندێك حیکمەت لەکاری نەخواردنی شیری دایەنەکاندا بدەین، ئەوا لەم رووەوە چەند حیکمەتێك دەردێنین:-

١- بێگومان ئەم شیر نەخواردنەی (موسا) کـارێکی پلانـی خـودایی بـووە، تـاکو بگەڕێتەوە بۆ لای دایکی.

٢- ئەگەر موسا شیری هەر دایەنێکی لە کۆشکی فیرعەونـدا بخواردایـە، ئـەوا لـە سۆزو ئامێزی گەرمو باش بەخێوکردنی دایکی بێبەش دەبـوو. وەك ئاشکراشـە دایکی منداڵ هەر خۆی سوورترو بەپەرۆشترە بۆ منداڵەکـەی، تەنانـەت ئەگـەر دایەنی شیردەر هەرچەندێکیش بۆی دڵسۆز بێت.

٣- ئەگەر پێشتر (بەر لەوەی موسـای منـداڵ مـەمکی دایەنـەکانی دی نـەگرێت) دایکی خۆی بچوایە بۆ ئەو شوێنەو، وەك دایەنێك خۆی بۆ تەرخان کردایە، ئەوا بە تاوانبار دادەنراو چەندین گومانی لیّ دەکراو پەیوەندیی راستەقینەشـی بـەو منداڵەوە دەزانرا، چونکە هەڵپەو جـۆشو خرۆشـی دایـك بـۆ منداڵەکـەی لـە چـاودێرێکی بینـاو چـاوتیژ ناشـارڕێتەوە، ئەمـەش لـە خۆشویـستنی زۆریو چۆنیەتی لەباوەش کردنو هەڵگرتنیو، شیر پێدانیدا دەردەکەوێت.

٤- ئەم شیرنەخواردنەی موساو (ڕەتکردنەوەی مەمکی هـەموو دایەنـەکانی) ئـەو هۆکارەیە، کە خودا پیلانی فیرعەونو گەلەکەی پێ پووچـەڵ کردۆتـەوەو سـەری لیّ تێکداون، ئەمەش بەو ڕەنگەی وای لیّ کـردن خۆیـان بەوپـەڕی سـووربوونو

بایەخەوە بەدوای هەر دایەنێکدا بگەڕێن، تا موسا مەمکی یەکێکیان پەسند دەکات. ئیدی لەو ساتەشدا هیچ گومانێك لە دایکی ناکرێت، کاتێك مەمکی دایکی دەگرێتە دەم‌و ڕەتی ناکاتەوەو، ئەوانیش بیر لە چۆنیەتی پەیوەندی نێوان منداڵەکەو ژنە شیرپێدەرەکەی ناکەنەوەو هەر ناشپرسن، کە ئاخۆ دایکیەتی، یان نا؟.. وەك ئەوەی خودا بە فیرعەونی ڕاگەیاندبێت، کە (تۆ دەتەوێت منالە شیرەخۆرەکە لەباوەشی دایکی دەربێنیت‌و ئێمەش دەمانەوێت، کە تۆ خۆت‌و کۆمەڵەکەشت بیگەڕێننەوە بۆ باوەشی دایکی‌و، هەر دایکیشی بکەن بە دایەنێکی‌و لەسەر حسابی خۆتان ڕایگرن‌و کرێی خۆی لەهەمبەر شیرپێدانیدا پێ‌بدەن.. ئیدی هیچ شتێکی تر لە ئارادا نابێت، تەنها خواستی ئێمە نەبێت، ئێوەش تەنها خواست‌و ئیرادەی ئێمە جێ‌بەجێ دەکەن.

## خودا موسا بۆ لای دایکی دەگەڕێنێتەوە

خوشکەکەی موسا لە کاتێکی گونجاودا خۆی گەیاندە لای تاقمەکەی فیرعەون‌و ئامادەیی خۆی بۆ هەر کارو خزمەتگوزارییەك دەربڕی، چونکە ئەوانیش زۆر سووربوون لەسەر هێشتنەوەی ئەو منداڵە بەهەر ئامرازێك بێت، دەبوایە ژیانی رزگارکەن‌و، هەر وتەو ڕاوێژێکیش لە هەرکەسێکەوە بێت وەریگرن‌و کاری پێ‌بکەن.

لەو کاتە گونجاوو دەرفەتە ڕەخساوەدا خوشکەکەی موسا خۆی لە مەسەلەکە هەڵقورتاندو، بەشێوەیەکی وەها لەباریش چووە پێشەوە، کە هیچ گومانێکی لێنەکرێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر وریایی‌و بێداریی خۆی‌و، لەسەر بەهرەو سەلیقەو جوانیی پلان دانان‌و، زیرەکی‌و راستیی تێفکرین‌و تێڕوانینی. ئەوەبوو پێی گوتن: ﴿... هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ القصص﴾. واتە: (ئایا ناونیشانی ماڵ‌و خانەوادەیەکتان پیشان دەم، کە دەتوانن ئەم منداڵەتان بەچاکی بۆ پەروەردە بکەن‌و دڵسۆزو خەمخۆریشی بن؟!)

جا لەم ئایەتەدا لە وتەی ئەم کیژە (خوشکی موسا) ورد بەرەوە: ﴿هَلْ أَدُلُّكُمْ﴾ (ئایا پیشانتان بدەمو پێتان بڵێم)، ئەو بەم پرسیارکردنەی کە دەلالەت لەهاندانو هەڵنان دەکاتو بە درکاندنێکی پڕ سۆزو میهرەبانیشەوە ڕاوێژیان دەخاتە بەرچاو، لەکاتێکدا ئەوان لەبەرامبەر ئەم جۆرە پرسیارو پرسو رایە هیچ وەڵامێکی تریان جگە لە ئەرێکردنو بەڵێ گوتن بەدەستەوە نییە. جا داخۆ ئەم کیژە چییان پیشان دەداتو بۆ کوێ رێنوێنییان دەکات؟!

بێگومان بۆ لای دانیشتوانی ماڵێك کە ئەرکی بەخێوکردنی ئەو منداڵە شیرەخۆرە هەڵگیراوەیەی سەرکەناری دەریایان بۆ بە ئەستۆ دەنێن، واتە بۆ بنەماڵەی فیرعەونی بەخێو دەکەن﴿يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ﴾.

هەم دیسان هەر ئەو ماڵەی کە ئامادەن بەخێوی بکەن دەتوانن زۆر بەچاکی پەروەردەو سەرپەرشتی بکەنو زۆر سوورو پەرۆشن لەسەر بایەخ پێدانیو دڵسۆزی بۆی. دڵسۆزیش لە مانای ﴿وَهُمْ لَهُۥ نَـٰصِحُونَ﴾ەوە بەدی دەکرێتو راڤەی ماناکەشی دەکرێت، چونکە (اخلاص) لە (نصح)ەوە بۆ شیرەخۆرەکە(الرضیع) هەر بەمانای سووربونو دڵسۆزیو بایەخ دان دێت.

ئینجا بنەماڵەو خانەوادەی فیرعەون بەم راوێژەی ئەو کیژە رازی بوون، تەنانەت هیچ کەسێکیشیان گومانیان لە شێوازی دڵسۆزیی ڕادەربڕینەکەیو لە ڕادەی پیشاندانی ئارەزوشی بۆ یارمەتیدانیان نەدەکرد. بەبیروخەیاڵی هیچ کەسێکیشیاندا ئەو بۆچوونە ڕەت نەبوو کە گوایە ئەمە خوشکی موسا بێت. پاشان هیچ کەسێك لەوان لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئەم منداڵە شیرەخۆرەیە دەگەڕێتەوە بۆ نێو باوەشی دایکی خۆی.

بەم ڕەنگە خودا موسای بۆ لای دایکی گەڕاندەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿فَرَدَدْنَـٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَـٰكِنَّ

أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ القصص﴾. واتە: (بەم ڕەنگە گێڕامانەوە بۆ لای دایکی، تا دایکی دڵنیاو ئاسوودە بێتو چاوی بەدیتنی ڕوون بێتەوەو چیدی خەمبارو دڵتەنگ نەبێتو، بەچاکییش بۆی روون بێتەوە کە بەڵێنی خودا هەقەو ڕاستەو هەر بەدیی دێت، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستییە نازانن‌و هەستی پێ‌ناکەن).

لە دەستەواژەی ﴿فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ﴾دا ئەوەی لێ تێدەگەین کەوا خودا موسای بۆ لای دایکی گەڕاندۆتەوە چونکە هەر دایکی لەپێشترو شایان ترە بۆی‌و هەر ئەویش شایستەی لەئامێزگرتنی‌و بەخێوکردنێتی.

خودا بەم گەڕاندنەوەیەی کۆرپەکە بۆ لای دایکەکە ڕاستیی بەڵێنی پێشووی بۆ دەسەلێنێت کە پێی فەرمووە: ﴿إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ ﴿٧﴾ القصص﴾ ئێمە هەر بۆ لای تۆی دەگەڕێنینەوە.

خودا بۆیە گەڕاندییەوە بۆ لای تاکو چاوی پێ روون بێتەوەو دڵشاد بێتو لە ئامێزی بگرێتەوەو شیری خۆی پێ بدات.. خودا بۆیەش گەڕانییەوە بۆ لای تاکو چیدی خەفەت بۆ دیارنەمان‌و ون بوونی نەخواتو لە شەوق‌و پەرۆشیدا خۆی بۆ لەنێو نەبات.. خودا ئەم نیعمەتو میهرەبانیانەی خۆی بەیادی موساش هێناوەتەوە کاتێك گەورەبووەو ئەرکی پێغەمبەرێتیی پێگەیاندووەو داوای لێکردووە بچێت بۆ لای فیرعەون‌و پەیامی خودای تێبگەیەنێت.. وەك پێی دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ...﴿٤٠﴾ طه﴾. واتە: (ئەی موسا ئەوەشت لەیاد بێت کە کاتێك خوشکەکەت بەدوات دا هاتبوو بە دانیشتوانی نێو کۆشکی فیرعەونی گوت: ئایا دایەنێکی واتان پیشان دەم کە بتوانێت بەخێوی بکات؟ ئەوانیش بەوە قایل بوون‌و بەم ڕەنگە تۆمان بۆ لای دایکت گەڕاندەوە تاکو بەدیتنت دڵشاد بێتو خەفەت نەخوات).

# دایکی موسا لەسەر حسابی فیرعەون

# شیر بە کوڕەکەی دەدات

خانەوادەی فیرعەون تێکڕا هەموویان دڵخۆش بوون بەوەی کە منداڵە شیرەخۆرەکە مەمکی ئەم ژنەی گرتە دەم (کە دایکی بووو ئەوانیش نەیاندەناسی)، بەم شێوەیە ژیانی رزگار کراو هیچ کەسێکیش بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئاخۆ ئەمە دایکی بێت!!

ئینجا فیرعەون بە رەسمی دایکی (موسا)ی دامەزراند بە دایەنو شیردەرو بەخێوکەرو هەڵسوڕێنەری کاروباریو بایەخ پێدەری گشت ئەركو فەرمانێکی. لە بەرامبەر ئەم کارەشدا فیرعەون کرێی بۆ دانا.

بەراستی ئەمەش لە کارە سەرسوڕهێنەرەکانی خودای پەروەردگارن، چونکە ئەگەر موسا لەلای دایکی بمایەتەوە، دایکی نەیدەتوانی بیپارێزت، بەڵکو لەبەردەم مەترسی لەناوبردن دابوو، هەروەها ئەگەر موسا لەماڵی فیرعەوندا شیری دایەنێکی تری بخواردایە، ئەوا لە سۆزو عەتفو بەزەیی دایکی بێبەش دەبوو، دایکیشی هەستو سۆزی خۆی بۆ رانەدەگیراو دڵنیاو ئاسوودەش نەدەبوو لەو کوڕەی.

خودا خواستی خۆی بۆ موسا ئەوەبوو لە پیلانی فیرعەون رزگار ببێت، هەروەها خودا خواستی لەوەش بوو کە سندووقەکە (موسا) بەرەو کۆشکی فیرعەون ببات، پاشان خوازیاری ئەوەش بوو کە دڵی ژنەکەی فیرعەونی بۆ نەرم ببێتو خۆشی بوێت، ئیرادەشی لەسەر ئەوەبوو مەمکی هیچ دایەنێکی دی لە ماڵی فیرعەوندا نەگرێتە دەم.

خواست(ئیرادە)ێکی دیکەی خودا ئەوەبوو بگەڕێنرێتەوە بۆ لای دایکیو لەنێوان ماڵی دایکیو کۆشکی فیرعەوندا هاتو چۆی پێ بکرێت. ئیرادەشی وابوو هیچ

کەسێك لەسەربازانو خزمەتکارانی فیرعەون گومـان نەکـەن لـەوەی کـە ئـەم ژنـە دایکییەتی.

ئینجا ئیرادەیەکی تری خـودا ئـەوەبوو دایکـی خـۆی لەسـەر حـساب‌و دارایـی فیرعـەون کاری شیر پێدانو لەباوەش گرتنو خزمەتکردنی ئەنجام بـداتو، لـەپارەی خودی فیرعـەونیش کرێی خۆی وەربگرێت.. ئەم هەموو خواستو ئیرادەیـەی خـودا لەم کاروبارانەدا بۆ هەڵوەشـاندنەوەو پەکخـستنی خواسـتی فیرعـەون بـووەو، بـۆ پووچەڵکردنەوەی پیلانو سـتەمی فیرعـەون بـووە.. جـا ئـیتر ئـەنجامی کاروبـاری خوازراوی خودا لەکوێو، ئەنجامی کاری خوازراوی فیرعـەون لـەکوێ؟! کێیـە ئـەو کەسەی بتوانێت خواستی خودا ڕاگرێت؟! بێگومان هیچ شـتێکیش بـەبێ خواسـتی خودا لەئارادا نابێت.. جا قوڕ بەسەر فیرعەونو قوڕ بەسەر هـەر (خـۆ بەفیرعـەون دانەرێکیش) کە لەسەر شێوازی فیرعەون هەڵس وکەوت دەکاتو، کە لە راستیشدا زۆر بچووكو لاوازە لەبەردەم خواستی خودای گەورەدا.

ئەم حاڵەتەی دایکی موساش، کە (لەسـەر حـساب‌و کـرێی دارایـی فیرعـەون شیری بە کوڕەکەی داوە)، بووە بە پەندێك بۆ هەرکەسێك، کە کاری چـاکە بکـاتو ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، پاشان کرێو هەقی خۆیشی لەسەر وەربگرێـت.. لـەم بارەیەوە فەرمودەیەکی پێغەمبەری خودا ﷺ هەیە، کە (ابوداود) لە (جبیری کوڕی نفیر)و ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوێتییەوە، کە فەرموویـەتی: **((مثـل الّذین یغزون من أمتي ویأخذون الجُعل، ویتقوّون به علی عدوهم، مثل أم موسـی ترضع ولدها وتأخذ أجرتها))**[1]. واتە: (نموونەی ئەو موجاهیدانەی کە لە نەتەوەی

---

١) سیوطی لـە کتـێبی (الجـامع الـصغیر)دا هێمـای راسـتی (صـحة)ی خـستۆتە سـەر ئـەم فەرموودەیەو بە (مرسل)ی داناوە، چـونکە کەسـێکی وەك (جوبـەیری کـوڕی نوفـەیر) بـە پێغەمبەرﷺ نەگەیشتووەو لەسەردەمی ئەودا نەبووە، یان (نەیـدیوە). بـەم چەشـنەش نـاوی هاوەڵی لەسەر لابردووە. بەڵام (المناوی) لە کتێبی (فیض القدیر)دا وای باس کردوە کە (جبیر کوڕی نفیر) لە (خالیـد کـوڕی وەلیـد)و (عیبـادە کـوڕی صـامیت)ەوە ئـەم فەرموودەیـەی

منن‌و بۆ جیهاد دەچن‌و دەسکەوت‌و پاداشتێکی دنیاییشی لەسەر وەردەگرن‌و بەهۆیەوە خۆیان لەسەر دوژمن پێ بەهێز دەکەن، وەك نموونەی دایکەکەی موسایە کە هەرچەندە شیری بەکورەکەی خۆی دەدا پاداشت‌و کرێشی لەسەر وەردەگرت).

## حیکمەت لەو گەشتە سەرسوڕهێنەرەی موسادا

لەوانەیە هەندێك كەس هەڵوێستە لە ئاست ئەم بەسەرهاتەدا بکەن‌و پرسیاریش دەربارەی حیکمەتی ئەم گەشتە ئالۆزەی موسا -سلاوی لێبێت- بکەن کە لەکاتێکدا موسا لای دایکی دەبێت‌و، خوداش لە فێڵ‌و تەڵەکەو ستەمی فیرعەون دەیپارێزێت، ئیدی بۆچی ئاوی دەریا بۆ ماڵی فیرعەونی ببات‌و، پاشان فیرعەونیش بیگەڕێنێتەوە بۆ لای دایکی..؟!!

بەراستی لەم کاری قەدەری پڕ لە حیکمەتی ئیلاهییەو لەم موعجیزەی هەڵسوڕاندنی کاروبارە پەروەردگارێتییەدا چەندەها حیکمەت‌و پەندو دانایی هەیە کە لێرەدا هەندێکیان دیاری دەکەین.

١- بێگومان خودا لەمەدا دەیەوێت فڕوفێڵی ستەمکارانەی فیرعەون لەنێو ببات‌و، ئەوەش بۆ خەڵکی روون کاتەوە، کە چۆن خواستی فیرعەون لەبەرامبەر خواستی خوادا پەکی دەکەوێت.

٢- بێگومان خودا لەمەداو لەرێی ئەم گەشتەوە دەیەوێت چەندین وانەو پەندو رێنمایی باوەڕدارێتی بخاتە بەرچاوی باوەڕداران، کە دەربارەی توانا و تەگبیری

---

وەرگرتووە. ئەمەش وای دەردەخات کە (مناوی) رایەڵی هاوەڵدارێتیەکەی بۆ دەگەیەنێتەوەو پلەی (ارسال)ی فەرموودەکەش لادەبات. بەم پێیە دەبێت (صحیح) بێت. پاشان (مناوی) گوتوویەتی: (ابن العربی لە فەرموودەیەکی لای معاذەوە گێڕاوێتییەوەو حافظی عێراقیش لەبارەی ئەم گێڕانەوەیەوە گوتویەتی: (اسنادێکی رێك‌و متنێکی نەزانراوی هەیە).
بڕوانە (فیض القدیر، شرح الجامع الصغیر) بەرگی پێنجەم، لاپەڕە (٥١١).

خــودانو، دەربــارەی بەجێگەیانــدنی خواســتو ئــیرادەو بــەدیهێنانی ویــستو بڕیارێتیو پاشان دەربارەی لاوازیو بێتوانایی ئەو کەسانەشە کە دژایەتی خــودا دەکــەنو شــەڕ لەگــەڵ بــاوەڕداران دەکــەنو پیاوچــاکان ئــازار دەدەنو، ئینجــا دەربارەی پارێزگاری خودا بۆ بەندە چــاكو ســاڵحەکانیو هەڵــسوڕاندنی ڕەوتــی کاروباریش بۆ بەدیهێنانی ئەو پارێزگارێتییە.

٣- بێگومان خودا دەیەوێت ئامڕازی لەبارو سەرکەوتوو بــۆ پاراســتنی موســا لــە زوڵمو فڕوفێڵی فیرعەون دابین بکاتو، دەیەوێت موسا لەئامێزی دایکی خۆیــدا بژیو لە مەمکی دایکی شیر بخواتو تەنانــەت بەوپــەڕی هــێمنیو ئارامییــەوە شیری دایکی بخواتو لەسەر حیسابو ئــەرکی داراییــی فیرعــەونیش شــیرەکەی دایکی پێبدرێت.

٤- بێگومان خودا دەیەوێت چەندین نموونە لە کەسانی چاكو خێرخوازی نێو خودی ماڵەکەی فیرعەونمان بۆ دەرخات، یــەکێك لــەو کەســە چــاكو بــە ئەمەکانــەش ژنەکەی فیرعەونە کە موسای کۆرپــەی خۆشویــستو بــەرگریی لێکــرد. دیــارە ماڵی خراپکارو بێباوەڕ لەکەسانی چاكو خێرخواز خــاڵی نییــەو نموونــەی ئــەم جۆرە مافپەروەرانەی هەر تێدا هەڵدەکەوێت.

٥- بێگومان خــودا دەیــەوێت هەنــدێك چــاکە لەگــەڵ موســادا بکــاتو هەنــدێك نیعمــەتو بەخشــشی خــۆییو، سەرپەرشــتیکردنی پێنیــشان داتو چــەند موعجیزەیەکیشی لە ژیانیدا بۆ بەدی بهێنێت.

٦- بێگومان خودا دەیەوێت چەند سەربازێکی نادیاری خۆیمان پیشان بدات کە لــەم گەشتەدا دەرکەوتوون.

ئەمانەی پێشوو هەندێك لەو حیکمەتانە بوون کە لەم کــارە جــوان ڕێکخــراوەی خوادا بەدیمان کردووەو کە لەو گەشتە سەرســوڕهێنە ئــاڵۆزەدا ڕەنــگ دەدەنــەوەو، خوداش هەر خۆی زانایە بە حیکمەتەکان.. واللە أعلم..

## هەندێك سـەربـازی خودا لەم گەشـتەدا

قورئـانی پـیرۆز هەنـدێك سـەربازی نادیـاریی خـودای پێناسـاندووین کـه لـه پاراستنی موساو له گەڕاندەوەشیدا بۆ لای دایکی ڕۆڵی خۆیان گێڕاوه، وەك:

١- ئەو سندووقەی موسای تیا دانرا.

٢- ئەو دەریایەی سندووقەکەی هەڵگرت.

٣- دڵی ئەو ژنەی هاوسەری فیرعەون که بۆ موسا نەرم بووو پڕبـوو لـه سـۆزو خۆشەویستیش بۆی.

٤- هەردوو لێوی موسا خۆی، که قایل نەبوون به گرتنی هـیچ مـەمکێك، تـا ئەو کاتەی دایکی دێتو موسا دەچێتەوه ئامێزی.

خودای مەزن له به سەربازکردن (تجنید)ی ئـەم شـته نادیارانـەدا ئـەو بەڵگەیـه دەخاته ڕوو که بێگومان خودا هەموو سەربازێکی له ئاسمانـەکانو زەویـدا هەیـەو هەر خودای پاكو بێخەوش خۆیشی بەخواستو ئارەزووی ئیلاهیانـەی خـۆی هـەر شتو کەرەسەو کەسـێك دەخاتـه گـەڕ بـۆ هـەر شـتو کەرەسـەو کەسـێك، وەك فەرمووشیەتی: ﴿...وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ...﴾ (٣١) المدثر. واته: (هیچ کەسـێك له ژمارەو ماهیەتو دەسەڵاتی سەربازانی خودای پەروەردگارت ئاگادارو زانا نییه تەنها زاتی خودا خۆی نەبێت).

بەسەربازکردنو بەگەڕخستنی ئـەو چـوار جـۆره سـەربازەش کـه نـه عـەقڵو هوشـیاریو زانـینو خواسـتیان هـەبووه (وەك لـه ڕواڵـەتی مەسـەلەکەوه دیـاره) وەڵامێکی کاریگەره بـۆ ئـەو مەتریالیـستو ماددەپەرسـتانەی کـه نکـووڵی لـه ڕاستییەکانی پشت مـادده دەکـەنو دان بـه هـیچ سـیفەتێکی عەقڵـدارێتی، یـان گیاندارێتی، یان هوشیاریی، یان ئیدراکی مەخلوقاتی تری غەیری ئینسان دانانێن.

ئەو ماددەپەرستانە ئەوە بە هۆش‌و عەقڵیاندا ناچێت کە دوو لێوی منداڵێکی شیرەخۆرە لە رۆژانی سەرەتای تەمەنیدا توانای جیاکردنەوەو هەڵبژاردنی هەبێت‌و بتوانێت هەرچی مەمك‌و شیری ئافرەتانی شیردەرە رەت کاتەوەو تەنها سور بێت لەسەر مەمکێکی تایبەتی کە مەمکی دایکی خۆیەتی.

بێگومان ئەم مەسەلەیە لە رواڵەتی خۆیدا سەیرو نامۆیە، بەڵام خۆ عەقڵی مرۆڤی خاوەن باوەڕو هوشیارو بەرچاورۆشن ئەمە بە کۆسپێکی لەناکاوی خۆی نابینێت، چونکە ئەمە لە بازنەی مەسەلە ماقووڵەکاندایە کە خودا خۆی خواستی لەسەر ئەوە بووە، خودا خۆی فەرمانی بە دوو لێوی ئەو کۆرپەیە کردووە کە هیچ مەمکێك نەگرێتە دەم‌و، هەموو دایەنەکانیشی لێحەرام کردبوو.

هەروەها عەقڵی مرۆڤی باوەڕدار تەسلیم بەو ڕاستییە دەبێت کە بێگومان ئیرادەی خودا ڕاپەڕێنراوەو، خوداش کردەو بکەری هەر شتێکە کە بیەوێت، هەموو دروستکراوو مەخلوقاتێکی نێو گەردوونیش ڕاپەڕێنەری فەرمانەکانی خوداو بەجێهێنەری خواست‌و ئیرادەی خودان.

## دایکی موسا دوای ئەمە چی بەسەر دێت؟

قورئان لەم قۆناغەی ژیانی دایکی موسادا وەستاوەو هیچ شتێکی تری دوای ئەمە باس نەکردووە، بۆیە ئێمەش نازانین دوای ئەمە چیی بەسەر هاتووە؟ هەموو ئەوەی کە لەسەر دایکی موسا لەرێی ئەم چیرۆکەی قورئانەوە بیزانین ئەوەیە ژنێکە لە هۆزی (بەنو ئیسرائیل)و هاوسەری پیاوێکی ئەو هۆزەشە کە ناوی (عیمران)ەو ئافرەتێکی ساڵح‌و باوەڕدار بووەو، خوداش نیگاو ئیلهامی شێوازێکی سەرکەوتوانەی بۆ پاراستن‌و رزگاربوونی موسا لە مەترسیی فیرعەون پێگەیاندووە، هەروەها خودا گەیاندوێتی بە کورەکەی‌و، کورەکەی بۆ ئامێزی گەڕاندۆتەوەو ئەویش شیری پێداوەو پێی گەیاندووەو بەخێوی کردووە تاکو لە ماڵ خۆی (واتە لە

ماڵی دایکەکەدا) گەورە بووەو گەیشتۆتە تافی لاوێتی.

قورئانی پیرۆز باسی هیچ لایەنێکی تری ژیانی دایکی موسای نەکردووە تەنها ئەو لایەنە نەبێت کە پەیوەستە بە کاتی منداڵیی موساوە- سڵاوی خوای لێبێ -. دوایین ساتی چیرۆکی ئەم دایکەش لە قورئاندا هەر ئەوەیە کە کوڕەکەی بۆ لای دەگەڕێتەوە، بەڵام بەپێی بڕیاری فیرعەونو لەسەر ئەرکی دارایی فیرعەونیش بەخێو بکرێت، ئیدی ئەویش شیری پێدەداتو بایەخی پێدەدات بەپێی ئەو هەلو مەرجەی بۆی دەرەخسێت.

ئەی ئاخۆ دوای ئەمە چی مابێت؟! ئایا شتێکی وا لە ژیانی ماوە کە پەیوەندیی بە منداڵێتیی موساوە مابێتو کە شایستەی باسکردن بێت؟ نەخێر شتێکی وا نەماوە.. هەربۆیەش قورئان دوای ئەم دیمەنە لەباسی ئەم ژنە وەستاوەو بەو ساتە وەختە کۆتاییی بەباسی دایکەکە هێناوە. ئەمەش کۆتایی پێهێنانێکی هونەریو بابەتیانەیە. ئێمەش دەبێت لەکوێدا قورئان کۆتایی بە باسێك دێنێت لەوێدا بوەستینو کۆتاییی پێ بێنین. هەروەها بێدەنگ بین لەئاست شتێکدا کە قورئان لەئاستیدا بێدەنگ بووەو هێندە بەس بێت کە قورئان پێشکەشی کردووین.

هەر کەسێکیش بەو بڕە باسکردنەی قورئان قەناعەت نەکات، خوداش قەناعەتی پێناکات.. هەرکەسێکیش بەوەندەی قورئان باسی کردووە تێر نەبێت، خوداش تێری ناکات.

بێگومان قورئان لە گێڕانەوەی لایەنەکانو قۆناغی هەر چیرۆکێکدا پوختەیەکی خێرای لێ دەهێنێت، بۆ نموونە باسی موسامان لەکاتی گەنجییدا کە پێگەیشتووە بۆ دەکاتو چەند قۆناغێکی ژیانیشی هەر لەوێدا دەپێچێتەوە، لەکاتی منداڵیشیداو دوای شیرخواردنی قۆناغێکی ژیانیمان بۆ دەپێچێتەوە، هەروەها لەکاتی باسکردنی قۆناغی مێردمنداڵیدا کە نەوجەوانێکی پێگەیشتووە بەشێکی تری ژیانیمان لەو شوێنەدا بۆ دەپێچێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو دیمەنانە بۆ

چیرۆکەکەی پێویست نین.. بەڵکو ئەوەی پێویستو گرنگ بێت لەدوای منداڵیی موسا -سڵاوی لێبێت- ئەو گەنجێتییە پڕ لە جۆشی ژیانو زیندویێتیو حەماسەتو ئازایەتیو ئیمانو دڵسۆزیو خۆشەویستییەیە کە تیایدا بەرگریی لە مەزڵوومان کردووەو پشتگیری لاوازو بێدەسەڵاتانی کردووە، وەك خودا لەبارەیەوە فەرموویە:

﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسۡتَوَىٰٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٤ وَدَخَلَ ٱلۡمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفۡلَةٖ مِّنۡ أَهۡلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيۡنِ يَقۡتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنۡ عَدُوِّهِۦۖ فَٱسۡتَغَٰثَهُ ٱلَّذِي مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِي مِنۡ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِ ... ١٥ القصص﴾.

واتە: (دوای ئەوەی موسا تەمەنی گەشتە رادەی ئەوەی کە لە ڕووی تێگەیشتنو لاشەوە بەهێزو توانا بێت، ئێمە حیکمەتو داناییو زانستو زانیاریمان پێبەخشی، هەر بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.. موسا لەکاتی غەفڵەتی خەڵکی شاردا خۆی کرد بە کووچەو بازاڕداو بینیی دوو پیاو شەڕ دەکەن، ئەمەیان لە هۆزەکەی خۆیەتیو ئەوی تریشیان لە هۆزی دوژمنەکەیەتی کە هۆزی فیرعەونە، جا ئەوەی کە لە هۆزەکەی بوو هانای بۆ هێناو داوای لێکرد فریای بکەوێتو لەو شەڕەدا لایەنی بگرێت، موساش بە پەلە بەهانایەوە چووو یەك بۆکزی کێشا بە کابرای دوژمنداو کوشتی).

ئێمە لێرەدا ناچینە نێو شیکارو قوڵایی ئەم بەسەرهاتانەوە تاکو لە ناوەرۆكو بابەتی ئەم کتێبەمان دەرنەچین، چونکە باسو خواسی ئێمە تەنها لەمەڕ دایکی موسایە نەك لەمەڕ خودی موسا -سڵاوی لێبێت-، هەر ئەوەشمان لەو چیرۆکە باس کردووە کە تەنها پەیوەندی بە چیرۆكو بەسەرهاتی دایکیەوەیەتی.

## مەسەلەی ( تاقیکردنەوەکە )و چیرۆکی
## ( پشکۆ گڕدارەکە )و ( دەنکە خورماکە )

پێش ئەوەی کۆتایی بەم چیرۆکە بێنین‌و بچینە سەر چیرۆکێکی دی، بەپێویستی دەزانم ئاماژەیەك بۆ مەسەلەی تاقیکردنەوەکە (حديث الفتون)و چیرۆکی (پشکۆ گڕدارەکە)و (دەنکە خورماکە) (حكاية الجمرة والتمرة) بکەین، لەبەردەم ئەم چیرۆکەشدا بەو پێودانەگە هەڵوێستە دەکەین کە دەربارەی چەند شتێکن‌و بە منداڵی بەسەر موسادا هاتوون، واتە لەکاتێکدا ئەو منداڵێکی شیرەخۆە بووە لەماڵی فیرعەنداو پێش ئەوەی بۆ لای دایکی بگەڕێنرێتەوە. لەم بارەیەوە خودای پەروەردگار بۆ بەیادخستنەوەی بەخشش‌و بەفریاگەیشتنی بە موسا، فەرموویەتی: ﴿...وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا ...﴿٤٠﴾ طه﴾. واتە: (هەروەها ئەی موسا ئەوە بەیادی خۆت بێنەرەوە کە کاتێك گەورەبوویت‌و بەهەڵە پیاوێکت کوشت‌و ئێمەش لە خەم‌و پەژارەی دەسگیربوونت رزگارمان کردیت‌و، پاشان بە چەندەها جۆرو شێوە تاقیمان کردیتەوە).

زۆربەی راڤەکار(موفەسیر)ە پێشینەکان مەسەلەی ئەم تاقیکردنەوەیە (حديث الفتون)و تەفسیرکردنیان بەم رەنگە بۆ (ابن عباس) ﷺ دەگێڕنەوەو وای باس دەکەن کە گوایە (ابن عباس)یش لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە (مرفوع) گێڕاوێتییەوە.

هەروەها راڤەکارانی پێشینی قورئان چیرۆکی پشکۆگڕدارەکەو دەنگە خورماکەشیان لەگەڵ بەسەرهاتی تاقیکردنەوەکەدا باس کردووەو وایان لەقەڵەم داوە کەوا موسا کاتێك منداڵێکی شیرەخۆرەی نێو ماڵی فیرعەون بووە، ژنەکەی فیرعەون داوای لە فیرعەونی مێردی کردووە نەختێك موسا لە ئامێز بگرێت. کاتێك هەڵیشی گرتووە، موسا بە وردی بۆ ریشی فیرعەونی روانیوەو رایکێشاوە

بۆ خوارەوە، فیرعەونیش بەوە پەست بووەو رەشبینیی لەسەر ئەو منداڵە دەربڕیوەو ئەو ریش راکێشانەی بە دژایەتی کردنی لەقەڵەم داوە، بۆیە فەرمان دەکات سەری برن. ژنەکەشی بەرگریی دەکاتو تکای لێدەکات کاری وا نەکاتو تێی دەگەیەنێت کە ئەوە تەنها نەریتێکی منداڵانەیەو ئەویش منداڵەو نازانێت چی دەکاتو بۆچی وادەکات؟!! لەبەر ئەوە هیچ نیازو مەبەستێك لەو حەرەکەتەی منداڵەکەدا نییەو نازانێت چی دەگرێتو چی رادەکێشێتو واز لەچی دێنێتو چی دەخوازێت، بۆ سەلماندنی ئەم وتەیەشی، ژنەکەی فیرعەون بە مێردەەی گوت: بۆ نموونەش تۆ ئێستا پشکۆیەکی گڕدارو دەنکە خورمایەکی بخەرە بەردەستو بزانە کامیان هەڵدەگرێت، ئەگەر ئاگرەکە هەڵگرێت ئەوە بێتاوانەو مەبەستی دژایەتیکردنت نەبوە کاتێك ریشی راکێشایت، خۆ ئەگەر دەنکە خورماکە بگرێت ئەوە مەبەستێکی لەوەدا هەبووەو هەڕەشەو گوڕەشەی لێکردوویت..).

راڤەکاران (مفسرین)ی قورئان گوتویانە: (فیرعەونیش پشکۆیەکی گڕاویو دەنکە خورماکەی بۆ منداڵەکە (واتە موسا) راگرت، موساش پشکۆ ئاگراوییەکەی گرتو خستیە سەر زاریو، زمانی سوتاند، بەمەش لەنگییەکی هەمیشەییی تێدا پەیدا بووو جۆرە لاڵبوونێکی تێدا دروست ببو کە بەردەوام زمانی (فث) ببوو، واتە پیتی (س)ی بە (ث)و پیتی (ڕ)یشی (غ) دەدرکاند).

هەروەها راڤەکاران گوتویانە: (بەڵگە لەسەر ئەو (زمان لەنگی)یەی (موسا) ئەوەیە کاتێك خودا لەگەڵیدا دەدوێتو فەرمانی پێدەکات بچێت بۆ لای فیرعەون، داوا لە خودا دەکات کە ئەو لەنگیو زمان فسییەی لابەرێتو ئەو گرێو کوسپە لەزمانیدا نەهێڵێت، ئەوەبوو وەك لە قورئاندا هاتووە بەخودا دەڵێت:

﴿قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِيٓ أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُواْ قَوْلِي ﴿٢٨﴾ طه﴾.

واتە: (موسا نزای کردو گوتی: ئەی پەروەردگاری من، سینەو دڵو دەروونم ئاسوودەو خۆشحاڵ بکەو، کاروبارم بۆ سووكو سانا بکەو، ئەو گرییەی زمانم بکەرەوەو زمانم ڕێكو پاراو بکە، تاکو فیرعەونو تاقمەکەی لە وتەو مەبەستو گفتارم تێبگەن).

ئێمەش لە (مەنهەجو بەرنامەی خۆمان بۆ تێڕوانین لە چیرۆکەکانی قورئان)دا ئەم وتەو بیروڕایە دەربارەی (مەسەلەی تاقیکردنەوەکەو، چیرۆکی پشکۆی گڕدارو دەنکە خورماکە) پەسند ناکەینو دانی پێدا نانێنو فەرمایشتی خوداشی پێ تەفسیر ناکەین، بۆیەش قبوڵو پەسندی ناکەین چونکە ئەمە لە پێغەمبەری خودا- محمد-ەوە ﷺ نەگێڕراوەتەوە، بەڵکو لەو وتە پووچەڵە ئیسرائیلییانەیە کە بەردەوام دەگوترێتەوەو کە ئێمەش هەمیشە داوای فەرامۆش کردنو وەلانانیان دەکەین.

ئیمام (ابن کثیر) لە تەفسیری سورەتی (طـه)دا دوای ئەوەی بەسەرهاتی تاقیکردنەوەکەی بەدرێژی هێناوە گوتویەتی: (ئەمە لە وتەی (ابن عباس)ەوە بە پلەی (موقوف) دانراوەو پلەی (مرفوع)یشی تێدا نییە تەنها کەمێکی نەبێت، وەك ئەوەی (ابن عباس)خۆی هێندەی ڕەوایيو شیاویی گێڕانەوەی دەقی ئیسرائیلیات لە گەورەی زانایانی جولەکەوە وەری گرتبێت، خوداش زاناترە)[1].

جا ئەگەر ڕاستیی مەسەلەکە ئاوابێتو، ئەگەر ئێمە ئەو ریوایەتو گێڕانەوە ناڕاستەش دەربارەی بەسەرهاتی پشکۆ ئاگرەکەو دەنکە خورماکە پەسند نەکەین، ئای داخۆ ئەو گرییەی لە زمانی موسادا هەبووەو کە داوای کردنەوەی لەخودا کردووە بەهۆی چییەوە بوو؟!

بێگومان ئەوە گرییەکی مەعنەوی بووە نەك هەستەوەریی(حسی)-خوداش زاناترە-.. واتە ڕاوەستانو بەندبوونێکی زمانە لە ئاکامی کارلێکی دەروونی

---

١) تفسیر ابن کثیر: هەروەها بڕوانە درێژەی (حدیث الفتون) تێیدا: ٣: ١٤٩-١٥٣.

(الأنفعال النفسي)یەوە دروست دەبێت، ئەمەش حاڵەتێکی زانراوی دەروونییە. مرۆڤیش کاتێك بەهۆی هەڵوێستێك یان وتەیەك یان ڕووداوێکەوە کارلێکی نێوخۆی دەروونی بەسەردا دێتو لە بەرزترین پلەی خرۆشانو کاردانەوەی دەروونییەوە دەدوێت، ئەوا قسەیەکی خێراو یەك بەدوای یەکی وەها دەکات کە ڕوونو ئاشکرا نییە، لەوانەیە بگاتە ڕادەیەکی کارلێکو کاردانەوەی وەهاش کە دەنگی لەدەست بداتو تووشی هەناسەبڕکێ ببێتو نەتوانێت قسە بکات.

وادیارە موساش-سڵاوی لێبێت- دەترسا لەوەی کە لەبەردەم فیرعەون بەو حاڵەتەدا تێبپەڕێتو، دەترسا لەوەش کە خۆی پێڕانەگیرێتو دەمارەکانی بۆ هێور نەکرێتەوە لە کاتێکدا فیرعەون بەدرۆی دەخاتەوەو بە زوڵمو ستەمو نامەردیو کاری تێکدەرانە بەرەوڕووی ببێتەوە. هەروەها موسا لەوەش نیگەران بوو کە وشەکان بەخێرایی لە زمانییەوە دەرچێتو بیسەران هیچی لێ تێنەگەن، یاخود وشەکان لە سینەیدا پەنگ بخۆنەوەو بەند بنو بەهۆی سینەتەنگیو پەست بوونو کارلێکی دەروونییەوە نەتوانێت دەریانبڕێت، بەم ڕەنگەش نەتوانێت بانگەوازەکە بگەیەنێتو بەڵگەی بەرپرسیارێتیش نەخاتە ئۆباڵی ئامادەبوان. هەر لەبەر ئەمەش داوای لە خودا کرد کە ئەو دەروونبەندییە مەعنەوییەی لەسەر لابباتو ئەو گرێدەروونییەی سەر زمانیشی بکاتەوەو، بتوانێت دەست بەسەر دەمارەخانەو دەمارگرژییدا بگرێتو هێمنیی خۆی لەدەست نەدات، خوداش ئەم نزاو داواکارییەی بۆ جێبەجێ کرد..

ئێمە ئاوا ئەو گرێ مەعنەوییە دەروونییەی زمانی موسا لێك دەدەینەوە، خوداش هەر خۆی زانایە.

مامۆستا-سید قطب- لە تەفسیری (في ظلال القرآن)دا دەڵێت: (ئەوەی لە وتەکەی موساوە-سڵاوی لێ بێت- دەردەکەوێت کە گوتویە:

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ۝١٢ وَيَضِيقُ صَدۡرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرۡسِلۡ إِلَىٰ هَٰرُونَ ۝١٣﴾ الشعراء:.

واتە: (من دەترسم لەوەی بەدرۆم بخەنەوەو باوەڕم پێنەکەن‌و، تەنگەنەفەس‌و سینە تەسك ببم‌و زمانم بگیرێت‌و پاراو نەبێت)..

ئەوەی لەم وتەیەی موساوە دیارە ئەوەیە، ترسەکەی ئەو تەنها لەسەر بەدرۆخستنەوە نیە، بەڵکو لەوەدایە کاتێك سینەی تەسك دەبێتەوەو زمانی بۆ هەڵناسوڕێت‌و، ئیدی شتێکی تری نییە پێی روون کاتەوەو وەڵامی ئەو بەدرۆخستنەوەو بەربەرەکانییەیان بداتەوە، چونکە وەستانێك لە زمانیدا هەبو، وەك لە سورەتی (طـە)شدا هاتووە: ﴿وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ۝٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ۝٢٨﴾ طـه. دیارە ئەم وەستانەش حاڵەتێکی تەنگەنەفەسیی بۆ دروست دەکات، ئەمەش بەهۆی بێتواناییی‌و لەسەرلابردنی پەستی بە ئاخاوتن، جا هەتا پەستییەکەش زۆرتر بێت، تەنگەنەفەسییەکەش زیاتر دەبێت، ئەمەش حاڵەتێکی زانراوە)[1].

## گرنگترین وانە لە چیرۆکی (دایکی موسا)دا

لەدواییدا هەوڵ دەدەین گرنگترین وانەو ڕێنمایی‌و پەند لە چیرۆکەکەی دایکی موسا لە قورئاندا دەربێنین.. ئەم وانەو دەرسانەش لەکاتی شیکردنەوەی چیرۆکەکەدا بەرچاو کەوتوون:

١- دایکی موسا پێغەمبەر نییە، سروشی خوداش بۆ ئەم ژنە، تەنها لە ڕێگای ئیلهامەوە بووە.

٢- پێویست بوون بە پابەندیی تەنها بەقورئان‌و فەرموودەی (صحیح) لە زانینی

---

١) في ظلال القرآن ٥: ٢٥٨٩.

شیکارو وردەکاریی چیرۆکەکەدا.

٣- فیرعەون دەسەڵاتدارێکی ستەمکارو تێکدەرو خۆبەزل زان بووە لە کوشتنی ئەو منداڵە لەدایك بوانەی گەلی ئیسرائیل گەر کوڕ بوونایە.

٤- پەککەوتن‌و شکستیی خواستی فیرعەون لەبەردەم خواستی خوادا، چونکە هیچ شتێك نابێت تەنها بەپێی خواستی خودا نەبێت.

٥- هەر کەسێك بەرامبەر خواستی خودا وەستابێت دەستەوسان‌و بێ‌هێز بووەو، شکست‌و بەزیوو دۆڕاو بووە. دوژمنانی خوداش لە هەر شوێنێك بووبن هەر تووشی تێشکان‌و خەسارەتمەندیی بوون، چونکە بەوپەڕی گەمژەیی‌و ساویلکەییەوە دژایەتی خودایان کردووە، جا داخۆ کێ هەیە ئەگەر دژایەتی خودای بەهێزو خاوەن توانا بکات، سەرکەوتوو بێت؟!

٦- خودای پەروەردگار بەویستی خۆی چەندین ئامرازو شێواز بۆ بەدیهێنانی بەڵێنی‌و، راپەڕاندنی ئیرادەی‌و، پاراستنی شوێنکەوتوانی‌و، بەزاندنی دوژمنانی، بەکار دێنێت. باوەڕدارانیش تەنها ئەوەندەیان لەسەرە، کە لە فەرمانی خودا دڵنیا بن‌و کاروباریان بەخودا بسپێرن‌و بەچاکییش پشتی پێ‌ببەستن‌و، ئەو ئامرازو هۆکارە ماددییانەش بەکاربێنن کە سەرکەوتنیان بەسەر کافراندا بۆ بەدیی دێنن.

٧- مرۆڤەکان پلان‌و رێکخستن‌و لێکۆڵینەوەو نەخشەکێشانیان هەرچەندبێك‌و هەرچۆنێك بێت ئەوا لەبەردەم نەخشەو تەقدیرو تەگبیری خوادا ون دەبن‌و دەپووکێنەوەو تۆزقاڵێك جێی بەراوردو باسکردنیش نیین.

٨- بێگومان مرۆڤەکان گەلێك جار لە ئاست ئەنجام دانی کارێك‌و، لە بەرگریکردن لە کەسێك‌و لە سەرخستنیدا دەستەوسان دەبن، بەڵام ئەگەر خودا بەرگری لەو کەسە بکات‌و سەرخەری بێت، ئەوا بێگومان ئەو کەسە بەهێزو سەرکەوتوو

دەبێت، چونکە خودا نە لە زەوی‌و نە لـە ئاسمانیـشدا هـیچ شـتێکی لەدەست دەرناچێت.

٩- خودا لە ئاسمانەکان‌و لە زەویشدا چەندین سەربازی پەنهانی‌و نەبینراوی هەیەو، تەنها خۆی نەبێت هیچ کەسێك سەربازەکانی ناناسێت.. لەوانەشە بـە خـەیاڵی هیچ مرۆڤێکدا نەیەت کەسەربازێك بێت‌و کارێك ئەنجام بدات، بـەڵام خـودا بـە خواستی خۆی ئەو سەربازانە بەیدەست (تسخیر) دەکات بۆ هەرکارێك کە خـۆی بیەوێت.

١٠- خودا لەگەڵ شوێنکەوتوان‌و پشتیوانانی خۆیدایە لە یەکـەمین چرکەساتەکانی ژیانیانـەوە، تەنانـەت لـەو کاتـەوەی لـە سـکی دایکانیانـدان، هـەر خـوداش کۆسپەکانیان بۆ لادەبات‌و رێگەیان بـۆ ئاسـان دەکـات‌و لـە مەترسی یـەکان رزگاریان دەکات.. ئەمەش کاراییەکی گەورەیی لەسەر ژیانی ئەو پشتیوانانەو لەسەر جیهادو هەڵوێستەکانیان هەیە.

١١- ماڵی فیرعەونی ستەمکار کە ئیدیعای خوایەتی‌و پـەروەردگارێتیی بـۆ خـۆی دەکرد لە ناوەوە بەزێنرابوو، چونکە هاوسەرەکەی کە بەڕواڵەت نزیکترین کەسی بوو باوەڕی بە فیرعـەون نـەدەهێناو تـەنها بـاوەڕی بـە خـودای تـاك‌و تـەنیاو بێهاوەڵ هێنابوو، خوداش فـەرمانی بـە دڵـی ئـەو ژنـە کردبـوو کـە منداڵـە شیرەخۆرەکە(موسا)ی خۆش بوێت‌و ئەرکی بەخێوکردنی لەخۆ بگرێت وبەرگریی لێبکات. فیرعەونیش لە ئاست ئەم فەرمانەدا شکست‌و دەستەوسـان بـووو بـە داواکارییەکانی ژنەکەی قایل بوو.

١٢- خـودا فرۆفێڵـی فیرعـەونی پووچـەڵ کردۆتـەوەو وای لێکـردووە چـەند هەڵس‌وکەوتێکی وەها بنوێنێت کە لە بێئاگاییدا بووە، بۆ نموونە قایـل دەبێت بەوەی کە منداڵـە شـیرەخۆرەکە لـەلای خـۆی بـژی‌و لـە کۆشـکەکەیدا گەشـە بکات‌و، هەر خۆیشی ئەرکی بەخێوکردن‌و چاودێری‌و خەرجییەکانی لـە ئەستۆ

بگرێت، تاکو له دواییشدا لەسەر دەستی ئەو منداڵە لەنێو بچێت.

١٣- خودا قەرەبوو بۆ بەندەچاکەکانی (کە کەس‌و کاریان لەدەست دەدەن) بەوە دەکاتەوە کە خەڵکی تریان پێدەبەخشێت‌و بەهۆی ئەو خەڵکەشەوە نیعمەتی خۆییان پێ دەگەیەنێت، ئەوەتا موسای منداڵی شیرەخۆرە کاتێك بۆ ماوەیەك ئامێزو خۆشەویستیی دایکیی لەدەست دەچێت، خودا بەوە قەرەبووی بۆ دەکاتەوە کە خۆشەویستی یەکی لەلایەن خۆیەوە پێدەگەیەنێت: ﴿...وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي...﴿٣٩﴾ طه:﴾.

١٤- بێگومان پەروەردەی پیاوانە لەرێی خۆشگوزەرانیو نازداریو جێی گەرم‌و نەرمەوە نییە، بەڵکو لەرێی میحنەت‌و بارتەنگی‌و رژدی‌و سووربوونەوەیە.. سەرنج بدە ئەوە موسای منداڵ فرێ دەدرێتە سندووقەکەوەو، سندووقەکەش هەڵدەدرێتە نێو دەریاکەوە، دەریاش دەیگەیەنێتە بەردەمی کۆشکی فیرعەون‌و وەك دیارییەك پێشکەشی دەکات بە دوژمنە سەرسەختەکەی، بەڵام خودا دەیپارێزێت.

١٥- بێگومان خودا پشتیوانان‌و خۆشەویستانی تاقیدەکاتەوەو تووشی نارەحەتی‌و مەینەتییان دەکات، خۆ ئەگەر ئەوان تووشی ئەم حاڵەتانە بن ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی، کە خودا ئەوانی خۆش ناوێت، یان لێیان رازی نیە، چونکە تاقیکردنەوە بۆ تۆکمەکردنی دەروونەکان‌و قووڵ کردنەوەی باوەڕو بەرزکردنەوەی پلەوپایەکانە.

١٦- هەردوو لێوی موسای منداڵی شیرەخۆر کە هیچ مەمکێکی دایەنەکانی نەگرتووە، تەنها مەمکی دایکی نەبێت، وەڵامێکی تێرو تەسەلە بۆ بێئیمان‌و ماددەپەرستەکان کە نکوولّی لەجیهانی غەیب‌و نادیارو بواری رۆح دەکەن‌و، تەنها مرۆڤ بە خاوەن‌و خولقێنەری عەقڵ‌و خواست‌و هوشیاری‌و ژیان دادەنێت.

١٧- خودا وادەی بەڵێن لەسەر دراوی خۆی ناشكێنێت، ئەوەبوو بەڵێنی بەدایكی موسادا كه بەساغو سەلامەتی كۆرپەكەی بۆ دەگەڕێنێتەوە، بە شێوازێكیش بۆی گەڕاندەوە كه بە هزری هیچ كەسێكدا نایەت.

١٨- فیرعەون كه كرێی داوە بە دایكی موسا لەبەرامبەر شیرپێدانی كۆرپەكەداو، دایكی موساش كه كرێی لە فیرعەون وەرگرتووە بەڵگەیەكی ترە لەسەر رێزلێنانی خودا لەو ژنەو لەسەر نیعمەت پێدانیشی، هەروەها بەنموونەیەكیش دادەنرێت بۆ هەركەسێك كە ئەركێك جێبەجێ بكاتو كرێی خۆی وەك مافێكی رەوا لەسەری وەربگرێت.

١٩- پێویست بوون(وجوب)ی بەكارهێنانی باشترینو سەركەوتووترین ئامرازی بەشەری بۆ نەخشەكێشان، هەروەها پێویست بوونی وریاییو بێداریو، شاردنەوەی نهێنییەكان لە دوژمنانو، زیرەكیو چەلەنگیو هەڵسوكەوتی باش لەگەڵیاندا، وەك چۆن لە هەڵوێستی خوشكەكەی موسادا رەنگی داوەتەوە.

## چیــرۆکی دووەم

# چیــرۆکی پیاوە ئیماندارەکەی هــۆزی فیــرعەون

چیرۆکی ئەم پیاوە لە قورئاندا لەم ئایەتانەدا هاتووە، کە خودا فەرموویە:-

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ
وَقَٰرُونَ فَقَالُواْ سَٰحِرٞ كَذَّابٞ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ مِنۡ عِندِنَا قَالُواْ
ٱقۡتُلُوٓاْ أَبۡنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ وَٱسۡتَحۡيُواْ نِسَآءَهُمۡۚ وَمَا كَيۡدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ
إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن
يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ
بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ لَّا يُؤۡمِنُ بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٞ مُّؤۡمِنٞ
مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ
جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا
يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ﴿٢٨﴾
يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ
قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ
ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ
وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ

يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ
مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا
جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًاۚ
كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ
ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ
ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ
أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ
كَٰذِبًاۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيْدُ
فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ
سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ
دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَاۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن
ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ
حِسَابٍ ﴿٤٠﴾ وَيَٰقَوْمِ مَا لِىٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِىٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾
تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى
ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى
ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾
فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ
﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُوا۟ۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾
ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّاۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ

أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ غافر﴾

واتە: (بێگومان ئێمە موسامان بە ئایەتو نیشانە ڕۆشنەكانمان كە موعجیزە هەست پێ كراوەكانو بەڵگە ئاشكراكان بوو، بۆ لای فیرعەونو هامانو قارون نارد بەڵام ئەوان باوەڕیان پێ نەهێناو گوتیان (ئەمە سیحربازێكی درۆزنە) دوایی كە ئەو هەقو ڕاستییەی بە بەڵگەو موعجیزەی ئاشكراوە كە لە ئێمەوە پێی درابوو بۆی هێنان فیرعەونو تاقمەكەی فەرمانیان داو گوتیان: (كوڕەكانی هەموو ئەو كەسانە بكوژن كە ئیمانیان هێناوە، بەڵام ئافرەتەكانیان بهێڵنەوە (تا بەهەموو شێوەیەك لە خزمەتیان دابن) ئەمەش پیلانو فێڵی بێ باوەڕانەو فروفێڵو تەڵەكەبازی ئەوانیش هەر لە گومڕایيو سەرگەردانی دایە، ئینجا فیرعەون گوتی: (وازم لێ بێنن با موسا بكوژمو با ئەویش پەنا بباتە بەر ئەو خودا پەروەردگارەی خۆیو تكای ڕزگاربوونی لێ بكات، بۆیەش دەیكوژم چونكە دەترسم دینو ئاینتان بگۆڕێت، یاخود خراپەو تێكدان لە وڵاتەكەمانو لەسەر زەوی دا بێنێتە كایەوە). موساش گوتی: (من پەنام گرتووە بە خودای پەروەردگارم (كە پەروەردگاری ئێوەشە) لەهەر لووتبەرزو خۆبەزل زانێك كە باوەڕ بە ڕۆژی حسابو لێپرسینەوە ناهێنێتو دەیەوێت ڕاستییەكان هەڵگێڕێتەوە) (دیارە فیرعەونیش پێشتر بڕیاری تەواوی بۆ كوشتنی موسا دابوو)، بۆیە پیاوێكی باوەڕدار لە خزمانو لە هۆزی فیرعەون -كە باوەڕەكەی دەرنەخستبووو تا ئەو ڕۆژە شاردبوویەوە، هاتە لایانو پێی گوتن: (ئایا ئێوە پیاوێك دەكوژن تەنها لەسەر ئەوەی كە دەڵێت (خودای پەروەردگاری من — الله -یەو لە هەمان كاتدا بەڵگەو نیشانە ڕۆشنەكانیشی لە پەروەردگارتانەوە بۆ هێناونو پیشان داون، جا گەر لەمەدا درۆزن بێت ئەوە ئۆباڵی درۆكەی لە ئەستۆی خۆی دایە، خۆ گەر ڕاستگۆش بێت ئەوا هەندێك لەو بەڵاو كارەساتانەتان بەسەردا دێت كە پێی ڕاگەیاندون، بەڕاستی خودا ڕێنمایی كەسێك ناكات كە زیادە ڕەوو درۆزن بێت.. (بەمانای ئەگەر موسا درۆزن بوایە ئەوا خودا

ئەو هەموو بەڵگانەی بۆ پشتگیری لێ کردنی پـێ نەدەگەیانـد).. هـەروەها پیـاوە ئیمانداره‌کە گوتی: (ئەی هۆزو قەومی خۆم ئەمڕۆ ئێوە لەم ناوچەیەدا بالاّ دەسـتن‌و بە ئارەزووی خۆتان حوکمی زەوی دەکەن، جا بیربکەنەوە لەوەی کـە ئەگـەر تۆڵـەو سزای خودامان تووش ببێت کێ هەیە فریاد ڕەس‌و سەر خەرمان بێت)؟!

لەوێدا فیرعـەون قسەکەی بڕی‌و گوتی: (مـن هـەر ئـەو بیروڕایـەی خـۆم بەچـاك دەزانم‌و هیچی ترم لا پەسند نییەو ، هەر منـیش تـەنها ڕێـی ڕاسـت‌و دروسـتتان پیشان دەدەم). دیسان ئەو پیاوەی کە باوەڕی هێنا بوو، گوتی: (مـن دەترسم لەوەی ڕۆژێکتان بەسەر دابێت وەك ئەو ڕۆژە کارەساتبارانەی کـە بەسـەر گـرۆو کۆمەڵـە خراپکارەکانی پێـشوودا هـاتوون، وەك ئـەوەی بەسـەر قـەومی (نـوح)و (عـاد)و (سەموود)و گەلانی پێشوودا هاتووە، خوداش ستەم لە بەندەکانی ناکات‌و نایەوێت بەستەم لە نێویان ببات —ئەی هۆزی خۆم من ترس‌و نیگەرانیم بۆ ئێوە لەسەر ئـەو ڕۆژەشە کە ڕۆژی بانگکردنتانە بۆ لێپرسینەوە، ئەو ڕۆژەی کە هەمووتان لە ترسـی هەڵدێن‌و سەرگەردانن‌و نازانن ڕوو لە کوێ بکەن‌و هیچ پەنادەرو دالّدەدەرێکتان بـۆ دەرباز بوون لە ڕق‌و تووڕەیی خودا نییە، جا هـەر کەسـێك خـودا بـەهۆی لادانـی خۆیەوە گومڕای بکات هیچ ڕێنما کارو ڕێ پیشاندەرێکی نی یە، بێگومان لەمـەو پێشیش (یوسف) بە بەڵگەو نیشانە ڕۆشنەکانەوە هاتە لاتان تا ڕێبـازی خواناسـی بگرنەبەر، کەچی بەردەوام گومانتان لەو بەرنامەو ڕێبازەی هەبوو تـا ئـەو کاتـەی کۆچی دوایی کردو گوتتان: ئیدی هەرگیز خودا لە دوای (یوسف) پێغەمبەرێکی تر نانێرێت، بەم ڕەنگەش خودا کەسانی زیادە ڕەوو گومانـدارو ڕاڕا گـومڕا دەکـات، ئەوانەی کە لەسەر ئایەت‌و بەڵگە ڕۆشنەکانی خودا مشت‌و مڕ دەکەن بەبێ ئـەوەی هیچ زانست‌و زانیاریەکیان هەبێت‌و پـێ بەخـشرابێت، بەمـەش ڕق‌و تووڕەییـەکی توند لای خـودا دروسـت‌و گـەورە دەبێـت، هـەروەها هـەمان ڕق لـەلای کەسـانی ئیمانداریش دروست دەبێت، خودا بەم ڕەنگە مۆر دەنێت بەسەر دڵی هەر کەسێکی خۆ بەزل زان‌و بەزەبری ستەمکاردا).

لە گەرمەی قسەکانی پیاوە ئیماندارەکەدا، فیرعەون بە (هامان)ی وەزیری گوت: (ئەی هامان قوللە (برج)ێکی بەرزم بۆ بنیات بنێ، تاکو هەندێك هۆکارو ئامرازم دەسگیر بێت لەو هۆکارانەی بۆ ئاسمانەکان سەرم دەخەن، تا لێیانەوە سەرکەوم و نهێنییەکانی بزانم و بڕوانم بۆ خوداکەی موسا، من دڵنیام کە درۆزنە).. بەم شێوەیە کردارە ناشیرینەکانی فیرعەون هەر لەسەر گەردانیو تیاچوونو زەرەرمەندییدایە، پاشان ئەو پیاوەی لە هۆزی فیرعەون ئیمانی هێنا بوو، گوتی: (ئەی هۆزەکەم شوێنی من بکەونو (بەم قسانەی من ڕەفتار بکەن) چونکە من ڕێنمونیتان دەکەم بۆ سەر ڕێی چاکەو سەرفرازی. ئەی هۆزەکەم ژیانی دنیا تەنها ڕابواردنێکی کەمەو هەر ڕۆژی دواییش شوێنی ئارامی تەواوو حەوانەوەی هەمیشەیی باوەڕدارانە، هەرکەسێك هەڵەیەك بکات تەنها بەقەد هەڵەو گوناهەکەی خۆی سزا دەدرێت، هەر کەسێکیش لە نێرو لە مێ (لە پیاوانو ئافرەتان) چاکە بکەنو لە هەمان کاتدا باوەڕداریش بنو بە ئیمانو باوەڕەوە چاکە بکەن ئەوە بێگومان ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو بەبێ حسابو چەندو چوون، ڕزقو ڕۆزیی هەمە جۆرو هەمە ڕەنگیان پێ دەدرێت، هەروەها ئەی هۆزی خۆم، ئێوە سەرنج بدەن لەوەی کە من تەنها بۆ ڕێی ڕزگاربوون ئێوە بانگ دەکەم، تا بچنە بەهەشتی خوداوە، کەچی ئێوە بەم سەرگەردانیو گومڕاییەتان من بۆ نێو دۆزەخ بانگ دەکەن، بۆ ئەوە بانگم دەکەن تاکو باوەڕ بە خودا نەهێنمو هاوەڵ (شەریك)ی بۆ دابنێمو، بەبێ هیچ بەڵگەو زانستێك خۆم کافر بکەم، لە کاتێکدا من بۆ لای خودای بالاّ دەستو لێبوردە بانگتان دەکەم، بێگومان ئەوەش، کە ئێوە منی بۆ بانگ دەکەن، نە لە دنیاو نە لە قیامەتیشدا خاوەنی هیچ بانگەوازو بەرنامەیەك نییە، نابێت ئەوەشمان لە یادچێت، کە گەڕانەوەمان بۆ لای خودایەو، ئەوانەش کە لە ستەمو تاوان دا ڕۆچوون دەخرێنە نێو ئاگری دۆزەخەوە، لەمەو لاش ئێوە لە ئایندەدا ئەو وتانەی منتان بەیاد دێتەوەو ڕۆژێك دێت، کە بیری لێ بکەنەوەو، ئەوا منیش کاروباری

خۆم هەر بۆ خودا دەگێڕمــەوەو خـۆم بــە خـودا دەسـپێرمو پـشتی پــێ دەبەسـتم، بەڕاستییش خودا بینایە بە بەندەکانیو دەیانبینێت)..

ئینجا خوداش ئەم پیاوە ئیمانداره‌ی نێو هۆزەکەی فیرعەونی لە پیلانی خـراپو دڕندانەیان پاراستو خێڵو دارودەستەی فیرعــەونی تووشــی سـزایەکی زۆر ســەخت کرد، کە ئاگری دۆزەخەو بەیانیانو ئێواران نیشانیان دەدرێت (واتە بەردەوام شــەوو ڕۆژ ئێوارەو بەیانی تیای دان)و هەر لە ڕۆژی مردنیانەوە تا کاتی قیامەت پیایانـدا دەچزێنرێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا فەرمان دەدرێت: ئادەی تـاقمو خێڵـی فیرعــەون بخەنە نێو توندترینو سەختترین ئەشکەنجەو ئازاری دۆزەخەوە).

تا ئێرە لێکدانەوەی کورتی ئایەتەکانی (٢٣-٤٦)ی سوورەتی (غافر) بــوو کــە بەسەرهاتەکەی ئەو پیاوە باوەڕدارەی هۆزی فیرعەونیان تیادا گێڕاوەتەوە..

## (( ئیماندارەکــەی هــۆزی فیــرعەون کــێیە ))

مێژوونووسانو زانایانی تەفسیر وتەو بیروڕای جیا جیایــان لەســەر دیـاریکردنی کەسـێتیی پیـاوە ئیماندارەکــەی هـۆزی فیرعــەونو چـۆنیەتی بەســەرهاتی لەگـەڵ فیرعەونو هۆزەکەیدا دەربڕیوەو، کــە چـۆن دەسـتی پــێکردووە لەگەڵیانـداو چــۆن کۆتاییشی هاتووە؟!

هەندێك لە مێژوو نووسانو زانایان گوتوویانە کە (ئەو پیاوە ئامۆزای فیرعــەون بووەو ئیمانی خۆی شاردۆتەوە لە ترسی ئەوەی نەبادا فیرعەون ئازاری بدات)، بەڵام لە دیاریکردنی ناوەکەشیدا وتەو بیروڕای هەمە جۆریان هەیە، هەنـدێکیان وای بــۆ دەچن کە ناوی (شەمعوون) بوو بێت، هەندێکیــشیان دەڵــێن نــاوی (خــەیر) بــووە، هەندێکی تریشیان دەڵێن ناوی (جەبرەك) بووە، گوتراویشە ناوی (شەمعان) بووەو، هەروەها گوتراوە ناوی (حەبیب) بــووە، زۆر لــە زانایــانیش ڕایــان وایــە کــە نــاوی

(حەزفیل)[1] بوو بێت.

زانا (الثعلبـــي) لە كتێبی (عرائس المجالس)دا بەشێك لە چـیرۆكی ئـەم پیـاوەی هێناوەو، گوتوویەتی: (ئەم پیاوە لە هاوڕێیانی فیرعەون بووەو، دارتاش بووەو هەر ئەویش سندووقەكەی بۆ دایكی موسا دروست كردووە كاتێـك موسـای لـێ بـووەو هەڵیداوەتە دەریاكەوە، گوتراویشە گەنجینەدارو بەرپرسی گەنجینەی فیرعەون بـووەو ماوەی سەد ساڵ ئەم كارەی بۆ كردووە، ئیمانیشی دەرنەخستووە تـەنها دوای ئـەو كاتە نەبێت كە خودای مەزن (مووسا) بەسەر سیحربازەكان دا سـەردەخات، كـاتی لەناو چوونو كۆتایی ژیانیشی لەگەڵ لەناوچوونی سیحربازەكان دابووە كە ئەوە بـوو فیرعـەون هەموویانی لەگەڵ ئەم پیاوەش دا گرتووەو لە خاچی داونو ئـەم پیاوەشـی وەك ئەوان كوشتووە، هاوسەری ئەم پیاوە قژ داهێنـەر(ماشـطة)ی كـچی فیرعـەون بـووەو ئـافرەتێكی ئیمانـدار بـووە وەك مێردەكـەی، فیرعـەون ئـەم هاوسەرەشـی گرتووەو دوای كوشتنی مێردەكەی، ئەویشی لەگەڵ منداڵەكانی دا كوشتووە)[2].

## چیرۆكێـكی نـەزانراوو، بێ سـەرچاوەی ڕوون كردنەوە

بۆ زانینی چیرۆكی ئەم پیاوە ئیمانداره، ئەگەر ئێمە بـەدوای سەرچـاوە ڕاسـتو متمانەپێكراوەكاندا بگەڕێین، ئەوا دەبینین هەموو سەرچاوە ڕاستەكان هیچ شیكارو درێژەدانێكیان لەسـەر چـیرۆكەكەی نەخـستۆتە ڕووو، ناوەكەشـی بـە یـەكێك لـە نەزانراوو شاراوەكانی قورئان (مبهمات القران) دادەنێن.

لە قورئاندا ناوی پیاوەكـەو شـیكاری ڕووداوەكـانیو بەسەرهاتەكەشـی دیـاری نەكراوە، پێغەمبەریش ﷺ شتێكی ئەوتۆی لێ دیاری نەكردووە، هـەروەها هاوەڵـە

---

١) (البداية و النهاية)ی (إبن كثير) /(١:٢٦٠).
٢) عرائس المجالس (قصص الانبياء)ي (ثعلبـي): ص(١٦٦).

بەرێزەکانیشی (خودا لێیان ڕازی بێت) خۆیان لە قەرەی درێژەدانی ئـەم بەسـەرهاتە نەداوەو تەنها ئەوەندەیان لێ باسکردووە کە قورئان بۆی دیاری کردوون.

لەبەر ئەوە ئێمەش لەو سنوورەدا باسی چیرۆکی ئیماندارەکەی هـۆزی فیرعـەون دەکەین کە قورئانو سوننەت کێشاویانە بۆمانو، باوەڕیشمان وایە کـە ئـەو بـڕەی قورئـان باسـی کـردووە، بەسـەو بـەشمان دەکـات وەك چـۆن بەشـی هـاوەڵانو شوێنکەوتوان (تابعین)و زانایانی بابەتکار (موضوعی)ی کردووە.

بەڕاستی کابرا باوەڕدارەکەی نێو هۆزی فیرعەون لەو بابەتە نادیارو نەزانراوانەی قورئانە کە ڕوونکردنەوەی زۆری لەسەر نەهاتووەو دەبێـت پـەنا ببرێتـە بـەر دەقـە ئەفـسانەییەکانی (ئیـسرائیلیات) بـۆ مەبەسـتی ڕوون کردنـەوەی زیـاتری بەسەرهاتەکە.

ئێمەش لەجیاتی ئەوەی بچینە نێو قووڵایی مەسەلەیەکەوە کـە هـیچ زانـستو زانیاریەکیشمان لە بارەیەوە نییە، ئەوەمان لێ خوازراوە کە هەڵوێستە لـە ئاسـت ئەو بڕەی بەسەرهاتەکەی دا بکەین کەوا لە قورئان دا هاتووە بـۆ ئـەوەی سـەرنجو ئاوڕدانەوەی پێویستو وانەو پەنـدو ئامۆژگـاری لـە ئیمـانو بانگـەوازو بـوێریو ئازایەتیو ڕوون کردنەوەو کارتێکردنو جیهاد دا لێوە دەستەبەر بکەین.

بێگومان پێشەوا (ابن کثیر)یـش خۆی لە شیکارو درێژکردنەوەی مەسەلەی ئـەم چیرۆکە لاداوەو، تەنها ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کاتێك فیرعەون (نـەفرەتی خـودای لێ بێت) بەتەمای کوشتنی موسا -سلاوی لێ بێت- بووەو پاشان خۆی بـۆ ئامـادە کردووەو ڕاوێژی تیادا لەگـەڵ دارو دەسـتەکەی کـردووە، ئـەم پیـاوە ئیمانـدارەش ترسو نیگەرانی لەسـەر (موسـا) هـەبووەو، بـۆ بـەرگری کـردن لـە (موسـا) بـە زمانێکی پڕ سۆزو تکاکاری، لەگەڵ فیرعەون دا دواوەو وتەیەکی وای بەکار هێناوە کە هەردوو شێوازی هەڵنانو وریاکردنەوە (ترغیبو ترهیب)ی لەخۆ گرتووە[١].

---

١) (البداية و النهاية) :-(١:٢٦٠).

## بۆچی لە هۆزی فیرعەون بووە؟

لە قورئانەوە تێدەگەین کە ئەم پیاوە ئیماندارە لە هۆزی فیرعەون بووە، وەك لە ئایەتەکاندا هاتبوو:

﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ ...﴾ (٢٨) غافر.

واتە: (پیاوێکی ئیماندار لە هۆزی فیرعەون کە ئیمانەکەی شاردبۆوە گوتی...).

کەواتە ئەو لە خانەوادەی دەسەلاتداری فیرعەون بووە، نەك لە هۆزی نەوەی ئیسرائیل (بنو اسرائیل).

هەڵبژاردنی ئەم پیاوە نزیکەی فیرعەون کە لە ئیمان بە خوداو پێغەمبەرێتی موساشەوە نزیکە، چەند ڕاستییەکمان بۆ دەردەخات، وەك:

١- نەمانی پاڵپشتیو ئینتیماو پەیوەندی یە خێزانیو تیرەگەریو عەشایەریو نەتەوایەتییەکان لە کاتی پێچەوانە بوونیان لەگەڵ ئیمان دا، بێگومان ئیمانو باوەڕداریتیش پەرتەوازەییو لێك دابڕان لە نێوان کەسێكو کەسێکی دیو، لە نێوان خێزانێكو خێزانێکی دیو، گەلێكو گەلێکی دی دا ناخولقێنێت، بەڵکو خەڵکی خۆیان بەپێی چەمكو تێگەیشتنە باوەڕدارێتییەکەیان هەر یەکەیان دەبنە کەسێکی باوەڕدار یان بێ باوەڕ، بەمەش لێك دادەبڕێن.

٢- بێگومان ئەم پیاوە باوەڕدارە دڵێکی زیندووو ساغی هەبووەو خاوەنی فیطرەتێکی ڕاستو ڕێك بووەو ئەم فیطرەتو سرووشتە پاکەشی بەهۆی نزیکیی لە حاکمەوە نەشێواوە.

دیارە مرۆڤیش لە هەر شوێنو پلەو پایەیەك دابێت دەتوانێت خۆی لەسەر خێرو ئیماندارێتیو چاکە خوازی بهێڵێتەوە ئەگەر خۆی وای بوێتو ڕێگەی ڕاست بۆ بەدی هێنانی ئەو سیفەتە بەرزانە بگرێتەبەر.

٣- ئەم پیاوە ئیماندارە بە ئیمانێکی گەورەوە بەهرەمەند بوو کە کاریگەری لە ژیانی دا هەبووو پاڵنەری بوو لەسەر نەویستنی دنیاو خۆ بەرز گرتن لە ئاست شتە فریودەرەکانی داو ڕەت کردنەوەی ڕواڵەتەکانی ژیانو پلەو پایەی ساختەو، بە باشتر دانانی پاداشتی خودا لە دنیاو ئەوەی تیای دایەو، ڕەت کردنەوەی هەیبەتو لافو گەزافی ساختە.

هەر بۆیەش بە هیممەتی پیاوانە ئەرکەکانی باوەڕی لەسەر شان هەڵگرتبووو بە نەفس بەرزیو جورئەتو خۆ ڕاگرییەوە بەرەو ڕووی کارەساتەکان دەبووەوە.

٤- بێگومان سنووری ماڵی فیرعەون لە ناوەوە بە ئیمان بەزێنرا بوو، ئەو نوێنەری بێ باوەڕیو ناهەقی بوو، کۆشکەکەشی قەڵای بێ باوەڕیو نا هەقی بوو، ئینجا ئیددعای خوایەتیو پەروەردگارێتی بۆ خۆی دەکردو، خەڵکی دەکردە بەندەی خۆی لە جیاتی بەندەی خودا. بەڵام خودای مەزن هەندێك لە کەسە نزیکەکانی فیرعەونی (بە مەبەستی پووچەڵ کردنەوەی پیلانو مەکری فیرعەونو سەلماندنی لاوازیی کفرو بێ ئیمانییەکەی) بۆ ئیمان بە خودای تاكو تەنیا هان دابوو، بۆ نموونەش ئەوەتا ئەم پیاوە لە هۆزی فیرعەون ڕێبازی ئیماندارێتی هەڵدەبژێرێت، ژنەکەی فیرعەونیش لەسەر ڕێبازی ئیمان دەڕوات بەڕێوە.

٥- موساش- دروودی خودای لێ بێت- لە بانگەوازی خۆیدا سەرکەوتوو بوو، چونکە گەیاندبوویە مەوقعێکی پێشەوەو نزیك لە هێزەکانی دوژمنەکەیو هەر ئەم بانگەوازەش بوو کە پیاوێکی زۆر نزیك لە سەرکردایەتی دوژمنانی بۆ تەرخان کرد بوو، لەوانەشە ئەم پیاوە ئیماندارە چەندین زانیاری گرنگی لەمەڕ جەنگی دوژمنانی بە (موسا) گەیاندبێت.

# دیمەنەكانی چیرۆكەكە

كاتێك بە وردیی سەرنج لەو ئایەتانەی كە چیرۆكەكەی كابرای ئیمانداری نێو هۆزەكەی فیرعەون دەگێڕنەوە، دەدەین، دەبینین ئەم چیرۆكە (بەسەر چوار دیمەنو كۆتاییەكدا) دابەش دەكەن، وەك:-

لە دیمەنی یەكەم دا/ فیرعەون پیلان لە موسا دەگێڕێت، یان دەیەوێت بیكوژێت.

لە دیمەنی دووەم دا/ پیاوە ئیماندارەكە دەردەكەوێتو بەرگریی لە موسا دەكاتو، لە دواندنی جەماوەرەكەش دا سەركەوتووە.

لە دیمەنی سێیەم دا/ فیرعەون جەماوەرەكە بەخۆیەوە خەریك دەكاتو سەرنجیان بەلای هێزو تواناو گەورەیی خۆی دا ڕادەكێشێت تاكو بەدەم بانگەوازی پیاوە ئیماندارەكەوە نەچن.

لە دیمەنی چوارەم دا/ پیاوە ئیماندارەكە جەماوەر بانگ دەكات بۆ شوێن كەوتنی خۆی.

لە كۆتاییدا/ پیاوە ئیماندارەكە گەلەكەی بەجێ دەهێڵێتو كارو بار هەر بەخودا دەسپێرێت.

ئایەتەكانیش بەم جۆرە بەسەر دیمەنەكان دا دابەش كراون:-

دیمەنی یەكەم: ئایەتەكانی (٢٣-٢٧)ی تایبەت بە چیرۆكەكەی بەركەوتووە.

دیمەنی دووەم: ئایەتەكانی (٢٨-٣٥)ی تایبەت بە چیرۆكەكەی بەركەوتووە.

دیمەنی سێیەم: ئایەتەكانی (٣٦-٣٧)ی چیرۆكەكەی بەركەوتووە.

دیمەنی چوارەم: ئایەتەكانی (٣٨-٤٣)ی چیرۆكەكەی بەركەوتووە.

كۆتاییەكەش: ئایەتەكانی (٤٤-٤٦)ی بەركەوتووە.

دیارە هەر دیمەنێكیش بە هێزێكو گیانێكی زیندووو بەوێناندنو كاریگەرییەوە چەندین (لقطة)یان لە خۆ گرتووەو چەند كەسو ڕووداوێكیش پیشان دەدەنو چەند

هەڵوێستەو بزاوتێکیش دەردەخەن‌و، چەندین ڕاستی‌و ئاماژەشمان پێشکەش دەکەن، ڕوانینی ئێمەش بۆ ئەو لەقتەو چرکە سات‌و دیمەنانە ڕوانینێکی شیکاریانەو بابەتیانەیە بەمەبەستی تۆمار کردنی ڕێنماییە باوەڕداریتی‌و بانگەواز کاری‌و حەرەکەت خوازییەکانیان، بەڵام بەڕادەیەکی کەم پەل دەهاوێن بۆ ڕواڵەتە هونەری‌و بەدیار خەرەکانی‌و بۆ شێوازە ڕەوانبێژییەکەی، چونکە ئێمە نیازمان لەوەدا بەند ناکەین، خوداش پشتیوانمانە لەمەدا.

❊ ❊ ❊

## دیمەنی یەکەم:-

## موسا بانگەوازی خودا دەگەیەنێتو، فیرعەون پیلانی لێ دەگێڕێت:-

خودای مەزن فەرموویە:

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا اقْتُلُوا أَبْنَاءَ الَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ وَاسْتَحْيُوا نِسَاءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُ ۖ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴿٢٧﴾ غافر﴾.

(پێشتر بە کورتی مانای ئەم ئایەتانەمان لێك دایەوە)

ئێستاش لەم دیمەنەی چیرۆکەکەدا شیکاریان دەکەین..

بێگومان بەسەرهاتی پیاوە باوەڕدارەکەی خێڵی فیرعەون چیرۆکێکی سەربەخۆی تاکە پیاوێك نییە، بەڵکو ئەڵقەیەکە لە ئەڵقەکانی چیرۆکی خودی موسا (سڵاوی خودای لێ بێت) لەگەڵ فیرعەونو هۆزەکەیدا کە لە چەندین سوورەتی قورئاندا باسی لێوەکراوە، بەسەرهاتی ئەم پیاوە باوەڕدارەش تەنها لە سوورەتی (غافر)دا هاتووە، ئەم سوورەتەش دوو ناوی هەیە، کە یەکێکیان (غافر)ەو دووەمیان (بە سوورەتی (مؤمن) ناوبراوە، مەبەست لە (مؤمن)یش ئەم پیاوە ئیمانداره‌یەو لەوانەیە بۆ ڕێزلێنانیو ستایشی هەڵوێستیو بانگکردنی باوەڕداران بۆ شوێنکەوتنو شوێن پێ‌هەڵگرتنیو سەرمەشق دانانی، ئەم ناوە لە سوورەتەکە نرا بێت.

لە سوورەتی (غافر) یان (مؤمن)دا شیکاری چەند قۆناغێکی بەسەرهاتی (موسا) باس نەکراوە وەك هاتنی بۆ (مەدیەن)و، ئاخاوتنی خودا لەگەڵیدا لەلای چیای (طور)داو، هەردوو بەڵگە ڕۆشنەکەی گۆچانەکەیو، دەستە سپییەکەیو، داواکاریی خودا لە موساو هارون لەسەر ڕۆشتن بۆ لای فیرعەونو گەلەکەیو بانگکردنیان بۆ سەر ڕێبازی خوداو دەست هەڵگرتنیان لە چەوساندنەوەی (بەنو ئیسرائیل)و سەربەست کردنیان، سوورەتەکە ئەم لایەنانەی چیرۆکەکەو شیکاری بەرەنگاربوونەوەی (موسا) لەدژی (فیرعەون)و دیمەنەکانی بەربەرەکانیو کێبەرکێی نێوان موساو سیحربازەکانو، باوەڕهێنانی سیحربازکانو دان بەخۆ داگرتنیانو، دەرچوونی موسا لەگەڵ گەلەکەیداو گەیشتنەوەی فیرعەون پێیانو، ڕزگاربوونی موساو گەلەکەیو تیا چوونی فیرعەونی باس نەکردووە، (بەڵکو ئەمانە هەمووی لە سوورەتەکانی تردا باسکراون)، بەڵام لەم سوورەتەدا تەنها گرنگی بە دەرخستنی هەڵوێستی پیاوە باوەڕدارەکە دراوە، چونکە هەر خۆی خانەی مەبەستە تیایدا.

## ڕوانینێکی هونەری بۆ بڕگەکانی ئەم دیمەنە:

دیمەنی یەکەم ئەم بڕگانەی لە خۆ گرتووە:-

١- لە بڕگەی یەکەم دا:- هەرسێ ستەمکاری لە ستەم ڕۆچوو (فیرعەونو هامانو قارون) لەسەر شانۆی حوکمو فەرماندان سەر گەرمی فەسادو ستەمی زۆر لە جەماوەران.

٢- لە بڕگەی دووەم: (موسا) دروودی خودای لێ بێت- دێتە لای هەرسێ ستەمکارەکەو بانگیان دەکات بۆ باوەڕهێنان لە فەسادو ستەمکاری.

٣- لە بڕگەی سێیەم دا:- هەرسێ ستەمکارەکە بانگەوازی موسا ڕەت دەکەنەوەو بەوە تۆمەتباری دەکەن گوایە سیحربازێکی درۆزنە.

٤- لە بڕگەی چوارەم دا: (موسا) ـ سڵاوی خودای لێ بێت ـ هەر بەڵگەو نیشانەو موعجیزەیەکی پێیە دەیخاتەڕوو بۆ سەلماندنی ڕاستگۆییو پێغەمبەرایەتییەکەی.

٥- لە بڕگەی پێنجەم دا: ستەمکارەکان بەو ڕەنگە دژایەتیی بانگەوازەکەی موسا دەکەن کە ستەم لە شوێنکەوتوانی دەکەن وەك ئەوەی کە کوڕەکانیان دەکوژنو کچەکانیان دەهێڵنەوە.

٦- لە بڕگەی شەشەم دا:- فیرعەونی ستەمکار پیلان لە موسا دەگێڕێتو دەیەوێت بیکوژێتو داوا لەگەلەکەی دەکات ڕێی ئەوەی پێ بدەن، بۆ ئەم مەرامەش چەند هۆکارێکی جوان کراوو پەسند کراویان پیشان دەدات بەمەبەستی پاساو هێنانەوە بۆ خواستەکەی.

٧- لە بڕگەی حەوتەم دا:- موسا پەنا بەخودا دەگرێتو هانای بۆ دەباتو، لە فڕوفێڵی فیرعەون خۆی پێ دەپارێزێت، هەروەها هۆکارە ڕاستەقینەکانی فیرعەون بۆ خەڵکی دەردەخات کە خستوونیە ڕوو بۆ کوشتنی موساو، هۆی تێکچوونی کە سێتیەکەشی ڕوون دەکاتەوە کە چۆن میزاج ونەریتی تێکچووە.

بەم بڕگەیەش دیمەنی یەکەم کۆتایی دێت، ئەمەش کۆتاییەکی ئاساییو، کۆتاییەکی هونەریی بەیانکاری کاریگەرو، کۆتاییەکی بابەتیانەی ڕەوانبێژانەیە..

موساش (سڵاوی خوای لێ بێت) لەم دیمەنەدا کۆتایی بە ئەرکی خۆی دێنێتو بە شێوازێکی هونەرییو لەڕێی بەڵگەو موعجیزەکانیەوە ئەو هۆزە جێ دێڵێتو پەنای بە خوداش گرتووەو هانای بۆ بردووەو پشتیی پێ بەستووە..

ئیدی بەم توێشووە باوەڕداری یە گەورەیەوە بەرەو ڕووی ئەو پیلانەی فیرعەون دەبێتەوە کە لەسەر ژیانی دەیگێڕاو، هەروەها پیاوانەو بە ئیمانو ئارامیو جیهادەوە بەرەو ڕووی خودی فیرعەونیش دەبێتەوە.

لە زمانحاڵی ئەم ئایەتانەشدا وادیارە دەیانەوێت جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە باوەڕدارانەی بانگەوازکاری لە قەوارەی باوەڕدارانـدا بکات کاتێك ئایەتەکان دەخوێننەوە، کە با شوێن پێی موسا هەڵبگرن لەو هەڵوێستەدا.

جا بۆیە هیچ کۆتاییەکی هونەریی نابینیت کە لەم کۆتاییە جوانتر بێت، هەروەها کۆتاییەکی باوەڕدارانەی بانگەوازکاری نابینیت کە لەم کۆتاییە چاکتربێت

## ئامڕازەکانی زۆر داران لەبەرەو ڕووبوونەوەی هەق دا :

موسا بە ڕێبازێکی هەق لەلای خوداوە چوو بۆ لای فیرعەونو گەلەکەی‌و، ئەو بەڵگەو نیشانە رۆشن‌و موعجیزانەشی بۆ خستنە ڕوو کە دەلالەتیان لە ڕاستی ی پێغەمبەرێتییەکەی دەکرد، بەڵام ئەوان لە جیاتی ئەوەی شوێنی بکەون‌و ئاینەکەی وەربگرن، بەدرۆیان خستەوەو، بە سیحرو درۆ خەتاباریان کردو گوتیان (ساحر کذاب)، جا خۆزگە هەر تەنها بە باوەڕ پێ نەهێنان‌و بە درۆخستنەوەی وازیان لێ بهێنایە (هەر چەندە ئەمەش هەڵوێستێکی ناشیرین‌و تاوانێکی زێوە)، بەڵکو چوونە سەر قوناغێکی دی کە لە کفرێکی سەر سەختانەو ستەمی زۆرو شێواندنی تەواو دا خۆی دەنواند، بە حیقدو ڕق‌و کینەوە دژایەتییان دەکرد، لەم دژایەتییەش دا ئامڕازێکی گەندەڵیان بەکارهێنابوو کە لەگەڵ هیچ داب‌و نەریت‌و یاساو ئاکارێك دا نەدەگونجا، ئەوە بوو ئازاری کەس‌و کارو شوێنکەوتوانیان دەدان‌و دەیانگوت (کوڕانی ئیمانداران بکوژن‌و کچ‌و ژنەکانیان بهێڵنەوە).. ﴿...ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ ...﴾ (٢٥) غافر.

بەکارهێنانی ئامڕازێکی ئاوا لە دژایەتی‌و ململانێدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چەند ڕق‌و کینەو پیلان‌و تۆڵە لە دڵیان دا هەیەو چەندە ئەو دڵە ساردو سڕانەیانی پڕ کردووەو هەموو مانایەکی سۆزو چاکەو خێرو بەزەیی‌و مرۆڤایەتی لێ دەرهێناون. بۆچی کوڕانیان دەکوشت‌و ئافرەتەکانیان دەهێشتەوە؟!

بۆیە وایان دەکرد تاکو ببنە کۆسپی بەردەم ڕێگای بانگەوازو نەهێڵن لە نێو کەسانی تردا بڵاو ببێتەوە، چونکە کەسانی تر بەر لەوەی بەدەم بانگەوازەکەوە بێن، بیرێکی قووڵ دەکەنەوە لەوەی بەهۆی باوەڕهێنانەوە چییان بەسەر دێت‌و ئیدی ترسیان لەسەر کوڕو ئافرەتەکانیان دەبێت کە بکەونە دەست حاکمەکان.

هەروەها بۆیە ئەم ڕەفتارەیان دەنواند تاکو فشارێکی ئازار بخەنە سەر باوەڕداران‌و لەو ئاقارەشەوە فشارەکەیان لەسەر بێت کە زیاد لە هەر ئاقارێکی دی ئازاریان دەدات‌و، واش گومان بەرن گوایە ئەمە خاڵێکی لاوازی دەبێت بۆیان‌و وایشیان لێ دەکات واز لە بانگەوازو بانگەوازکاران بێنن.. ئەمەش ئاقاری ئازاردانی خێزان‌و خانەوادەو کوڕان وکچەکانە.. خۆ بەڕاستی خاڵێکی لاوازیشەو فشار دانان لەم ئاقارەوە هێجگار بە ئازارەو دیارە وا لە کەسانێك دەکات کە بە فیعلی‌و بە کردەوە واز لە حەق بێنن.

بەڵام ئەم ڕەوتەیان بۆ دژایەتیی چەند کەسێکی بێ تاوان‌و بێ دەسەڵات کە منداڵانی کوڕو ئافرەتانن خۆی لە خۆیدا ستەم‌و دەستدرێژیە لەو ستەمکارانەوە، چونکە ئەو بێ تاوانانە بە تۆمەتێك سزا دەدەن کە ئەنجامیان نەداوە، هەروەها ئەم ڕەوتە نائینسانییە ڕق‌وکینەو پیلان‌و زەبرو زەنگێکی زۆریشی لەخۆ گرتووە چونکە کوشتاری چەند منداڵێکی بچووك‌و لاواز دەکەن کە هیچ وزەو توانایەکیان لە جەنگدا نیەو ناشتوانن خۆیان بۆی ئامادە بکەن، جا وەك پێشتر گوتمان ئەم شێوازە لەگشت مانایەکی ڕەحمەت‌و مرۆڤایەتی دابڕاوەو لەگەڵ هیچ عورف‌و حەقێکیان لەگەڵ هیچ بنەماو یاسایەکدا ناگونجێت.. بەڵام ئاخر کەی‌و چ کاتێك ئەوانەی لەسەر ناهەق‌و (باطل)ن، بە یاساو بنەماکانەوە پابەندن لە کاری دژایەتیی هەق‌و شوێنکەوتوانیدا.

ماوەتەوە بڵێین: بێگومان ئامڕازی ﴿...ٱقۡتُلُوٓاْ أَبۡنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ وَٱسۡتَحۡيُواْ نِسَآءَهُمۡۚ ...﴿٢٥﴾ غافر:﴾. تەنها فیرعەون‌و گەلەکەی بەکاریان نەهێناوەو هەر تاکە ئامڕازی تایبەتیی ئەوان نەبووە، بەڵکو ئامڕازێکی هەمیشەیی‌و درێژکراوەی چاخ لە دوای چاخی شوێنکەوتوانی نا هەقە، کە بە کاری دەهێنن لە ڕووبەڕووبوونەوەی شوێنکەوتوانی هەق دا.. بەڕاستی مێژوو ئاگادارەو چەندین نموونەی توندو ئازار بەخشی لە کۆن‌و نوێدا لەسەر ئەم ئامڕازە شەیتانییە کینە بەرانەیە لە لاپەڕەی یاداوەرییەکانیدا تۆمار کردووە.

## بۆچی فیرعەون مۆڵەتی کوشتنی موسای لەهۆزەکەی خۆی دەخواست؟

فیرعەون ڕقو کینەو پیلانی خۆی ئاڕاستەی (موسا) کرد بووو، دەیویست بیکوژێت تاکو بەمە بانگەوازەکەشی لەناو ببات، بۆ کاری کوشتنیشی داوای مۆڵەتی لە هۆزەکەی دەکرد:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ﴿٢٦﴾ غافر﴾.

بەڕاستی سەیرەو داوایەکی سەیرو سەمەرەیە کە فیرعەون داوا لە هۆزەکەی دەکات تا ڕێی بدەن (موسا) بکوژێت، مەگەر هەر فیرعەون خۆی نەبوو کە بە هەواو ئارەزووی خۆی حوکمی ئەو خەڵکەی دەکردو هیچ بەرهەڵستکارێکیشی نەبوو، چونکە لە هەموو بیروڕایەکیدا لەگەڵی دابوون، تەنانەت لەوەشدا، کە پڕوپاگەندەی خوایەتیو پەروەردگارێتی بۆ خۆی دەکرد..

جا داخۆ مانای ئەمە چی بێت کەوا داوای ڕەزامەندیی ئەوان دەکات بۆ کوشتنی (موسا) هەر چەندە ئەگەر بەبێ پرسو مۆڵەتی ئەوانیش بیکوشتایە هەرگیز بەرهەڵستیان نەدەکرد ؟!!

وا دیارە ئەو بەم مۆڵەت خواستنە ویستوویەتی خۆی وا پیشان بدات گوایە زۆر سوورە لەسەر هاوکاریی گەلەکەیو داوای ڕاوێژو ئاڵو گۆڕی بیروڕایان لێ دەکات, یان وا دیارە ویستوویەتی لەم کارە ترسناکەدا ئەوانیش بەشدارکاتو ئەو هەستەیان بۆ دروست کات گوایە (موسا) دوژمنی ئەوانیشە وەك چۆن دوژمنی خۆیەتیو، ئەوانیش وەك خۆی خاوەنی کێشەکەنو، بەم ڕەنگەش بەجۆش بن بۆ دژایەتیی (موسا) لەوانەشە ویستبێتی ئاکامی کوشتنەکەی بخاتە ئەستۆیان تاکو بیر لە لێپرسینەوەی (فیرعەون)یان موحاسەبەکردنی نەکەنەوە.

بەڕاستی ستەمکارو تاغووتەکان (لە هەر زەمانو شوێنێکدا بوو بن) ڕێچکەی فیرعەونیان لە دژایەتی هەقو لە کوشتنی پیاوانو سەرکردەکانی هەقدا وەبەرناوەو

لە هەمان کاتدا گەلانی ژێر دەستەلاتیشیان لە هەلگرتنی باری گوناەو خوێنڕشتنی هەقخوازاندا بەشدار کردووە، لەم کارەش دا هەموو بەیاننامەو ڕوونکردنەوەیەکی چەواشەکارانەیان ڕێك خستووەو، فەتواو پرسیارو وەلامیان ئامادەکردووەو، دیدارو وتوویژو چاو پێکەوتنیان بۆ سازداوە تاکو لە دەرەنجامی ئەو شێوازەنەدا بە ئارەزووی خۆیان بڕیارەکانی داڕێژنەوەو ئەنجام بدەن.

## بێشەرمی فیرعەون لە وتەی (وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ)دا

فیرعون دەیەوێت (موسا) بکوژێت، لەمەش دا هیچ حسابێك بۆ خودای (موسا) ناکات، نەلێی دەترسێتو نە ڕێزو شکۆی لێ دەنێت، ئەم نەریتەشی بەو وتەیە دەربڕی کە گوتی (وليدع ربه) واتە (ئەوا من موسا دەکوژمو با ئەویش هەر داوا لە خودای خۆی بکات کە فریای کەوێتو با هەر پەنا بەرێتە بەر ئەو خودایەی).. ئەم وتە ناشیرینەشی دەلالەت لەسەر لووتبەرزیو بێشەرمو حەیاییو سووکایەتیکردنی دەکات، ئەو باوەڕ بە خودای —موسا- ناهێنێتو بە چاوی سووکایەتی بۆی دەڕوانێت، (با پەنا بەرێتە بەر خودای خۆی) واش دەگەیەنێت گوایە خودا فیرعەون ناترسێنێتو ناتوانێت ڕێی کوشتنی لێ بگرێت.

بێگومان نەترسان لە خودا ئەم هۆیە بوو کە پالی بە هەر ستەمکارێکەوە ناوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بانگەوازکارانی هەقو ئازاردانو کوشتنیان..

خۆ گەر ئەم ستەمکارەش باوەڕی بە خودا بهێنایەو ڕێزو شکۆی لێ بنایە ئەوا ئازاری شوێنکەوتوانی خودای نەدەدا.

ئەو ڕستە فیرعەونییە ناشیرینەش (با پەنا بەرێتە بەر خودای خۆی) هەموو ستەمکارێك لەکاتی بەربەرەکانیکردنی سەربازانی خوادا گوتوویانەتەوە، هەندێکیان بە زمانیان گوتوویانەتەوەو هەندێکی تریشیان لە کردارو هەلسوکەوتیاندا ڕەنگی داوەتەوە..

جا هەر کاتێك چەند ستەمکارێك چەند بانگەوازکارێکی خودایان سزا دابێتو خستبێتیانە نێو زیندانەکانەوەو چەندین جۆر سزاو ئەشکەنجەیان پێ گەیاندبن‌و یەکێك لە بانگەوازکارەکان ڕووی لە خودا کردبێتو پەنای بۆ بردبێتو گوتبێتی (خودایە/ یا الله)، ئەوا ستەمکاری قامچی وەشێن دەسبەجێ پێی گوتووە: (ئەگەر خودای تۆ بێتە ئێرە ئەویش لەگەڵ تۆدا دەخەمە کونجی زیندانەکەوە)! جا کاتێك ستەمکارێك ئەم قسەیە دەکات ئەوە لە فیرعەون بەدڕەفتارترو بێحەیاترو بەزەبرترە.

## فیرعەون پڕوپاگاندەی بەرگریی لە ئاسایش‌و ئایین دەکات:

داخۆ ئەو هۆیانە چی بن کە فیرعەون دەیانخاتە بەرچاوی گەلەکەی‌و پاساوی کوشتنی موسایان پێدەهێننەوە؟! وەك لە وتەکانیدا هاتووە ئەم هۆیە خولقێنراوانە بوون:- ﴿...إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٦﴾ غافر﴾.. واتە: (من بۆیە (موسا) دەکوژم چونکە لەوە دەترسم کە دین‌و ئایینی ئێوە بگۆڕێت، یاخود خراپەو بەدکاری لە ولاتەکەمان‌و سەر زەویدا بێنێتە ئاراوە).

کەوابوو فیرعەون دوو هۆی خولقاندبوو، یەکەمیان: پاراستنی ئایین، چونکە بە وتەی فیرعەون (موسا) دوژمنی ئاینیان بووەو فیرعەونیش بەرگریکارو بەپەرۆشی ئەو ئاینە بووە.

دووەمیان: پاراستنی ئاسایش، چونکە هەر بە وتەی فیرعەون (موسا) دژی ئاسایش بووەو فیرعەونیش پارێزەری ئاسایش بووە.

فیرعەونی کافرو بێباوەڕ کە بە گەلەکەی گوتبوو: (من خودای بەرزو بالاتانم/ ... أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾ النازعات. پێشی گوتبوون: (جگە لە خۆم هیچ خودایەکی تر بۆ ئێوە شك نابەم/ ...مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي... ﴿٣٨﴾ القصص.

بەم ڕەنگەش بۆتە کەسێکی ڕژدو دەمارگیر لەسەر ئایینو، پاسەوانیی بووە لە دژی هەر گۆڕانکاریو ئاڵوگۆڕ پێکردنێك کە لەسەر دەستی موسا هەڕەشەی لێوە بەدی دەکرا.

فیرعەونێك کە بە (ستەمو بێباوەڕی) فەسادی بڵاودەکردەوەو، بە (لووتبەرزیو خۆ بەزل زانی) دنیای تێك دەدا، بووەتە بانگخوازی چاکسازییو خێرو ئاسایشو خۆشگوزەرانی..

ئەم پاکانەکاریو لێکدانەوە فیرعەونییەش هەموو ستەمکارێکی دی لە بەربەرەکانیکردنی هەقو شوێنکەوتوانیدا پەنای بۆ دەبات.. ستەمکاری دەسەڵاتدار خۆی وا پیشانی خەڵکی دەدات گوایە پیاوێکی بە ئیمانو دیندارەو، پاسەوانی ئیمانو باوەڕدارێتییەو، سوورە لەسەر نەریتە جوانەکانو، ڕژدە لەسەر ڕەوشتو ئاکارەکانو، خوازیاری ئاوەدانکردنەوەو پێشکەوتنو ئاسایشو گەشەسەندنە، کەچی لە هەمان کاتدا بانگەوازکارانی ڕێی خوداش واپیشان دەدات گوایە چەند گێرەشێوێنێکی تێکدەرو، گومڕاو گومڕاکارو، دوژمنانی خوداو نەتەوەو نیشتمانن‌و، هاوپەیمانی شەیتانو سەرکردەی فیتنەو، بانگەشەچییانی گومڕایین.. لەبەرئەمە پێش ئەوەی نیازە شەیتانییەکانیان بەدی بێنن پێویستە قەڵاچۆ بکرێن..

(سید قطب) -خودا پلەی بەرزکات لە نێو شەهیدان- دەربارەی ئەو پاساوەی فیرعەون بۆ کوشتنی (موسا)و، دەربارەی هەمان پاساوی ستەمکارانی تریش کە لە دژی بانگەوازکاران دەیهێننەوە، گوتوویە:- ((ئایا لەو پاساوە سەیرو سەمەرەتر هەیە کە فیرعەونی گومڕای بتپەرست دەربارەی (موسا)ی پێغەمبەری خودا بڵێت..)) ﴿...إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٦﴾ غافر﴾ ؟! ئایا ئەمە هەمان وتەی گشت دەسەڵاتدارێکی خراپکار نییە کە لەمەڕ گشت بانگەوازکارێکی چاکەخواز دەریدەبڕن؟ ئایا هەمان وتەی ناهەقی

ناشیرین نییە کە بەرەو ڕووی هەقی جوانو قەشەنگ دەگوترێت؟ ئایا هەمان وتـەی پیسی چەواشەکاری نییە کە بۆ وروژاندنی هـزرو ئەندێـشەکان بەرامبـەر ئیمـانی هێمنو ئاسوودە دەگوترێت؟ ئەمە هەمووی یەك لۆژیکەو بەدرێژایی سەردەمەکانو لە گشت جۆرە شوێنێکدا هەر کاتێك هەقو ناهەقو، ئیمانو کفرو، چاکسازیو لـە ستەمدا ڕۆچوون، ڕووبەڕووی یەکدی بووبنەوە، دووبارەو چەندبارە بۆتەوە.. چیرۆكو ڕووداوەکانیش دێرینو چەند بارە بووەوەن کە ناوبەناو دەخرێنەوە بەرچاو)[1] .

## (موسـا) پەنـا بۆ خوا دەبـات :

(موسا)—سلاوی خودای لێ بێـت- چـۆن ڕووبـەڕووی فڕوفێڵـی فیرعـەونو ڕقو کینـــەو پـــیلانو دوژمنکـــاریی بـــووەوە؟!.. ﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾ غافر﴾.. واتە: (موسا- گووتی: من پەنام گرتووە بـە خـودای پـەروەردگارم (کـە بێگومـان پـەروەردگاری ئێوەشە) پەنام پێ گرتووە لەهەر لوتبـەرزو خـۆ بـەزل زانێـك کـە بـاوەڕ بـە ڕۆژی حسابو لێپرسینەوە ناهێنێت).

بێگومان (موسا) پەنای بردۆتە بەر خودای خۆیو پشتی پێ بەستووەو جڵـەوی کاروباری پێ سپاردووە، چـونکە زانیویـەتی کـە هـەر خـودا خـۆی پـشتو پـەناو پارێزەرو لە خۆگریەتیو، هەر خوداش داڵدەو پەنای دەداتو فریای دەکـەوێتو لـە فروفێڵو دەسدرێژی فیرعەون رزگاری دەکات.

جا پێویستە ئەم هەڵوێستە ئیماندارانە گەورەیەی موسا-سلاوی لێبێت- ببێتـە نموونەیەکی پەیڕەوکراوی هەر بانگەوازکارێك کە ڕووبەڕووی فـڕوفێڵو ڕقو کینـەی ستەمکاران دەبێتەوە، چونکە جگە لە خودا کەسی تـری نییـەو بـەهیچ شـتێکیش

---

١) في ظلال القران/٥:٣٠٨٧.

ڕزگاری نابێت تەنها به پەنا بردنه بەر خوداو خۆ خستنه ژێر سایەی پارێزگارێتیی خوداوه.. ئەمەش ڕاستیو بنجو بناوانی ئیمانو مەرجیشیەتی.

خۆ ئەگەر مرۆڤی بانگەواز کار وانەکاتو پەنا بەرێته بەر خەڵکی لاوازو بێ دەسەڵات، ئەوا بەمه کەموکوڕیی دەخاته باوەڕەکەیەوەو، عەقیدەشی دەڕوشێنێت، پاشان بەم پەنا بردنه بەر مرۆڤه لاوازانەش چارەسەرێکیان لێ دەسگیر ناکاتو ڕزگاریو سەر فرازیشیان لێ وەرناگرێت، جا هەر بانگەوازکارێك وتەکەی موسا بڵێتەوه: (إني عذت بربي وربكم) ئەوا له چەند حەقیقەتێکی زیندووی ژیاندا دەژی.

## موسا دەروونی ستەمکاران شیی دەکاتەوە :

وتەکەی (موسا) ـ سەلامی لێ بێت ـ: ﴿...إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴿٢٧﴾ غافر﴾.. لێکدانەوەیەکی ڕاستو تەفسیرێکی دروستو شیکردنەوەیەکی ساغی هەڵوێستی ستەمکارانمان دەخاته بەرچاو، هەروەها باری دەروونیی گشت ستەمکارێكو رازی ستەمو لەستەمدا ڕۆچوونیشیمان بۆ شیی دەکاتەوه. بێگومان ستەمکارییو ڕۆچوون تێیدا دووهۆی هەیه، کەوا لەو ستەمکارەدەکەن سووربێت لەسەر ستەمو زۆرداریو دوژمنکاریی.

ئەو دوو هۆیەش ئەمانەن:-

یەکەم: خۆ بەزل گرتن ئەو هۆیەیه، کە پاڵ بەوستەمکارانەوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی تاوانەکانو کاری خراپەو شێواندن لەژیاندا، هەر ئەوهۆیەشە ڕێی تەنازولو وازهێنان له دەسکەوته حەرامه بەدەستهێنراوەکانیان لێ دەگرێتو، ناهێڵێت دەست لەو ڕواڵەته پووچەڵو بەتاڵانەش هەڵگرن، کە چوار دەوری دەروونەکانیانی داون.. بەڕاستی (خۆ بەزل گرتن) بەربەستێکه بۆ ئەوان، کە ناهێڵێت مل بەهەق بدەنو دانی پێدا بنێنو پەیڕەویی بانگخوازانی بکەن.

جا بێگومان هیچ کەسێك هەق ڕەت ناکاتەوه، تەنها کەسێکی لووتبەرزو

خۆ بەزل زان نەبێت، هەر ئەم کەسەش بەربەرەکانی ودژایـەتی شـوێنکەوتوانی هەق دەکات.

دووەم: باوەڕنـەهێنان بـەڕۆژی حـساب لەگـەڵ کـردنو لێپرسـینەوە، چـونکە دەسەلآتداری لە ستەمدا رۆچوو (الطاغیـة) لـەو بڕوایەدایـە کـەژیانی دنیـای هەموو شتێکە بۆ ئـەو، بیروڕاشـی وایـە کـە هێـزی خـۆی هـەر دەمێنێـتو دەسەلآتەکەشی هەربەدەوام دەبێت، خۆ ئەگـەر ئـەو بـاوەڕ بـەرۆژی قیامـەت بێنێتو لە حسابو چەندو چوونی رۆژی حساب بترسێت، ئەوا بێگومان واز لە ستەمو زۆرداریی یەکەی دێنێت.

کەوابوو هۆکاری تاوانەکانو لەهەق لادان باوەڕنەهێنانە بەڕۆژی لێپرسـینەوە.. زمانەی دڵنیایی (صمام الامان) ی مرۆڤو بنچینەی چاکردنی ژیانیش باوەڕهێنانـە بەرۆژی لێپرسینەوە، ئەم باوەڕەش زامنی راگرتنی ستەمکارە لە ئاست ستەمەکەی داو زامنی مل بەهەق دانو خۆبەهەق سپاردنیشیەتی.

## دەرکەوتنی پیاوە ئیماندارەکە لەکاتی گونجاودا :

خـودای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ ... ﴿٢٨﴾ غـافر﴾ ..واتـە. (پیـاوێکی باوەڕدار لەخزمانو لەهۆزی — فیرعەون- کەباوەڕەکەی شاردبۆوە هاتە لایان وپێـی گـوتن: (ئـەری ئێـوە پیاوێـك تـەنها لەسـەر ئـەوە دەکـوژن کـەدەڵێت: خـودای پەروەردگاری مـن —اللە-یـە))؟ ئـەم پیـاوە ئیمـانی خـۆی دەرنەخـستبوو، بـەلآم لەدواییدا ناچار بوو دەری بخات، وادیارە ئەو هۆیەی وای لێ کردووە کەباوەڕی خۆی ئاشـکرا بکـات، ئـەو وتەیـەی فیرعەونـە: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ... ﴿٢٦﴾ غافر﴾. ئەم وتەیەشی بـە هەڕەشـەیەکی ڕاستەوخۆ بـۆ سـەر ژیانی (موسا) داناوە. موساش (سلآوی لێ بێت) پێـشەوایەتیو، ژیـانی پێـشەوای

بانگەوازەکەی لەمەترسیدایە. بەم رەنگە خودی بانگەوازەکەش لە مەترسیدایە. ئایا ئیدی هیچ هۆیەکی حەشاردەری باوەڕەکەی لەئارادا ماوە؟

ئەی داخۆ ئیدی ئەو باوەڕە حەشاردراوەی بەکەڵکی چی دێت ئەگەر پێشەوای بانگەوازەکە لەنێو ببرێتو ئەگەر خودی بانگەوازەکەش لەنێو ببرێت؟! خۆ ئەگەر پێشتر بۆی شیاوبووبێت کە باوەڕەکەی بشارێتەوە ئەوەدیارە بارودۆخەکە ڕێی پێداوە، بەڵام ئێستا ئەوەی بۆ ناشێت. بێگومان ئەم باوەڕدارە دوو ڕێگەچارەی لەبەردەم دابووە کە شیرینترەکەیان تاڵ بووە.. یان دەبێت باوەڕەکەی بەحەشاردراوی بهێڵێتەوەو ڕێگەچارەی سەلامەتیو پارێزراویی هەڵبژێرێت، تەنانەت گەر بانگەوازەکەو پێشەواکەشی لەنێو ببرێت، یاخود باوەڕەکەی دەرخاتو بچێتە پێشەوە بۆ بەرگری کردن لەبانگەوازەکەو لەپێشەواکەی، تەنانەت گەر راستیی کارەکەش بخاتە ڕووو، خۆیشی بخاتە بەر ئەشکەنجەو مەترسی.

وا دیاریشە ئەم هەڵوێستە باوەڕدارانەیەی بانگەوازیی ئەم پیاوە ئیماندارە رووکارێك لەڕووکارە جوانەکانی بانگەواز بۆ لای خودامان پیشان دەدات، هەروەها وانەیەکی بانگخوازانەی زۆر پێویستە بۆ بانگەوازکارانو زانیاریش بۆ هەر بانگەوازکارێك پێشکەش دەکات، کە لەچ کاتێکدا شاردنەوەی بانگەوازو نهێنگیریی تێیدا پێویستن.

دیارە شتێکی باشەو پاکیشە، ئەگەر لە هەندێك جاردا بانگەوازکاران بانگەوازیان بشێرنەوەو بەنهێنی ئیشی لەسەر بکەن. بەڵام هەندێك بارودۆخی تازە دێتە پێشەوە، هەر دەبێت ئەو بانەگەوازکارانە هەڵوێستەکانیان دەسنیشان بکەنو بانگەوازیان دەربخەنو باوەڕیان ئاشکرا بکەن، جا ئەگەر لەم جۆرە بارودۆخەدا یەکێك لەوبانگەوازکارانە شاردنەوەی بانگەوازو نهێنگیریی بەباشتر دەبینی، ئەوە بێگومان تووشی جۆرە ترسنۆکییەك بووە ، یاخود تووشی بەزین بووە، یان سەلامەتیو خۆپارێزیی، یان پەنا بردنە بەر دنیاو خۆشییەکانی بەچاکتر دەزانێت،

یاخود بەرژەوەندییی تایبەتیی خۆی دەخاتە سەرووی بەرژەوەندیی بانگەوازەکەوە.

لەراستیدا بەرژەوەندیی بانگەواز لەپێشترو لەسەرووی بەرژەوەندیی شەخصی بانگەوازکارانو سوودە تایبەتییەکانیشیانەوەیە.. خۆ ئەگەر لەهەندێك بارودۆخ دا شاردنەوەی بانگەوازو پەنهانکاریی تێیدا بەژیریو زیرەکیو دووربینیی دابنرێت، بەڵام لەچەندین بارودۆخی دیکەدا ئاشکرا کردنی بانگەوازو دەرخستنی ئیمان گەلێك ژیرانە ترو زیرەکانە ترو پیاوانەترو بەئارامترو بوێرانەترە.

دەبا هەر بانگەوازکارێك بەچاکی ئەوە بزانێت کەوا (کەی) ولە چ کاتێك دادەبێت بانگەوازەکەی بشارێتەوەو، لەچ کاتێکیشدا ئاشکرای بکات، ئینجا بەهاوڕێکیو بابەتیانەو بە نەریتێکی پیاوانەو هاوسەنگیی باری دەروونی یەوە نێوانی هەردوو هەڵوێستەکە رێك بخات..

پاشان با تاکە پاڵنەرو هاندەری شاردنەوە یان ئاشکرا کردن بەرژەوەندیی بانگەوازەکەو هێزو گوڕیی پێشکەوتنیو سەرکەوتنی بێت.

## دیمـەنی دووەم :

## بەرگرییی پیاوە باوەڕدارەكە لە –موسا– و سەركەوتنی لەدواندنی جەماوەردا :

خودای مەزن فەرموویەتی:-

﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤۡمِنٌ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ﴿٢٨﴾ يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ مُّرۡتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡۖ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ ﴿٣٥﴾ غافر﴾.

بێگومان لە سەرەتای ئەم چیرۆکەدا، مانای هەموو ئەم ئایەتانەمان بەکورتی لێك دایەوەو لەم وێنانەی دیمەنەکەشدا بەدرێژیی شیکاریان دەکەین.

پیاوە باوەڕدارەکە لەکاتی گونجاودا چووە پێشەوەو باوەڕی خۆی ئاشکراکردو ڕووبەڕووی فیرعەونو ستەمو زۆرداریەکانی بووەوەو، بەرگریی لەموسا بە سەرکەوتوویی کردو، بەشێوازێکی سەرکەوتوانەش بانگەوازەکەی خستە بەر دیدەی جەماوەرو توانیی بە لێهاتوویی بیاندوێنێتو، لەم کارەشدا چەند هەڵسوکەوتێکی جوانی گرتەبەر.

بێگومان ئەم پیاوە بەشێوەیەکی (بەرنامەرێژیی) شێوازو دەربڕینەکانی دیاری کردبووو، قۆناغ بە قۆناغیش بانگەوازەکەی بۆ ئامادەبوان ڕوون دەکردەوەو لەمەوقیعێکیشەوە بۆ مەوقیعێکی تری دەبردن، خۆیشی دەرکی بەو وتانەی کردبوو، دەیزانیی چییان پێ دەڵێت و، بەنەخشەو بەرنامەیەکەوە بۆیان دەدوا.

هەروەها دەرسێکی کاریگەریی بانگەوازکاریی دەربارەی ڕێبازی خستنەڕووی بانگەوازو شێوازەکانی کارتێکردن لە بیسەران پێشکەش بەبانگەوازکاران دەکات. بۆیە پێویستە گشت بانگەوازکارێك کە (بەبانگەوازەکەیەوە هەڵسو کەوت دەکات) بیکاتە سەرمەشقی خۆیو سەرکەوتنی شێوازی خۆی پێ بخوازێت.

ئەم پیاوە باوەڕدارە سۆزو نەرمیی لەبانگەوازەکەدا نواندووەو، هەنگاوەکانی بەچاکی ڕێك خستووەو وتەکانی دیاری کردووەو، بەووردی لەهەنگاوێکەوە بۆ هەنگاوێکی دیو، لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دی مەبەستی خۆی دەربڕیوە، قۆناغو هەنگاوو هەڵوێستەکانیشی لەسەر یەکدی بنیات ناونو، بەم ڕەنگە گەشتێکی سەرکەوتوانەی بانگەوازکارێتیی بەئەنجام گەیاندووە. ئەم پیاوە (وەك لە نمایشە قورئانییەکەوە باسی لێ‌کراوە) دێتە سەر شانۆی واقیعەکەو (فیرعەون)یش لەوێدا تاکە فەرماندەرو تاکە ڕێگرو، پیلانگێری دژی موسایە، فیرعەون لەوێدا تاکە وتاربێژەو هەموان گوێ بیستی بوون، ئیدی بەئارەزووی خۆی بەخۆیەوە

دەنازێت‌و خۆی بەزل دەگرێت‌و فوو لەخۆی دەکات وخۆی دەئاوسێنێت‌و هەڕەشەو گوڕەشەو سزای سەخت پیشان دەدات‌و خۆی بەتوندوتیژ دەنوێنێت.

لەم شانۆیەدا پیاوە باوەڕدارەکەی بۆ پەیدا دەبێت وبەرەو ڕووی دەوەستێت‌و دەست دەکات بەوتاردان بۆ جەماوەرەکەو وتارێکی کاریگەریان ئاراستە دەکات‌و، هێدی هێدی رایاندەکێشت بەلای خۆی داو، لە هەر هەڵوێست‌و جم‌و جووڵێکیدا فیرعەون شەرمەزارو دەمکوت دەکات‌و تەنگی پێ هەڵدەچنێت‌و، لە بەردەم خەڵکیشدا وەك ستەمکارێکی بەزەبرو لووتبەرزو نادانی پیشان دەدا، کە هیچ بەڵگەو پاساوو لۆژیك‌و هۆیەکی قەناعەت پێکاری بەدەستەوە نییە. بەم شێوەیە پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون پێی لەسەر شانۆکە توند کردبووو کۆنترۆڵی بارودرۆخەکەو بابەتە نمایشکراوەکەشی کردبووو، دەنگی فیرعەونیشی کز کردبووو وجودی لەئارادا نەدەهێشت.. جا هەر کە لەوتەو بانگەشەو وتارەکەی بووەوە شانۆکە فیرعەونی تێدا نەماو، پیاوە باوەڕدارەکە بەتەنیاو بەرێکی لەسەر شانۆکە مایەوەو لە سەکۆی ئەو شانۆیەوە، وەك بانگەوازکارێکی ئامۆژگارو ڕێپیشاندەر مایەوە، هەموان گوێیان بۆ شل کردبووو، بە وتەو گفتوگۆی سەرسام ببوون، پاشان دوای ئەوەی ئەرکی خۆی راپەڕاندو خۆی‌و بانگەوازەکەی پێ ناساندن، بەپشتیوانی خودا شانۆکەی بەجێ‌هێشت‌و کاروباری خۆی هەر بە خودا سپاردو.. ئیدی پەردەی شانۆکەش دادەدرێتەوە.

ئەم پیاوە باوەڕدارە هەرچەندە یەکەمجار سەرکەوتوانە باوەڕی خۆی شاردبۆوە، بەڵام دوای ئەوە لەئاشکراکردنی ئەو باوەڕەیدا سەرکەوتووتر بوو.. هەرچەندە لە شاردنەوەی باوەڕەکەیدا شارەزاو زیرەك بوو، بەڵام دوایی لە دەرخستنیدا زیرەکی‌و شارەزاییی‌و زیاتری هەبوو.. بەهەر حاڵ ئەگەر لەشاردنەوەی باوەڕەکەیدا (پیاو) بووبێت، ئەوا لە دەرخستنیدا پیاوەتییەکی بەهێزتری هەبووە..

## بڕگـەکانی دیمەنی دووەم:

دیمەنی یەکەمی ئـەم چـیرۆکە بەبڕگەیـەکی جـوانی ئیمانداریانـە کۆتـایی پـێ هاتووە، ئەوەبوو (موسا) ـ دروودی لـێ بێـت ـ پـەنای بـردە بـەر خـودای خـۆیو کاروبـاری خـۆی پـێ سـپاردو، لـەڕوو بـەڕوو بوونـەوەی فیرعـەونو فـڕو فـێڵو پیلانەکانیشیدا پشتی هەر بەخودا بەست.

دیمەنی دووەمیش بەبڕگەیەکی جوانی ئیماندارییانەی پیاوە باوەڕدارەکـەی هـۆزی فیرعەون دەست پێ دەکات، کە تێیدا ئەم پیاوە بەرگریی لەموسا دەکاتو ناهێڵێت فیرعەونو گەلەکەی (موسـا) بکـوژن.. ئـەوا خـودا وەك (حیکایـەتخوانێك)، واتـە (چیرۆك گێڕەوە) کابرای ئیماندار وادەناسێنێت، کە دەچێتە سەر شانۆکەو، ئـەویش ناسنامەی ئامادەبوانی تری سەرشانۆکە دەردەخات، حیکایەتخوان بەم وتەیە وەسفی ئیماندارەکە دەکات: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ ﴾...

واتە: (پیاوێکی باوەڕدار لە هۆزی فیرعەون کە بـاوەڕی خـۆی شـاردبۆوە گـوتی..)

دەکرێت لە دیمەنی دووەم دا ئەم بڕگانە بەدیی بکەین:-

بڕگـەی یەکـەم/ دەرکـەوتنی پیـاوە باوەڕدارەکـەو بـە ناشـیرین دانـانی ئـارەزووی هۆزەکـــەی لـــەکاری کوشـــتنی موســـاداو ترســـاندنیان لـــەئاکامی پێنانـــە سەرکەوتنێکی ئاوا کە چەند کەتنێکی دزێوو ناشیرینە.

بڕگەی دووەم/ دەرکەوتنی فیرعـەونو دواندنی هۆزەکەی لەمەڕ ئەوەی، گوایـە هـەر بـیروڕای خـۆی تـەواوەو، هـەر ڕێگـای خـۆی ڕێ ڕاسـتەو، ئـەوانیش تـەنها هەماهەنگیو لەگەڵدا ڕۆیشتنی ئەویان لەسەرە.

بڕگەی سێیەم/ دەرکەوتنەوەی پیاوە باوەڕدارەکە لەدوای فیرعەونو، ڕاوەستانە زۆرو درێژخایەنەکەی لە دواندنی جـەماوەرو، بەیادهێنانـەوەی ڕابردوویـانو بەرچـاو ڕۆشنکردنیان بەقیامەت، لەم وتـارو دواندنەشـیاندا چـەندین شـێوازی سـەرنج ڕاکێشو کارتێکەری بۆ بەکارهێناون.

لەم سێ بڕگەیەدا تێبینی ئەوە دەکەین، کە وەستانی پیاوە باوەڕدارەکە لەبەردەم جەماوەرەکەدا ماوەیەکی درێژی خایاندووەو بانگەوازو خستنە ڕووی بیروباوەڕەکەشی هەمەلایەنەو گشتگیر بووە، لەکاتێکدا دەستەواژەی وتەکەی فیرعەون لەسەر شانۆ، کە کورت بووەو دەربڕینەکانیشی کەم بوونو، تەنها خۆ بەزلزانیو ستەمکارییو زەبرو زەنگەکەی تێدا ڕەنگ داوەتەوەو، تەعبیریشی لە سوکایەتیکردن بە کەسانی تر تێدا کردووە.

## سەرنجێك لە دەربڕینی بانگەوازکارانەی پیاوە باوەڕدارەکە :

پیاوە باوەڕدارەکە لەوتو وێژە بانگەوازکارییەکەیدا، چەندین شێوازی کارتێکردنی بەکارهێناو چەندین مەسەلەو بابەتیشی تێدا خستەکارو، چەندین ڕاستیو ڕێساشی خستە ڕوو، لەمەشدا توانایەکی ڕۆشنبیری ومێژووییو دەروونیو شیکارییو بانگخوازییو یاسایی هەبوو..

ئێمەش لێرەدا ڕوانینێکی خێراو بەپەلەدا سەرنج لە شێوازی دەربڕینو وتو وێژەکانی دەدەین:-

١- لەو وتەیەیدا: (أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا ) (ئایا پیاوێك دەکوژن)؟! فیرعەونی خۆ بەزل زانو بەخۆوە نازیی سەرشانۆو داواکاری کوشتنی موسا، کە گوتبووی: ﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓ ﴿٢٦﴾ غافر﴾ وکە ئەم داوایەی ئاراستەی جەماوەرکردبووو داوای لەوان دەکرد ڕێی بدەن موسا بکوژێت، پیاوە باوەڕدارەکە ئەم فیرعەونە فەرامۆش دەکات وبایەخ بە ئاراستەکردنی ئەو نادات چونکە دەزانێت کە ئەو بەدەم ئاراستەو بانگەوازەکەیەوە نایەت، ئیدی بۆچی وەختی خۆی بەووەوە بەفیرۆبدات؟ بەڵکو وتارەکەی ئاراستەی ئەوکەسانە دەکات، کە هیوای بەتەنگەوەهاتنیان لێ دەکرێت. بەڵام دەشڵێت (أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا ) ئایا

پیاوێك دەکوژن؟!- باشە چۆن پێیان دەڵێت (ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن) لەکاتێکدا بکوژ هەر فیرعەون خۆیەتی، نەك ئەوان ؟! وەڵامی ئەم پرسیارەش ئەوەیە بێگومان فیرعەون داوای مۆڵەت لەوان دەکات بۆ کوشتنی (موسا) جائەگەر ئەوان قایل بوونی خۆیان لەسەر ئەوکارە بۆ دەربڕن ئەوا لەو تاوانەدا ئەوانیش بەشدارنو وەك فیرعەون بکوژانی موسا دەبن، بۆیە پیاوە باوەڕدارەکەش دەیەوێت لەوجۆرە تاوانە بیانترسێنێت، کە خەریکە هەنگاوی بۆ دەنێنو، ئۆباڵی کوشتنی موساش دەخاتە ئەستۆیان، ئەگەر بەوکارەی فیرعەون قایل بن، چونکە فیرعەون بەناوی ئەوانەوەو بە قایل بوونی ئەوان (موسا) دەکوژێت.. بێگومان ئەوەی بەکوشتن قایل ببێت، خۆیشی (بکوژ)ە سەرەڕای ئەوەی بە کردەوەش بەشداریی لە کرداری کوشتنەکەدا نەکردبێت، هەروەها ئەوکەسەی لە یارمەتی دانو پشتگیرییکردنی ستەم لێکراوێکی کوژراودا بێ دەنگو بێ هەڵوێست بێت، ئەویش (بکوژ)ە چونکە بەو بێدەنگییەی خۆی هاوکاریی بکوژەکەی لەسەر تاوانەکەی کردووە.

٢- ((أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا - ئایا پیاوێك دەکوژن))؟! بەم سەرزەنشتە سەرەتا دەلالەت لەسەر بێلایەنیی خۆی لەم مەسەلەکەدا دەکاتو ئەونیازەش دەگەیەنێت کە جارێ وازوو بەتەما نییە هەموو لاپەڕەکانی باوەڕداریتیی خۆی بەیەك جار کەشف بکات، تابەمەش قەناعەتیان پێ بێنێت.خۆ ئەو پێی نەگوتوون: (ئایا موسای پێغەمبەری خودا دەکوژن، کە منیش لەسەر ئایینەیکەی ئەوم)؟! ئەوەپیاوە باوەڕدارە ئەو وتەیەی پێ نەگوتن، بەڵکو گوتی (أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا )؟!

٣- (أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ ) ﴿کە دەڵێت خودای پەروەردگارم (الله)یە﴾ داخۆ ئەو تاوانەی شایستەی هۆی کوشتنیەتی چی بێت؟ ئایا گوتنی (ربي الله) بەتاوان دادەنرێت؟ پاشان هەرئەم پیاوە باوەڕدارە (موسا) بەخەڵکەکە دەناسێنێت، تاکو

ئەوانیش خۆیو بانگەوازەکەی بناسن، ناساندنەکەش بەو بڕگە کورتەی (ربی الله)یە. هەمدیسان بەشێوازێکی پەنهایی توانجیان لێ دەدات تاکو لەو بیروبۆچوونەی خۆیان دووریانخاتەوە، توانجەکەشی بەو رەنگەیە کەوا بێگومان — موسا- دەڵێت (خودای من (الله)یە)و کەچی ئەوان دەڵێن (خودای ئێمە فیرعەونە).. جاچەند جیاواز لێك جودان ئەم وتەیە!!!

٤- ﴿وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ مِن رَّبِّكُمْ﴾ (لەهەمان کاتدا بەڵگەو نیشانە رۆشنەکانیشی لەپەروەردگارتانەوە بۆ هێناون..) کەوابوو (موسا) چەندین بەڵگەی لەسەر پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون پەروەردگاری ئێوە تەنها (الله) یە نەك ئەو فیرعەونەی، کە ئیددیعای بۆ دەکەن.

٥- ﴿وَإِن يَكُ كَـٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ﴾ خۆ ئەگەر لەمەدا درۆزن بێت، ئۆباڵی درۆکەی لە ئەستۆی خۆی دایەو خۆی لێی بەرپرسیارە، بەڵام ئەگەر ڕاستگۆ بێت، ئەوا هەندێك لەو بەڵاو کارەساتانەتان بەسەردا دێت، کە بەڵێنی ئاکامەکەیان لەسەر پێ‌ڕاگەیاندوون).. ئەمەیە شێوازی بانگەوازی دانایانە. بەم وتەیەش پیاوە باوەڕدارەکە دەیەوێت بایەخێکی چاك لەلای بانگکراوان بۆ بانگەوازەکەو خاوەنەکەی دروست کاتو، داواشیان لێ بکات کە بەچاوی هەقبینیی بێ لایەنیو بابەتیانە بۆ بانگەوازەکە بڕوانن و، ئینجا بیربکەنەوەو عەقڵی خۆیان بخەنەکار. جا موساش لە بانگەوازەکەیدا یان درۆزنە، یان راستگۆیە، ئایا هیچ ئەگەرو مەزەندەیەکی دی لەئارادایە؟! هەر لەدەرووی بابەتداریو سەربەخۆیی بێ لایەنییشەوە ئەگەرێکی درۆکردنی بۆ (موسا) پیشان داوەو، ئیدی ئەگەر درۆزن بێت، ئەوە دیارە هەر خۆی لە ئەنجامی درۆکردنی بەرپرسیار دەبێت وخوداش بەهۆی ئەوەوە سزای خەڵکی نادات، بەڵام ئەی باشە ناگونجێت، کە لەم بانگەوازەیدا راستگۆ بێت؟!

تەنانەت گەر لە دەرووی مەزەندەکاریو ئەگەری دانایيشەوە بێت، وەلامی پرسیارەکە راست دەرچوو و ئەگەرەکەش بەلای راستدا یەکلا بووەوە؟! بێگومان گەر باوەڕی پێ نەهێنن ئەوا هەندێك لەو سزاسەختانەیان لەدنیا پێ دەگات کە (موسا) ﷺ وریایان دەکاتەوەو هەڕەشەی بەدی هاتنیان پێ لێ دەکات ﴿وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ﴾ بێگومان بەم وتەیەی دوایی ئەگەری ڕاستگۆیيیەکەی- موسا -ی یەکلایی کردۆتەوە، ئەویش کاتێك پێی گوتوون: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ﴾ بێگومان خودا ڕێنمایی کەسێك ناکات، کە زیادەڕەوو درۆزن بێت، جا بەهۆی ئەوەی خودا ڕێنمایی موسای بەو بەڵگەو موعجیزانەوە کردووە، کەواتە موساش لە بانگەوازەکەیدا ڕاستو ڕاستگۆیەو، درۆزن نییە.

٦- ﴿يَـٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَـٰهِرِينَ فِى ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا﴾ (ئەی هۆزی خۆم ئەمڕۆ ئێوە لەم ناوچەیەدا دەسەڵاتدارنو بەئارەزووی خۆتان حوکمی زەوی دەکەن، جا بیربکەنەوە لەوەی ئەگەر تۆڵە وسزای خودامان تووش ببێت، کێ هەیە فریادرەسو سەرخەرمان بێت)؟! ئەم وتەیەی تری پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون بەکارهێنانی شێوازێکی بانگەوازکاری دانایە لەئاست هۆکاری دنیایيی ئابووریو شارستانی، کە جێی بایەخی هەموانە، چونکە نایانەوێت ئەو دەسەڵاتو باڵادەستی یەیان لەکیس بچێت، خۆ ئەگەر ئازاری مووساش بدەن، ئەوا خودا تۆڵەیان لێ دەکاتەوەو سزاو تۆڵەی سەختی خواییان پێ دەگەیەنێتو، ئیدی کێ هەیە یارمەتیدەرو سەرخەریان بێت.؟

ئایا فیرعەون فریایان دەکەوێت؟! لەم وتەیەشدا تێبینیی ئەو نەریتەجوانە دەکرێت، کەوا پیاوە باوەڕدارەکە خۆشەویستیو نزیکایەتیی خۆی بۆ گەلەکەی پیشان داوەو خۆی بە یەکێك لەوان داناوەو بایەخی بەکاروباری ژیانیان داوەو

پەرۆشی بەرژەوەندییان بووەو، ئەمەش لە ئامرازی هاوارلێکردنی (یاقوم) یەوە دەردەکەوێت هەروەها لەو رستەیەشیەوە دەردەکەوێت کە خۆی کردووە بە یەکێك لەوانو گوتوویەتی: (کێ سەرخەرو فریادرەسمانە ئەگەر خودا تۆڵەو سزای خۆیمان بۆبنرێت ﴿فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا﴾.

٧-﴿ يَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ﴾(غافر) (ئەی هۆزی من دەترسم لەوەی رۆژێکتان بەسەردابێت وەك ئەو رۆژە کارەساتبارەی کەبەسەر گرۆو کۆمەڵە بەدکارەکانی پێشوودا هاتوون)؟! ئەمەش وتەیەکی بەکارهێنراوی تریەتیو هۆکاری مێژوویی پێ دەخرۆشێنێت، کە وادەی خودای پێ بەدی دێتو وریاکردنەوەی ئاراستەکراویان بەراست دەگێرێت، ئەمەش وەك ئەوەی پێیان بڵێت (ئاورێك لە مێژووی رابردوو بدەنەوەو دیراسەبکەنو بڕوانن خودا چۆن کۆمەڵو گەلانی پێش ئەوەی وەك گەلەکەی (نوح)و (عاد)و (ثمود)و کافرانی ئەوانی لەنێو بردووە؟! ئەو گەلانە باوەڕیان بەخودا نەهێناوەو شوێنکەوتوانی خودایان ئازار داوە، خوداش سزای سەختی خۆی پێگەیاندبوونو خاكو وڵاتی بۆ تێکداونو خۆشیانی لەناوبردووەو، هیچ کەسێك بەفریایان نەکەوتووە.. جا ئەی هۆزی خۆم تەماشای مێژوو بکەن، تاکو راستیی ئەم قسەیەمتان بۆ دەرکەوێت).

٨- ﴿وَيَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ﴿٣٣﴾﴾ (هەروەها ئەی هۆزەکەم من ترسو نیگەرانیم بۆ ئێوە لەسەر ئەو رۆژەشە، کە ڕۆژی بانگگردنە بۆ لێپرسینەوە، ئەو رۆژەی کە هەمووتان لەدەستی هەڵدێنو سەرگەردانو نازانن ڕوو لەکوێ بکەنو هیچ پشت وپەناو داڵدەدەرێکتان بۆ دەربازبوون لە ڕقو تووڕەیی خودا نیە). لێرەشدا پیاوە باوەڕدارەکە ترسو نیگەرانیی لەسەر ئەو سزایەی داهاتوویان هەیە، کە رۆژی قیامەت (رۆژی بانگردن)ی خەڵکی، کە هەندێکیان هەندێکی تریان بانگ

دەکەن تووشیان دەبێت، بەڵام هیچ کەسێکیان وەڵامی ئەوی دی ناداتەوەو هەریەکەو بەلایەکدا دەڕۆن وپشت دەکەنە یەکتر وەك لەدنیادا هیچ پاڵپشتو پەنادەرێکیان نییە کە لە سزای خودا بیانپارێزێت ئەگەر تووشیان ببێت، لە ڕۆژی دواییشدا ئەو پاڵپشتو پەنادەرانەیان نییە، ئیدی چۆن ئازاری پێغەمبەری خودا (موسا) دەدەن؟!

٩- ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ﴿٣٤﴾ غافر﴾

(بێگومان لەمەوبەر (یوسف)یش بە بەڵگەو نیشانە ڕۆشنەکانەوە هاتە لاتان تاکو ڕێبازی خواناسیی بگرنە بەر، کەچی بەردەوام گومانتان لەو بەرنامەو ڕێبازەی هەبوو کە لەلایەن خوداوە بۆی هێنابوون، تەنانەت کاتێك (یوسف) مرد گوتتان ئیدی خودا لەدوای ئەو پێغەمبەرێکی تر نانێرێت)، ئەم وتەیەی دوایی پیاوە باوەڕدارەکە سەرنج ڕاکێشانێکی مێژوویی‌و عەقیدییشە، چونکە (یوسف) (سڵاوی خودای لێ بێت) بەیادی ئەوان دێنێتەوە، هەروەها هەڵوێستی یوسف‌و گومان کردنیان لە پەیامەکەی‌و دڵشادبوونیان بەمردنیشی بەبیر دێنێتەوە، کە وای بۆ دەچوون ئیدی دوای مردنی (یوسف) پەیام لەخەڵکی دەبڕێت. ئەوان بەم هەڵوێستەی باب‌و باپیرانی خۆیان زانیبوو، پیاوە باوەڕدارەکەش تەنها ئەمانەی بەیاد دەهێنانەوە، بەڵام کارتێکەری باوەڕداریی لەمەدا بەکارهێنانی سەرگوزەشتەکەی پەیامی یوسفە (سڵاوی خودای لێ بێت) بۆ سەلماندنی پەیامەکەی موسا (سڵاوی خودای لێ بێت).

بێگومان (موسا)ش پەیوەستە بە (یوسف)ەوە ـ سڵاوی خودایان لێ بێت ـ چ لەڕێی ڕەچەڵەك‌و چ لەڕێی پەیامیشەوە پەیوەستە پێوەی.. سەبارەت بەیەکەمیان واتە پەیوەستیی موسا بە یوسف لەڕێی ڕەچەڵەکەوە ئەوە زانایان هاوڕاو یەکدەنگ لەسەر ئەم ڕاستییە پاشان دەربارەی پەیوەستیی دووەم کە پەیامە ئەوە دیارە هەتا

بەڕوونی سەلمێنرابێت کە (یوسف) پێغەمبەری خودا بووە ئەوەش دەسەلمێنرێت، کە (موسا) پێغەمبەری خودابووە، بۆیە ئەو خودایەی، کە پێشتر (یوسف)ی بەبەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردووە، هەر ئەو خودایە، کە موساشی بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردووە.

پاشان پیاوە باوەڕدارەکە سەرنجیان بۆ شتێکی تر ڕادەکێشت، کە گومانیان لە پەیامەکەی (یوسف) یش هەبووە ﴿فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ﴾ بەمەش هەڵوێستی پێشووی ئەوگەلە بەیادی خۆیان دەخاتەوە کە بەرامبەر یوسف گرتبوویانە بەر، کە لەسەرگومانو نکوولی لێکردن بنیاتیان نابوو، ئینجا داوایان لێ دەکات هەمان هەڵوێست بەرامبەر (موسا) دووبارە نەکەنەوە، ئاخر بۆچی هەمان هەڵوێست دووبارە دەکەنەوە؟! ئایا پەندو دەرس لە رابردوو وەرناگرن؟! دیارە باوەڕداری بانگەوازکار لەم دیمەنەدا چەندەها فاکتەرو دەلالەتو ئاماژەی دەروونیو مێژوویی‌و عەقیدی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و ژیاریی بەکاردێنێت. جگە لەمانەش بەراورد لەنێوان (شێوازی حەز پێکردن)و شێوازی (سڵ پێکردنەوە)و لەنێوان (شێوازی بەیادهێنان)و (شێوازی ترساندن)یشدا دەکات. هەروەها ڕۆشنبیرییە هەمەلایەنییەکەی‌و، دەربڕینە کاریگەرەکەی‌و بابەتداریێتیی رەچاوکراوو عەقڵی کراوەی بۆ گەیشتن بەدڵانی گوێگرەکان بەکاردێنێت، هەموو ئەمانەشی بە فیعلی کردووە.

## دیمەنی سـێیەم

### " فیـرعەون " جـەماوەر سـەرقاڵ دەکات

خودای مەزن دەفەرموویت:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّيٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ غافر﴾

واتە: (فیرعون بە (هامان)ی وەزیری گوت: (ئەی هامان قوللەو برجێکـی بـەرزم بۆ بنیات بنێ تـاکو هەنـدێك هۆکـارو ئـامراز بـن بـۆ سـەرکەوتنی ئاسمانـەکانو بەهۆیەوە سەرکەومو نهێنییەکان بزانمو بۆ خودای موسا بڕوانم، چونکە مـن دڵنیـام درۆزنە)، بەم شێوەیە کردارە ناشیرینەکانی فیرعەون لەلای خۆی جـوان ببـوون ولـە ڕێبازی ڕاست لای دان.. بەراستی پیلانو فڕوفێڵی فیرعەون هەر لەسـەر گـەردانیو تیاچوونو زەرەرمەندیی دایە).

پیـاوە باوەڕدارەکـەی نێـو هـۆزی فیرعـەون (وەك لەدیمـەنی دووەمـدا بۆمـان دەرکەوت) توانیی بگاتە نێو دڵی خەڵکیو کاریان تێ بکاتو، بەچـەند ئاکـارێکی جوانو هانـدەر دڵیـان بکاتەوەو،فیرعـەونی سـتەمکاریش والـێ بکـات کـە هـیچ ئامادەیی یەکی کاریگەری ئەوتۆی نەبێتو زمانێکی روون کەرەوەو قایلکاری واشی نەبێت کە لەئاست دەربـڕینی ئـەودا بێـت، چـونکە فیرعـەون بەچـەند سـیفەتێکی نالەباری وەك خۆ بەزل دانانو لووتبەرزی بەرامبەر یان وەستابوو.

وادیاریشە فیرعەون تێبینی ئەوەی کردووە کە پیاوە باوەڕدارەکە سەرکەوتووە لە چوونە نێو جەماوەرو کارتێکردنیانداو، لەوەش ترساوەکە جڵەوی کارەکـە لەدەسـت

خۆی دەرچێت‌و خەڵکەکە لێی بتەکنەوەو روو لەو پیاوە بـاوەڕدارەو بانگەوازەکـەی بکەن. هەربۆیەش فیرعەون ناچار بووە کەلە داواکارییەکەی یەکـەمینی (واتـە لـە مۆڵەت وەرگرتن بۆ کوشتنی (موسـا)) پاشـگەزبێتەوەو، رەفتـارێکی ناهـەمواری تەڵەکەبازانە بنوێنێت،و لەوڕییەشەوە شانۆ گەرییەکی بێهوودەیی پێشکەش بکات بەمەبەستی خەریك کردنیان بەشتێکی ترەوەو لەبیربردنەوەی راستییەکەیان ئەوەبوو (هامان)ی وەزیـری بـانگ کـردو داوای لێکـرد قووللەیـەکی بـەرزو سـاختمانێکی سەرکەشی بۆ دروسـت کـات تـاکو بگاتـە نێـو بۆشـایی ئاسمـان‌و بـۆ ئاسمانـەکان سەرکەوێت‌و بەدوای خوداکەی (موسا)دا بگەڕێت بێگومان نایشی دۆزێتەوە، بـەڵام دەیـەوێت درۆی موسـا بـۆ خـەڵکی دەرخـات‌و ئـەو راسـتییەش پیـشانی پیـاوە باوەڕدارەکە بدات کەبەرگریی لە موسا دەکرد تا گوایە ئەویش وابزانێت کە خـودای موسا لەئارادا نییە.

## هـــامـــان و قەڵاکـــەی

قورئان شەش جار ناوی (هامان)ی دیاری کردووە لە هـەموو جارەکانیـشدا ئـەم ناوە بە فیرعەونەوە پەیوەستە ئەمەش دەلالەتە لەسـەر ئـەوەی کـە نـاوبراو لـەلای ئەوکاری کردووەو لێیەوە نزیك بووەو، راوێژکارێکی بووەو (بەجێ هێنەری فەرمان‌و رێنمایی یـەکانی بـووە. ئیـدی لەمـە زیـاتر دەربـارەی (هامـان) نـازانین‌و، جگـە لەقورئان‌و فەرموودەی راست (الحدیث الـصحیح) لەهیچ سەرچاوەکی ترەوە هـەواڵ‌و قسەوباسی لـێ وەرناگرین.

لە چیرۆکی پیاوەباوەردارەکەی هۆزی فیرعەوندا دەبینین کە فیرعەون داوای لـە-هامان-ی وەزیری کردووە کەوا قەڵایەکی بەرزی بـۆ دروسـت کـات، ئەمـەش ئـەو ساختمانە بڵندو بەرزەیەکە وەك —برج — وایە.

لەسوورەتی (قصص)دا خودا ئاماژەی بۆ ئەو قەڵایە کردووەو فەرموویەتی:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ القصص﴾ واتە: ((فیرعەون گوتی: (ئەی خەڵکینە من جگە لەخۆم کەسی ترشك نابەم کە شایانی ئەوەبێت خوداتان بێت، جائەی هامان تۆ خشتی سوورەوە کراو لەگڵم بۆ دروست بکەو، قەڵایەکی بەرزو پتەوم بۆ بنیات بنێ تاکو لەوێوە پیایدا سەرکەومو خوداکەی موسا ببینم سەرەڕای ئەوەی لەو بڕوایەدام کە ئەو لەریزی درۆزنەکان بێت)).

لەم ئایەتەی سوورەتی (قـصص)ەوە ئـەوە تێدەگـەین کەئـەم قەڵایـە لـەقوڕی سووتێنراو واتە لەخشتی سوورەوە کراوی لەقاڵب گیراو بنیات نرابێت وفیرعەون ئەو وەهم وخەیاڵەی لەدڵی خەڵکیدا چاندووە گوایە دەیەوێت لێیـەوە سـەرکەوێت تـاکو بیکات بـەهۆکارو ئـامرازی دیـتنی ئاسمانـەکانو، ئـەم هۆکارانـەش واتـە ڕێگـەو دەروازەو ڕێـچکەی ئاسمانـەکان بـە مەبەسـتی ئەوەیـە گوایـە بـەدوای خوداکـەی (موسا)دا دەگەڕێت..

## "نیازەکـانی فیـرعەون لە دروسـت کردنـی قەڵاکـە"

گوتمان ئەم هەڵسوکەوتە تەمسیلکارییە لە فیرعەونەوە بووو بەهۆیـەوە ویـستی جەماوەر خەریك بکاتو بەشتی لابەلاوە سەرقاڵیان بکات، چـۆن ئـەم تەمـسیلەی کرد؟ نیازەکانی لەمە چی بوون؟! ئەو بەم هەڵسوکەوتە ویـستوێتی چـەند نیازێـك بەدی بێنێت:

١- بەمە مەسەلە بنچینەییە کە لـەبیر خـەڵکی بباتـەوە، واتـە ئـەو بانگـەوازە سەرکەوتوانەیەی کە پیاوە ئیماندارەکە ئاراسـتەی خەڵکەکـەی کـردو مەسـەلە ڕاستەقینەکەی خستە بەردیـدەی خـەڵك، فیرعـەونیش بـە مەسـەلەیەکی مـام

ناوەندییەوە خەڵکەکەی خەریك کرد، کە بیناتنانی قەڵاکە بووو، پاشان سەرنج دان لەشێوازو قۆناغەکانی ئەو قەڵایەو چۆنیەتی بەکارهێنانی .

٢- هەروەها فیرعەون دەیویست بانگەوازو تێفکرین لە بانگەواز، یان لەڕێی هۆکاری زەمەنەوە لەبیربباتەوە، لەو زەمەنەشدا قەڵاکە دروست کاتو هەر بەوماوەو زەمەنەش خەڵکی لە مەسەلەکە دوابخاتو گەمژەو نادانیان کاتو، درێژە بە مەسەلەکان بداتو پاشان خەریكو سەرقاڵیان کات، بەشتی لاوەکییەوە.

بێگومان درێژە پێدانو دواخستنیش لە ئامانجەکانی ئەو بنیات نانەن، تەنانەت ئەو وشانەی کە درکاندنیو کە مەسەلەکەی خۆی پێ دەخستنە ڕوو یاریدەدەری درێژە پێدانی دیمەنی ئەو تەمسیلو نواندنکارییەی بوون، ﴿فَأَوْقِدْ لِي يَـٰهَـٰمَـٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّي صَرْحًا ﴿٣٨﴾ القصص﴾. واتە: (ئەی هامان تۆ خشتم لە گڵو قوڕ بۆ سوورکەرەوەو بەو خشتانە قەڵایەکی بەرزو پتەوم بۆ دروست بکە؟).

جا سەرنج بدەن درێژەدانەکە لەمانەدایە، گڵ بێنێتو قوڕی لێ بگرێتەوەو پاشان دارو سووتەمەنی بخاتە ژێر قوڕەکەو ئاگری لەژێردا داگیرسێنێتو، ئینجا قوڕەکە هێندە بسوتێنێت، تاکو دەبێتتە قوڕێکی سوورکراوەی برژێنراو، ئینجا ئەم قوڕە سوور کراوە سووتێنراوەش بکات بەچەندەها خشتو، لە خشتەکانیش ئەم قەڵایەی بۆ بنیات بنێت.. دوای لێبوونەوەش لەکاری درێژخایەنی بنیاسازییەکە، ئینجا جەنابی فیرعەون سەرکەوێتە سەر قووللەی بەرزیو بەهێواشیو زۆر لەسەرخۆ، ئامرازەکانی سەرکەوتنی بۆ ئاسمان بخاتە گەڕو ڕێچکەکانی بدۆزێتەوەو زۆر بەهێواشی بەدوای خوداکەی مووسادا بگەڕێتو، دوای ئەم گەشتە هێمنو دوورو درێژەش بگەڕێتەوە بۆ لای جەماوەرو هەواڵی ئەوەی دیویەتی پێیان بگەیەنێت، ئیدی بەم هەموو درێژپێدانو سستیو

خاووخلیچکییەش، جەماوەر چاوەڕوانیی ئەنجامی ئەم گەشتە فیرعەونییە بکەنو، زەمەنێکی هێجگار درێژیشیان بەسەردا تێدەپەڕێتو هەر لەچاوەڕوانی دابن، بەم رەنگەش هەموو بەڵگەو نیشانە راستەکانی ئەوپیاوە باوەڕدارەیان لەبیربچێتەوە کە لێیان بیستبوو.

٣- پاشا، فیرعەون ویستوویێتی بەو کاری بنیاتنانی قەڵایە بەڵگەی راستی پیاوە ئیماندارەکە هیچ هێزو گوڕوتینو زیندوویێتییەکی لەلای جەماوەر نەمێنێت، چونکە ئەوان لە ساتەوەختی بیستنی بەڵگەکەدا گەرماو گەرم مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد، چونکە گەرمو زیندوو بوو و گوڕوتینو گەرمیی خۆی هەبوو، بەڵام کاتێك بەهۆی بنیاتنانی قەڵاکەوە سەرقاڵ کرانو بەم مەسەلەیەوە خەریك کران، ئەوسا لەکێشەیەکی سەرەکیی جێی بایەخی جەماوەر کەلەپلەی یەکەم دایە سەرنجەکان بەرەو کێشەیەکی مام ناوەندی و لابەلای تر رادەکێشرێن کەفیرعەون خولقاندوویەتی، لەو کاتەشدا لە ئاوێنەی تێڕوانینو تێفکرینیاندا مەسەلە گەرمو بنچینەییەکە سارد دەبێتەوە، تادەبێتە مەسەلەیەکی تیۆری (نظري)ی ساردو سڕو بێگیان.

٤- فیرعەون دەیەوێت بەگیانێکی بابەتیانەو مەنهەجیو گەڕانی جیددی بەدوای راستیدا خۆی پیشانی خەڵکی بدات کەگوایە ئەو نەیویستووە موسا بەدرۆ بخاتەوە تەنها لەبەر ئەوەنەبێت کە ئەو خودایەی بەدوایدا گەڕاوە نەیدۆزیوەتەوە. هەروەها بەو رەنگەش خۆی پیشانی خەڵکەکە داوە کەگوایە ئەو سوورە لەسەر بنیات نانی قەڵاکەو لەسەر گەڕان بەدوای خوداکەی موسادا.

هەموو ئەم کردارەش سووکایەتی پێکردنو گاڵتەجاڕیو بەکەم دانانی جەماوەر بووە. چونکە کاتێك دەبینین چەندە پارەو پوولی لەپێناوی بنیات نانی قەڵاکەدا خەرج کردووەو چەندە تواناو وزەی هەمەجۆری بۆ خستۆتە کارو چەندە کاتو زەمەنی پێ بەفیڕۆداوە کە بێگومان هەموو ئەمانەش لەئامانجەکانی ئەو

بنیاتنانە بوون، وێنەیەکی سووکایەتی کردنی زاڵمانمـان بەعـەقڵی جـەماوەر دێتـە بەرچـاو کـە سەرقاڵیـشیان دەکـات بەشـتی بـێ‌نرخ‌و سـەیرو سـەمەرەوە، تـاکو راستییەکانیان لەبیر بچێتەوەو، پارەو ماڵو کات‌و کۆشش‌و تواناکانیان پـێ بـەفیڕۆ بدرێت بێ ئەوەی هیچ خێرو سوودو کەڵکێکی تێـدابێت بۆیـان.. جـا ئایـا رۆژانـە چەندو چەند پارەو پوول‌و کەرەسە پێویستەکانی تریش لەم شـانۆ نامـەو تەمـسیلە پووچەڵو سووکایەتی پێ‌کردنانەدا خەرج دەکرێت؟ ئەی داخۆ چـەندە لـەم کەرەسـە گرنگانە بۆ رازی کردنی ئارەزووەکانی ستەمکاران بەفیڕۆ دەدرێت؟!

## " پاشـەکشـێی فیـرعەون لەبەردەم حیکمەتی پیاوە باوەڕدارەکـەدا "

ئایەتەکان ئـەوەمان بـۆ دەردەخـەن، کـە فیرعـەون چـەند هـەنگاوێك لەئاسـت حیکمەتی پیـاوە باوەڕدارەکـەو جـوانیی ڕەوانبێـژیو کاریگـەریی لەسـەر خەڵکـە دوێنراوەکەیدا پاشەکشێی کردووەو نـەختێك گەڕاوەتـە دواوە، ئـەم پاشەکـشێیەی فیرعەون وەك قەناعەت پێ‌هێنانێکی ڕاستەقینەی خۆی، بە بەڵگـەکانی پیاوەکـەدا نەبووەو بانگەوازەکەشی پەسەند نەکردووە، بەڵکو تەنها بۆ ئەوە بووە، تـاکو پیـاوە باوەڕدارەکە جەماوەر بۆ خۆی دەستەبەر نەکات‌و لەبەردەم ئەواندا بەسەر فیرعەوندا سەرنەکەوێت. پاشەکشێی فیرعەون لەو چەند هەنگاوە کەمەدا لەم خاڵانەدا بووە:-

١- پێشتر فیرعەون گوتبووی: ﴿...ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ ...﴿٢٦﴾ غافر﴾ رێم بدەن ئەی خەڵکینە، بـا موسـا بکـوژم‌و، دەبـا ئـەویش پـەنا بەرێتـە بـەر خوداکەی خۆی".. بەڵام ئێـستا لـەو داوای رێ پێدانـە پاشـگەزبۆتەوەو، داوای بنیاتنانی قەڵایەك دەکات بەمەبەستی گەڕان بە دوای خوداکەی موسادا.

٢- پێشتر فیرعەون داوای مۆڵەتی لە گەلەکەی کردبوو، تا موسا بکوژێـت، بـەڵام ئێستا داوای بێ لایەنی‌و چاوەڕوانی کردنی لە گەلەکەی دەکات، تاکو ئـەنجامی

گەشتەکەی خۆیان بۆ ئاسمانەکان پێ دەگەیەنێت.

٣- پێشتر فیرعەون سوور بوو لەسەر ئەوەی گوایە (موسا) سیحربازێکی درۆزنە، بەڵام ئێستا لەوە دابەزیوەو پاشەکشێی بۆ گومانو بۆچوون کردووە ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ واتە: واگومان دەبەم کە ئەو درۆ بکات). فیرعەونی زاڵمو لە ستەمدا رۆچوو ئەم پاشەکشێو پاشگەزبوونەوانەی نەدەبوو تەنها لەبەردەم هێزی بەڵگەکانی پیاوە باوەڕدارەکەدا نەبێت کە بەهۆی ئیمانو باوەڕەکەیەوە بەهێز ببووو، دەسەڵاتو گەورەیشی هەر لە خودای پەروەردگارییەوە بوو. هەروەها ئەم پاشەکشییەی فیرعەون دەلالەت لەسەر شکستی فیکریی دەکات —لەکاتێکدا هەر خۆی خاوەنی فەرمانو دەسەڵاتیشە لەئاست پیاوە باوەڕدارەکەدا کە بەڕوالەت هیچ دیاردەیەکی هێزی ماددی تێدا نەدەبینرا. ئەمەش هەر خۆی سروشتی باطل (ناڕەوا)ی خۆبەزل زانو ستەمکارە لەبەردەم هەقی ڕوونو ئاشکراو بەهێزو تۆکمەدا، جا هەر پێك گەیشتنو ڕووبەڕووبوونەوەیەك، یان هەر جەنگێکی فیکریی لەنێوان هەقو باطیلدا، بەرپابێت ئەوا هەر (باطیل)ەکە بەئاشکرا بەزیوو لاوازە تیایداو، حەقیش سەرکەوتووو جێگیرە تیایدا، لەو جۆرە جەنگە فیکرییانەشدا (باطیل)ی بەزیوی سەر ئاقارە فیکرییەکە پەنا دەباتە بەر ئامرازە دڕندانەکانی وەك جەڵدەو قامچی وەشاندنو ئازارو ئەشکەنجەدانو چەوساندنەوەو کوشتن. پرسیار لە مێژووی کۆنو ناوەڕاستو هاوچەرخ بکەن، تا وەڵامی تەواوتان لەسەر باری ڕاستێتی ئەم حەقیقەتە پێبدات.

## دیمەنی چوارەم

## "پیاوە باوەڕدارەکە داوا لە خەڵکی دەکات پەیڕەویی بکەن"

خودای مەزن فەرموویەتی:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٤٠﴾ وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ غافر﴾[1]

پیاوە باوەڕدارەکە نزیکو دانایەو لەمەبەستی فیرعەون لەبنیات نانی قەڵاکە تێگەیشتووە، هەر بۆیەش بۆ ڕەت دانەوەی ئەو فێڵەو تەڵەکە پیسەی فیرعەون، ڕێبازێکی زانستیانەی نەخشە بۆکێشراوی بانگخوازانە دەگرێتە بەر، ئەوەبوو یەك داواکاریی باوەڕدارانەی دەستنیشان کراوی لەو خەڵکە هەبوو کە گوییان لەخۆیو لە فیرعەونیش گرتبوو، داواکەشی ئەوەبوو کە پەیڕەویی بکەن، چونکە بێگومان

---

(١) لە سەرەتای ئەم چیرۆکەدا تێکرای ئایەتەکانی ئەم بەشەمان –بەم ئایەتانەشەوە- بەکورتی لێکدایەوە، ئەم دیمەنەش تەرخانە بۆ تەفسیرو شیکاری ئەم پێنج ئایەتەی دوایی. (وەرگێڕ).

ئەو لەڕووی تیۆری (نظري)یەوە بەگوێرەی پێویست قسەی بۆ کردبوونو هەوڵو کۆششی تەواوی خۆی بۆ قەناعەت پێهێنانو کارتێکردنیان خستبووە کار، ئیدی هێندەی لەسەر ماوە کە ئامانجی ئەو قسەکردنو ئاخاوتنو ڕوونکردنەوانەی خۆی بەدی بێنێت، ئەویش لەو ئامانجە عەمەلییەدا بەندبوو کە خەڵکە بیسەرەکەی پەیڕەویی ئاینەکەی بکەنو بانگەوازەکەی ئەو لەجیاتی ئەوەی فیرعەون هەڵبژێرن (تاکو لەکاتی پەیڕەوکردنیاندا ڕاستیی ئەو ئاینو بانگەوازە بەدیی بکەن).

هەروەها بەکورتی بانگەوازەکەی بۆ شیکردنەوەو گرنگترینی ڕاستیو بنەماکانیی بۆ خستنە ڕوو تاکو بەڵگەی ڕاستو ڕەوانی خۆی بخاتە ئەستۆیانو، ئەوانیش هیچ پاساوێکیان لە نەزانینیو تێنەگەیشتندا نەمێنێت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾ (ئەی گەلی خۆم پەیڕەویی من بکەنو ڕەفتار بەم قسانەی من بکەن چونکە من ڕێنموونیتان دەکەم بۆ سەر ڕێی چاکەو سەرفرازیی".. بەڵام کەی داوای ئەوەی لێ کردن کە پەیڕەویی بکەن؟ بێگومان لەیەکەم دیداری نێوان خۆیو گەلەکەیدا داوای ئەم کارەی لێ نەکردن، چونکە گەر ئەم داوایەی لێ بکردنایە ئەوا دەسبەجێ ئەو قسانەیان پێ ناخۆشو ڕەق دەبوو و بانگەوازەکەشیان بەشتێکی کتوپڕیی دەبینیو، هەر لەو ساتە سەرەتاییانەشدا لێی دەتەکینەوەو پشتیان تێ دەکرد.

ئەم پیاوە باوەڕدارە دوای ئەوەی بەوردیو بەشێوەیەکی نەخشەبۆکێشراو زنجیرەیەك دیداریی لەگەڵ دا سازدابوونو، دوای ئەوەی چەند هۆکارێکی کاریگەری بۆ کارتێکردنیان بەکار هێنابووو دوای ئەوەش بە ناواخنی عەقڵو دڵیان گەیشتبوو، ئەوسا داوای لێ کردن کە پەیڕەویی بکەن.

هەروەها لەلایەکی تریشەوە ئەم داواکاریی پەیڕەوکردنە لەخەڵك وەك بەرهەڵستی کردنێکی فیرعەون وایەو، لە بەرامبەر ئەو بانگەشەیەی فیرعەونیشدابوو کاتێك داوای لەخەڵك کردبوو کەوا پەیڕەویی خۆی بکەن، ئەوەبوو

پێشتر فیرعـەون پـێی گوتبـوون: ﴿مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ غـافر﴾ (من هەر ئەو بیروڕایەی خۆم بەچاك دەزانمو هـەر منـیش ڕێی ڕاستو چاكتان پیشان دەدەم"، ئێستـاش پیـاوە باوەڕدارەكـە پێیـــان دەڵێـت: ﴿... يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ ئـەم وتەیـەو ئـەم بانگـەوازو داواكارییەشی بەڵگەیەكە لەسەر جورئەت و ئازایەتیو بوێریی، دەنا چـۆن وەڵامـی فیرعەونی پێ دەدرێتەوەو بانگەشەو داواكارییەكەی ئەویان لەلا ڕەت دەكاتەوە، یان چۆن لەهەڵبژاردنی ڕێبازیدا سەرپێچیی لێ دەكاتو لەهەڵوێستیشیدا بەربەرەكانیی دەكات، لەڕێگاشیدا لێی جیـا دەبێتـەوە؟ خـۆ ئەگـەر بـەراوردی نێـوان هـەردوو ڕستەكە بكەین واتە وتەكەی فیرعەون بۆ خەڵكی)و (وتـەی پیـاوە باوەڕدارەكـە بـۆ ئەوان) ئەوا جیاوازیی نێوانیان بەدیی دەكەین، جیاوازییەكەش لەنێوان (خـۆ بەكـەم زانینو لەخۆبوردنی پیاوە باوەڕدارەكە)و (خۆ بەزل دانانی فیرعـەون)دایـە، لـەنێوان (بوار ڕەخساندنی پیاوە باوەڕدارەكە بۆ خەڵكی كە سەربەسـتو سەرپـشك بـن لـە هەڵبژاردنی ڕێبازدا)و (زەوت كردنی سەربەستی جـەماوەر لەلایـەن فیرعەونـەوە).. هەمدیسان جیاوازیی وتەكانیان لەوەدایە كە پیاوە باوەڕدارەكە لەجەماوەر نزیكـەو خۆشیی دەوێن، ئەمـەش لەو ئامرازی دواندنەدا كە پییان دەڵێـت: (یـاقوم..) واتـە (ئەی هۆزم خۆم.. ئەی گەلی خۆم.. ئەی كەسو خزمانی خۆم..) كەچـی فیرعـەون خۆی لەئاستیان دا بە گـەورەو بـەرز دادەنێـتو سـووكایەتییان پـێ دەكـاتو بـێ ئومێدی دەخاتە بیرو هۆشیانەوە، ئەوەش لـەو وتەیـەیدا كـە پێیـان دەڵێـت: ﴿مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ﴾. واتە: (من هیچ ڕێبازێكی وا نابینم تەنها ئەوە نـەبێت كـە خۆم بەڕاستی دەزانم). لێرەدا فیرعەون هـەموو بـوارێكی بیركردنـەوەو لێكدانـەوەو ڕێی ڕاست گرتنەبەریان لێ زەوت دەكاتو هـەر خۆیـشی لـەجیاتی ئـەوان كـاری تێفكرینو لێكدانەوەو گەڕان بەدوای ڕێی ڕاستیاندا بۆ لەئەستۆ دەگرێت، ئەوانیش

دەبێت بن بە چەند تووتییەكو قسەكانی بڵێنەوەو بەبیروڕایـەوە پابەنـد بـن، بـەڵام پیاوە باوەڕدارەکە سەربەستیی گەڕان بەدوای ڕێبازی ڕاستو قەناعـەت پێهێنـانو تێفکرینو سەرپشك بوونیان پێ دەداتو وایان لێ دەکات کەسێتییەکی خـودداربنو توانـای شـوێنکەوتنی ڕێی ڕاسـتو بەرچـاو ڕۆشـنانەیان هـەبێت: ﴿... يَـٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾.. دوای ئەمـەش نـەختێك درێـژە بەقـسە لەگەڵ کردنیان دەداتو پوختەیەك دەربارەی ئاینەکەیو بانگەوازەکەی باس دەکات تاکو بەڕوونی لێی تێبگەن. لەم ناساندنەشدا تێبینیی ئەوە دەکەین کە یەکـەم جـار چەقی لەسەر باوەڕو ئیمان داناوە، هەروەها لەسەر مەسەلەی دنیاو ڕۆژی دوایـیو، پلـەی دنیـا بـەپێوەری ڕۆژی دوایـی بەشـێوەیەك کـەدڵیانی بـەڕۆژی دواییـیەوە بەستۆتەوەو ڕووگەی ڕوانینەکانیشیانی هەر ئاراستەی ڕۆژی ئاخیرەت کردووە.

## "بانگـەوازکارەکە بەراورد لەنێوان هەردوو بانگـەوازەکەدا دەکات"

- بانگەوازەکەی فیرعەون کە بەخەڵکەکـەی گـوت: ﴿مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ غافر﴾.

- بانگەوازەکـەی پیـاوە باوەڕدارەکـەش، کـە بەخەڵکەکـەی گـوت: ﴿... يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾..

ئـەم دوو بانگـەوازە پێـچەوانەو دژی یەکـدین، بانگـەوازێکیان بـۆ دۆزەخـەو، بانگەوازێکیشیان بـۆ بەهەشـتە، لەوانەیـە خـەڵکی لـەو جـۆرە کاتانـەدا بکەونـە گومـانو دوو دڵییـەوەو نـەزانن راسـتەکەیان هەڵبـژێرن، جـا بـۆ ئـەوەی پیـاوە باوەڕدارەکە شێوازی هەڵبژاردن بۆ گەلەکەی روون کاتەوەو هیچ تەم و مژو لێڵییەك لەئارادا نەهێڵێتو، بۆ ئەوەش، کـە یارمـەتییان بـدات لەسـەر چـاك هەڵبـژاردنی یـەکێك لـەو دوو رێبـازە، هەڵوێـستەیەکی کـرد بـۆ بـەراوردکردنی هـەردوو بانگەوازەکەی خۆیو فیرعەون.. وەك ئەوەی گوتی:

﴿وَيَٰقَوْمِ مَا لِىٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِىٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ غافر﴾.

واتە: (ئەی هۆزەکەم سەرنج لەوە بدەن کە من تەنها ئێـوە بـۆ رێی رزگـاربوون بـانگ دەکـەم تـا بـچنە بەهەشـتی خـوداوە، کەچـی ئێـوە بـەم سـەرگەردانیو گومڕاییەتان من بۆ نێو دۆزەخ بانگ دەکەن، بۆ ئەوە بانگم دەکەن کـە بـاوەڕ بـە

خوا نەهێنمو هاوەڵ (شەریك)ی بۆ دابنێمو، بەبێ هیچ بەڵگەو زانستێك خۆم کافر بکەم، لەکاتێکدا من بۆ لای خودای باڵادەستو لێبووردوو ئێوە بانگ دەکەم، بێگومان ئەوەش، کە ئێوە منی بۆ بانگ دەکەن، نە لە دنیاو نە لە قیامەتیشدا خاوەنی هیچ بانگەوازو بەرنامەیەك نییە، نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت، کە گەڕانەوەمان هەر بۆ لای خودایەو، ئەوانەش، کە لەستەمو تاواندا ڕۆچوون دەخرێنە نێو ئاگری دۆزەخەوە).. کاتێك سەرنجی ئەم بەراوردکارییەی پیاوە باوەڕدارەکە لەنێوان هەردوو بانگەوازەکەدا دەدەین، ئەم ڕاستییانەمان لەلا گەڵاڵە دەبێت:-

١- هەردوو بانگەوازەو سێهەمێکیان نییە: بانگەوازی هەقو، بانگەوازی ناهەق (باطل). بانگەوازێکیان بۆ گوێڕایەڵیکردنی فەرمانی خودایەو، بانگەوازێکیشیان بۆ سەرپێچی لەفەرمانی خودایە.

٢- بەدەنگەوە هاتنی هەردوو بانگەوازەکەش ئاکامی پابەندکاری خۆیان هەیە، جا هەرکەسێك بانگەوازی هەق پەسەندکاتو بەدەنگیەوە بچێتو باوەڕ بەخودا بێنێتو گوێڕایەڵیی فەرمانی بکات، ئەوا بەهەشتی دەست دەکەوێتو خێرو چاکە بەدی دێنێتو سەرفرازییو ڕزگاربوونی بۆ نووسراوە.. هەر کەسێکیش بەدەم بانگەوازی ناهەقو (باطیل) ەوە بچێتو باوەڕ بەخودا نەهێنێتو سەرپێچی لە فەرمانی بکات زەرەرمەندو لەنێو چووەو شایستەی نێو دۆزەخە. پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەونیش ئاکامی هەردوو بانگەوازەکەی بەئاشکرا دیاری کردووەو، سەرەنجامی هەردووکیشیانی بۆ خستوونە ڕووو پێی گوتوون:

﴿مَا لِيَ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾؟!

٣- پیاوە باوەڕدارو بانگەوازکارەکە هەردوو بانگەوازەکەی ناساندووە، ئەوەش بەدەست نیشانکردنی دیارترین خاڵی جیاکەرەوەی یەکێکیان لەوی دیکەیان:

﴿تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ﴾.

٤- وتـنی وشـەی (یـاقوم) پێیـان ئارەزوویەکـە لەخۆیـەوە بـۆ راژەنـینی دڵیـانو کارلێکردنیان/ چونکە ئەو بەردەوام لێیان نزیك دەبێتـەوەو خۆشەویـستییان بـۆ دەردەبڕێت، تاکو وایان لێ بکات هەست بکەن بەوەی کە ئەو یەکێکە لـەوانو، ئەوانیش لەون، ئەوان هۆزی ئەونو، ئەویش یەکێکە لەوان.

٥- لەوتەکەیدا کە پێیان دەڵێت: ﴿وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ ئاورێکی بانگخوازانەی جوان هەیە/ ئەوەیە کە ئاخۆ کێ ئەم بانگ دەکـات بـۆ نێـو دۆزەخ؟ بێگومـان هەر فیرعونە، نەك هۆزەکەی، ئەی بۆچی (بانگکردنی بۆ لای ئاگر) دەخاتە پاڵ ئەوان لەکاتێکدا ئەوان بۆ ئاگر بانگیان نەدەکرد؟! بێگومان پێشتر لـەکردارێکی فیرعەوندا بەشداریی کردبوونو پـێی گوتبـوون: ﴿...أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ ...﴿٢٨﴾ غافر﴾ واتە: (ئایا ئێوە پیاوێکی وەك —موسا- تەنها لەسەر ئەوە دەکـوژن کـە دەڵێـت پـەروەردگارم (الله)یـە)؟!، لێرەشـدا بەشـداری ئـەو بانگەوازەی فیرعـەونی کـردوون بـۆ نێـو ئـاگر، چـونکە ئەگـەر ئـەوان بـەدەم بانگەوازی فیرعەونەوە (کە بۆ ئاگر دەیکرد) بچوونایە ئـەوا بەشـدارو هـاوەڵی بـوون تێیـدا، هـەروەها چـونکە نکـوولێیی ئـەو بانگەوازەشـیان لـێ نـەکردو بەرەورووی نەوەستانەوە، بەم پێیەش ئەوان بەشداریی بـوون لـە ئاراسـتەکردنی بانگەوازەکەدا بۆ ئاگرو، بەشـداریی بـوون لـە ئاشـکراکردنیو پروپاگەنـدە بـۆ کردنیو، لەئاکامو سەرەنجامە دژوارەکانی رۆژی قیامەتیشییدا.

خواستی پیاوە باوەڕدارەکەش وەك ئەوەبوو کە کاتێك بانگەوازەکەی فیرعـەون دەخاتە پاڵ ئەوانو دەیکات بەبانگەوازی ئـەوان، مەبەسـتی لەوەدایـە بانگیـان بکات بۆ بەدەمەوە نەچوونی بانگـەوازی فیرعـەون لـە سـەرەتاوەو، پاشـان بـۆ نکوولی لێکردنـیو بەرووداوەسـتانەوەیو، لـەدوا جاریـشدا بـۆ پـەیڕەویکردنی رێبازە جوانەکەی پیاوە باوەڕدارەکە کـە بانگـەوازیان دەکـات بـۆ رزگـاربوونو ڕەزامەندیی خودا.

٦- پیاوه باوەڕدارەکه لەوتەکانیدا دوو ناوی لەناوه جوانەکانی خودا بەگوێیاندا داوەو بانگەوازی خودای پێ ناساندوون‌و ئەنجامەکەشی بۆ دیاری کردوون: ﴿وَأَنَاْ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ﴾ (من بانگتان دەکەم بۆ لای خودای بالاّدەست‌و لێبوردوو). دیاره لەهەڵبژاردنی ئەم دوو ناوه جوانه (خودای بالاّ دەست‌و لێبوردوو)دا مەبەستێکی گرنگی هەیەو بۆ ئەو ساتەوەختە شیاوترن.. بێگومان خودا بالاّدەستەو بەهێزەو هێزو عیززەت بەو کەسە دەبەخشێت کە باوەڕی پێ دەهێنێت‌و بەدەم بانگەوازییەوە دەچێت، ئەویش بەو هێزەوە جیهاد لەدژی ناهەق‌و باطیل دەکات‌و رووبەرووی ستەم‌و زۆرداری دەبێتەوە، هێزو عیززەتیش شیاوترین سیفەتە لە بەرەوڕووبوونەوەی فیرعەون‌و ناهەقی‌و لەستەمدا رۆچون‌و زەبرو زەنگەکەیدا، لێبوردەیی (غفار)یش بۆ ئەوەیە کە بێگومان خودا لێبوردەیە بۆ هەر کەسێك کە بەدەم بانگەوازییەوە دێت‌و، خوداش لەکردارەکانی رابوردوویی‌و، لەبێ باوەڕی‌و سەرپێچییەکانی لەوەو پێشیی دەبووریت‌و، تۆبەی لێ وەردەگرێت تاکو لەدوای باوەڕهێنانی ژیانێکی نوێی باوەڕدارانە دەست پێ بکات، ئەمەش هاندانێکە بۆ ئەو گەلە تا باوەڕ بە خودا بێنن، جا کاتێك باوەڕ بە خودای بالاّدەست‌و لێبوردوو دێنن، ئەوا بەهێزو بەرێزو سەربەرز دەبن‌و، لەلای خوداش بەپلەی بەرزی خۆیان دەگەن‌و، خوداش لێیان خۆش دەبێت‌و تەوبەو پەشیمانیان لێ وەردەگرێت.

٧- له وتەی پیاوه باوەڕدارەکەدا کە گوتبووی: ﴿لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴿٤٣﴾ غافر﴾ (بەراستی‌و بەبێ هیچ گومانێك ئەوەی کە ئێوه منی بۆ بانگ دەکەن، نه له دنیاو نه له قیامەتیشدا خاوەنی هیچ بانگەوازو بەرنامەیەك نییە) لەم وتەیەیدا گشت مانایەکی هێزو کارایی‌و کارتێکردن لە فیرعەون دادەماڵێت‌و، ڕوونی دەکاتەوە، کە لەم هۆکارە سامدارانە هیچ شتێکی نه له دنیاو نه له قیامەتیشدا نییە. مرۆڤیش لێرەدا

سەری لەم مەسەلەیە دەسوڕمێت کە چۆن پیاوێکی خاوەن باوەڕ کـە لەهـەموو ڕەنـگو سـیمایەکی هێـزی بینـراوی مـاددیی دابـڕاوەو کەچـی لـە بەرامبـەر ستەمکارترینو زۆردارترین ستەمکاری لە ستەمدا ڕۆچوودا، کـە (فیرعـەون)ە، وەستاوە، (ئەو فیرعەونە ستەمکارەی کە خاوەنی چەندین جۆرو دیاردەی هێـزی ماددییـە)، لەنێوانیانـدا بەوپـەڕی خـۆڕاگریی‌و جوامێرییـەوە بەربـەرەکانیی فیرعەون دەکاتو هەموو ئەو دیاردەو هێـزە ماددییانـەش نایترسـێنن، ئینجـا هەنگاوێکی تری سەرسـوڕهێنتر دەنێـتو لـەم هـەنگاوەدا فیرعـەون لەهـەموو هۆکارێکی سامداری هێزو کاریگەری دادەبڕێت.

پیاوە باوەڕدارەکە بە چاوێکی باوەڕدارێتیو ڕاستبینانە بۆ فیرعەونو دەسەڵاتو بانگەوازەکـەی دەڕوانێـت. لـە ڕاستیـشدا فیرعـەونی هـەروابینی کـە لـە هێـزو کارتێکردن داماڵراوەو، بەلاوازی بینی کە نـە لـە دنیـاو نـە لەقیامەتـدا خـاوەنی بانگەوازێکی هەق نییە. هەروەها پیاوە باوەڕدارەکە بـەودیاردە ماددیانـەی دەوری فیرعەونیان دابوو تەفرەی نەخوارد، بەڵکو ڕوانگەی چاوی خۆی بە چاویلکە ڕەسەنە ئیمانداریتییەکەیەوە ڕووەو ڕاستییەکانی وجودو ژیانو خێـرو هـەق ئاڕاسـتەکردو، ئیدی دیتی فیرعەون لە هەموو ئەم ڕاستییانە داماڵراوە. گشت زاڵمو لـە سـتەمدا ڕۆچوویەکی تریشن هەر ئاوانو هیچ شتێکی ڕاستو دوستیان نییە، هـەر دیـاردەو سـیمایەکی هێـزو دەسەڵاتداریەتیـشی لـەخۆی کۆکردبێتـەوە، ئـەوە هەرچـەندە سیمایەکی ساختەو، چەند ڕەنگ وڕوویەکی دەسەڵاتێکە، بەڵام ڕاسـتییەکی ژیـانی تێدا نیە. بێگومان بانگەوازکارانیش پێویستیان بەوەیە کە شوێن پێـی ئـەم پیـاوە باوەڕدارە لەو هەڵویستە مەزنە باوەڕدارانەیەیدا هەڵگرنو، بزانن چـەندین دیـاردەی هەقیقـەتیان پێیـەو بـەو هۆیانـەوە هـەر دیاردەیـەکی فریـو دانو سـاختەکاریو لەخۆباییبوونی ستەمکاران دەرخەنو ئەوسـاش بـەڕوونی بۆیـان دەردەکـەوێت کـە ستەمکاران هەرچییەکیان هەیە تەنها وەك ئەو تراویلکە (سەراب)ەیە کـە مرۆڤـی تینووبەئاوی تێدەگاتو کاتێك دەچێتە سەری هیچ شتێك لەئاو نابینێت.

## کۆتاییی چیرۆکەکە: پیاوە باوەڕدارەکە هۆزەکەی جێدەهێڵێت و کاروباری خۆی بەخودا دەسپێرێت..

خودای مەزن فەرموویە:

﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُوا۟ ۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ غافر﴾

واتە: (لە دوایی داپیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون بەهۆزەکەی خۆی گوت: ئێوە لەمەولا لەئایندەدا ئەم وتانەی منتان بەبیردا دێتەوەو ڕۆژێك دێت کە بیری لێبکەنەوە. ئەوا منیش کاروباری خۆم بە خوای گەورە ئەسپێرم وپشتی پێ دەبەستم، بەڕاستی خوداش بینایەو بەندەکانی دەبینێت).

ئینجا خودا ئەم پیاوە باوەڕدارەی نێو هۆزەکەی فیرعەونی لەپیلانی خراپو درندەیان پاراستو خێڵو داروودەستەی فیرعەونیشی توشی سزایەکی زۆر سەخت کرد کەئاگری دۆزەخەو بەیانیانو ئێواران پیشانیان دەدرێت -واتە بەردەوام هەمو کاتێك سزایان بەو ئاگرە دەدرێت- و هەر لەڕۆژی مردنیانەوە تاکاتی قیامەت پیایاندا دەچزێت، لەڕۆژی قیامەتیشدا فەرمان دەدرێت بەوەی کە (ئادەی تاقمو خێڵی فیرعەون بخەنە نێوتوندترینو سەختترین ئەشکەنجەو ئازاری دۆزەخەوە)".

ئێستاش دێینە سەر بەشیکۆتاییی چیرۆکی پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون.

بێگومان پیاوە باوەڕدارەکە دەرکەوتووەو بەرگریی لە پێغەمبەری خودا (موسا)

ـ سلاوی خودای لێ بێت ـ کردووەو، بەرپەرچی بانگاشەی فیرعەونی داوەتەوەو، داوای له جەماوەر کردووە پەیڕەویی ڕێبازەکەی خۆی بکەن، هەروەها بانگەوازەکەی خۆی بۆ روون کردوونەتەوەو هانیداون بۆ ژیانی ئاخیرەتو، بۆ هەڵبژاردنی بەندایەتیو گوێڕایەڵیی فەرمانی خوداو رازیکردنی خوداو، رێگەی سەرفرازیو سەرکەوتنیشی بۆ دەسنیشان کردوونو، لەرێگەی خەسارەتمەندیو تیاچوونیش وریای کردوونەتەوە. ئیدی چیی پێ ماوە؟ ئایا شتێك ماوە پێیان بڵێت؟!

ئایا لەمە زیاتری لەسەر بووە؟ بێگومان ئەو بەڵگەی رۆشنی خستنە بەرچاوو رێنمایی کردن بۆ ڕێی ساغی وسەلامەتی ی نێو هەردوو خانەی دنیاو ئاخیرەتو، رێگەی راستی بۆ دیاری کردن، بێگومان هەرچیی لەدڵدابوو پێی گوتنو، هەر ئەرکێك لەسەرشانی بوو، بەچاکی ڕاپەڕاند. ئیدی هیچ شتێك وهیچ کارێکی نەماو تەنها ئەوەندەی لەسەرماوە کەشانۆی رووداوەکان بەجێ بهێڵێت.

بێگومان شانۆکەی بەجێ هێشتو ماڵئاواییی له هۆزەکەی بەم رستەیە کرد:

﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾

واتە: (لەمەولا له داهاتوودا ئەم وتانەی من بەیادی خۆتان دێننەوەو رۆژێك دێتە پێشەوە کەڕاستی حەقیقەتی ئەم بانگەوازەی من بەدیی بکەن، ئەوا منیش کاروباری خۆم بەخودا دەسپێرم، بێگومان خوداش بەندەکانی خۆی دەبێنێت و له کاروباریان ئاگادارە).

## " فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ "

ئەم رستەکاریگەرە دەلالەت لە (بنەمایەکی دیاری بانگەواز بۆ لای خودا) دەکات کە پێویستە بانگەوازکاران ئاوڕی لێ بدەنەوەو وابەستەبن پێوەی.

بانگەوازکارەکە (واتە پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون) بانگەوازەکەی دەخستە بەرچاوی خەڵکی وبانگی دەکردن بۆ پەیڕەوی کردنی ئەوهەقەی پێیەتی‌و، پاشان بەرەو ڕووی ڕێبازی پووچەڵ (باطل) دەبێتەوەو بەرپەرچی دەداتەوەو بیروراو فیکرەکانی پووچەڵ دەکاتەوەو، ساختەو فڕفێڵی ئاشکرا دەکات‌و، هەق سەردەخات‌و ڕوونی دەکاتەوەو دەیناسێنێت. لەو کارەش دا باشترین شێوازو کاراترین ئامرازی کارتێکردن‌و بەتینترین ئاموژگاری دەخاتە گەڕ.. مرۆڤی بانگەوازکار لەمە زیاتری نییە: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ الغاشية:﴾ واتە: ( تۆ ئەی پێغەمبەر (ئەی بانگەوازکار) ئەم شتانەیان یادبێنەرەوە چونکە تۆ بەیاد خەرەوەیت‌و، هیچ دەسەڵاتێکی ئەوەت بەسەریان دانییەکە بەزۆر باوەڕیان پێ بێنیت).

جا ئەگەر بانگەوازکار گەیشتە قۆناغێکی لەم جۆرە لەگەڵ بانگکراوەکاندا، ئەوە دەبێت بەجییان بێڵێت‌و وازیان لێ بێنێت تاکو بیر لە وتەکانی بکەنەوەو لەراستییەکان بکۆڵنەوەو سەرنجی لێ بدەن‌و بەخۆیان دابچنەوە، بۆیە پێویستە بانگەوازکار مۆڵەتێکیان بۆ تێفکرین‌و جیاکردنەوەی چاك‌وخراپ لەیەکتر پێبدات..

پێویستە ماوەیەك وازیان لێ بێنێت تاکو عەقڵ وفیکری خۆیان دەخەنەکار، وەك خوداش فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾ سبأ﴾ واتە: (پێیان بڵێ: من یەك ئاموژگاریی ئێوە دەکەم کە

بۆ خوداو لەپێناوی خوادا دووقـۆڵیو، بەتـەنیایی دانیـشنو بیرلـەم قورئانـە، لـەم پێغەمبەرە، لەم ڕێبازە بكەنەوە، ئەم هاوڕێیەی ئێوە، واتە محمد ﷺ شـێت نیـە، بەڵكو ترسێنەرێكی ئێوەیە لەسەر ئەوەی سزایەكی سەخت تووشتان بێت).

جا ئەگەر مرۆڤی بانگەوازكار لەگەڵ بانگكراوانیدا گەیشتە ئەم قۆناغـە، ئـەوا باحیكمەتی پیاوە باوەڕدارەكەیان لەگـەڵ دا بـەكاربهێنێت ﴿فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ﴿٤٤﴾ غافر﴾ واتە پێیان بڵێـت (ئێـوە ڕۆژێـك هـەر بـیر لـەم وتانـەی مـن دەكەنەوەو ساتێك دەبێت، كە بە جیددی ئەم وتانە بخەنە بەر تیـشكی لێكدانـەوەو ورد بوونەوەتان).

بێگومان ئەم بڕگەیەش، كە بەڵێنو پەیمانێكی ڕەق لەسەر شـتێك دەگەیـەنێت، هەڕەشــە نیـە، بـەڵكو ئاموژگـاریو بەیادخـستنەوەیە، هـەروەها واز لێهێنـانیو پشتگوێ خستنیان نیە، بەڵكو ئامرازێكی ترە لە ئامرازەكانی كارتێكردنیان، تاكو هەق هەڵبژێرن. بانگەوازكار بـە گەلەكـەی دەڵێـت: (بەراسـتی مـن ئـەركی خـۆم بەجێهێناو بانگەوازی خۆم پێگەیاندنو ئەوپەڕی كۆششو تەقەللاشم خستە گەڕ بـۆ ئامۆژگاریی كردنتان بەمەش لێپرسـراوێتی سەرشـانم گەیانـد هـەنگاوی ئاینـدەش دەكەوێتەوە سەرشانی خۆتانو ئیـدی خۆتـان ڕێبازەكـە هەڵبـژێرنو، هـەر ئێـوەش ئەنجامی هەڵبژاردنەكەتان لەئەستۆدایە، كە چیتان هەڵبژارد ؟!

ئەنجامەكانی ئەو ڕێبازو بەرنامە هەڵبژاردنەتان لە دنیاو ڕۆژی دواییشدا لەسـەر ڕەنگ دەداتەوە، جا ئەگەر ڕێبازی باوەڕو هـەق هەڵبـژێرن، ئـەوا بەروبومـە تـاڵو وەڕسكارەكانی لە دنیاو ڕۆژی دواییشدا دەدوورنەوە.

جاكاتێـك یـەكێك لـەو دوو ڕێبـازە هەڵدەبـژێرنو بەروبوومەكـەی دەچـننەوە، ئەوكاتە وتـەكانی منتـان بەبیردێتـەوە، ئەوكاتـە ﴿فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ﴿٤٤﴾ غافر﴾ ..هەر ئەوكاتەش ئەگەر ڕێبازی باطیلو ناهەقتان هەڵبـژاردبێت، ئـەوا گلەیی لەمن نەكەن، بەڵكو تەنها گلەیی لەخۆتان بكەن.

## وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ

ئەم وتەیەش لە وتەکانی پیاوە باوەڕدارەکە ﴿فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ غافر﴾ دەلالەت لەسەر بنەمایەکی دیاری دیکەی باوەڕو بانگەواز دەکاتەوە، هەروەها دەلالەتە لەسەر ڕێسایەکی بنچینەیی لە ڕێساکانی جیهادو کۆشش کردن، کە هەرگیز لەبیرکردنی، یان لێبێ ئاگابوونی ناشێت.. بانگەوازکارانیش دەبێت هەڵوێستەی درێژی لەئاستدا بکەنو، بەچاکی لەئەستۆی بنێنو بەچاکی لێی تێبگەنو بەچاکی تێیدا بژین.

بەراستی پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون بەرەو ڕووی باطیل بووەوەو، بەربەرەکانی فیرعەونی کردو، لەستەمو دەسەڵاتو زەبرو زەنگی نەترساو، بەرگریی خۆی لە (موسا) ـ سلاوی لێ بێت ـ کردو، وتەکانی فیرعەونی پووچەڵ کردەوەو داوای لە جەماوەر کرد، پەیڕەویی ڕێبازی خۆی بکەونو، پەیڕەویی ڕێبازی فیرعەون نەکەن. ئەو بەم هەڵوێستە ئیمانداریتییەیو، بە جیهادی قارەمانانەیو، بەبەربەرەکانی کردنی پیاوانەی، کەوتبووە بەر ئەگەری سزاو ئەشکەنجەی فیرعەونو، رقو تۆڵەی کوێرانەیو، فڕوفێڵو تووڕەیی توندیەوە- ئێ خۆ فیرعەونیش لێی بێ دەنگ نابێت، بەڵکو سزای دەداتو دەیچەوسێنێتەوە- بۆ ئەم کارەشی چەندین ئامرازو شێوازی هەیەو، هەموو سەربازو دەستو پێوەندەکانی کەئامادەی راپەراندنی فەرمانەکانین لەوێ ئامادەن، بەڵام پیاوە باوەڕدارەکە (وەك لە رواڵەتدا دیارە) هەرخۆی بەتەنیا لەمەیدان دایەو، هیچ هێزو پێزو توانـاو بەرگرییەکی نییەو، بەپێی پێوەرە مەتریالییەکانی مرۆڤ- بێ هێزو لاوازەو، لەبەر ئەمەش زەرەرمەندو دۆڕاوە، چونکە گوایە ناتوانێت زەبروزەنگ وئەشکەنجەی فیرعەون لەخۆی دوورخاتەوە، نەخاسمە، کە توانای لەگەڵ داجەنگینیشی نییەو،

ئیدی بە لۆژیکی ماددی (مەتریالیستی)ی جاهیلانـە کێشەکە ئاوایـە. بـەڵام بـە لۆژیکی باوەڕدارانە کێشەکە ڕەهەندێکی تری هەیە، ئەوەیە ئـەم پیـاوە بـاوەڕدارە لەخۆیەوە راسـتەوخۆ نـەبزواوە، دەنـا بەشـێتێك دەردەچـوو. هەرخۆیـشی بەتـەنیا لەبەردەم فیرعەون دانەبوو دەنـا بـەخۆکوژ (منتحـر)ێـك دەردەچـوو. بـەڵکو ئـەو لەسرووش (وحی)ی ئیمانەکەیەوە دەستی بە بـزووتن کردبـووو راسـپاردەی خـودای لەسـە رخـۆی بەبانگـەوازو جیهـاد جێبـەجێ دەکـرد. دیـارەو بێگومـان خـوداش (بەلایەنگرتنیو لەسەر هەق چەسپاندنیو بەئارام پـێ بەخـشینی) لەگـەڵی دابـوو، لەراسـتیدا بانگەوازەکـەش بانگـەوازی خودایـەو خـوداش هـەرخۆی سـەرخەری بانگەوازەکەی بوو، بێگومان —موسا-ش پێغەمبەری خودایەو خودا بـەرگریی لـێ دەکات. پیاوە باوەڕدارەکەش پشتگیری ئایینی خودای کردووەو، خوداش پاڵپـشتی بووە، لەملاوە فیرعەونیش بەربـەرەکانیی خـودای کـردووەو خـوداش هـەر دەبێـت بیبەزێنێت.

پیاوە باوەڕدارەکە لەکاتێکـدا بـەرەو ڕووی فیرعـەون دەبـووەوە کـەباوەڕداربوو بەخوداو پشتی پێ بەستبووو دڵنیابوو لەوەی خودا سـەری دەخـاتوو داوای هێـزو کۆمەکیشی هەرلەخودا دەکرد.

لەهەمان کاتدا فیرعەون دوژمـنی خـودا بـووو ئەگەرچـی لـەدژی باوەڕدارەکـە دەجەنگی بەڵام لەراستی دامانای وابوو کەدژی خـودا دەجـەنگێت. ئەمەیـە بـاری ڕاستەقینەی جەنگە کەلەنێوان پیاوە باوەڕدارەکەو فیرعەون داو، هەر ئەمەشە باری ڕاستەقینەی هێزەکان لەوجەنگەدا.

بێگومـان هـەمو هێـزە بەشـەرییەکان لەبـەردەم هێـزی خـودای پـەروەردگاردا سەرشۆرو لاواز دەبنو دەتوێنـەوە سـەرەڕای ئـەوەی هـەر چـەندێك گـوڕو تـەوژمو دیاردەی ماددییان تێدا بێت، هەروەها هەمەرەنگی فرۆفێڵیان وشـێوەو جۆرەکـانی زەبرو زەنگیان ونو پوچەڵو بێ نێوەرۆکنو زیـان بـەهیچ کـەس ناگەیـەنن مەگـەر

بەمۆڵەتو خواستێکی خودایی نەبێت. لەبەر رۆشنایی ئەم راستییە دەرخراوەدا لەوتەی پیاوە باوەڕدارەکە تێدەگەین کە دەڵێت: ﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلْعِبَادِ﴾ ئەم بڕگە باوەڕدارێتییە پەیمان ئامێزە بەرنامەیەکمان لەباوەڕو بانگەواز دەخاتە بەرچاو، بەرنامەیەك کەهەموو بانگەوازکارێك لەکاتی رووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی باطیلو ستەم دا پێویستی پێی دەبێت بێگومان مرۆڤی بانگەوازکار دەچێتە نێو مەیدانی جەنگەوە لەدژی هێزەکانی باطیل و گومڕایی دەجەنگێت، لەم مەیدانەشدا دەروونی پڕە لە ماناو بەها باوەڕدارییەکانو، پەی بەحەقیقەتی جەنگو هێزولایەنەکانی دەبات..کاتێك دەچێتە نێو جەنگەکەوە هەموو جەستەوگیانی یەکپارچە بەباوەڕ بەخوداو بەپشت بەستن بەخودا جۆش دراوەو، داوای سەرکەوتن هەر لەخودا دەکاتو پەنا بەخودا دەگرێتو بەشێوەیەکی رەهاو بێسنوور هەموو کاروبارێکی هەر بەخودا دەسپێرێتو داوای کۆمەكو ئارامیو جێگیربوون لەسەر هەق هەر لەخودا دەکات.

جاکاتێك مرۆڤی بانگخواز کاروبارو جڵەوی ژیانی هەربەخودا دەسپێرێت، دەبینێت کەوا خودا لەگەڵی دایە، کاتێك داوای سەرکەوتنیش لەخودا دەکات دەبینێت کەوا خودا باشترین سەرخەرە... کاتێك پشت بەخوداش دەبەستێت دەبینێت خودا باشترین پشت پێ بەستراوە.

بەڕاستی ئەو بڕگە باوەڕدارییە، تەنها وتەیەکی ئاسایی سەرزاری بانگەوازکارەکە نەبووە، کەلە واتاو حەقیقەت دابڕا بێت، بەڵکو کۆمەڵێك ڕاستیی ئیمانداریێتیو بانگەوازکاریو جیهادکاری بووە کە تیایان داژیاوە. هەروەك کە هەڵوێستێکی کورتی ساتەوەختیش نەبووە،بەڵکو ژیانێکی باوەڕدارانەی ڕاستەقینەبووە کەلەگشت چرکەو ساتێکی ژیانیدا تیایدا ژیاوە.

مرۆڤی بانگەوازکار چەندین ئایەتی دیکەی قورئانیش دەخاتە پاڵ ئەو بڕگە

باوەڕدارانەیەی پیاوە ئیماندارەکەی هۆزی فیرعەون، کە هەموو ئایەتەکان بەرنامەیەکی باوەڕداریو بانگخوازیو جیهادکاریی بۆ پێکدەهێنن، لەو ئایەتانەش:

١- ئایەتەکانی (٣٦-٣٧) لە سوورەتی (الزمر) کە خودا تیایاندا فەرموویە:

﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾﴾ واتە: (ئایا خودا هەر خۆی بەس نییە بۆ ئەوەی کەپشتیوانی بەندەی خۆی بێت- کە پێغەمبەرە ﷺ؟! بەڵام ئەوان تۆ دەترسێنن بەشتی ترلەجیاتی خودا. جا هەر کەسێك خودا گومرای بکاتو بەهۆی خراپەو سەرکێشیەکانییەوە سەری لێ بشێوێنێت ئەوا هیچ ڕێ نیشاندەرێکی نییە. هەرکەسێکیش خودا ڕێ نیشاندەری بێتو بەهۆی دڵپاکیی خۆیەوە بیخاتە سەر ڕێی ڕاست ئەوا هیچ کەسێك ناتوانێت گومڕای بکات. جا ئایا خودا باڵادەستو تۆڵەستێن نییە؟!".

٢- هەردوو ئایەتی (١٧٣-١٧٤) لە سوورەتی (ال عمران) کە خودا تیایاندا فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ... ﴿١٧٤﴾ آل عمران﴾، واتە: (ئەوانەی بەدەم بانگەوازی هەقەوە چوون، هەندێك لەخەڵکی پێیان دەڵێن: (ئەوا کەسانێکی زۆرخۆیان بۆ ئێوە کۆکردۆتەوەو بەتەمان پەلامارتان بدەن جا ئێوەش لێیان بترسنو خۆتان تووشی کارەسات مەکەن)، بەڵام... ئەو ئیماندارە بەئارامانە باوەڕیان توندترو زۆرتر دەبێتو دەڵێن: (ئێمە خودامان بەسە کەباشترین یارمەتیدەرو پشتیوانمانە. ئەوسا موسوڵمانان بەنازو نیعمەتو فەزڵی خوداوە گەڕانەتەوەو هیچ کارەساتو ناخۆشییەکیان تووش

نەبووە).

٣- ئایەتی (٧١) لە سوورەتی (یونس) کە خودا تێیدا فەرموویە.. ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةً ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ۝٧١﴾.

واتە: (ئەی پێغەمبەر، بەسەرهاتو چیرۆکی (نوح) یان بۆ بگێڕەوە، کاتێك بە گەلەکەی خۆیگوت: (ئەی گەلی خۆم- ئەگەر ئێوە بەهۆی مانەوەی منەوە لەنێوتاندا وەڕس بوونو بەم یادخستنەوەیەی ئایەتو بەڵگە دیارەکانی خودا دڵتەنگو بێزاربوون، ئەوە دڵنیابن من کوڵ نادەم وپشتم بەخودابەستووە، جائێوەش چیتان لەدەست دێت درێغی مەکەنو خۆتانو بتەکانانو هاوڕێبازەکانتان کۆبنەوەو بە ئاشکراچیتان پێ دەکرێت لە دژی من بیکەنو منەتتان نەبێتو مۆڵەتیشم مەدەن).

٤- ئایەتەکانی (٢-٣) لە سوورەتی (الطلاق) کە خودا تێیان دافەرموویەتی: ﴿...وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ۝٣﴾

... واتە: (هەرکەسێك لە خودا بترسێتو خۆی لەسزاکانی بپارێزێت ئەوا خوداش دەروازەی خێرو بەختەوەریی لێ دەکاتەوەو، لە شوێنێکی وەهاشەوە رزقو رۆزیی بۆ دەنێرێت کە ئەو عەبدە پێشتر حسابی بۆ نەکردووەو بەخەیاڵیدا نەهاتووە کەوا لەو شوێنەوە خودا رزقی دەدات. جا هەر کەسێك پشت بەخودا ببەستێت ئەوا تەنیا خودای بەسە بۆ سەرخستنو کۆمەك پێدانی، چونکە بەراستی خودا کاروباری بڕیار لەسەر دراوی خۆی هەر بەئەنجام دەگەیەنێتو بۆ هەرشتێکیش کاتو وادەیەکی دیاریکراوی داناوە).

٥- ئایەتەکانی (٥٤-٥٦) لە سوورەتی (هـود) کـە خـودا تێیانـدا فەرموویـەتی:
﴿...قَالَ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٦﴾﴾... واتە: (هود) لـە وەڵامـی بێباوەڕانی گەلەکەیدا گوتی من خودا دەکەم بەشاهیدو، ئێوەش بە شـایەت بـن لەسەر ئەوەی کە من بەریو دوورم لەوشـتانەی کـە ئێـوە دەیکەنـە هـاوەڵ بـۆ خوداو، جگە لەخوداش پەرستنی هیچ شتێکی دی ڕەوا نییە، ئیدی چی دەتوانن بیکەنو هەمووتان نەخشەبکێشن بۆ لـەناوبردنی مـنو هـیچ مۆڵەتێکیـشم بـۆ دامەنێن، چونکە تەنها پشتم بەوخودایە بەستووە کە خودای منو ئێوەشەو کـە جڵـەوی ژیـانو کاروبـاری هـەموو گیانلەبـەرێکی ئێـو ئـەم بوونەوەرەشـی بەدەستەوەیە.. بێگومـان خـودای پـەروەردگاری مـن لەسـەر حەقـەو خـاوەنی ڕێبازێکی ڕاستو دروستە).

## فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ

دوای ئەوەی پیاوە باوەڕدارەکە ئەرکی خۆی گەیاند، دیارە فیرعەونیش هەڕەشەو گوڕەشەی تەواوی لێ دەکاتو بەسزاو زەبرو زەنگی خۆی دەیترسێنێت، ئەمەش پیاوەکەی نەترساندووە، بەڵکو کاروباری خۆی بەخودا سپاردووە، ئەم کاربەخودا سپاردنەشی، کۆتاییی ئەو ئاخاوتنە ئیمانداریو بانگخوازییەو، کۆتاییەکی گونجاوی چیرۆکەکەشە، هەروەها مەبەستێکی گێڕانەوەی چیرۆکی نێو قورئانیشی تێدایە. بێگومان قورئان دەیەوێت ئەم هەڵوێستە پتەوکات لەلای موسڵمانانو، ئەم واتا جوانە لە هزرو زەین و هەستی هەریەکەیاندا بچەسپێنێت، هەروەها قورئان دەیەوێت (لەڕێی چیرۆکەکانییەوە) ئەوە فێری موسڵمانان بکات، کە باوەڕی تەواو بەخودا بێننو پشتی پێ ببەستنو پەنای بۆ بەرنو کاروباری خۆیانی پێ بسپێرنو، ملکەچی بنو خۆیان بەئیرادەو مەنهەجی تەسلیم کەن. پاشان قورئانی پیرۆز باسی شیکارو وردەکاریی ڕووداوەکانی دوای ئەوکاتە ناکات، کە بەجێیان دێڵێت، چونکە لە چیرۆکەکەدا بە ئامانج نەگیراوەو، باسکردنیشی سوودی زۆری نییە.

ئێمە لە بیروخەیاڵی خۆماندا وای بۆ دەچین، کە پیاوە باوەڕدارەکە سزاو ئازارێکی زۆری پێ گەیەنرابێت لەوانەشە وای دابنێنین بەچەندین جۆرو شێواز لەلایەن فیرعەونەوە، پیلانی لێ گێڕرابێتو سزاو ئەشکەنجە درابێتو لە حیقدو فڕوفێڵی فیرعەون دەرباز نەبووبێت.

ئەم بۆچوونەی نێو ئاوێنەی خەیاڵ کەمو کورتی تێدانییەو، قەیدی ناکات ئەگەر خەیاڵمان ئەم دیمەنانە بۆ چیرۆکەکە تەواو بکات، بەڵام تەنها دەبێت لەدەرووی بۆچوونو بەخەیاڵداهاتنەوە بێت، نەك لەدەرووی بەراستی دانانو گێڕانەوەی چەند شتێکی تری بەسەرهاتەکانەوە.

دەنا ناشێت بڵێین فیرعەون لەدواییدا واو واو ئاوای لێ کردووە، مادام قورئانو سوننەت باسیان لێ نەکردووە. بەڵکو گرنگ ئەوەیە ئێمە ساتێك لەبەردەم ئەم هەواڵەی خوادا بووەستینو رامێنین که دەربارەی پیاوەکە فەرموویەتی: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ ﴾... واته: (خوداش ئەم پیاوە ئیمانداره‌ی هۆزی فیرعەونی لەپیلانی خراپو درندانەیان پاراست ) بێگومان پیاوە باوەڕدارەکە خۆی بەخودا سپاردووەو کاروباری خۆی هەربۆ خودا رەوانە کردووە، جا ئایا خوداش پشت گوێی خستووە؟ ئایا خوداش ئەم پیاوەی تەسلیم بەفیرعەونو فرو‌فێڵو پیلانەکانی کردووە؟ بێگومان خودا هەرگیز واز لە شوێنکەوتوانی ناهێنێتو بەدوژمنانی خۆیو دوژمنی ئیماندارانی ناسپێرێت، بەڵکو خودا لەگەڵ ئیماندارە شوێنکەوتووەکانی خۆی دایەو بەسەرخستنو جێگیر کردنیان لەسەرهەق بەهرەمەندیان دەکات. ئەمەش سوننەتێکی خوداییەو ناگۆڕێت ودوا ناکەوێت قورئان چەندان نموونەی لەسەر ئەم سوننەتە خوداییە هێناوەتەوە، پیاوە باوەڕدارەکەی نێو هۆزی فیرعەونیش نموونەیەکە، لەو نموونانە. ئەم هەواڵە راستە قورئانییەش (کە خودا لەفرو‌فێڵی ئەوان پاراستوویەتی مژدەیەکەو خودا لە قورئاندا بە ئیماندارانیداوە لە کاتێکدا داوایان لێ دەکات هەر پشت بە خودا ببەستنو جڵەوی ژیانو کاروباریانی پێ بسپێرن.

هەروەها ئومێدێکیشەو قورئان لەدڵو دەروونی باوەڕدارانیدا پەخشی دەکات لەو کاتەدا کەئاینی خودا سەردەخەنو بەرگریی لێ دەکەنو جیهاد لەدژی دوژمنانی خودا دەکەن. لێرەدا زۆر دڵگیرو خۆشحاڵم بە وتەیەکی بەپێزی ئیمام (جعفر-ی کوڕی محمد الصادق) خودا لێی ڕازی بێت — کە گوتوویە[1]. " سەیرە لای من کەسێك بە چوار بەڵا گرفتار بووبێتو، کەچی چوار هۆکاری چارەسەر پشت گوێ بخات):-

---

(١) بڕوانە کتێبی (جعفر محمد الصادق) نووسینی (عبدالعزیز سید الاهل)- لاپەرە (٦٨).

١- سەیرە لای من کەسێك ترسا بێت، کەچی پەنا نەباتە بەر فەرمایشتەکەی خودا: ﴿...حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ آل عمران﴾، چونکە من بیستوومە هەر دوای ئەم فەرمایشتە خودا دەفەرمووێت: ﴿فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ ...﴿١٧٤﴾ آل عمران﴾، واتە: (ئەوانەی لەکاتی ترسانیاندا گوتوویانە (ئێمە هەر خودامان بەسە کە فریاد ڕەس‌و پاڵپشتمان بێت) ئەوانە بەنازو نیعمەت‌و فەزڵی خوداییەوە دەگەڕێنەوەو هیچ ناخۆشیەکیشیان تووش نەهاتووە).

٢- سەیرە لای من کەسێك دڵتەنگ‌و غەمبار بووبێت وکەچی پەنانەباتە بەر فەرمایشتی خودا: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ الأنبياء﴾، چونکە بیستوومە لەدوای ئەم فەرمایشتەوە خودا فەرموویەتی: ﴿ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ۚ وَكَذَٰلِكَ نُۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ الأنبياء:﴾، واتە: (کاتێك (یونس) لەنێو سکی نەهەنگەکەدا هاوارو نزای کردو گوتی: "خودایە هیچ خودایەکی پەرستراوو پەروەردگار جگەلە تۆ نییەو هەر تۆ شایستەی هەموو سوپاس‌و ستایشێکیت‌و بەراستی من ستەمم لەخۆم کرد کاتێك بەبێ فەرمانی تۆ گەلەکەم جێ هێشت) ئێمەش بەهانایەوە چووین‌و رزگارمان کرد لەو خەم‌و پەژارەو دڵتەنگییە، هەربەم شێوەیەش ئیمانداران رزگاردەکەین‌و بەهانایانەوە دەچین کاتێك دەکەونە نێو تەنگانەو خەمناکی یەوە.

٣- سەیرە لای من کەسێك فێڵ وپیلانی لێ کرابێت، کەچی پەنا نەباتە بەر فەرمایشتی خودا ﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾

غافر﴾، چونکه من بیستوومه خودا لەدوای ئەوه فەرموویەتی: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ ﴿٤٥﴾ غافر﴾، واته: (پیاوه باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون دوای ئەوەی بانگەوازی پێگەیاندن گوتی: (ئەوا من کاروباری خۆم بەخودا دەسپێرم، خوداش بینەری بەندەکانیەتی، پاشان خودا لە خراپەو فڕوفێڵی ئەو گەلە پاراستیی).

٤- سەیرە لای من کەسێك دڵی چووبێت بەدنیاو جوانییەکانی وشتە باقو بریقەکانی داو کەچی پەنا نەباتە بەرفەرمایشتی خودا ﴿...مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ... ﴿٣٩﴾ الکهف﴾، چونکه من بیستوومه خودا دوای ئەمە فەرموویەتی: ﴿ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ ... ﴿٤٠﴾ الکهف﴾، واته: (کەسێکی ئیماندار بەکەسێکی لەخۆبایی خاوەن باخو بێستانی گوت (ئەگەر چوویتە نێو باخەکەتەوە بڵێ ما شاء الله، ئەم هەموو نازو نیعمەتە هەمووی بەخششی خودایەو لەخوداوەیەوە هیچ هێزو توانایەك ئاوا بەپیت بەرەکەت نابێت تەنها بە پشتیوانیو هێزی خودا نەبێت دەبێت ئەمە بڵێیت کاتێك دەبینی من ماڵ و سامانو نەوەم لەتۆ کەمترە، چونکه دوورنییە کە خودای پەروەردگارم لەو باخەی تۆ چاکترم پێنەبەخشێت چ لەدنیا یان لە قیامەتدا)

## وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ

خودا پیاوە باوەڕدارەکەی هـۆزی فیرعـەونی لـە خراپـەکانی پیلانـی فیرعـەون پاراسـتو رزگـاری کـرد لێـی.. ناشـزانین دوای گەیانـدنی پەیامـە بـاوەڕداریو بانگخوازی یەکەی چیی بەسەر هاتووە.

نازانین ئایا فیرعەون ئەویشی لەگەڵ ئەو سیحربازانەدا کوشتووە کە باوەڕیان بـە (موسا) هێنا ـ سڵاوی خودای لیٚ بێت ـ یان بەندی کردبێت لە زینداناو، ئـەویش لە زیندانەکەیدا مردبێت؟ یان ئایا لە (میـسر) بـە مردنێکـی ئاسـایی مردبێـت؟ یاخود لەگەڵ هۆزی (بەنوئیسرائیل)دا وڵاتی جیٚهێشتبێتو دوای ئەوە مردبێت؟!.. نازانین چـۆن دەربـازبووە، یـان چـی بەسـەرهاتووە. چـونکە قورئـان ئەمـەی روون نەکردۆتەوەو لە فەرموودەی (صحیح)ی پێغەمـەریش ﷺ روون نەکراوەتـەوە.. جـا لەبەرئەوەی ئـەو دوو سەرچـاوە راسـتو جـیٚ متمانەیـە لـە باسـکردنی شـیکاری چارەنووسو حاڵەتی پیاوەباوەڕدارەکە بیٚ دەنگ بوون ئەوا ئێمەش دەبێت لێـی بـیٚ دەنگ بینو لەهیچ سەرچاوەیەکی دییەوە بەدوای دەنگو باسـی دا نەگـەڕێین وهـەر هێندەمان بەسە کە لەو دوو سەرچاوە ڕاستەقینەیە (قورئانو سوننەت)داهاتووە.

خـوداش لـە فـڕوفێڵو پیلانـی فیرعـەون پاراسـتوویەتی، فیرعـەونو هـۆزە بێباوەڕەکەشی بەسزای سـەختی ئاکـامی فـڕۆفێڵ وخراپـەکانیان گەیانـدووە، وەك فەرموویـــــەتی: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ غـافر﴾، واتە: (هەروەها خـودا خـێڵو دارودەسـتەی

فیرعەونی تووشی سزایەکی زۆر سەخت کرد کە ئاگری دۆزەخەو بەیانیان‌و ئێواران پیشانیان دەدرێت واتە (بەردەوام شەوو رۆژ، ئێوارەو بەیانی‌و هەموو ساتێك) تیایدان‌و، هەر لەرۆژی مردنیانەوە تاکاتی قیامەت پیایاندا دەچزێنرێت، لەرۆژی قیامەتیشدا فەرمان دەدرێت بەوەی کەئادەی تاقم‌و هۆزی بێ باوەڕی فیرعەون بخەنە نێو توند ترین‌و سەخت ترین ئەشکەنجەو ئازاری دۆزخەوە).

بەم رەنگە فیرعەون‌و هۆزەکەی کەوتوونە نێو ئەو ئاکامە دژوارەی فرۆفێل‌و ساختەکاری‌و زۆرداریتییەکەیانەوەو، بەروبوومی نەخشەو پیلانە خراپەکانیان چنییەوەو، پیلانە شەڕ خوازییەکانیشیان لەگەردنی خۆیان ئالآیەوە، وەك خوداش فەرمووبەتی ﴿... وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ... ﴿٤٣﴾ فاطر﴾. واتە: (پیلانی (شەڕو تاوانکاری) هەمیشە هەر بەسەر خاوەنەکانیاندا دەشکێتەوە". ئەمەش رێسایەکی جێگیرو نەگۆڕە لە رێساکانی قورئان‌و رێبازو سوننەتێکی راستیشە لە سوونەتەکانی خودا.

هۆزی فیرعەون تووشی سزایەکی سەخت بوون – خودا فیرعەون‌و سەربازەکانی لە دەریادا خنکاندکاتێك بەدوای موساو باوەڕدارەکانیدا ڕایان دەکردو دەیانوویست بیانگرنەوەو بیانخەنەوە ژێر حوکمی ستەم‌و تاوانی خۆیان، دنیایان بەوشێوە مەینەتبارییە بەجێ‌هێشت بێ‌ئەوەی کەسێك بۆیان دلتەنگ‌و خەمباربێت، وەك خودا لەبارەیانەوە فەرموویە ﴿كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَـٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَـٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ الدخان﴾... واتە: (ئەو هۆزەی فیرعەون چەندە باخ‌و باخات وکانیاوی سازگاریان بەجێ هێشت، چەندەها کێڵگەو بێستان‌و جێگەو رێگەی خۆشیان لەپاش بەجێ ماو، چەندین جۆر لە نازونیعمەتی تریش کە ژیانی خۆشیان تێدا بەسەردەبرد، بەڵام بەهۆی کفرو ستەمی خۆیانەوە بەم

رەنگە لێیانمان سەندنەوەو کردمانن بەمیراتیی هۆزێکی تر، ئیتر نە ئاسمان بۆیان گریاو نەزەویش بۆیان خەمباربوو، ساتەوەختێکیش لەوادەی دیاری کراویان مۆڵەتیان پێ نەدرا)..

بەم شێوەیە فیرعەونو خێڵو دەست پێوەندو شوێنکەوتوانی لەژیانی دنیاوە بۆ ژیانی (بەرزەخ)ی گۆڕستان گوازرانەوە کە لە گۆڕەکانیاندا تاهاتنی ڕۆژی قیامەت سزادەدرێنو دوای ئەوەش سەخت ترین سزای دۆزەخیان بۆ دانراوە.

قورئانی پیرۆزیش ئەو سزا ناخۆشەی دیاری کردووە کە لە گۆڕەکانیاندا تووشیان دەبێت: ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ ﴿٤٦﴾ غافر﴾، ئەوان دەخرێنە بەرئاگر هەموو ڕۆژێك، لە بەیانیانو لە ئێواراندا، ئەمەش دو وژەمی ڕۆژانەیە کە تیایاندا سزا دەرێن لەو ڕۆژەوەی خودا لە دەریاکەدا سەرنگومی کردوون تاکو ڕۆژی هاتنی قیامەت.. دەی ئایا تائەمرۆ چەند سەدە بەسەر ئەو سزا ڕۆژانەیاندا تێپەریووە؟! ئەی داخۆ تارۆژی قیامەت چەند سەدەی تریان بەسەردا تێدەپەرێت، ڕۆژی هاتنی قیامەتیش فیرعەونو هۆزەکەی دەبرێن بۆ حسابو لێپرسینەوە: پاشان فەرمان دەدرێت بەفریشتەکانی دۆزەخ کەفیرعەونو بێ باوەڕەکانی هۆزەکەی بخەنە ئاگری دۆزەخەوە: ﴿ ...وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ غافر﴾ .. زانایانی تەفسیر ئەم ئایەتە بەدەقێك دەربارەی سزای نێوگۆڕ دادەنێنو گوتوویانە: (بێگومان سزای نێوگۆڕ، یان نازو نیعمەتەکەی، ئاوایەو بەدەقی ڕۆشنی قورئانیو فەرموودەی ڕەوان (صحیح) سەلمێنراوە. دەقی ڕۆشنی قورئان ئەم ئایەتەیە: ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ غافر﴾.. فەرمودەی (صحیح)ی پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوەیە کە(بخاری)و (مسلم) لە (عبداللە ی کوڕی عمر)ەوە (خودا لێی ڕازی بێت) گێڕایانەتەوە کە پێغەمبەر خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**ان أحدكم اذا مات، عرض**

**علیه مقعده من الغداة والعشي، ان كان من أهل الجنّة فمن اهل الجنّة وان كان من اهل النّار فمن اهل النّار، يقال: هذا مقعدك حتي يبعثك الله يوم القيامة))**[1]...

واتە: (ئەگەر کەسێك لە ئێوە مـرد شـوێنی خـۆی هـەموو ڕۆژێـك لـە بـەیانیان‌و ئێوارانـدا پیشان دەدرێت، جا ئەگەر لە کەسانی نێو بەهەشت بێت ئەوە لەوانە، خـۆ ئەگەر لە کەسانی نێو دۆزەخ بێت ئەوە لەوانەیەو، پێی دەگوترێـت: ئەمـە شـوێنی تۆیە تاکو خودا لـەڕۆژی قیامەتـدا زینـدووت دەکاتـەوە). (بخـاری و مـسلم) ئـەم فەرموودەیەیان گێراوەتەوە.

(١) (بخاری) گێراویەتییەوە لە: (کتـاب الجنـائز- ٢٣، بـاب الميـت يعـرض عليـه مقعـدة، رقـم (٨٩)، حيث رقم (١٣٧٩)). هەروەها (مسلم)یش گێڕاویەتییەوە لە: (کتاب الجنّتو نعيمهـا- ٥١-، باب عرض مقعد الميت (١٧)، حديث رقم (٢٨٦٦)).

## لەنێوان (أبوبکری صدیق)و پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیــرعەوندا

وادیارە (ئیمامی بوخاری) ـ خودا لێی خۆشبێت ـ ویستوێتی بەراورد بکات لەنێوان پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون (کە پشتگیریی موسای کردووە)و لەنێوان (ابوبکری صدیق)دا کە پشتگیریی پێغەمبەری خودا ﷺی لە (مەککە) دا کردووەو، هەروەها ویستوێتیی وای دەرخات کە (ئەبوبەکری صدیق) لەو پیاوە باوەڕدارە باشتربووە، بۆ نموونە لە (کتاب التفسیر)ی (جامع الصحیح)ەکەیدا فەرموودەیەکی لە (عروەی کوڕی زبیر)ەوە هێناوە، کە (عروە) گوتوویە: بە(عبدالله کوڕی عەمری کوڕی العاص)م گوت: (پێم بڵێ لە بەسەرهاتی پێغەمبەرو بێباوەڕەکاندا، بێباوەڕانو موشریکان توندترین ڕەفتاریان بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ چی بوو)؟ ئەویش لەوەڵام داگوتی: کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لەحەوشەی (کەعبە)دا نوێژی دەکرد، (عقبەی کوڕی أبو معیط) هەڵی کوتایە سەر شانیو کراسەکەی لەملی ئاڵاندو هێندەی لەگەردنی توند کرد، تا بیخنکێنێت، ئەوەبوو خێرا (ابوبکر) یەخەی کابرای گرت و لە پێغەمبەری خودای دوورخستەوەو گوتی[1]: ﴿...أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ...﴾ (٢٨) غافر: ٢٨﴾ ...ئەم وتەیەی (ابوبکر) کە دەقی ئایەتەکەی سوورەتی (غافر)ی ئاراستەکردوون کاتێك پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەونیش، هەمان پرسیاری ئاراستەی هۆزەکەی کرد، واتە: (ئایا پیاوێکی وەك (محمد) تەنها لەسەر ئەوە دەکوژن، کە دەڵێت پەروەردگاری من (الله)یەو لە هەمان کاتدا بەڵگەو نیشانە

---

(١) البخاري- كتاب التفسير(٦٥)، باب (٤٠)، سورة المؤمن، حديث رقم (٤٨١٥).

ڕۆشنەکانی بۆ هێناون)؟

ئەمیری ئیمانداران (علی‌ی کوڕی ابوطالب)ﷺ بەراوردێکی لـەنێوان (ابـوبکری صدیق)و پیاوە باوەڕدارەکەی هـۆزی فیرعـەون داکـردووەو، (ئـەبوبکر)ی لـەوپیاوە بەچـاکتر دانـاوە- لـەم ڕووەوە (امـام ابـن کـثیر) لـەکتێبی (تـأریخ)ەکەیـداو لـە (البزار)ەوەو، ئەویش لە (محمدی کوڕی عقیل)ە وە ئەم وتەیەی ئیمامی (علـی)یـان هێناوە، کە ڕۆژێکیان (علی ی کوڕی أبو طالب) ﷺ لە وتارێکیدا بۆ خەڵکی لێـی پرسـیون (خەڵکینـە ئـازاترین کـەس کێـیە)؟ گوتوویانـە (تۆیـت ئـەی ئـەمیری ئیمانداران)، ئەویش گوتوویەتی (هەرکەسێك زۆرانبازیی لەگەڵمدا کردبێـت هـەقی خۆم لێ سەندووەو تۆڵەم لێ کردۆتەوە.. بەڵام فەزڵی (ئەبووبەکر) لەوەدابووە کاتێك ئێمە کەژاوەیەکمان بۆ پێغەمەر ﷺ ڕێك خستو گوتمان: کـێ لەگـەڵ پێغەمبـەری خوادا دەبێت؟ وەڵڵاهی کەس لێمان نزیك نەبووەو، تەنها (ئەبوبـەکر) نـەبێت، کـە شمشێرەکەی لەپێناوی پێغەمەری خوادا ﷺ هەڵکێشابووو، هەرکەسـێك خوازیـاری پەلاماردانی بوایە خێرا پەلاماری دەدایەوە، بەمەش ئەو ئازاترین کەس بوو).

هـەروەها گوتوویـەتی: (دیـتم قوڕەیـشییەکان تـەنگیان بـە پێغەمبـەر ﷺ هەڵچنیبوو، یەکێکیان دژایەتی‌و بەربـەرەکانیی دەکـرد، یـەکێکی تریـان پەسـتی دەکرد، پێیان دەگوت (تۆ هەموو خوداکانت کردووە بەیەك خـودا؟) لـەو سـاتانەدا هیچ کەسێك بۆ بەرگری لێ کردنمان نزیك نەدەبووەوە، تەنها (ئەبوبەکر) نەبێت، کە لە فلان کافری دەداو، ئەوی تریـانی بـەپاڵ دەردەکـردو، یـەکێکی تریـانی پەسـت دەکردو، ئینجا پێیشی دەگوتن: (ئەی قوڕ بەسەرتان) ئـەوە پیاوێـك دەکـوژن، کـە دەڵێت (پەروەردگارم- الله یە؟) پاشان ئیمامی (علی) کەوایـەکی خەتـداری لەبـەر خۆی داکەند کە لەخۆی پێچابوو، ئینجا گریـا هـەتا ڕیـشی تـەڕبوو، گـوتی (دەی توخوا لەئێوە دەپرسم ئایا پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون باشتر بوو، یـان ئـەو (واتە ئەبوبەکر)؟ خەڵکەکە لە وەڵامدا بێدەنگ بوون، ئینجا (امام علـی) گـوتی:

(دەسا بەخـودا سـاتێك ژیان لەگەڵ ئەبوبەکردا باشـترە لـەوەی پڕاوپـڕی زەوی هەر هەمووی تـەنها پیـاوە باوەڕدارەکـەی هـۆزی فیرعـەون بێـت، چـونکە پیـاوە باوەڕدارەکە باوەڕی خۆی شاردبۆوە، بـەڵام (ئەبوبـەکر) ئیمـانو باوەڕەکـەی خـۆی ئاشکرا کردبوو)[1].

## پوختەی گرنگترین پەندو ئاماژەکانی ئەم چیرۆکە

ئێستاش دوای ئەوەی گەشتەکەمان لەگەڵ چیرۆکی پیـاوە باوەڕدارەکـەی هـۆزی فیرعەون لەکۆتایی نزیك بۆتەوە، هەڵوێستەیەك لەئاست چیرۆکەکەدا دەکەین، تاکو گـرنگترین وانـەو ئامـاژەو دەلالاتـی بـەکورتی لـێ دەربهێـنین،وەك ئەمانـەی لای خوارەوە:

١- ستەمکارانو زۆردارانو لە ستەمدا رۆچوو، چەندین ئامڕازو شێوازی نایاساییو نائەخلاقیو نائینسانی لەبەرەو ڕووبوونەوەی هەقو شوێنکەوتوانی هەقدا بـەکار دێـنن، وەك کوشـتنی کـوڕانی ئیمانـدارەکانو هێـشتنەوەی ئافرەتـەکانیان بـۆ خزمەتی خۆیان ، وەك چۆن فیرعەونو هۆزەکەی ئەمە رەفتارەیان بووە.

٢- ستەمکاران دەیانەوێت بەو ئامڕازو کەرەسە گـەورەو گرانانـەی لەجـەنگی دژی دەست وەشاندن لە بانگەوازکارانەوە بیانترسێنن.

٣- ستەمکاران دەیانەوێت بەسیمای دیموکراسیەتەوە خۆیان پیشان دەنو ئیـددیعای

---

(١) بڕوانە (البدایە والنهایة)ی- ابن کثیر بەرگی (٣) لاپەڕە (٢٧١-٢٧٢).

تێبینی: نووسەری ئەم کتێبە لەم بەشەی دوایی ئـەم چـیرۆکەدا کاتێـك ئـەم بەراوردکارییـەی هێناوەتەوە، مەبەستی لەکەم کردنەوەی رۆڵی پیاوەباوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەون نییە، بەڵکو تەنها بۆ دەرخستنی رۆڵو فەزڵی چاکترین هـاوەڵی پێغەمـەری خودایـە ﷺ ئێمـە بەهـەمان نیازەوە ئەم بەشەمان وەك خۆی تەرجەمەکردووە.(وەرگێر).

خۆ نزیك كردنەوە لەجەماوەر بۆ خۆیان دەكەن وچەند پرۆسەیەكی دەنگو دانو ڕاپرسیی ڕواڵەتی و چەند دیاردەیەكی سەرنج ڕاكێشو فریودەریش بۆخۆیان ئەنجام دەدەن.

٤- ستەمكاران سوورن لەسەر ئەوەی جەماوەریش لەبەربەرەكانی هەقو ئازاردانی خاوەن هەقەكاندا بەشداربكەنو لێپرسراوێتی بەشێك لەو كارە دزێوانەیان بخەنە ئەستۆو، ئەو هەستەشیان پێ دروست بكەن، گوایە ئەمە كێشەی بنچینەییانە.

٥- ستەمكاران لەبەر چاوی خەڵكی خۆیان وا دەردەخەن، گوایە پارێزەری ئایینو، پێشڕەوی چاكسازیو، پاسەوانی ئاسایشن.

٦- ستەمكاران هەموو بانگەوازكاران بەبێ باوەڕو تێكدەرو وێرانكەر دادەنێنو گوایە ئەمانە دژی ئاینو ئاسایشو چاكسازیین.

٧- بانگەوازكار لەكاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمكاراندا، دەبێت پەنا بەرنەبەر خوداو تەنها پشت بەخودا ببەستنو هانای بۆببەن.

٨- هۆكارو ڕازو نهێنیی ستەمكاریی لە دوو سیفەتدا بەندە: (خۆ بەزل زانی)و (باوەڕنەهێنان بە ڕۆژی لێپرسینەوە). ڕازو نهێنیی چاكسازییش لە دوو سیفەتی جواندا بەندە: (لەخۆ بوردوویی)و (باوەڕهێنان بەرۆژی لێپرسینەوە).

٩- (ستەمكاریی) خاوەنەكەی (واتە ستەمكارەكە) لەنێو دەباتو، ژیانیشی دەشێوێنێتو ئازارە بۆ كەسانی ترو ناڕەحەتیان دەكات، بەڵام ئیمانو باوەڕ بە خودا، زمانەی دڵنیایی (صمام الامان)ی ژیانی خۆشو بەختەوەرانەی مرۆڤی باوەڕدارو كەسانی تریشە.

١٠- وانەیەكی تری ئەم چیرۆكە ئەوەیە، كە دەشێت مرۆڤی باوەڕدار لەهەندێك جێگەی دژواردا، باوەڕی خۆی دەرنەخاتو بیشارێتەوە، ئەگەر لەوەدا بەرژەوەندییەكی بانگەوازەكەی ڕەچاو دەكرد، وەك چۆن باوەڕدارەكەی هۆزی فیرعەون ئەو ڕێگەیەی گرتبووەبەرو، وەك چۆن پێغەمەری خوداش ﷺ لە

سەرەتای بانگەوازی نهێنیدا لە (مەککە)دا بەوشێوازە ڕەفتاری دەکرد.

١١- پێویستە بانگەوازکار بزانێت چۆن هەنگاوەکانی لەگەڵ هەڵوێستە بانگخوازییەکانیدا ڕێك دەخات، تابزانێت کەی باوەڕی خۆی دەشارێتەوەو، کەی دەری دەخات، بۆ نموونە لەبارودۆخی مەترسییەکی ڕاستەوخۆدا، کە بەرەو ڕووی بانگەوازو سەکردایەتییەکەی دەبێتەوەو گەر بانگەوازکارەکەش بتوانێت تیایدا سەرکەوێت، ئەوا لێی پەسەند ناکرێت، کە باوەڕەکەی لەپێناوی ساغیو سەلامەتیی خۆیدا بشارێتەوە.

١٢- گەر کەسێك ڕوو لەئیمان بکاتو، بەدەم بانگەوازەوەبێت، ئەوە بەڵگەی دروست بوونی خێرە تیایداو پاشەکەوت بوونی ماناکانی ئەمەكو پیاوەتیو ڕاستگۆیی یە لەناخیدا.

١٣- قەوارەی کفرو ستەم، قەوارەیەکی لاوازو بێدەسەلاتەو، لەنێوخودی خۆیەوە درزو کەلەبەری تێدەکەوێتو، لەو کەلەبەرانەوە باوەڕدارانی پیاوچاك دەدۆزرێنەوە.

١٤- بانگەوازکارەکە بەرامبەر هێزەکانی ناهەق (باطیل) وەستاوەو بەربەرەکانیی ڕەگەزو هەستو نەستەکانی مرۆڤ بەشێوەیەکی پیاوانەو ڕاستگۆیانەو بە ئارامیو ئیمانەوە دەکات، هەرچەندە بەتەنیایەو لە هەموو هێزێکی ماددیش داماڵراوە.

١٥- وتەی ڕاستو پەیمانبەخشو بوێرانە لەوتەی (باطیل) بەهێز ترەو، وتاری پووچەڵو (باطیل)یش لە هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی فیکری وا لە هیچ دیدارو گفتوگۆیەکدا خۆی لەبەردەمدا ڕاناگرێت، بەڵام بەو مەرجەی خاوەنی وتەی ڕاستو هەق هەڵگری سیفەتەکانی سەرکەوتنو ئازایەتی بن.

١٦- پێویستە بانگەوازکار باشترین شێوازو هەموو چەشنە ئامرازو هۆکارێکی کاریگەر بۆ چوونە نێو دڵی بانگکراوان بەکاربێنێت، هەروەك پێویستە

هەنگاوەکانو هەڵوێستەکانو وتەکانیشی ڕێك خاتو، بەشێوەیەکی زانستیو مەنهەجیو بەرنامەڕێژی، بچێتە نێومەیدانی بانگەوازو گەیاندنی پەیامی هەقەوە.

١٧- بێگومان مرۆڤی بانگەوازکار بەشێوازی سەرکەوتووی بانگخوازانەیو، بەحیکمەتی کارای باوەڕدارانەوە ناهەقی وگومڕاییو باوەڕی دەبەزێنێت، چونکە لەسەر بناغەیەکی دروست بنیات نەنراونو، هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی بەهێزیشیان نییە.

١٨- پێویستە بانگەوازکار لەکاتی دواندنی جەماوەرو وتار بۆدانیاندا بابەتیانە هەڵسوکەوت بکاتو، ڕێز لەعەقڵو ڕۆشنبیرییان بگرێتو، بزانێت چۆن کاریان تێدەکاتو هەڵوێستیان دەگۆڕێت.

١٩- شێوازێکی دی لە شێوازەکانی سەرکەوتنی بانگەوازکار لە دواندنو قەناعەت پێهێنانی خەڵکیدا، بەکارهێنانی هۆیەکاریگەرە ئابووریو کۆمەڵایەتیو مێژوویيو ژیارییەکانەو خرۆشاندنی ئەوپرسیارانەشە، کە بیروڕاو قەناعەتی پێشوویان دەلەرزێننو لەڕیزی خۆییان نزیك دەکەنەوە.

٢٠- جیاوازییە لە نێوان شێوازی ستەمکارانو، بانگەوازکاران لەدواندنی خەڵکیدا، ئەوەیە لۆژیك (منطق)ی ستەمکاران لەسەر خۆ بەزل زانیو لووت بەرزی بەندە، بەڵام لۆژیکی بانگخوازان لەدواندنی خەڵکیدا، لەسەر خولقاندنی خۆشەویستیو لێك نزیکیو ڕێز لەیەك نان بەندە.

٢١- ستەمکاران ئەوە لە جەماوەر دەخوازن، کە عەقڵی خۆیان لێك هەڵوەشێننو هیچ لێکدانەوەو تێفکرینێکیان نەمێنێت، بەڵکو ستەمکاران هەر خۆیان لەجیاتی خەڵکی بیربکەنەوەو ڕەوتی مەسەلەکانیان بۆ لێکبدەنەوە، جەماوەریش تەنها ئەو بیروڕاو فیکرو بۆچوونانەی ئەوان پەسەند بکەن، کە بۆیان هەڵدەڕێژن.

٢٢- ستەمکاران ڕێگە بە بیروڕای بەرهەڵستکارێکی خۆیان نادەنو، ناهێڵن

کەسانی دی سەرپێچی لە بیروڕایان بکەنو لە بەرامبەریاندا بووەستن..

٢٣- کاتێك ستەمکاران هەست بەکاریگەریی بانگەوازکاران لەسەر جەماوەر دەکەنو، دەترسن لەوەی جڵەوی کاروباریان لەدەست دەرچێتو، جەماوەریش لایەنگری بانگەوازیان دەبن، لەوکاتانەدا ستەمکاران پاشەکشێ لەبیروڕای پێشوویان بەئاشکرا دەکەنو ئیددیعای شێوازی زانستی وبابەتیانە دەکەنو واش خۆیان پیشان دەدەن، گوایە دیراسەی بانگەوازو داواکارییەکانی بانگخوازان دەکەن، تاله دواییدا بڕیاری ئەوە بۆخۆیان بدەن، کە درۆزن بوون.

٢٤- بێگومان هێزی حیکمەتی بانگەوازکارانو باش کارتێکردنیان لە خەڵکی، بەسە بۆ پاشەکشێی ستەمکارانو گۆڕینی هەڵوێستەکانیان، تەنانەت گەر بەڕواڵەتیش بێت.

٢٥- ستەمکاران سوورن لەسەر سەرقاڵ کردنی جەماوەر بەچەند مەسەلەیەکی لاوەکیو بێبایەخی مام ناوەندییەوە، تاکو لە مەسەلە بنچینەییەکەیان دوور بخەنەوەو، کێشەی چارەنووسسازیان لەبیربەرنەوە، لەوانەشە هەندێك لەبانگەوازکاران بکەونە نێو ئەم داوەوە، تاکو لەنیازە بنەڕەتییەکانیان لادەن.

٢٦- لەوانەیە ستەمکاران هەندێك جار هۆکار (زەمەن) بەکاربێنن تاکوو مەسەلەی بانگەوازەکە لای جەماوەر بمرێننو تەزووی کارایيو گەرموگوڕیی تێدانەهێڵن. بەڵام ئەوەی لەسەربانگەوازکاران پێویستە ئەوەیە، هەر بەردەوام بن لەسەر گەیاندنی بانگەواز بەوپەڕی هێزو کاریگەرییەوەو بەزیندوویێتیو گەرم و گوڕیی لەلای خەڵك بیهێڵنەوە.

٢٧- ستەمکاران چەندین وزەو تواناوماڵو سامانی نەتەوەو کاتێکی زۆریش بۆ چەند دیاردەو رواڵەتێکی چەواشەکاریو چەند کاروبارێکی تریان بەفیڕۆ دەدەن، کە هیچ کەڵكو خێرو بێرێکیشی نییەو، تەنها چەند شانۆگەرییەکن بۆ سەرقاڵکردنی خەڵکیو خەریك کردنیان بەشتی لابەلاوە.

٢٨- پێویسته‌ بانگه‌وازكار، بانگراوان بگه‌یه‌نێته‌ وێستگه‌ی دوڕیانه‌كان‌و وایان لـێ بكات، تاكو ببینن، كه‌ ته‌نها دوو رێگه‌ له‌به‌رده‌میاندا هه‌یـه‌، (ڕێگـه‌ی بـاوه‌ڕو ڕێی راست‌و ڕزگاری‌و به‌هه‌شت)، یان (ڕێگه‌ی بێباوه‌ڕیی‌و گومرایی‌و تیاچـوون‌و دۆزه‌خ)، پاشـان داوایـان لـێ بكـات بـه‌ وردی دیراســه‌ی ڕێگـه‌كان بكـه‌ن‌و یه‌كێكیـان هه‌ڵبژێرن، هـه‌روه‌ها ده‌بێـت مۆڵـه‌ت‌و ده‌رفـه‌تی هه‌ڵبـژاردنی ڕێی راستیان پێ بدات‌و، بۆ ئه‌و مه‌به‌سته‌ ماوه‌یه‌كی كـه‌م لێیـان دووربكه‌وێـته‌وه‌، تاكو هه‌ست بكه‌ن به‌وه‌ی، كه‌وا به‌خواست‌و سه‌ربه‌ستیی خۆیان ڕێگه‌ی راسـتیان هه‌ڵبژاردووه‌.

٢٩- پێویسته‌ بانگه‌وازكار لایـه‌نی (چـاوه‌ڕوانی كـردن)و (ڕوانـین بـۆ داهـاتوو)ش له‌گه‌ڵ بانگكراواندا به‌كاربێنێت، تـاكو متمانـه‌ به‌وتـه‌كانی بكـه‌ن‌و لـه‌جیهانی راستیدا به‌دی بێن‌و، پاشان تاكو بـیر لـه‌و وتانـه‌ی ئه‌وسـای بكه‌نـه‌وه‌، كـه‌پێی گوتبوون‌و ئاگاداریی كردبوون‌و، ئینجا دوای ماوه‌یه‌ك بیریان بخاته‌وه‌، تـاكو لـه‌ شوێنكه‌وتوانی نزیك تربێت.

٣٠- پێویـسته‌ بانگــه‌وازكار به‌باوه‌ڕه‌كه‌یــه‌وه‌ بــه‌رزو ســه‌نگین بێــت‌و، شـانازی به‌ئاینه‌كه‌یـه‌وه‌ بكـات‌و، پـشت بـه‌خودای خـۆی ببه‌سـتێت، چـونكه‌ ئه‌مانـه‌ گه‌وره‌ترین هۆكاری خۆ ڕاگرتن له‌به‌ره‌و ڕووبوونه‌وه‌ی هێزه‌كانی زوڵم وسـته‌مدا. بێگومان بانگه‌وازكاریش كاتێك كاروباری خۆی به‌خودا ده‌سـپێرێت‌و بـه‌ره‌هایی جڵه‌وی ژیانی خۆی ته‌سلیم به‌خودا ده‌كات، به‌ ڕاستگۆییش هانـای بـۆ ده‌بـات، ئـه‌وه‌ ڕووكـارێكی بـاوه‌ڕداری‌و بانگخوازانـه‌ی دیـاره‌و، بناغـه‌ی خـۆراگری‌و سه‌ركه‌وتنه‌ له‌ به‌ره‌نگارییه‌كه‌دا.

٣١- خودا له‌گه‌ڵ به‌نده‌كان‌و سه‌ربازانی خۆی دایه‌و له‌سه‌ر هه‌ق جێگیریان ده‌كات و ڕێنماییان ده‌كات‌و سه‌ریان ده‌خـات‌و حـوكمی زه‌وییـان پـێ ده‌دات، هـه‌روه‌ها خودا دژی دوژمنه‌كانیانه‌، كـه‌ دوژمـنی خوداشـن‌و ده‌یانبـه‌زێنێت‌و فـڕوفێڵ‌و

پیلانەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە.

٣٢- بانگەوازکاران خۆیانو گەلەکەیان لە دنیــاو ڕۆژی دواییــشدا رزگــار دەکــەن، بەڵام ستەمکاران خۆیانو گەلەکەشیان لە دنیاو رۆژی دواییشدا لەناو دەبەن.

٣٣- مەیدانی جەنگی نێوان هەقو (باطیــل) بەتاکە جێگەیەكو بەتاکە زەمانێــك، یان بەتاکە مەوقیعو مەیدانێکی تایبەتیەوە بەندنییە، بــەڵکو ســەرتاپاگیرە بــۆ هەموو مەوقیعو مەیدانو بوارو سەردەمو جێگەکان، هەروەها تەنهابە دنیایــەوە پەیوەست نییە، بەڵکو بۆ ژیانی بەرزەخو مەیدانەکانی پیشاندانو ســەعاتەکانی حسابو، لێپرسینەوەش دەگوازێتەوە.

بێگومــان ســەربازانی (باطیــل) لــە دنیــادا رۆژی لێپرســرینەوە، کــە ڕۆژی دەرکەوتنی فریشتەکانو پێغەمــەرانو باوەڕدارانــە- ســەر دەکــەونو – وێنــەکانی سەرکەوتنیش زۆرن- وەك ئەوەی، کە لە گۆڕەکانیاندا نازو نیعمەتیان پیێ دەدرێتو ڕۆژی حــسابو لێپرســینەوەش ڕێــز لێنــراونو، لەبەرهەشــتەکانی نەمریــدا نــەمرو زیندوون.

# چیـرۆکی ســێیەم

# چیـرۆکی قاروون

چیرۆکی (قارون) لە قورئاندا بەم جۆرە هاتووە، کە خودا فەرموویە:-

﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ القصص﴾.

سەرەتا واتای ئایەتەکان بەکورتی لێك دەدەینەوەو پاشان لەگێڕانەوەی بڕگەکانی چیرۆکەکەدا شیکاریان دەکەین:-

واتە: (بێگومان قارون لە قەومو خوێنانی موسا بوو- بەڵام بەهۆی ماڵو سامانیەوە خۆی بەسەریاندا گیف کردەوەو فیزی بەسەردادەکردن، ئێمە ئەوەندە ماڵو سامانو داراییمان بە (قارون) بەخشیبوو، کە کلیلەکانی قاسەو گەنجینەو کۆگاکانی بەچەپكو دەستە بوونو لە شوێنی قایمو گرنگدا هەڵگیرابوونو، تەنانەت بەکۆمەڵێك پیاوی زۆر بەهێزیش ئەو کلیلانە هەڵنەدەگیران، ئەم دیاردەیە فیزوهەوایەکی وای دابوو بە قارون، کە حەزی دەکرد لەئاست بەنو ئیسرائیل دا خۆی بەزل بزانێتو، هەر خۆی پیاو ماقووڵو قسە ڕۆیشتووبێت تیایاندا، گەلەکەشی واتە (بەنو ئیسرائیل) پێیان گووت: (ئەی قارون تۆ بەم سامانو ماڵەت مەنازەو بێ باكو دڵخۆش مەبە، چونکە بەراستی خودا کەسانی بێ باكو لەخۆباییی خۆش ناوێت. هەوڵ بدە بەم ماڵو سامانەت، کە خودا پێی بەخشیویت ماڵی قیامەتو بەهەشتی بەرین بکڕیت. بەشی خۆیشت لەدنیا لەیادمەکەو بەش حەڵاڵی خۆت لەبەرچاوبێت (نەك بەشی دەیان کەسی تریش بخۆیت). چاکە کارو بەئەمەك بە، وەك چۆن خودا چاکەی لەگەڵ داکردویو خێرو بێری پێ داویت، جا نەکەیت هەوڵی فەسادو گوناهو تاوان بدەیت لەسەر زەویدا، چونکە بێگومان خودا فاسیدو تێکدەرانی خۆش ناوێتو لێیان ڕازی نابێت). (قارون) لەوەڵامدا پێی گوتن: (من ئەم ماڵو سامانەم بە زانستو شارەزایی خۆم دەست کەوتووەو، هەرخۆم کانگاو جێو ڕێی گەنجینەکانم زانیوە)، بەڵام ئایا قارون نازانێت، کە خودا پێش ئەو چەندین کەسو قەومی لەخۆبایی لەنێو بردووە، کە لە قارون زیاتر بەدەسەڵاتو دەوڵەمەندتریش بوون؟! پرسیاریش لەگوناەوتاوانی تاوانباران ناکرێت (چونکە لەلای خودا هەمووی تۆمارکراوە).. ڕۆژێکیان (قارون)خۆی ڕێکخستو بەهەموو دیاردەو ڕواڵەتێکی دەوڵەمەندیو دەست ڕۆیشتوویییەوە چووە دەرەوەو بەنێو کووچەو بازاڕدا دەسووڕایەوەو خۆی دەنواند، ئەو کەسە سادەو ساکارانەش،

کە تەنها ژیانی خۆشی دنیا بەئاوات دەخوازن، وتیان (خۆزگە ئێمەش وەك قارون سامانو دەسەلاتمان هەبوایە، چونکە بەڕاستی ئەو بەختێکی زۆرو زەبەندەی لەژیاندا هەیەو زۆر بەختەوەرە) بەلام ئەوانەی، کە بەهۆی زانستو زانیارییەوە ڕاستییەکانی ئیمانداریان پێ بەخشرابوو، بەو کەسە سادەو خۆزگە خوازانەیان گوت: (کورە قورڕتان بەسەر، وریا بن، ئەوە بۆ بیرناکەنەوە لەوەی کە پاداشتی خودا زۆر چاکترە بۆ ئەوکەسەی باوەڕێکی پتەوو دامەزراوی هەیەو کە کردەوەی چاکی کردووە، ئەوپاداشتەش تەنها ئارامگرانو خۆڕاگران دەستیان دەکەوێت کەلەئاست ئەم جۆرە دیاردە دنیاییانەی کەسانی وەك قاروندا تاقی دەکرێنەوەو پلەی سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەدا بەدەست دێنن)، جا کاتێك (قارون) بەتەواوەتی لە سنوور دەرچوو و لەخۆی بایی بوو، کتو پڕخۆیو مالو سامانیمان بەناخی زەویدا بردە خوارەوەو، هیچ دەستەوتاقمێکیش نەیانتوانی فریای کەونو لەدەست ڕقو قیینی خودا ڕزگاری بکەن. بێگومان لەو کەسانەش نەبوو کە ڕزگاریان ببێت. لەملاشەوە ئەوانەی تادوێنێ خۆزگەو ئاواتیان پێ دەخواست، گوتیان (ئەی هاوار، سەد داخ، بەس نەبوو ئێمەش وەك ئەو تیانەچووین.. ئەی هاوار بەراستی خودا ڕزقو ڕۆزی بدات بەهەرکەسێك یان کەمی کاتەوە، بێ حیکمەتو بێ مەلامەت نیە، خۆ ئەگەر فەزلو منەتی خودا لەسەرمان نەبوایە، ئەوا ئێمەشی بە ناخی زەویدا دەبردە خوارێو سەرنگوم دەبووین- ئەی هاوار چەند دیارە، کە کافرانو سپلەو خوانەناسان، هەرگیز شادو سەرفراز نابن). جائیتر دەبا خەلکی هەموویان دلنیابن لەوەی، کە ئەو خانەومالەی قیامەت ئەو بەهەشتە بەرینەمان بۆ ئەوکەسانە ئامادەکردووە، کە پلەی بەرزو پایەداریو گەورەیی سەرزەوییان ناوێتو پێی تەفرە نادرێنو، فەسادو شێواندنو تاوانیان لەسەر زەوی پێ ئەنجام نادەن، سەرئەنجامو چارەنووسی بەختەوەریی دواڕۆیش، هەر بۆ خواناسو لەخواترساوو پارێزگارانە.

## ناوی قاروون –لە قورئان دا

لە قورئانی پیرۆزدا چوار جار ناوی (قارون) هـاتووە، دووجاریـان لـە سـوورەتی (قصص)داو لەم ئایەتانەی پێـشوودا. جـاری سـێیەمیش لەسـورەتی (العنکبـوت) دایە، کە بەکورتی باسی ئاکاری بەدرۆخستنەوەی هەرسێ ستەمکارەکە (فیرعەونو هامانو قارون) کراوە، کە چۆن خودا لەناوی بردوون، وەك خوداش فەرموویە:

﴿وَقَـٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَـٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَـٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ العنكبوت﴾.

واتە: (قارون وفیرعەونو هامان)یشمان لەناوبرد، چونکە کاتێك موسامان نارد بۆ لایان بەو هەموو بەڵگەو ڕێنماییە ڕۆشنانەوە کەچـی ئـەوان خۆیـان بـەحاکمی ڕەهاو لوتبەرزی سەرزەوی دەزانیو لەئاسـت هەقـدا خۆیـان بەگـەورە دانـاو ئێمـە سزامان دانو نەیانتوانی لەدەست سزای سەختی خودا دەربازبن، ئێمە هەریەکە لەو سـتەمکارو گـەلو هـۆزە یاخییانـەی پێـشوومان بـەجۆرێك سـزداوە، بـۆ نموونـە هەندێکیانمان بەرد باران کردووە، هەندێکیشیانمان بەهاوارو قیژەیەکی بەهێز لـەنێو بردووە، هەندێکیشیانمان بەناخی زەویدا بردۆتە خوارەوەو، هەندێکی تریشیانمان لـە دەریادا سـەرنگوم کـردووە. بـەڵام خـودا سـتەمی لـێنەکردوون، بـەڵکو خۆیـان ستەمیان لەخۆیان کردووە، کە خۆیان بەو سەرەنجامە دژوارانە گەیاندووە.

لە جاری چوارەمیشدا ناوی (قارون) لە سوورەتی (غافر)دا هاتووە، کە لەگەڵ هەردوو ستەمکارەکەی تر (فیرعەونو هامان)دا باسکراوە کاتێك خودا (موسا)ی ناردوە بۆلایانو ئەوانیش پێغەمبەری خودا (موسا)یان بەدرۆخستۆتەوەو گوتوویانە ئەمە سیحربازێکی درۆزنە: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ غافر﴾.

## کورتەی چیرۆکی (قاروون)

(قارون) لە هۆزەکەی (موسا) بووە واتە لە بەنو ئیسرائیل بووە نەك (قیبطي) بێت. خودا موسای بۆ لای ئەویش ناردووە، وەك چۆن بۆ لای (فیرعەون)و هامانی وەزیری ناردووە. خودا پارەو سامانێکی زۆرو چەندین گەنجینەی پڕ لە شتومەکی بەنرخی بە (قارون) دابوو، کە کلیلەکانیان هێندە زۆر بووە، قورس ببوونو لە قورسیدا بەچەندین پیاوی بەهێزو خاوەن توانا هەڵنەدەگیران. قارونیش ئەمماڵو سامانەی لەتاوانو زوڵمو دەسدرێژیدا بەکار دەهێناو خۆی پێ گیف دەکردەوەو خۆی وەك پیاوێکی گەورەو بەدەسەڵات پێ دەنواند، لەجیاتی ئەوەی سوپاسی خودای لەسەر بکاتو خۆ بەکەمگرو لەخۆ بوردوو بێت.

هەروەها قارون بەم دیاردەی دەوڵەمەندیو خۆبادانو خۆڕازاندنەوەیەوە ببووە مایەی فیتنەو بەڵا بۆ هەژارانو کەم دەستانی (بەنو ئیسرائیل). هۆزی (بەنو ئیسرائیل) لە ڕوانینیاندا بۆ قارونو گەنجینەو سامانەکەی بوون بە دووبەشەوە، بەشێکیان باوەڕیان بەخودا هێنابووو چاویان بڕیبووە پاداشتو رەزامەندیی خودا لەبەرئەمە بە موڵکی ئەو کابرایە فریویان نەخوارد بووو، ئاواتیان نەدەخواست وەك ئەویان لێ بێت، بەڵکو بەرهەڵستی قارونیان لەسەرخۆ بەگەورە دانانو ستەمو

فەسادەکەی دەکردو، داوایان لێدەکرد ماڵو سامانی لە پێناوی خوادا بەکاربهێنێو بۆ سوودو بەرژەوەندیی بەندەکانی خودا تەرخانی بکات.

بەشێکی تریش لەو هۆزە بەموڵكو سامانی قارون سەرسام ببوون، چونکە تەرازووی هەقو ئەو پێوەرو رێساو بنەمایەشیان لەدەستدابوو، کە قارونو موڵكو سامانی پێ هەڵسەنگێنن، بۆیەش بەڕای خۆیان ئەو دەوڵەمەندیو دەستڕۆیشتوویییەی (قارون)یان بەهۆکارێکی رەزامەندیی خوداو خۆشەویستی خودا بۆ قارون دادەناو ئاواتەخوازبوون، وەك ئەویان لێبێت، چونکە گوایە بەختێکی گەورەی هەیەو زۆر بەختەوەرە.

((قارون)یش بەبۆنی ماڵو سامان مەست ببوو، ئەمەش لەئاست هەقدا کوێری کردبووو، لەئاست بیستنی ئامۆژگاریی باوەڕداراندا کەڕی کردبوو. کاتێك داواشیان لێکرد، کە لەسەر نیعمەتی ماڵو سامانو سوپاسی خودا بکاتو لەڕێی سوودو بەرژەوەندییو بواری حەلاڵدا بیخاتە گەڕو، هەواڵی ئەوەیان پێدابوو، کە ئەوە ماڵو سامانی خودایە، نەك هی خۆی، کەچی بەم وتەیە وەڵامی دانەوە: ﴿...إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ ... (٧٨) القصص﴾، (من بەزانستو شارەزاییو توانای خۆم ئەم ماڵو موڵکەم بەدەست هێناوە).

ڕۆژێکیان بە بەرگی ئاڵو واڵاو خۆرازاندنەوەی، بە دیاردەو لووتبەرزیو بە خۆنازینەوە، دەچێتە دەرەوەو بەنێو خەڵکیدا دەسووڕێتەوەو دڵی هەژاران دەلەرزێنێتو چاوانیان دەفڕێنێتو فریودەدات بەلای دنیادا، ئەوەبوو کەدیتیان، گوتیان: ﴿يَٰلَيۡتَ لَنَا مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ (٧٩) القصص﴾، (خۆزگە ئێمەش وەك قارون دەوڵەمەندو بەختەوەر بووینایە، چونکە بەراستی خاوەنی بەختو شانسێکی مەزنە)...بەڵام ئەو باوەڕدارانەی کە زانستو زانیارییان لەسەر حەقیقەتی دنیاو دوارۆژ هەبوو، فریودارانیان بەم وتەیە ئامۆژگاری دەکرد: ﴿...وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ... (٨٠) القصص﴾،

(کورە قورِبەسەرتان وریابن‌و نەخەڵەتێن، هەر پاداشتی خودا باشترە بۆ ئەوکەسەی باوەڕی هێناوەو کردەوەی چاکی کردووە).

سوننەتی خودا لەسەر قارون بەدی هات‌و رق‌و تووڕەیی خودای بەرکەوت، چونکە ئەو ماڵ سامانەی بووە هۆی سزادانی‌و تیاچوونی، ئەوەبوو خودا خۆی‌و ماڵ‌و سامانی‌و گەنجینەکانی‌و خانووەکەشی بەناخی زەویدا بردە خوارەوەو زەویی قلێشاو قارون‌و سەرجەم موڵك‌و ماڵەکەی لەبەرچاوی بەنوئیسرائیل قووت داو هەموو خەڵکی ئەو هۆزی بەهەردوو بەشەکەوە (واتە بەوانەی ئیمانداربوون‌و بە موڵکی ئەوپیاوە نەخرۆشابوون، بەوانەش کە بەوە سەرسام‌و ئاواتەخوازبوون‌و دەیانەویست وەك ئەویان لێ بێت) هەموویان دیتیان قارون چیی بەسەرهات‌و دیتیشیان کەسێك نەبوو بەهانای بگات‌و بەرگریی لێ بکات، تەنانەت ئەو هەموو ماڵ‌و گەنجینەیەشی سوودێکیان بۆی نەبوو.

وەختێك (بەنوئیسرائیل) دیتیان قارون‌و سامانەکەی چییان بەسەرهات، باوەڕدارە دامەزراوو بەئاواتەکان باوەڕیان زۆرترو زیاتر بوو، ئەو کەسانەش کە تەفرەیان پێ خواردبووو، تادوێنێ هیوای ئەوەیان دەخواست وەك قارون دەوڵەمەندبن، ئەوانیش راستییان بۆ دەرکەوت‌و ئەو پەردەیەی سەرچاویای لاچووو سوپاسی خودایان کرد، کە وەك قارون نەبوون، ئەوەبووگوتیان ﴿...وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ القصص﴾، (ئەی هاوار چۆن خودا رزق‌و رۆزییەکی زۆر بە هەرکەسێك دەدا کەخۆی خواستی دانایانەی لێی بێت‌و چۆن رزق‌و رۆزیش لە هەرکەسانێکی دی کەم‌و تەنگ دەکاتەوە. ئەمانە بەخواستی خۆیەتی‌و ئەگەر چاکەو منەتی لەسەرمان نەبوایەو وەك قارونی لێ بکردینایە ئەوا ئێمەشی بەناخی زەویدا دەبردەخوارەوە، ئەی هاوار کافران شادو سەرکەوتوو نابن).

## چەند وتەیەکی دەسەهەڵبەستی جوولەکەکان لە چیرۆکی قاروونندا

لێرەدا دیارترین وتەو ڕیوایاتی هەڵبەستراوی جوولەکە کە بە (اسرائيليات) ناو دەبرێن، دیاری دەکەین تاکو لێیان وریابینو، خوێنەرانیش ئەگەر لەلایەکی ترەوە بیستوویانە یان خوێندوویانەتەوە پێیان هەڵنەخەڵەتێنو وەڵامی ئەوانەشی پێ بدەنەوە کە دەیڵێنەوەیان دەینووسنەوە، لەمبارەیەوە (الثعلبي) لەکتێبەکەدا (عرائس المجالس في قصص الانبياء) کە پڕی کردووە لە وتەو قسەوباسی ئیسرائیلییەکانو لە ئەفسانەکانیان، لەپێشەکیی چیرۆکی قارون-دا گوتوویەتی ﴿قالت العلماء بأخبار القدماء﴾[1]، واتە: (زانایان دەنگو باسو چیرۆکی گەلانی دێرینیان گێڕاوەتەوە) بێگومان ئەم وتەیەی (الثعلبي) وتەیەکی سەیرو پەسەندنەکراوە چونکە دەنگ وباسی دێرینەکان لەلای راستو دروستو بژارکراوەوە دەست دەکەوێت، هەر ئەوەشە کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ،یان پێغەمەری خودا ﷺ لە فەرموودەی (صحيح)دا باسی کردووە.

جا هەر کەسێك پڕوپاگاندەی (زانستو شارەزایی لەسەر چیرۆکی گەلانی دێرین) بۆخۆی بکات، یان هەرکەسێك وتەیەك یا هەواڵێك لەدەنگو باسی دێرینەکان بێنێتەوە، ئەوا پێویستە سەرچاوەی وتەو هەواڵەکە روون بکاتەوە کە داخۆ لە قورئانەوەیە یان لەفەرموودە راستەکانەوە).

دەنا گەر وانەکات ئەوا قسەکانی لێ پەسەندناکرێتو هەواڵو چیرۆکەکەشی رەت دەکرێتەوە، ئەم پیاوەش (ثعلبي) لە ریزی زانایانی چیرۆکی دێرینەکان (العلماء بأخبار القدماء) نییە بەڵکو کۆکەرەوەی دەقە ئیسرائیلییەکانو، حیکایەتخوانی ئەفسانەو شتە خەیاڵییەکانە. ئەوانەی وتە هەڵبەستراوە

(١) (عرائس المجالس- (الثعلبي): ١٩٨٨)

ئیسرائیلییەکان دەگێڕنەوە سەبارەت بەقارون وایان باس کردووە گوایە کوڕی مام (واتە ئامۆزای موسا بووە)و زاناترین کەسی بەنوئیسرائیلو چاکترینو جوانترین پیاویشیان بووەو تەنانەت بەخاوەن روخساری درەوشاوە (المنور) ناوبراوە بە هۆی جوانیی روخساریەوە، هەروەها گوایە لەنێو هۆزی (بەنو ئیسرائیل)دا هیچ کەسێك بەقەد ئەو خوێندەواریی لە تەوراتدا نەبووە، بەڵام دوورِوو بووە- سەبارەت بە کلیلەکانی گەنجینەو کۆگاکانی وایان باس کردووە گوایە باری شەست ئێستر بووەو بارستاییی هەر کلیلێکیش لەپەنجەیەك زیاتر نەبووەو هەر یەکەشیان کلیلی گەنجینەی یەکی بووە.

دەربارەی سەرەتای کۆکردنەوەی ئەو ماڵو سامانەش وای باس دەکەن گوایە قارون لە سەرەتادا گۆشەگیرو خواپەرست بووەو لە پەرستگایەکی خۆیاندا کە بە (صومعە) ناو دەبرێتو لەبن قەدپاڵی کێوێك دابووە چل ساڵ خواپەرستیو بەندایەتیی کردووەو لە عیبادەتو خواپەرستیشدا پێش (بەنو ئیسرائیل) کەوتووە. هەتا لەم دواییدا –ئیبلیس- شەیتانەکانی بۆ ناردووە تاکو سەری لێ تێك بدەن، بەڵام نەیانتوانیوە سەری لێ تێك بدەن، تا ئیبلیس خۆی هاتووە بۆ لایو وەك خۆی (وەك قارون) خودای پەرستووە لەبەرچاویو لە عیبادەتدا بەزاندوویەتیو، قارونیش ملکەچی بووە بەو پێودانگەی کە عیبادەتی لەخۆی زیاترە بێئەوەی حەقیقەتی مەسەلەکە بزانێت، ئیدی (ئیبلیس سامانی زۆر بوونو گەنجینە کانیشی زیاتر بوون تا لە ئاکامدا بەتەواوی رووی کردۆتە دنیاو، بەندایەتیو خواپەرستییەکەی پشت گوێ خستووە.

هەر خودی ئەوکەسانەی دەقە هەڵبەستراوە ئیسرائیلییەکان دەگێڕنەوە گوتووشیانە گوایە کاتێك ماڵو دارایی (قارون) زۆر بووە، هاتووە بۆ لای –موسا- سلاوی لێ بێت= و لەگەڵیدا رێك کەوتووە لەسەر زەکاتدان بەو شێوەیەی کە لە هەزار دینار یەك دینار، لە هەزار دەرهەم یەك درهەمو لەهەزار مەڕیش یەك مەڕ بدات، یان لە هەر شتێکی تر کەهەیەتیو لەهەر هەزار دانە یەك دانەی لێ بدات

بە زەکات لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك (قارون) بۆ ماڵەوە دەگەڕێتەوەو ئەو بڕە زەکاتە کەمەش حساب دەکات، دەبینێت میقدارێکی زۆری لەسەر دەکەوێت، بۆیە دەروونی خۆی ڕێگە بەدەرکردنی ئەو زەکاتەش نادات‌و، پەنا دەباتە بەر فێڵ کردن لە موسا. بۆ ئەم مەبەستەش لەگەڵ چەند پیلانگێڕێکی (بنو اسرائیل)دا ڕێك دەکەوێت‌و پێیان دەڵێت: (داوایان لێ دەکەم کەفلان ئافرەتی لەشفرۆش بێنن‌و بەپارە بەکرێی بگرین بۆ ئەوەی تاوانی زیناکردن بخاتە پاڵ (موسا) جائەگەر ئەم کارەمان بۆ بکات ئەوا (بنو اسرائیل) لە (موسا) هەڵدەگەڕێنەوەو دەری دەکەن و ئێمەش ڕزگارمان دەبێت لێی‌و پشووی خۆشی دەدەین)، ئەوانیش ئافرەتەکەیان هێناو قارون هەزار دەرهەمی پێ دا، گوتراویشە هەزار دیناری پێ داو، گوتراویشە تەشتێکی زێڕینی پێ بەخشیوەو، پێیشی گوتووە: (سبەینێ تاوانی زینا کردنی خۆت لەگەڵ موسا دا بخەرە پاڵ موسا لەنێو خەڵکی بەنوئیسرائیل دا ئەگەر ئامادەبوون لەلای). بۆ سبەینێ (قارون) خەڵکی بەنوئیسرائیلی کۆکردەوەو، ئینجا هات بۆلای موساو پێی گوت : (ئەوا(بەنو ئیسرائیل) کۆبوونەتەوە چاوەڕێی تۆ دەکەن بچیت بۆ لایان تاکو پەندو وانە یان پێ بگەیەنیت‌و ڕێنمایی یان بکەیت)، (موسا)ش ـ سلاوی لێ بێت ـ چووە دەرەوە بۆ نێو خەڵکی ووتاری بۆدان‌و گوتی : (ئەی بەنو ئیسرائیل هەرکەسێك دزی بکات دەستی دەبڕین، هەرکەسێك بوختان بکات هەشتاداری لێ دەدەین، هەرکەسێك زینا بکات‌و ژنی نەهێنابێت سەد داری لێ دەدەین، بەڵام گەر ژنی هێنابێت بەرد بارانی دەکەین تاکو دەمرێت)، (قارون) لێی پرسی: (تەنانەت گەر خۆیشت بیت ئایا ئەو سزایانە بەسەر خۆتا رادەپەڕێنیت)؟ (موسا) گوتی (بەڵێ تەنانەت گەر خۆیشم بم)، ئینجا (قارون) پێی گوتووە (دەی ئەوا (بەنوئیسرائیل) وای بۆ دەچن کەتۆ لەگەڵ فلان ئافرەتدا زینات کردووە) (موسا)ش دەڵێت (من؟) دەڵێت (بەڵێ)، دووبارە (موسا) دەڵێت (دەبانگی بکەن ئەگەر ئەو ئافرەتە خۆی وابڵێت ئەوە قسەکەی ڕاستە)، کاتێك هێنایان، موسا لە ئافرەتەکەی پرسی: (ئەری فلان کەس، ئەمانە ڕاست دەکەن

کەمن وام لە تۆ کردبێت)؟ لەگەڵ ئەم پرسیارەدا (موسا) مەسـەلەکەی لەبەرچـاوی ئافرەتەکە زۆر بەگەورە گرتبووو سوێندیشی دەدا بەو خودایەی کە تەوراتی ناردۆتە خوارەوەو دەریاکەی کەرا کردووە کـە وەڵامـی راسـتگۆیانە بداتـەوە، جـا کاتێـك خودای بەیادخستنەوەو سامو گەورەیی خودای بۆ دەرخست، خوداش رێنمایی کردو، ئەو ئافرەتەش بەخۆیدا چووەوەو لەدڵی خۆیدا گوتی: (ئەگەر ئەمڕۆ (تەوبە) بکـەمو بۆ لای خودا بگەڕێمەوە، باشترە لەوەی ئازاری موسـای پێغەمـەری خـودا بـدەم). بۆیە لەوەڵامدا بە (موسا)ی گوت: (نەخێر، تۆ وات لەمن نەکردووە، بەڵکو ئـەوان درۆیان کردووەو، قارونیش پارەیەکی زۆری پێ دام تاکو ئەو تاوانەت بخەمـە پـاڵ). کاتێك بەم رەنگە ئافرەتەکە دەدوا پیلانی نێو دەستی قارون پووچـەڵ بـۆوەو قـارون سەری داخستو خەڵکەکەش بێ دەنگ بوون. (مـوسا)ش خێرا کرنووشـی بـۆ خـودا بردو دەگریاو دەیگوت: (خودایە ئەوە دوژمنەکەتە ئازاری دامو قسەی نابەجێی بـۆ دروست کردمو ویستی حەیاو ئابڕووم بەرێت، جا ئەگـەر مـن پێغەمـەری تـۆم دەی خوایە لەسەرمن تووڕەببیت لێیو زاڵم کەیت بەسـەریدا)، خـوداش سرووشـی پێـدا کە: (سەرت بەرزکەرەوەو فەرمان بـەزەوی بکـە بـۆ هـەرکاتێك بێـت گوێرایـەڵیت دەکات)، (موسـا) رووی کـردە خەڵکەکـەو پێـی گـوتن: (ئـەی - بەنوئیـسرائیل بێگومان خودا ناردمی بۆ لای قـارون وەك چـۆن بـۆ لای فیرعەونیـشی نـاردبوون، جاهەر کەسێك لەگەڵ قارون دایە با لەجێی خۆی بمێنێـت، هەرکەسـێکیش لەگـەڵ من دایە باخۆی لەودابرێت).

ئەوانیش خۆیان لە (قارون) دابڕیو کەسی لەگـەڵدا نەمایـەوە تـەنها دوو پیـاو نەبێت- پاشان (موسا) گوتی: (ئەی زەوی بیانگرە) زەویش تا پاژنەکانیان گـرتنی، پاشان تاپشتو لاتەنیشتیان گرتنی، پاشان تاملیان... قارونو هەردوو هاوڕێکەشی لە (موسا) دەپاڕانەوەو داوایان لێدەکرد لەبەر خـودا رەحمیـان پـێ بکـات، دوایـی (مـوسـا) بـەزەوی گـوت: ئـەی زەوی بیـانگرەو قوتیـان دە، زەویـش قـووتی دانو سەرنگوومی کردن، خوداش سرووشی بە (مـوسا)دا کە (ئەی موسا تۆ چەند دڵـڕەق

بوویت، ئەوان حەفتا جار هانایان بۆهێنایتو رەحمت پێ نەکردن، دەسا بە عیززەتو شکۆی خۆم، ئەگەر تکایان لەمن بکردایە ئەوا نزیك دەبووم لێیانو بەدەمیانەوە دەچووم). خوداش هەموو رۆژێك بەقەد بالآی مرۆڤێك قارونو هەردوو هاوەڵەکەی بەناخی زەویدا دەباتە خوارەوەو بەردەوام بۆناوەوە شۆڕیان دەکاتەوەو تارۆژی قیامەت ناگەنە بنیشی)[1].

بێگومان ئێمە ئەم شیکارو لێکدانەوە نادروستە ئیسرائیلیانە پەسەند ناکەین، چونکە هیچ کەسێك بۆی نییە بیانگێڕێتەوە، تەنها لە دەرووی وریاکردنەوەی خەڵکییەوە نەبێت، کە لێیان وریاو هۆشیارکاتەوەو ئاماژەش بدات بەو لایەنەی، کە بەهۆی ئەوەی چیرۆکی هەڵبەستراوو بێبەڵگەی جولەکەن، پەسەند ناکرێن.

## (بۆچی (قاروون) کە لە بەنوئیسرائیلە – لەریزی فیرعەوندا دانراوە)؟!

قورئان هەواڵی ئەوەی داوە کە (قارون) لە هۆزەکەی موسایە، واتە لە بەنوئیسرائیلە نەك لە خێڵو هۆزی فیرعەون، جا ئەگەر لە هۆزی بەنوئیسرائیلە، بۆچی قورئان لەگەڵ فیرعەونو هاماندا داینـاوەو، موسای بەنێرراو بۆلای هەر کەسێکیان داینـاوەو، وەك لە فەرمایشتەکەی خودادا هاتبوو ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ غافر﴾ ... واتە: (بێگومان ئێمە موسامان بەئایەتو نیشانە رۆشنەکانمانەوە کە موعجیزە هەست پێکراوەکانو بەڵگە ئاشکراکان بوون، بۆلای (فیرعەون) و(هامان)و (قارون) نارد، بەلآم ئەوان باوەڕیان پێ نەهێناو گوتیان

---

(١) بڕوانە (عرائس المجالس للثعلبي):: ص ١٨٨-١٩٢.

(ئەمە سیحربازێكی درۆزنه).

(فیرعەون) میسریی یەو.. (هامان)یش میسری بووه.. بەڵام (قارون) لەبەنو ئیسرائیله.. وادیاره هۆكاری پێك گەیەنەریان هەر ستەمو دەستدرێژیو شێواندنو بێباوەڕیو بەدرۆخستنەوەیه. جادوای ئەوەی ئەو هۆكاره هاوبەشەیان لەنێوان دابووەو پێكی گەیاندوون، بەڵام هەریەكەیان بە تاوانێكی خۆیەوه لەوانی دی جودایه: بۆ نموونەش له ستەم داڕۆچوونی (فیرعەون) بەهۆی موڵكو دەسەڵاتییەوه بووه، هەربۆیەش داوای له گەلەكەی كردووه، كه بیپەرستنو پێی گوتوون: (من نەمدیوه جگە لە خۆم خودایەكتان هەبێت) ﴿...مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي...(٣٨) القصص﴾.. له ستەمدا ڕۆچوونی (هامان)یش بەهۆی وەزارەتو پلەوپایەی لای فیرعەونو ڕاپەڕاندنی فەرمانەكانی بووه.. له ستەمدا ڕۆچوونی(قارون)یش لەڕێی دەوڵەمەندیو پارەداریو ماڵو گەنجینەكانییەوه بووه. كەواته ئەمان هەرسێكیان ستەمكارن ئەگەرچی هۆیەكانی ستەمكارییان جیاوازو لێك جودا بێت.

جا لێرەدا سێ هۆی ستەمكاریی دەردەكەون: (دەسەڵات پلەوپایه ماڵ وسامان).

ئەم هۆیانەش بە درێژای هەموو جۆره سەردەمێكی مێژوویی مرۆڤایەتی هەنو بەردەوامن، چەندەها ستەمكاریش دیلو گرفتاری ئەم هۆیانه بوون.. هەروەها چەندین كەس لە خەڵكی، كە دەكەونە نێو ستەمكارییەوه بەهۆی موڵكو دەسەڵاتەوەیه، چەندینی تریش بەهۆی كارو فەرمان (وظیفە)و پلەوپایەو خۆبەزل زانییەوەیەو، چەندەهای تریش بەهۆی ماڵو سامانو دەوڵەمەندییەوەكەیه له ستەمدا ڕۆدەچێت.

هۆیەكان هەمه ڕەنگو چەند جۆرێكنو حوكمەكەشیان یەكێكەو، ستەمیش هەرستەمه.

سەیر لەوەش دایه هەرسێ ستەمكارەكه (فیرعەونو هامانو قارون) بەهەمان ئاكاری پێشوازی وەسفی موسایان كردووەو، هەمان وەڵامی چونیەكیان هەبووەو

گوتوویانە: سیحربازێکی درۆزنە ﴿سَٰحِرٌ كَذَّابٌ﴾.

خـودای مـەزن کـە دەفـەرموێت قـارون لـە هۆزەکـەی موسـایە: ﴿إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ﴾ بەدوایدا فەرموویە ﴿فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ﴾، واتە: (ستەمی لـێ کردن‌و خۆی لە ئاستیاندا بەرزو بڵند راگـرت کـە خـاوەنی وتـەی یەکـەم بێـت لـە هەموو شتێکدا، چونکە لە هەموویان دەوڵەمەندترە). لە زمانی عەرەبیـدا وشـەی (بغی) واتە لە ستەمدا ڕۆچـوون‌و زۆرداری‌و دەسـتدرێژی.. ئـەویش بـەهۆی مـاڵ‌و گەنجینەکانییەوە ستەمی لێکردوون .. ماڵ‌و سامانیش هاندەرە بۆ سـتەم‌و زۆرداری ئەگەر خاوەنەکەی ئیمانی نەمابێـت. وەك لەم ئایەتانەی چـیرۆکی قارونـدا دیـارە، ئەم پیاوە لە هۆزی (بەنوو ئیسرائیل) بووە دوای ئەوەی کە لە (میـسر) دەرچـوون، ئەمەش بەپێی ئەو، ئایەتانەی ئامـاژە بـۆ وجـودی دوو جـۆرە کۆمـەڵ لـە (بـەنو ئیسرائیل) دەکەن: کۆمەڵێکیان ئەو کەسە باوەڕدارو زانایانـەن کـە خۆزگـەیان بـە (قارون) نەخواردووەو ئاواتە خوازی سامانەکەی نەبوون کۆمەڵی دووەمیـشیان ئـەو ساویلکەو دوروون لاوازانە بوون کە سەرسام و تەفرەدراو بوون پێی. بەڵگەش لەسەر تەفرە خواردنی ئەمان ئەوەیە کاتێك (قارون) بەو شێوە خۆڕازاندن‌و خۆنواندنەوە بـە بناو هۆزەکەیدا دەسووڕێتەوە، ئەمان ئاواتی پێ دەخوازن‌و حەز دەکەن وەك ئەوبن.

بەڵام لەکوێ بەناویاندا سـووڕاوەتەوەو، شـیکارو وردەکـاریی چـیرۆکەکەیلەگەڵ موسادا چییەو چۆن کۆتایی پێهاتووەو،کەی ولەکوێ؟

ئەم پرسیارانە هیچ وەڵامێکیان لە قورئان‌و سوننەتدا نیە، تەنها چەند وتەیەکی دەسهەڵبەست لەلای حیکایەتخوانانی ئەفسانە پووچەکانی (ئیسرائلیات) نەبێت کـە بەبێ بەڵگە هۆنیویاننەتەوە.

# گـه نجینـه‌کـانی قاروون

قورئان ئاماژەی بۆ زۆریـی گەنجینـەکانی (قـارون) کـردووە، وەك خـودا تیایـدا فەرمووییــه: ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ القـصص﴾، واتـه: (هێنـده سـامانو گەنجینەمان بە قارون دابوو، کە تەنها کلیلەکانی ئـەو کۆگـاو گەنجینـەو قاسـانەی ئەوەندە قورسو گران بوون کە بە چەندین پیاوی بەهێزو بـەتواناش هەڵنـەدەگیران) ئەم ئایەتە باس لەوە دەکات کـە بێگومـان، مـاڵو دارایـیو گەنجینـەکانی قـارون ئەوەندە زۆرو بێ شومار بوون، کـە کۆمـەڵێك لـەپیاوە بـەهێزەکانی نـەیانتوانیوە کلیلەکانی ئەو گەنجینانەی هەڵگرن، یان گەنجینەکان خۆیان هەڵبگرن.

لێرەدا وشەی (کنوز) کۆ (جمع)ی (کنز)ە. کەنزیش بەو ماڵ سامان و پاشەکەوت کراوو شـاردراوانە دەگوترێـت کـە لـەژێر زەویـدا حەشـاردراون. بـەڵام لەقورئانـدا بەمانای (هەڵگرتنی ماڵو سامانو لەسەریەك وپاراستنی) هاتووە.

ریشەی وشەی (کنز) له هەڵگرتنی خورمـا لـه بەرچـنەو لـه حوشـتری قەڵـەوو گۆشتنیشەوە هاتووە[1].

وادیارە حیکمەت لە دانانی وشەی (کنوز) بۆ ماڵو سامانەکەی — قارون- لـەم خاڵانەدا بێت:-

١- بێگومـان ئـەم مـاڵو سـامانە بەئاسـانی بەدەسـت هـاتوونو لەنزیکـەوە دەستەبەرکراونو شاراوەی نێـو زەوییـەو ئـەو تـەنیا بەچـنگ پیاکردنێـك لێـی دەرێنێت.

---

(١) بڕوانە لاپەڕە-٤٤٢-ی (مفردات)- راغب ـی- اصفهانی.

٢- بێگومان (قارون) ئەو ماڵو سامانەی لای خۆی دەپاراستو لەسەریەك دایدەنانو زیادی دەکردو پەرەی پێدەدانو، سوور بوو لەسەر لەگەنجینە دانانیانو حەشاردانیان.

٣- -قارون- مافی هەژارانو کەمدەستان لەماڵو سامانەکەی دەرنەدەکردو زەکاتەکەی نەدەدا، چونکە گەنجینە، واتە ئەو ماڵو سامانە هەڵگیراوەی، کە زەکاتی لێ نەداوەو لەپێناوی خوادا بۆ هەژارانو نەداران خەرج نەکراوە.

قورئانی پیرۆز لەم فەرمایشتەی خوادا ئاماژە بۆ ئەم مانایە دەکات:

﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ۖ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ التوبة﴾

واتە: (ئەوانەی کە زێرو زیو کۆدەکەنەوەو لە گەنجینەدا قایمی دەکەنو لەڕێی خوادا لێی نابەخشن، مژدەی سزایەکی سەختو پڕ ئازاریان پێ بدە. ڕۆژێك دێت ئەوپارەو سامانەی کۆیان کردۆتەوە لە دۆزەخدا سووردەکرێتەوەو ناوچاوو لاتەنیشتو پشتیان پێ داخ دەکرێتو، ئینجا پێیان دەگوترێت (ئەمە ئەو سامانەیە کە کۆتان کردبۆوە بۆ خۆتانو دەئیتر بچێژن سزای ئەوەی بۆ خۆتان کۆکردبۆوە)).

## لەنێوان (مفاتح) (مفاتیح) دا

زانایانی تەفسیر لە مانای وشەی (مفاتح)دا چەند بیروڕایەکی لێک جودایان هەیە، واتە کە لە فەرمایشتی خوادا هاتووە، لەم چیرۆکەدا ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ﴿٧٦﴾ القصص﴾... هەندێك زانا دەربارەی وشەی مفاتح (کلیلەکان) لەم ئایەتەدا دەڵێن: (مفاتیح خزائن اموالە)، کلیلەکانی گەنجینەکانی ماڵو سامانیبووە، ئەم کلیلانەش بچووك بوونو هەریەکەیان بەقەدەر پەنجەی مرۆڤێك بووەو ژمارەشیان گەلێك زۆربووە، کە ئەگەر هەموویان پێکەوە ببە سترانایە ئەوا باری حەفتا وشتر دەبوون.

ڕیشەی زیادە ڕۆیی لەمەدا بەڕۆشنی دیارە، جگە لەوەی هەموو ئەم دەنگو باسو بەسەرهاتانە لە دەقە هەڵبەستراوەکانی (ئیسرائیلیات)و ئەفسانە پووچەڵەکانیانە هەر بۆیەش (ئیمامی رازی) لە تەفسیرەکەیدا گوتوویەتی: (بێگومان ماڵو سامانی پیاوێك هێندە نییە، کە بگاتە ئەو ڕادەیە چونکە ئێمە ئەگەر شارۆچکەیەکەی پڕ لە ئاڵتوونو خشڵە گرانەکانیش مەزەندە بکەین ئەوا ژمارەیەکی کەم لەو کلیلانەی بەر دەکەوێت، ئیتر چ ئاتاجێك بە زۆرکردنی ئەو کلیلانە هەیە؟)[1].

زانایانی تریش گوتوویانە (مفاتح) واتە ئەو گەنجینانەی کە ماڵو سامانی قارونی تێدا پارێزراوە، ئەم گەنجینانەش گەورەو زۆر بوونو پیاوانی بەهێزی بارهەڵگر توانای هەڵگرتنیان نەبووە) ئەم وتەیەش زۆر شیاوو ماقووڵەو لەگەڵ وشەکانی ئایەتەکەشدا دەگونجێت. ئیمام (رازی) لە تەفسیرەکەیدا (التفسیر الکبیر)

(١) بڕوانە، (التفسیر الکبیر)ی -الرازی- (١٥:٢٥).

وای باس کردووە کەوا ڕای (ابن عباس)و (حسنی بصری)یە، وەك گوتوویە: (ڕای پەسندکراوی ابن عباس‌و (حسن ی بصری)یش لەسەر ئەوەیە کە وشەی (مفاتح) هەمان ئەو ماڵو گەنجینەیەیە کە بە چەندین کەس هەڵ نەگیراون، ئەم مانایەش ڕۆشنترەو، لەگومانیش دوورترە)[1] ئێمەش لەگەڵ ئەم ڕایەداین‌و وای بۆ دەچین، کە لەگەڵ سیاغەی قورئانیشدا دەگونجێن. لە قورئانی پیرۆزدا سێ جارو لە سێ سوورەتدا وشەی (مفاتح) هاتووە، وەك:

١- ئایەتی ژمارە (٥٩) لە سوورەتی (الانعام)، کە خودا (جل جلالە) تیایدا فەرموویە: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ... ﴿٥٩﴾ الأنعام﴾ .. واتە: (خودا ئامرازەکانی گەیشتن بە هەموو نادیارو شارراوەکانی هەیەو جگە لەخۆی، کەس هیچیان لەبارەوە نازانیت).

لێرەدا وشەی (مفاتح الغیب) ئەو گەنجینە نادیارانەیە، کە تەنها خودا پەیوەستە پێیان‌و دەیانزانێت. کلیلەکانی ئەم گەنجینانەش لە سوورەتی (الأنعام)و لە سوورەتی (لوقمان)دا باسکراون، وەك خودا دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾ لقمان﴾... واتە: (بێگومان هەرخودا زانیاریی لەسەر ڕۆژی قیامەت هەیەو بارانیش دەبارێنێت‌و، دەزانێت چی لە سکی دایکاندا هەیە، هیچ کەسێکیش نازانێت، کە سبەینێ چیی بەسەردێت‌و چیی لە بەرهەمی دنیا دەست دەکەوێت، یان لە تووێشووی ڕۆژی دوایی، هیچ کەسێکیش نازانێت لە چ زەوییەکدا دەمرێت‌و لەکوێ کۆتایی بە ژیانی دێت. بەڕاستی خودا هەرخۆی زانایە لەم شتانەداو زۆریش ئاگادارە).

---

(١) سەرچاوەی پێشوو. (١٥:٢٥).

٢- ئایەتی ژمارە (٧٦) لە سورەتی (قصص) کە خودا فەرموویەتی ﴿...وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ ...﴿٧٦﴾ القصص﴾، واتە: (هێندە ماڵو سامانو گەنجینەمان دابوو بە (قارون) کە کلیلەکانیان (یان ئامرازەکانی تێدا هەڵگرتنیان) هێندە قورس بوون، کە بە چەندان پیاوی بەهێز هەڵنەدەگیران).

٣- ئایەتی (٦١) لە سوورەتی (نور) کە خودا فەرمویەتی:

﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ﴿٦١﴾ النور﴾

لەم ئایەتەدا وشەی (مفاتحە) لە ڕستەی (او ماملكتم مفاتحە) واتە: (ئەو کەسانەش کە گەنجینەکانیان لەژێر دەسەڵاتی هەڵسوکەوتو پارێزگاریتان دایەو سەرپشکیان کردوون دەتوانن لە خۆراکی ئەوانیش بخۆن).

کەوابوو جیاوازی لەنێوان هەردوو وشەی (مفاتح ومفاتیح) داهەیە لەمبارەیەوە زانایەك بەناوی (العكبری) گوتوویەتی: (وشەی (مفاتح) کۆی (مفتح)، (مفتح)یش شوێنی هەڵگرتنی شتو مەکە، بەڵام ئەو کەرەسەیەی، کە دەرگای پێدەکرێتەوە (مفتاح)ە، واتە (کلیل)ە، کە کۆ (جمع)ەکەی (مفاتیح)ە، واتە (کلیلەکان))[1].

(١) بڕوانە (املاء مامن بە الرحمن)ی (العكبری) لاپەڕە (٢٤٥).

زانایـەکی تـر بـەناوی (الكفـوی) گوتوویـەتی: (کلیـل (مفتـاح) ئـامێری کردنەوەیە (فتح) وەك (مفتح)و وەك (مسکن)، کـە مانـای (خزانـە)و (کنـز)و (مخزن) دەگەیەنێت[1]، وشەی (مفاتح)یش کۆی (مفتح)ە، واتە ئـەو ئـامرازەی، کە دەرگای پێدەکرێتەوە، هەروەها کۆی (مفتح)یشە، کە مانای جێگەو شـوێن دەگرێتەوە، بەڵام کۆی (مفتاح) نییە)[2].

## تنوء بالعصبة اولي القوة

گەنجینەکانی- قارون- وەك لە قورئاندا هـاتووە (تنـوء بالعـصبة أولـي القـوة)، واتە: گران بوون لەسەر شانی کۆمەڵێك پیاوی بەهێزو نەیاندەتوانی هـەڵیانگرن لـە زمانی عـەرەبیدا وشەی (عـصبة) بـە کۆمـەڵـە کەسـێکی دەمـارگرژو یاریـدەدەری یەکترو یەکگرتوو دەگوترێـت، هـەروەها بـە کۆمـەڵـە پیـاوێکی پێکـەوە کۆبـۆوەو هاوکاری یەکترو بەهێزیش دەگوترێت، کە ژمارەیان لە دەپیاو زیاتر بێت.

ئیمامی (رازی) سێ ئەگەری بۆ مەبەستی فەرمایـشتی خـودا (تنـوء بالعـصبة أولي القوة) داناوە:-

١- ئەو کۆمەڵە پیاوە ناتوانن کلیلەکانی ئەو گەنجینانە هـەڵگرن.. ئـەم ئەگـەرەش سەنگێکی خۆی هەیە.

٢- ئەو کۆمەڵە پیاوە ناتوانن گەنجینەکان هەڵگرن ئەمەش شیاوو ماقووڵە.

هەڵگرتنەکەش لەم دووئەگەرەیان دایـە، هـەڵگرتنێکی هەسـتەوەریانەی مـاددیو هەست پێکراو.

٣- مەبەست لە هەڵگرتنەوەکەش پاراستنو حساب کردنو سەرپەرشتیکردنە.

---

١) (لە زمانی کوردیشدا هەموویان مانای گەنجینە)

٢) الكليات لابى البقاء لبكفوي- ٤:٢٩٤.

(رازی) دەڵێت: (مەبەست لە کلیلەکان (المفاتح) زانستو لـێئاگاداربوونە مەبەست لە (آتیناه من الکنوز)یش ئەوەیە بێگومان پاراستنو لـێئاگاداربوونی کارێکی گران بووە لەسەر چەند پیاوێکی بەهێزو سەرپەرشتیار، بەمانای ئەو گەنجینانە بەهۆی زۆرییانو هەمە جۆرییانەوە ئەوکەسانە ماندوو دەکەن کە ئەرکی پاراستنو سەرپەرشتی کردنیان لە ئەستۆ گرتووە)[1].

هیچ رێگرێکیش لەبەردەم ئەو وتەیەدا نییە گەربگوترێت (مەبەست لە هەڵگرتنی کلیلەکان (حمل المفاتح) پاراستنی ماڵو سامانەکەو حساب کردنی وسەرپەرشتی کردنو لەسەر مانەوەیەتی بە شێوەیەکی بەردەوام، بەم جۆرە مەبەست لە (تنوء بالعصبة) واتە: (ئەرکی پاراستنی ماڵو سامانەکە قورس دەبێت لەسەریان ، بەڵام وتەی دووەم لەپێشترە بۆ ئەگەری ڕاستیو بۆ چوونەکان).

## بەنو ئیسرائیل بەرامبەر -قارون بوونەتە دووبەشەوە:-

(قارون) بەهۆی ماڵ وگەنجینەو سامانەکەیەوە ببووە مایەی بەڵاو فیتنە بۆ(بەنو ئیسرائیل) دیارە ماڵو سامانیش ئامرازێکی هێجگار فریو دەرەو چەندەهاکەسی لەخشتە بردووەو کەوتوونەتە نێو چاڵی فیتنەو تاقیکردنەوەی رۆژگارەوە.

بێگومان (قارون) خۆیشی بەماڵ وسامانەکەی خۆی تەفرەی خواردبوو و پێی تاقی دەکرایەوە، ئەوەبوو لە زوڵم وستەمو بەدکاریدا بەکاری دەهێنا، بەو هۆیەشەوە خەسارەتمەندو کافر دەرچوو، هەرئەو موڵك ومالەشی هۆیەکی تیاچوونی بوو هەڵوێستی گەلەکەشی لە بەرامبەریدا، ئەوەیە کە قورئان باسی لێکردووەو کە بوونەتە دووبەشەوە:-

بەشی یەکەم ئەو باوەڕدارە بەئارامو دامەزراوانەبوون کە بەهۆی باوەڕەکەیانەوە سەربەرزو دنیانەویستو ئاواتە خوازی پاداشتی لای خودا بوون. ئەمانە لە

---

(١) التفسیر الکبیر للرازی ٢٥: ١٥.

حەقیقەتی قارون تێگەیشتبوونو رەزامەندیی خودایان لەلا مەبەست بوو. ئەم کۆمەڵە باوەڕدارە ئامۆژگاری (قارون) یان کردبووو پێیان گوتبوو: ﴿لَا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ﴾(القصص: ٧٦-٧٧)، واتە: ﴿ئەی (قارون) تۆ بەمماڵو سامانەت مەنازەو بێ باكو دلشاد مەبە، چونکە بەراستی خودا کەسانی دڵشادو لەخۆبایی بووی خۆش ناوێت بەڵام هەوڵ بدە بەم ماڵ وسامانەت (کە خودا پێی بەخشیویت)، ماڵی قیامەتو بەهەشتی بەرین بکرێتو، بەشی خۆیشت لەدنیا لەیاد مەکە، هەروەها چاکە کارو بەئەمەگ بە وەك چۆن خودا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووەو خێرو بێری زۆری پێ داویت، جا نەکەیت هەوڵی فەسادو گێرەشێوێنی لەسەر زەوی دابدەیت، چونکە بێگومان خودا فاسیدو بەدکارانی خۆش ناوێت﴾.

بەشی دووەم: کەسانی باوەڕ لاوازو ماددە پەرستەکانن ئەوانەی ژیانی دنیاو خۆشییەکانیان دەویستو، (بەقارون) فریوداربوونو، بەماڵ و گەنجینەکانی تاقی کرابوونەوەو، بەخۆڕازاندنەو خۆنواندنی سەرسام بوون: ئەمانە کاتێك دیتیان (قارون) بەو بەرگو پۆشاکە جوانو گرنبەهایەو بەو کەرەستەو ئامێرە دڵفرێنانەی گواستنەوەی ئەو سەردەمەوە بەنێویان دادەگەرێت، گوتیان (خۆزگە ئێمەش وەك قارون سامانو دەسەلاتمان هەبوایە، چونکە بەراستی ئەو زۆر بەختەوەرە): ﴿...يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾(القصص- ٧٩).

ئەو دیاردەیەی لەبەنو ئیسرائیلدا هەبوو کەقارونو ماڵو سامانی بوو، لەهەر نەتەوەیەکی تریشو لەگشت کاتو جێگەیەکدا هەیە. هەندێك کەس خودا لەرێی ماڵو دەوڵەمەندیو سامانداریییەوە تاقیی دەکاتەوەو تووشی بەڵاو فیتنەی دەکاتو دەروازەکانی رزقو رۆزییان لەسەر والا دەکات، پارەوپوولێکی زۆریان دەخاتە

بەردەستو، ئەویش پێی لەخۆبایی دەبێتو پێی تاقی دەکرێتەوەو، دەکەوێتە بەردەمی فیتنەو، ماڵو سامانەکەشی لەستەمو زوڵم و فەسادیدا بەکار دێنێتو، ئیتر لەسەر رەوتی قارون- دەڕوات.

جاکاتێك خەڵکی ئەم جۆرە (قارونە) دەبینن، هەریەکەو بە شێوەیەك بۆی دەڕوانێت.. کەسانی باوەڕدارو خاوەن باوەڕی جێگیرو بەئارام کە زانیاریو شارەزاییان لەسەر ئاینو باوەڕەکەیان هەیە پێی ناخەڵەتێن، بەڵکو ئامۆژگارییو رێنمایی دەکەن، دیارە ئەوان بەبێ هیچ گومانێك دەزانن، کە زەرەرمەندو فەوتاوە.

بەڵام ئەو کەسە گەمژەو ساویلکانەی، کە ژیانی دنیاو خۆشییەکانی بەئاوات دەخوازن، ئەوا پێی سەرسام وتەفرە خواردوو دەبنو، خۆزگەی گەیشتن بەجێو مەقامی ئەو دەخوازن.

ئای چەند قارون لەنێو گەلو نەتەوەکاندا پەیدا دەبن، ئەی داخۆ چەند ساویلکەو نەفامیش بەو قارونانە هەڵدەخەڵەتێن!! ئەی داخۆ چەند کەسی باوەڕدارو پیاوچاکیش خودا بیانپارێزێتو بەئارامو دامەزراوو خۆڕاگرتنو ئامۆژگاری قارونە دنیاپەرستەکان بکەن.

جابۆیە ئەو کەسێتییانە (شخصیات)ەی، کە قورئان لە چیرۆکەکانیدا دیارییان دەکات، هەر تەنها چەند کەسێتییەکی کاتیو مرۆڤی سەردەمێکی دیاری کراونین، بەڵکو ئەوانە چەند نموونەیەکی گشتیی بەشەریەتنو، لە چەندین قۆناغی جیاجیای مێژوودا دەردەکەونو، کەسانی زاناو داناو بینا، هەست بە وجودیان دەکەنو، دەشزانن کە لەنێو ئادەمیزادانی تری هەر سەردەمێکیشدا نموونەیان هەیەو تیایاندا دەژین، ئەگەرچی ناوو ناونیشانو نیشتگاکانیان لە نموونە بەشەرییەکاندا وەك یەك نەبێت، دەنا لەهەمان حاڵەتی دوبارەو چەندبارە بووەدانو، هەمان رووکارنو پێی نەخەڵەتاون، نموونەی ئەوانەش، کە پێی تەفرە دراونو ئاواتەخوازی جێو مەقامی بوون، لە هەموو ئانو زەمانو جێگەیەکدا هەنو، هیچ کاتو شوێنێك لەو نموونانە بەدەر نییە.

## لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ

کەسانی باوەڕدارو بەئارامو خاوەن باوەڕی پتەو ئامۆژگاریی (قارون)یان کردو ڕێی بێ باکیو دڵشادیی نەفامیو خۆ بەزل زانییان لێ گرتو، پێیان گوت: (هێندە بەم ماڵو سامانەت مەنازەو دڵخۆش مەبە وچونکە بەراستی خودا کەسانی لەخۆباییو دڵخۆشی خۆشناوێت).

لەوانەیە لێرەدا هەندێك كەس سەریان بسورمێتو ئەوپرسیارە بەخەیاڵیان دابێت، کە ئایا دڵخۆش بوون حەرامە تابگاتە ئەوەی کەڕێی ئەوەیان لێ گرتبێت؟! ئەی ئایا خودا هەموو کەسێکی دڵخۆشی خۆش ناوێت؟ ئایا تۆبڵێی شادی و خۆشیمان لێ قەدەغە بکرێتو هەمیشە لە دڵتەنگییەکی بەردەوامدا بژین تاکو خودا خۆشیی بوێین؟.. بێگومان مرۆڤ (هەر مرۆڤێك بێت)، دڵشاد دەبێتو، حەزیش دەکات کەبەدڵشادی بمێنێتەوە، کەوابوو مانای چییە ئەو خەڵکە باوەڕدارە، نەیانهێشتووە (قارون) دڵشاد بێت؟!.

بۆ وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە بەخێرایی چاوێك بە وتاری قورئان دەربارەی (دڵخۆشی) دەگێڕین، بەڵام سەرەتا پێناسەیەکی وشەی شادیو دڵخۆشی دیاری دەکەین، لەمبارەیەوە (ئیمام راغیبی ئەسفەهانی) لەکتێبی (مفردات)یدا گوتوویە: (شادی (الفرح) کردنەوەی سینەیەبەتامو چێژێکی خێرا، زۆربەیئەوەش لەتامو چێژە خۆشەجەستەییەکان دایە)[1] لەئایەتەکانی قورئاندا دووجۆرە شادی (فرح) هەیە:

١- شادییەکی ڕێ پێدراو (مباح).
٢- شادییەکی ڕێ لێ گیراو (منهی عنه).؟

---

(١) بڕوانە لاپەڕە (٣٧٤) المفردات فی غریب القران.

شادیی ڕێ پێدراوو شیاو، ئەوەیە دڵو سینەی پێ دەکرێتەوەو قایل بوون بەڕووی خاوەنەکەیەوە دیارەو مرۆڤی ئیماندار دڵشادە بەو نیعمەتانەی، کە خودا پێی بەخشیوەو، بەو خێرو خۆشیو شتە بەتامو چێژانەی بۆی مسۆگەر کردووەو، پاشان هەموو ئەو نیعمەتانە لەکاری جێی رازی بوونی خوادا بەکاردێنێت، نەك هاندەری بن بۆ بێ باکیو خۆ بەزل زانی، یان بیانکاتە مەبەست و ئامانجی ژیان. خودا فەرموویەتی: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ یونس﴾.... واتە: بڵێ واچاکە باوەڕداران بەفەزڵو بەخششو ڕەحمەتی خودا دڵخۆش بن (کەگرنگترینیان دینداریو ئیمانداریتییە) هەر ئەوەش چاکترە بۆیان لەو شتانەی کە خەڵکی سەرقاڵی کۆکردنەوەو کەڵەکە کردنیانن.

ئەم ئایەتەی سوورەتی (یونس) فەرمان بەشادی دەکاتو هاندەریشیەتیو، ئەوشادییە فەرمان پێ دراووڕێ پێدراوەش پێناسە دەکات کەوا: (شادیو دڵخۆشییە بەفەزڵو بەخششو ڕەحمەتی خودا)و، گەلێك باشترو چاکترە لەو ئامرازو کەرەسەو کەلوپەلە باقو بریقانەی، کە خەڵکی بێهوودە کۆیان دەکەنەوەو لەجیاتی زیکری خودا سەرقاڵو ئالوودەی بوون. هەر لەم بارەیەوە خودا فەرموویە: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ...﴾(آل عمران: ١٦٩-١٧٠)، واتە: (هەرگیز وای دامەنێ، کە ئەوانەی لەپێناوی خوادا کوژراون، مردوون،بەڵکو لەلای خودای پەروەردگاریان زیندوونو رزقو رۆزییان پێ دەدەرێت ئەوان زۆر دڵشادو شادمانن بەو بەخششو فەزڵەی، کە خودا پێی بەخشیون) بێگومان ئەم شەهیدانە لە بەهەشتدانو، لەوێش بەفەزڵو بەخششی خودا دڵشادن)).

شادیی دووەمیش ئەو شادییە یاساغو ڕێ لێگیراوەیە، کە مرۆڤ بۆ لەخۆبایی بوونو خۆ بەزل دانان هەڵدەنێت.

خودا لە سەرزەنشتی کافراندا فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَمۡرَحُونَ ﴿٧٥﴾ غافر﴾ ... واتە: (ئەم بارودخی ئازارو ئەشکەنجەدانەی نێو دۆزەختان، کە تێیکەوتوون بەهۆی ئەو کەیفو شادیو دڵخۆشییە نارەوایەتانەوەیە، کە لەسەر زەویدا دەرتاندەبڕیو، کە بەناهەق کاری خۆبەزل زانیتان پێ ئەنجام دەداو نازو نووزو کەشخەییتان بەسەر خەڵکیدا دەکرد) کەوابوو دڵخۆش بوونی کافران بەناهەق ئەوەیە، کە بەرەو کەشخەییو بێ باکیو لووتبەرزیو لەخۆبایی بوونیان هەڵدەنێت.

هەرلەم بارەیەوە خودافەرموویەتی: ﴿وَلَئِنۡ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ ثُمَّ نَزَعۡنَٰهَا مِنۡهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٞ كَفُورٞ ﴿٩﴾ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ نَعۡمَآءَ بَعۡدَ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٞ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ هود﴾... واتە: (ئەگەر مرۆڤمان تووشی خێرو خۆشیو ڕەحمەتێك کردو، دوایی (بۆ تاقیکردنەوەی خۆی) لێمان سەندنەوە، ئەوا نائومێدو پێ نەزانە، خۆ ئەگەر دوای تەنگانەو ناخۆش یەك خستمانە خۆشیو نازونیعمەتەوە، ئەوا دەڵێت: (ئیتر هەرچی ناخۆشییەك دەردەسەرییە لەکۆڵم بۆتەوە)و، دەبینیت زۆرشادمانەو شانازی بەخۆیەوە دەکاتو لەخۆی بایی دەبێت) تەنها مرۆڤی ساویلکەو هەڵخەڵەتاو، تووشی جۆرە شادیو دڵخۆشیەك بە نیعمەتەکانی خودا دەبێت، کە هەڵیدەنێت بۆ لووتبەرزیو خۆبەزل زانیو بەخۆنازینو بەدکاری ئەم جۆرەکەسە ساویلکەو فریوخواردووە، مرۆڤێکی دووربین نییەو، بەڵکو لە ئاقارێکی کەمدا دەبینێت، کە دنیایە بۆیە پێویستە بزانێت ئەو نیعمەتانەی لەبەر دەستیدان، وەك (نیعمەتی ماڵ و سامانو پلەو پایەو هێزو تواناو لەش ساغیو جوانی) هەموویان بەخششی خوداو خەڵاتو نیعمەتی خودان. خوداش بەخواستی خۆی بە هەرکەسێکیان دەبەخشێت لە خەڵکیو لە هەرکاتو زەمانو بەهەر بڕو میقدارێکیش بن، هەر خودا خۆیشی بەتوانایە لەسەر

سەندنەوەی ئەو نیعمەتانە لەخاوەنەکەی لەهەرکاتێکدا بیەوێت. هیچ کەسێکیش ناتوانێت ڕێگە لەخودا بگرێتو پەنا بەخودا.

کەواتە چۆن کەسێکی لووت بەرزو خۆبەزل زان بەنیعمەتێك شادو لەخۆبایی دەبێت کە لە بنەڕەتدا خۆی خاوەن وبەدی هێنەری نییە؟! ئەی چۆن کەسێکی وا لووت بەرزو لەخۆبایی بەنیعمەتێك دڵخۆشەکە ناتوانێت زەمانەتی بکاتو، بەردەوام نابێت بۆی؟! ئایا پێشتر نەمانگوت کەسێکی ئاوا گەر وابکات (ساویلکەو خەڵەتاوە)؟! ئەم جۆرە شادمانییە خاوەنەکەی تێك دەداتو لەناوی دەباتو دەیکاتە هۆیەك بۆ تووڕەیی خوداو، دەیخاتە بەر رقو سزای سەختی خوداو، لە خۆشەویستیو ڕەزامەندیی خودا بێبەشی دەکات . (ان الله لایحب الفرحین).

## چەند ڕێسایەکی قورئانی بۆ بەکارهێنانی نیعمەتەکانی خودا

کاتێك بەوردی سەرنج لە ئامۆژگاریی دووەم دەدەین کە ئیمانداره ئامۆژگارەکان ئاراستەی –قارون–ی دەکەن، لەوەدا چەند ڕێسایەکی هەمەلایەنەی قورئان دیاری دەکەین کە لە (ئەحکامدا)یەك لەدوای یەکدا دێنو تایبەتن بە چۆنیەتی بەکارهێنانی نیعمەتەکانی خوداو، چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنیش بەو ماڵو سامانەوە.

ئیماندارەکان بە (قارون)یان گوت:

﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٧٧﴾ القصص ﴾

(پێشتر بەکورتی ماناکەیمان لێك دایەوە)..

دەشێت ئەم ئایەتە بەسەر ئەم رستانەدا دابەش بکەین:-

١- وابتغ فيما آتاك الله الدار الآخرة.

٢- ولاتنس نصيبك من الدنيا.

٣- واحسن كما احسن الله إليك.

٤- ولاتبغ الفساد في الارض.

٥- ان الله لايحب المفسدين.

هەر رستەیەك لەم رستانە رێسایەك لە رێسا جێگیرە قورئانییەكان (دەربارەی بەكارهێنانی نیعمەتەكانی خودا بەشێوەیەكی گشتی)و (بەكارهێنانی نیعمەتی خودا بەماڵو سامان بەشێوەیەكی تایبەت) دادەرێژن.

ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ رێگای ڕاستەقینەو تەواو لە چۆنیەتی هەڵسوكەوت كردنمان بەماڵو سامانو مامەڵە پێوەكردنیمان دەكات. هەروەها رێنماییمان دەكات بۆ تێروانینی ڕاستو دروست لەو سامانەو، چۆنیەتی بەگەڕخستنی لە سوودی خاوەنیو لە بەختیاركردنی كەسانی ترو دانانی بەو ئامرازەی كە بەندایەتیو چاكەكردن بۆ خوداو بەدەست هێنانی بەهەشتو ڕەزامەندی خودای پێ بەدی دێت.

## ڕێسـای یەکەم/ ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾

### "هەوڵ بدە بۆ پاداشتی ڕۆژی دوایی لە ماڵو نیعمەتەکان دا"

فەرمایشتەکەی خودا ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾ ڕێنماییمـان دەکات بۆ ئەوەی کە هەموو نیازو ئامانجو ئاواتێکمان لەو مـاڵو سـامانەی خـودا پێمان دەبەخشێتو لەو هەموو نازو نیعمەتە جۆربەجۆرانەی پێی گەیاندووین تەنها هەوڵ دان بۆ ڕۆژی دوایی بێتو، هەموو ئەو نیعمەتانـەش ئاراسـتەی ڕۆژی دوایـی بکەنو بیانکـەن بـەو ئامرازانـەی کـە سـەرکەوتنو بـەختیاریی ڕۆژی دوایـی پـێ بەدەست دێنین. ئەم نیعمەتانەش –لەنێوانیاندا ماڵو سامان- خۆی لەخۆیدا نیازێك نینو، ئامرازێکی ژیانی دنیاش بەتەنها نین، بەڵکو هەموو ئەو نیعمەتانەی ئامرازی ڕزگاریو بەختیاریی ڕۆژی دواین، خاوەنەکەشیان دەبێت بەچاکی بیانخاتـە گـەڕ بـۆ بەدیهێنانی ئەو نیازە، هەروەها دەبێت لەهەر دانەیەکیانو لەهەر گەردیلەیـەك لـە گەردیلەکانیدا ئەو واتا قورئانی یـەو ئـەو ڕێـسا ڕاسـتو ڕەوانـە بـەدی بهێنێـت. لەوانەشە هەندێك کەس بەهەڵە لـەم ڕسـتەیەی ئایەتەکـە ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾ تێ بگات، بەتایبەتیش لەکاتێکدا دەیگەیەنێت بەو ڕسـتەیەی دواوەی : (ولاتنس نصيبك من الدنيا)و هەروەها لەم دوو ڕستەیەوە نیعمەتەکان – بەتایبەتیش ماڵو سامان- دەکەنە دوو بەش:-

بەشی یەکەم/ زۆربەی نیعمەتەکان بـۆ بەدەسـت هێنـانی پاداشـتی ڕۆژی دوایـی بەکاردێنێت.

بەشی دووەم/ هەندێك لە نیعمەتـەکان بـۆ بـەکارهێنانی بەشـی خـۆی لـەدنیادا تەرخان دەکات.

ئەم شێوە دابەشكردنەش لەگەڵ ئاراستەی رستەی یەكەم دا ناگونجێت، چونكە رستەی یەكەم داوای ئەوەمان لێ دەكات، كە هەموو ئەو نیعمەتانەی خودا لە دنیادا پێی بەخشیوین (بەبێ جیاكردنەوەی هیچ برِو بەشێكیان) بۆ پاداشتی رۆژی دوایی تەرخان بكەین، هەر ئەمەش لە وشەكانی سەرەتای ئایەتەكەدا ﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ ﴾دا بەدی دەكرێت، واتە بەشێوەیەكی گشتیو سەرتاپاگیر هەرچی خودا پێی داویت ئامانجی رۆژی دواییان پێ بخوازە.

جا ئایا نیعمەتەكان ئامرازێكی بەختیاریو خۆشگوزەرانی نین؟ ئایا ماڵو سامان ئامرازێكی كاركردنو پەیداكردنو ژیانی خۆشو ڕابواردن نین؟ ئەی كەی مرۆڤ خۆشگوزەرانیو بەختیاریو كامەرانی بەدی دێنێت؟ ئایا لەدنیادا ئەم واتاو مانایانە بەدی دێنێتو دەسكەوتە دنیاییەكانیشی بەردەوام نەبڕاوە دەبن؟.

بەڕاستی هەرچی لە دنیادایە كاتیو سنوورداروو بڕاوەیەو، خەمو پەژارەشیان تێكەڵە.. ئەو چەملەكو واتا جوانانەش كە داواكراوو بەئاوات خوازراون، هەرگیز بەچاكترینو تەواوترینو جوانترین شێوەو حاڵەتی خۆیان بەدی نایەن، تەنها لە خانەی پڕ نیعمەتەكانی بەهەشت دا نەبێت. هەر بۆیەش ئیمانداری ژیرو زیرەك، كە خودا رێنموونیی بۆ پەی بردن بەم راستییە كردووە، هەوڵی بۆ دەدات لە رێی بەگەڕخستنی گشت نیعمەتەكانی خوداوە، بۆ بەدیهێنانی ئەو خواستە باڵاو پیرۆزانە.. كەواتە لە هەموو نیعمەتەكانی خودای پەروەردگاردا، هەوڵ بۆ ئەو ئامانجە بنەڕەتییانەی خانەی ڕۆژی دوایی دەدات: ﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ ﴾.

## ڕێسای دووەم/ "وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا"

### بەشی خۆت لەدنیادا لەیاد مەکە

ئەم ڕێسایە داوادەکات لە هەر کەسێك لەوانەی خودا نیعمەتێکی پێ داونو بۆ ڕۆژی دواییان تەرخان کردووە، کە بەشی خۆی لەدنیا لەیاد نەکات. ئەم ڕێسایەش چۆنیەتیی پەیرەوکردنی ڕێسای یەکەمی ڕوون کردۆتەوەو، هەندێك هەڵەو خاڵی نارۆشنی نێو مێشکی هەندێك کەسی لەحاڵەتی پەیڕەوکردندا بۆ لابردووە.

بۆ نموونەش لەوانەیە هەندێك موسڵمان چۆنیەتی هەوڵ دان بۆ پاداشتی ڕۆژی دوایی لەڕێی نیعمەتەکانی خوداوە نەزانێتو، لەژیانی دنیاشدا خۆییان لێ بێ بەش کاتو، سوودی لەباری ڕێ پێدراویان لێ وەرنەگرێتو، بەشێوەیەکی ڕاستو حەلاڵ بەکاریان نەهێنێتو، لەدنیاشدا لێیان مەحروم بێتو، بەم خۆ مەحروم کردنەش وابزانێت گوایە هەوڵی دەسکەوتی ڕۆژی دواییان پێ دەدات تاکو لەوێ تامو چێژیان بزانێت.

ئایا گۆشەگیرو ڕاهیبەکان ئەم شێوە تێگەیشتنەیان نەبووە؟ ئایا هەندێك کاری حەلاڵو ڕێپێدراوو هەندێك خۆشیی ژیانیان لەخۆیان حەرام نەکردووە وەك ژن هێنانو ماڵ پەیداکردنو موڵکداریتی؟ ئایا هەندێك لەموسڵمانانیش هەڵەی لەخۆ حەرام کردنی هەندێك لەو نیعمەتە خۆشو ڕێپێدراوانەیان (بەناوی نەویستن (زوهد) لە دنیاو دانانی بۆ خانەی ڕۆژی دواییییەوە) دەرهەق بەخۆیان ئەنجام نەداوە؟ بێگومان ئایەتەکەش هەڵەی تێگەیشتنو خراپ ڕوانینی ئەو جۆرە کەسانە ڕەت دەکاتەوەو نکووڵیی بەکارنەهێنانی حەلاڵیان لێ دەکاتو، داوایان لێ دەکات تامو چێژی ڕەوای خۆیان لە چەند نیعمەتێك لە دنیادا بچێژنو، ئەو تامو خۆشی لێ

چەشتنەش بەباشی لـەدنیادا ئـەنجام بـدەن. دیـارە موسـڵمانانیش لەبـەکارهێنانو خۆشی چەشتنی هـەموو ئـەو نیعمەتانـەدا ئـەنجامی رۆژی دوایـیـشان لەبەرچـاوەو هەوڵی بۆ دەدەن، بەڵێ ئەمە ئاوایە، بەڵام داواشیان لـێ کـراوە لـەژیانی دنیاشـدا تێیدا بژینو بیکەنە ئامرازێك بۆ ژیانێکی خۆشو شادو کامەران لەدنیادا، ئەمەش لەچوارچێوەی هەوڵدانە بەرەو بەدەستهێنانی خانەی رۆژی دوایی.

هـەردوو ڕسـتە رێـسایییەکە ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾، نێـوانی دنیـاو ئـاخیرەت بەپـشتێنێکی نـاوازەی قورئـانی دەبەسـتنەوەو، (شـێوەی بـەکاربردنی نیعمەتـەکان لـەدنیادا) لەگـەڵ (پاشەکەوت کردنی بۆ پێ گوشادبوونی لەرۆژی قیامەتدا) رێـك دەخـەن.. هـەردوو ڕستەکەش بڕیار لەسەر ئەوە دەدەن، کە واتایەکی بەرزی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی پاداشتی رۆژی دوایی لەرێی نیعمەتەکانی خوداوەو لەدنیادا، ئەوەیە تامو خۆشـیی رەواو رێپێدراو لەو نیعمەتانە لەدنیادا بچێژێت.. بەم رەنگە مرۆڤـی ئیمانـدار دوو بەخششی زۆر چاکی بەسەلیقەو هاوسەنگییەوە دەست دەکەوێت، کە ئەمانەن:-

یەکەم: بەکارهێنانی ئەو نیعمەتانە بەحەلاڵی لەدنیاداو سوودو خۆشی لێ دیتنیـان، بـەم پێیـەش دەشـێت ژیـانی دنیـای بەخۆشـگوزەرانیو نـازو نیعمەتـەوەو، بەبەختیاریو ئاسوودەییو دڵنیاییەوە بەرێتە سەر.

دووەم: بەئامانج گرتنی رۆژی دوایی لەهەمان نیعمـەتو خۆشـیی ژیـانی دنیـاداو کردنیان بە ئامرازێك بۆ سەرکەوتنو رزگاریو بەختەوەریی لەبەهەشتی پڕ نـازو نیعمەتدا.

بەڕاستی مادده خوازەکان هاوڕێی دنیانو نیعمەتـەکانی دنیاشـیان، تـەنها بـۆ ژیانی بڕاوەی دنیایان دەوێتو، بەشی ئاخیرەتیان تیایدا لەبیر چووە.. بەڵام مرۆڤـی باوەڕدار لەدنیاشدا خۆشـیو سـوودیان لـێ دەبینێـت، وەك چـۆن لـەرێی خـستنە

گەڕیانەوە بۆ سەرکەوتن‌و بەختەوەریی ڕاهیب‌و گۆشەگیران‌و هەموو ئـەو کەسـانەی هاوبیرو ڕایانن —بەپێی ئیدعای خۆیان- ئەو نیعمەتانەیان تەنها بـۆ ڕۆژی دواییـان دەوێت‌و خۆیانیـان لـەدنیادا لـەبیر دەکـەن.. مرۆڤـی بـاوەڕداری ڕاسـتەقینە ئـەو نیعمەتانە بۆ بەختیاریی ڕۆژی ئاخیرەت دەخاتە گـەڕو، مـاڵی ڕۆژی ئـاخیرەتی بـە ئامانج دەگرێت لەگەڵ ئەوەدا، کە تام‌و چێژو خۆشیی خـۆی لـەژیانی دنیاشـدا لـێ وەردەگیرێت.

هەر بەم مانایەی، کە لەو دوو ڕێسا قورئانییەدان، ئەم فەرمایشتەی تری خـودا هاتووە، کە لە سـوورەتی (الأعـراف)دا فەرموویـەتی:﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣٢﴾ الأعراف ﴾.

واتە: (ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: (کـێ جـوانی‌و خۆشـییەکانی خـودای حـەرام کردووە، کە بۆ بەندەکانی فەراهەم هێناوەو ئـەی کـێ ڕزق‌و ڕۆزیـی پـاك‌و خۆشـی حەرام کردووە؟ بەو خەڵکە بڵێ: هەموو ئەو خۆشی‌و شتە جوان‌و حەڵاڵانەی ژیـانی بۆ سەرجەم ئیماندارانیـشە لـەڕۆژی دنیـادا، بـەڵام لـە قیامەتـدا تـەنها بـۆ ئـەو ئیماندارانەیە، کە لە دنیادا مافی تەواوی خۆیان پێداوەو بەباشی بەکاریان هێناوە).

کێ ئەو خۆشی‌و جوانییانەی دنیای یاساغ کردووە، کە خودا خۆی بۆ بەنـدەکانی خوڵقاندووە؟ ئەی کێ ئەو شتە خۆش‌و دڵڕفێنانە لەخۆی یاسـاغ دەکـات لـەدنیادا، بەبیانووی پاشەکەوت کردنیان بۆ ڕۆژی دوایی‌و، ئـاوات خواسـتنی پاداشـتی ڕۆژی دوایی؟! ئەم شتە خۆش‌و بەتام‌و جوانانەی دنیا بۆ بـەکاربردن‌و تـامی خۆشـی لـێ دیتنیانـە ئـەو لـەدنیادا، بـەڵام بـەپوختی‌و تایبـەتی لـە قیامەتـدا تـەنها بـۆ باوەڕدارەکانە.

## "ڕێسای سێیەم/ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ"

## "چاکەکار بەوەك چۆن خودا چاکەی لەگەڵ دا کردوویت"

ئەم ڕێسایە ئەوە دەخوازێت کە چۆن خودا چاکەیەکی هێجگار زۆرو مەزنی لەگەڵ مرۆڤدا کردووە کاتێك ئەو نیعمەتانەی پێ داوەو، کە ئەم چاکەیەش لەفەزڵو بەخشندەییو میهرەبانیی خودا خۆیەوەیە، داوا لە مرۆڤیش دەکات کە بە چاکەو وەفاو ئەمەکەوە مامەڵە لەگەڵ چاکەکانی خوادا بکات، ئەمەش لەدەرووی شوکرانە بژێریو سوپاسگوزاریەوەیە، وەك خودا لەجێگەیەکی تردا فەرموویەتی:

﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾ الرحمن﴾ واتە: (ئایا پاداشتی چاکە هەر چاکە نییە، جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزادو جن، ئێوە بڕوا بە کام نیعمەتو بەخششی خودای پەروەردگارتان ناکەنو بەدرۆی دەخەنەوە)؟ چاکەکردن (احسان)یش لەڕێی سوپاسکردنی خوداو شوکرانە بژێرییەوە لەسەر بەخشینی ئەو نیعمەتانەو لەسەر چاکەکردنی خودا لەگەڵ مرۆڤدا بەو نیعمەتانە، خودا لەمبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ... ﴿٧﴾ إبراهيم﴾... واتە (خودا بەدڵنیاییەوە هەواڵی پێداون، یان سوێندی خواردوە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر سوپاسگوزاری خودابن لەسەر نیعمەتەکانو لەڕێی خوادا بەکاری بێننو لێی ببەخشن ئەوا ڕزقو ڕۆزیتان بۆ زیاد دەکەمو نیعمەتی زۆرترتان پێ دەبەخشم).

(ئیحسانو چاکەکاری)یش ئەوەیە مرۆڤی باوەڕدار لەو نیعمەتانەی دنیادا ڕۆژی دوایی مەبەست بێتو لەو مەبەستەشیدا بەشی خۆی لەدنیا لەیاد نەکات.

هەمدیسان (ئیحسانو چاکەکاری) ئەوەیە مرۆڤ ئەو نیعمەتە خوداییانە لە (سوود گەیاندن بە بەندەکانی خودادا)و لە (بڵاوکردنەوەی خێرو خۆشی لەنێویاندا)و، لە (پتەوکردنی بەهاکانی حەق لەژیانیاندا) بەکار بێنێت. بەراستی گەر مرۆڤ لە نیعمەتەکانی خوادا چاکەکار (محسن) بێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر دروست بوونی ماناکانی حەق لە هەناوی داو، نیشانەی دڵسۆزیو ڕاستگۆییو خواویستیو بەخشندەییەتی.

هەر مرۆڤی بەخشندەو ڕاستگۆو پاکو چاکەخوازو بەئەمەك چاکە دەکاتو لە بەرامبەر چاکە (احسان)ی خودادا چاکە بەکار دێنێتو، بەچاکیش خودا دەپەرستێتو، بەچاکیش نیعمەتەکانی خودا بەکاردێنێتو، بەچاکییش لەدنیادا خێرو خۆشیان لێ دەبینێت،و بەچاکییش بۆ بەندەکانی خودای خەرج دەکاتو، بەچاکیش مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، هەموو ژیانی بە چاکیو چاکەکارییەوە بەسەر دەبات، جا کاتێك خودا نیعمەتەکانی لەسەر بەردەوام دەکاتو، ئەویش بەچاکە وەڵامی چاکەی خودا دەداتەوەو ئیتر ئایا پاداشتی چاکە هەر چاکی نییە "هل جزاء الأحسان إلاّ الأحسان"؟!

## ڕێسای چـوارەم / وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ

**(هـەوڵی تێکـدان لەزەوی دا مـەدە).**

مەبەستت فەسادو شێواندن لەژیانی سەر زەویدا نەبێت، نیعمەتـەکانی خـوداش لە فەسادو تێکدانی زەویدا بەکار مەهێنە، ئەو نیعمەتی ماڵو سامانەش، کە خودا پێی بەخشیویت، مەکە بە ئامرازی تێکدان لە زەویدا.

هەر دوو ڕێسای (سێیەمو چوارەم) مرۆڤـ ئاراستە دەکەن بۆ بـاش بـەکارهێنانی نیعمەتەکانی خودا. بۆ نموونە ڕێسای سێیەم مرۆڤـ ئاراستە دەکـات بـۆ چـاکەکردن لەگەڵ خوداو، چاکەکردن لەگـەڵ خەڵکییـشدا لـەڕێی بـەکارهێنانی نیعمەتـەکانی خوداوە.

ڕێسای چوارەمیش وریای دەکاتەوە لەخراپ بەکارهێنانی ئەو نیعمەتانە لـەڕێی فەسادو بەدکارییەوە لەسەر زەوی.

لەڕاستیشدا نیعمەتەکانی خودا لەلای ئەو کەسـانەی بەچـاکی بۆیـان نـاڕوانن‌و بەباشی بەکاریان ناهێنن‌و هەڵسوکەوتی جوامێرانەیان پێوە ناکەن، دەبنە ئامرازێك بۆ فەسادو شێواندن.. ئای چەند کەس هەن، نیعمـەتی مـاڵو سـامان لەبـەدکاری‌و زۆرداریدا بەکاردێنن؟ ئـەی چـەند کەسـی تـر هـەن‌و نیعمـەتی هێـز لـە فەسـادو زۆرداریدا بەکاردێنن!! ئەی داخۆ چەند کەسی تر هەن‌و نیعمەتی تەندروستی‌و لەش ساغی لە فەسادو زۆرداریدا بەکاردێنن!! ئەی چەند کـەس هـەن‌و نیعمـەتی حـەزو ئارەزوو لە فەسادو زۆرداریدا بـەکاردێنن.. ئـەی داخـۆ چـەند کەسـی تـر هـەبن‌و نیعمەتی عەقڵو بەهرەو زیرەکی لە فەسادو ستەمکاریدا بەکاردێنن!! ئـەی چـەندو چەند کەسی تر لە لووتبەرزان‌و زاڵمان نیعمەتە هەمەجۆرەکانی خـودا لـە فەسـادو

زۆرداریدا بەکاردێنن!!

ئەی ئاخۆ دەرەنجامی بەکارهێنانی نیعمەتەکانی خودا لە بەدکاریو شێواندندا چی بێت کە ئەو خۆبەزل زانو لەخۆباییانە وای بەکاردێنن؟ بێگومان ئەوان فەرمانی بنچینەیی نیعمەتەکان پەك دەخەنو لەرووکاری ڕاستەقینەیانەوە بۆ رووکارێکی ناڕاستو ناپەسەندیان دەگۆڕن. هەروەها ڕووکاری ژیانی پێ دەشێوێننو، بەندەکانی خودای پێ ئازار دەدەن لەجیاتی ئەوەی ژیانی پێ چاكو ڕاست بکەنەوەو سوود بە بەندەکانی خودا بگەیەنن، ئەوان بەم ڕەفتارە داوای رقو تووڕەیی خودا لەخۆیان دەکەنو داوای پێشخستنی سزای خودا دەکەنو، خۆیان شایستەی دۆزەخی خودا دەکەن.. ئەوان لە ئاکامی هەموو ئەمانەدا ڕەنجەڕۆو لەنێو چووو ، کەوتووو، شکست خواردوون.

بەڕاستی جیاوازیەکی زۆر گەورە هەیە لەنێوان چاکە کارێکی پیاوچاك دا کە نیعمەتەکان لەرێی چاکەو بڵاوکردنەوەی خێرو چاکەی نێو خەڵکیدا بەکاردێنێتو لەدواییدا قازانج دەکاتو سەردەکەوێتو، لەنێوان زۆردارێکی لەخۆباییشدا کە بەماڵو سامان تەفرەی خواردووەو نیعمەتەکانی خودا لەتێکدانو شێواندندا بەکاردێنێتو، لەدواییدا ڕەنجەڕۆ دەبێتو لەنێو دەچێت.

## ڕێسای پێنجەم / إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ "

## بێگومان خودا بەدکارو تێکدەرانی خۆش ناوێت"

بەڕاستی ئەم ڕێسایەش ڕاستییەکی هەمیشەیی‌و ڕەگ داکوتاو دەردەخات، کە لە هەموو زەمان‌و کات‌و شوێنێکدا هەیەو لەهیچ ئان‌و سەردەمێکدا جیاوازیی لێ پەیدا نەبووە.. بێگومان خودا فاسیدو بەدکارانی خۆش ناوێت.. ئەم جۆرە کەسانەی خۆش ناوێت، چونکە لەزەویدا خراپەو تاوان دەکەن‌و، جارِدەری خراپەو ستەم‌و بەدڕەفتاریین.. بەڵکو خودا چاکسازانی خۆش دەوێت، کە بانگەوازکاری چاکەو دادپەروەری‌و جوامێریین.

خودا بۆیە فاسیدو تاوانکارانی خۆش ناوێت، چونکە ئازاری خەڵکی دەدەن، دیارە خودا کەسانێکی خۆش دەوێت کەسوود بەخەڵکی دەگەیەنن. جا ئەگەر مرۆڤێك بەختەوەر نەبێت بە خۆشەویستیی خودا چیی بۆ دەمێنێت؟ ئەگەر مرۆڤ خۆشەویستیی خودای لەکیس بچێت، کێ سوودێکی پێ دەگەیەنێت؟ ئەی ئەگەر خودا رقی لە مرۆڤێك هەڵگرت‌و سزای خۆی پێ گەیاند، ئایا کەس هەیە سەرخەرو یاریدەدەری ئەو مرۆڤە بێت؟

بێگومان ئەو کەسەی خۆشەویستی خودای لەدەست داوە هەموو شتێکی دۆڕاندووە، ئەو کەسەش، کە خۆشەویستی خودای دەستگیر بووە، هەموو شتێکی بردۆتەوە.

دەبا بەو سیفەتە جوانانە، خۆمان ڕەوشتمەند بکەین، کە خودا پێیان خۆشە، با لەو سیفەتە ناشیرینانەش دوورکەوینەوە، کە خودا پێی ناخۆشە.. تاکو خۆشەویستی خودا دەستەبەر بکەین.

## وەڵامی قاروون : " أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ "

(قارون) چۆن بەپیر ئامۆژگـاریی ئامۆژگاریکارەکانـەوە چـووە؟ ئایـا تەماشـای ڕێسا جێگیرەکانی تایبەت بە شـێوازی بـەکارهێنانی نیعمەتـەکانی خـودای کـرد؟ بێگومان ئامۆژگارییەکەی پەسەند نەکردو، هەردوو چاوی خـۆی لەئاسـت ڕاسـتیدا کوێر کردو، وەڵامی وتەی ئامۆژگـارانی بـەم وتەیـە دایـەوە: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ﴾، بەمانای (من ئەم ماڵو سامانەم بـەهۆی زانیـاریو شـارەزایی خۆمـەوە دەسگیرم بوو)، (خودا ئەم ماڵەی پێدام لەبەرئەوەی شایانی بوم)، (خـوداش خـۆی دەزانێت کە من شایانیم، ئەگەر شایانی نەبوومایە پێم نەدەدرا)..

زانایانی تەفسیر لەئاست ئەم وتەیەی (قـارون)دا ﴿ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ ﴾ ڕای هەمەجۆریان لەسەر دەرخستنی نیازی خاوەن وتەکە هەیە.. (امام ابن کـثیر) سێ ڕای ئەو زانایانەی دیاری کردووە:

یەکەم/ بەمانای بێگومـان خـودا، کـە ئـەم مـاڵو سـامانەی پێـدام بـەپێی ئـەو زانیارییەی خۆی بوو، کە من شایانی ببـووم، هـەروەها بـەپێی خۆشەویـستیی خۆی بوو بۆ من.. قارون بەمەزەندەی خۆی وای بۆ چووە، کە: (بێگومان خـودا بۆیە ئەم ماڵو سامانەی پێداوم، چونکە زانیاریی لەسەر ئەوە هەبووە، کـە مـن شایستەی دەبم) لەبارەی ئەم جۆرە مەزەندەیەوە خودا لەجێیەکی تـری قورئانـدا فەرموویـەتی: ﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلۡنَٰهُ نِعۡمَةٗ مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍۢ ....(٤٩)﴾ الزمـر ، واتە: (ئەگەر مرۆڤ تووشی ئـازارو زیانێك بێت هانا بۆ ئێمە دێنێت، خۆ ئەگەر نازو نیعمـەتێکمان پـێ بەخـشی، دەڵێت: ئەمە تەنها بە شارەزاییو زیرەکیـی خـۆم دەسـتم کـەوتووە. واتـە: بـە

زانیاری‌و ئاگاداریی خوداش، وەك فەرمایشتێکی تری خودا کە فەرموویە:

﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا ﴿٥٠﴾ فصلت ﴾..

واتە: (خۆ ئەگەر خێرو خۆشی بەسەر مرۆڤدا برێژین دوای ئەو تەنگانەیەی رووی تێ کردبوو) خێرا بە دڵنیاییەوە دەڵێت: (ئەمە هی خۆمەو بەرەنجی شانی خۆمەو شایستەی بووم). بەمانای ئەمە هەر شایانی خۆمە.

دووەم/ -قارون- بایەخی بەزانستی کیمیا داوە: زانستی کیمیا لەلای گەلانی پێشین ئەو مانایەی وەك مانا زانستییە هاوچەرخەکەی ئەمڕۆی نەبووە، بەڵکو مانایەکی ئەفسانەیی‌و خەیاڵیی وای هەبووە کە لەسەر شتی پووچەڵ‌و خەرافات بەندبووە، بۆ نموونە لای خەڵکی ئەو سەردەمە (قارون) زانستێکی وای هەبووە گوایە توانیوویەتی کانزا هەمە جۆرەکانی وەك ئاسن‌و مس بگۆڕێت بۆ ئاڵتوونێکی ساغ‌و بێ گەرد، قارونیش لای ئەوان توانیویەتی کە هەر کانزایەك لەبەردەمی دابووە بکات بە ئاڵتوون، بەهۆی ئەمەشەوە ماڵ‌و سامانەکەی زۆر بووەو، گەنجینەکانیشیی زیادیان کردووە.

(امام ابن کثیر) بەرپەرچی ئەم وتەیەی داوەتەوەو گوتوویەتی (وتەیەکی لاوازە، چونکە زانستی کیمیاکەی لەخۆیدا زانستێکی بێ ناوەڕۆك‌و پووچەڵ بووە، لەبەرئەوەی هیچ کەسێك توانای بەسەر دڵ‌و دەروونی خەڵکی عەوامدا نەبووە، تەنها خودای بەدەسەڵات‌و باڵا دەست نەبێت، لەم ڕووەوە خودای مەزن فەرموویە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ... ﴿٧٣﴾ الحج ﴾..

واتە (ئەی خەڵکینە گوێ رادێرن نموونەیەك هێنراوەتەوە: بەڕاستی ئەو کەسە بتپەرستانەوئەو لایەنانەی کە ئێوە هاوارو نزایان لەلا دەکەن (لەجیاتی ئەوەی نزاو هاوارەکە لای خودا بکەن) هەرگیز ئەوانە ناتوانن مێشێك دروست بکەن تەنانەت گەر هەمووشیان پێکەوەو لەیەك کۆمەڵدا کۆببنەوەو یاریدەدەری

یەکتریش بن) ئەی داخۆ کێ هەیە بتوانێت لە مسو ئاسنو هەر کانزایەکی تر ئاڵتوون دروست بکات.

سێیەم/ ڕای سێ یەم لەسەر نیازەکەی (قارون)، ئەوەیە گوایە (ئەو ناوی هەرە گەورەی خودای زانیوەو، دووعای لەلای خودا پێ کردووەو، بەهۆیەوە ماڵو سامانی دەست کەوتووە)[1].

لێرەدا گرنگ ئەوەیە (قارون) گومانی وابووە، کە خودا بۆیە ماڵو سامانی پێ بەخشیوە، لەبەرئەوەی شایستەی بووەو، لەبەرئەوەی خودا خۆشیی ویستووەو، خۆیشی پیاوی ئەو حاڵەتەیە کە موڵکو ماڵی هەبێتو، لەبەرئەوەش گوایە چەند سیفەتێکی تایبەتیی وای تێدایە کە لەغەیری ئەوەدانین، لەبەر هەموو ئەمانە گوتوویەتی ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ﴾.

(قارون) ئەو حەقیقەتەی نەزانیوە، کە خودا بەماڵو سامان تاقی کردۆتەوەو، ئەگەر خوداش نازو نیعمەتێکی زۆر بەسەر کەسێکدا بڕێژێت بەڵگەی ئەوە نییە، کە خودا ئەو کەسەی خۆش دەوێت.. کەمکردنەوەی ماڵو سامانیش لەدەستێکی دی (واتە دەسکورتیی مرۆڤێکی تر) بەڵگەی ئەوە نییە، کە خودا رقی لەو کەسە بێت، هەروەها ماڵو سامان دیاردەیەکی ڕێزلێنان یان سووکایەتی پێ کردن نییە.. (قارون) هەموو ئەم ڕاستیانەی نەدەزانی، هەر بۆیەش لە تاقیکردنەوەی وانەی (ماڵو سامان)دا دەرنەچوو.

ئای چەند کەس هەیە لە خەڵکی، کە خودا نیعمەتی ماڵو سامانی پێ بەخشیونو بە چاویلکەی (قارون) بۆ ئەو نیعمەتە دەڕوانن،و بەپێوەری (قارون) دەیپێونو -وەك ئەو لێی تێدەگەنو، بەزمانی حاڵ، یان زمانی ئاخاوتن هەمان قسەی -قارون- دەڵێنەوەو هەریەکەیان لەسەر بنچینەی وتەکەی ئەو ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ

---

(١) بڕوانە تەفسیری (ابن كثير) بەرگی (٣)، لاپەڕە (٣٩٩).

عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ ﴾ رەفتار دەکەن.

لە سوورەتی (کهف)دا باسی کابرای خاوەنی دوو باخەکە کراوە، کە ئەویش هەمان وتارو رەفتاری هەبووە، وەك خودا لەسەر زاری ئەوەوە وتەکەی هێناوە کە کاتێك چۆتە باخەکەیەوە:﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ﴿٣٦﴾ الكهف﴾... واتە: (کابرای خاوەن باخو رەز چوو بۆ سەردانی باخەکانیو ستەمی لەخۆی کردبوو کاتێك گوتی: (من گومانم وا نییە، کە هەرگیز ئەم موڵکەم لەناوچێت، گومانیشم وانییە کە قیامەت بێت، ئەگەر بۆ لای خوداش بگەڕێنرێمەوە دڵنیام لەوێش جێگەو رێگەو باخو باخاتی باشترم بۆ دانراوە).

بێگومان ماڵو سامان خۆی فیتنەو تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنن. زۆریی ماڵو دەسرۆیشتوویی کەسێکیش نیشانەی ئەوە نییە ئەو کەسە خۆشەویستو رێزلێنراوی لای خودایە، هەروەك کەمیو کەمدەستیش نیشانەی ئەوە نییە، کە ئەو کەسە بەکەم سەیر کرابێتو خودا رقیی لێی بێت.

بەڵکو بناغەی پەسەندیو پیاو ماقووڵیی کەسێك لەلای خودا باوەڕو لەخواترسانە.. مرۆڤی بەرێز لەلای خودا ئیمانداڕێکی لەخواترسە، نەك دەوڵەمەندێکی دەستڕۆیشتوو، بەرێزترین کەسیش لەلای خوا بەتەقواترینو خواناسترین کەسە نەك تەنها دەوڵەمەندترین کەس بێت، قورئان بەراشکاوی ئەم حەقیقەتەی دەربڕیوە:﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ الحجرات﴾. واتە: (بەبێ هیچ گومانێك بەرێزترین کەستان لەئێوە (ئەی گرۆی ئادەمی) لەلای خودا ئەوەیە کە بەتەقواترین کەسەو، کە زۆرتر لەخوا دەترسێت، بەڕاستی خودا زاناو ئاگاداری هەموانە).

باوەڕدارانی لەخواترس‌و خاوەنانی بیروڕای ئیمانداریتی، ساغ‌و جۆش دراوی قورئان بەم جۆرە لە ڕاستییەکە تێدەگەن، لەبەرئەوە نە لە ستەمدا ڕۆدەچن‌و نە دەستدرێژی دەکەنە سەر کەسیش لەکاتێکدا، ئەگەر پارەو ماڵ لەلایان زۆر بوو، بەڵکو لە جێبەجێکردنی فەرمانی خوادا بەکاری دێنن‌و، سوپاسی خودای بەخشندەو نیعمەتبەخشی لەسەر دەکەن، هەروەها لەکاتێکدا ماڵ‌و سامانیان کەم بووەوە، دڵتەنگ‌و نائومێد نابن.

بەلاّم ئەوکەسەی پێوەرە ئیمانییەکەو، دیدە قورئانییەکەی ون کردووە وای بۆ دەچێت گوایە ماڵ‌و سامان، هۆکاری ڕێزلێنسان، یان بەکەم گرتنە، هەر بۆیەش ئەگەر پارەو ماڵی زۆری لەدەست دابوو، وەك (قارون) هەڵسوکەوتی پێوە دەکات‌و دەڵێت: بەزانست‌و شارەزایی‌و ئازایەتی خۆم دەستم کەوتووە ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ﴾، خۆ ئەگەر ماڵ‌و سامانی کەم بۆوە دڵتەنگ‌و خەمبار دەبێت، خوداش لە قورئاندا ئەم جۆرە بۆچوونەی ئەو کەسانەی دیاریکردووەو لەبارەیانەوە فەرموویە:

﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ الفجر ﴾..

واتە: (ئادەمیزاد کاتێك، خودا تاقیی دەکاتەوەو ڕێزی لێ دەنێت‌و نازو نیعمەتی بەسەردا دەڕێژێت، دەڵێت: پەروەردگارم خۆشیی دەوێم‌و ڕێزی لێ ناوم، بەلاّم کاتێك لە تاقیکردنەوەیەکی تردا، خودا رزق‌و ڕۆزیی کەمی پێ دەبەخشێت‌و لێی ئالۆز دەکات، دەڵێت: پەروەردگارم منی خۆش ناوێت‌و رقی لێمەو، بەچاوی سووك سەیری کردووم).

## " فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦ "

(قارون) لە ڕەفتارێکی تریدا بەشێوەیەکی خۆنواندنو دیاردەی دەوڵەمەندیو کەشخەییەوە چووە دەرەوە بۆ گەڕان بەنێو هۆزەکەیدا ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦ ﴾ .. ئەمەش تاوانێکی دیکەیەو دەچێتە پاڵ تاوانەکانی پێشووی، ئەو تاوانانەی، کە تەنها بەهۆی زۆریی ماڵو سامانیەوە ئەنجامی دەدان.

دیارە (قارون) تەنها بەهۆی لەخۆبایی بوونی بە زۆریی ماڵو سامانییەوە نەوەستاوە، تەنها بە خۆبەزل زانیو بەخۆنازینو لەسنوور دەرچوونو ستەمکاریی بە ماڵو سامانییەوە نەوەستاوە، هەر بەوەش نەوەستاوە کە ئامۆژگاریی ئیماندارەکان ڕەت کاتەوە، هەر بە ڕوانینی هەڵەی بۆ ماڵو سامانیش نەوەستاوە کە بۆ خۆشیو ڕابواردنی دنیای بخاتە گەڕو ڕۆژی دواییی پێ لەبیر بکاتو، زۆریی ماڵو داراییشی بە نیشانەی خۆشویستنی خودا دابنێت، کە گوایە خودا خۆشیی دەوێت.. بەهەموو ئەو گوناهو تاوانو کردارە نابەجێیانەوە نەوەستاوە، بەڵکو تاوانێکی دزێوتری خستنە پاڵ کەبووە هۆی بەڵاو تاقیکارییەك بۆ هۆزی (بەنوئیسرائیل)و بەشێوەیەك ستەمی لێکردنو لە سنوور دەرچووو فیتنەیەکی نائاسایی بەسەرداهێنان، کە بووە تاقیکردنەوەیەکی قورسو سەخت بۆیان، ئەوەبوو بەهەموو دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێشو فریودەری دەوڵەمەندیو کەشخەییو بەرگی ئاڵو واڵاوە بەنێویاندا دەسووڕایەوە، تا ئەوانیش خەفەتی زۆری پێ بخۆنو ئاواتە خوازی هەمان حاڵەتی دەسڕۆیشتوویی ئەو بن.. ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦ ﴾ ئەم ڕستەیە بە هەموو سایەو ئاماژەو وشەکانییەوە خۆنواندنێکی قارونیانەی پڕ فیزو هەواو خۆ بەگەورە

گرتوومان بۆ وێنا دەکات کە خەیاڵی خوێنەر لەناخی خۆیدا بەهەموو لایەکدا دەبات‌و، دیارە خەیاڵیش وێنەیەکی خەیاڵیی گەورەکراوو قەبەش بۆ خۆی دەکێشێت. بەڵام هەرچەندێك خۆنواندن‌و خۆدەرخستنەکەی —قارون- لەبەرچاوی گەلەکەی بخەینە بازنەی گریمان‌و مەزندەکارییەوەو، هەرچەندێکی لەبارەوە بڵێین، هەر کەم‌و کورتەو، گریمانەکانیشمان بەکەم دادەنرێت، بۆیە پێویست ناکات هیچی لەبارەوە بڵێین، بەتایبەتیش، کە لە فەرموودە راست (صحیح)ەکانیشدا هیچی لەبارەوە نەهاتووەو، هەر ریوایەت‌و گێڕانەوەیەکی تری لەسەر هێنرابێت ئەوە هەر لە دەقە پووچەڵەکانی (ئیسرائیلیات)ەوە وەرگیراون، کە بەهیچ شێوەیەك شیاو نییە سوودیان لێ وەربگیرێت، یان شتێکیان لێ بهێنرێت.

پاشان بێگومان هێنانەوەی ئەو ریوایەتە ناڕاست‌و ناجێگیرانەش (چێژی بیرکردنەوەی خوێنەر لە چۆنیەتی خۆنواندن‌و خۆڕازاندنەوەکەی قارون) حەرام دەکات‌و، ناهێڵێت وێنەیەکی لووتبەرزی‌و خۆ بەزل دانەرانەی ئەو کابرایە لەخەیاڵیدا وێنا بکات.. دەبا رێ بەخەیاڵ دەین، کە چۆن ئەو (کەشخەیی‌و خۆبادانەی قارون لەنێو گەلەکەیدا) وێنا دەکات‌و، با خەیاڵ بەهیچ وتەو ریوایاتێکی ناڕاستەوە کۆت‌و پێوەند نەکەین.

قارون بەو شێوە نابەجێیەی خۆڕازاندنەوە چووە نێو گەلە هەژارو کەم دەستەکەیەوە، تاکو گرفتارو دڵتەنگیان کات بەوەی گوایە لەخۆیان دەوڵەمەندترو بەهێزترەو، هەر خۆی لەنێویاندا لەژیانێکی پڕ نازو نیعمەت‌و خۆشی‌و رابواردندا دەژی‌و، گوایە هەر خۆی مانای ژیان دەزانێت، ئیتر ئەوان بێ بەش‌و مەحروم بن لە خۆشیی ژیان‌و خۆشگوزەرانی.

ئەم رەفتارە بێ شەرمانەیەی (قارون)، هەمان رەفتاری ئەو کەسانەشە، کە لەسەر شێوازی ئەو رۆیشتوون‌و،ماڵو سامانی خۆیان لەفیتنەو ئازارداني خەڵکی‌و، خۆ بەزل زانی‌و خۆ نواندن‌و، کەشخەیی‌و لەخۆبایی بووندا بەکارهێناوە.

زۆرن ئەو کەسانەی بەخۆڕازاندنەوەو جوانکاریی زیاد لەڕادەوە دەچنە نێو خەڵکییەوە تاکو دڵیان ئازار بدەن‌و گرفتاری خەم‌و پەژارەیان بکەن.. زۆریشن ئەو کەسانەی شت‌ومەك‌و کەل‌وپەلی گرانبەهای خۆیان دەخەنە بەرچاوی خەڵکی‌و هەواڵی کەرەسەی خۆشی‌و بەدڕەفتاری‌و بێ ئابڕوویی‌و دیاردەکانی خۆ گۆڕین‌و ئارایشتیان بۆ کەسانی تر بڵاودەکەنەوەو، دەربارەی هەمە چەشنی‌و هەمەڕەنگیی خۆراك‌و خواردنەوەو جل‌وبەرگ‌و بابەتی ناوماڵ‌و کاڵاو بەرگی دەگمەنی خوری‌و ئاوریشم‌و خانووو کۆشکەکانیشیان دەدوێن.

هەندێك کەس لەوانەی هەمیشە بەزینەت‌و خۆڕازاندنی زیاد لەڕادەوە بەنێو گەل‌و هۆزو عەشرەتیاندا دەسووڕێنەوە چەندەها پلەی زیادتریان لە -قارون- تێپەڕاندووەو پاشان هەر ئەوانیش بەتوندترین شێوە ستەم‌و دەستدرێژی ئەنجام دەدەن‌و لە (قارون) توندتر فیتنەو گرفتاری بەسەر خەڵکیدا دێنێت.

## "ئەوانەی بە (قاروون) هەڵخەڵەتابوون"

(قارون) خۆی‌و ماڵەکەی هۆی فیتنەو گرفتاریی گەلەکەی بوون، ئەوەبوو کاتێك بەو شێوە خۆنواندن‌و کەشخەییەوە بەنێویاندا دەگەڕا، کۆمەڵێك پێی هەڵخەڵەتا.. قورئانیش هەواڵی ئەو فریو خواردن‌و هەڵخەڵەتانەیانی پێ گەیاندووین: ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ القصص﴾.. واتە (ئەوانەی ژیانی دنیایان دەویست گوتیان: خۆزگە ئێمەش وەك قارون، ماڵو سامانی زۆرمان پێ بەخشرایە، بەراستی ئەو زۆر بەختەوەرە).. کەواتە قورئان وەسفی ئەو جۆرە کەسانەی بەوە کردووە، کە حەزیان لەژیانی دنیایە.. ئەم سیفەتەش بنچینەی لادان‌و گومڕابوونیانەو، هۆیەکی بەهەڵە ڕوانین‌و تێکچوونی پێوەرەکانیانە، چونکە ژیانی دنیایان دەوێت، هەر بۆیەش

کاتێك (قارون) دەبینین کە خاوەنی چەندین دیاردەی خۆنواندنو خۆ بەگەورەدانانە وای دادەنێن کە خۆیان لەئاست ئەودا زۆر هەژارو بێ بەشن، ئیدی هیوای ئەوە دەخوازن وەك ئەو هەمان کەرەسەو شتومەکی جوانو رازاوەی ژیانی دنیایان هەبێتو، وەك ئەویش ماڵو گەنجینە لەسەر یەك کەڵەکە بکەنو، لەهەمان ژیانو گوزەرانی وەك ئەودا بژین، ئەوەبوو بە خەمو ئاخ هەڵکێشانەوە گوتیان: ﴿يَٰلَيۡتَ لَنَا مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ﴾

ئەوان قارونیان بەخاوەنی بەشو شانسێکی گەورە داناوە تەنها بەهۆی ئارایشتی ژیانی دنیاو موڵكو ماڵیەوە، چونکە لەلای ئەوان پێوەری بەختو شانس زۆریی موڵك ماڵە.

خۆ ئەگەر وەك قارون خوازیاری ژیانی دنیا بوونایە ئەوا بەو نە دەخەڵەتانو، بەو خۆڕازاندنەوەیەی گرفتار (مفتون) نەدەبوونو بەختو شانسی گەورەیان بەزۆریی ماڵو سامانو کەشخەییو کەلوپەلی بریقو باقی دنیا دانەدەنا. ڕازو نهێنی هەڵخەڵەتانیان ئەوەیە: ﴿يُرِيدُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا﴾.. قورئانیش کاتێك سیفەتی ئەو هەڵخەڵەتاوانەمان بۆ باس دەکات، داوامان لێ دەکات کە نابێت ئێمەش هەمان سیفەتی ئەوان لەخۆ بگرینو، نابێت وەك ئەوان بەدیاردە پووچەڵو ساختەکانی دنیا بخەڵەتێینو، نابێت وەك ئەوان ئاخو داخ بۆ ئەو دیاردەو ڕواڵەتە سەرنج ڕاکێشانە هەڵکێشین.. هەروەها قورئان داوامان لێ دەکات کە خوازیاری ژیانی دنیا نەبین، بەڵکو خۆمان لەسەرڕوویەوە بگرینو تەنها خوازیاری ڕۆژی دواییو بەهەشتی خودا بینو هەوڵی تەواویشی لەدنیادا بۆ بدەین.

بەڕاستیو بێ هیچ گومانێك فەرمایشتەکەی خودا زۆر ڕاستو ڕەوانە، چونکە هەر کەسێك ژیانی دنیای ویستبێتو ژیانی ڕۆژی دوایی لەبیر چووبێتەوەو، تەقەللای زۆرکردنی دیاردەو ڕواڵەتە جوانکارییەکانی دنیای دابێتو بەختەوەریی زۆرو بەختی گەورەی بەزۆرکردنی ئەو دیاردانە لەقەڵەم دابێتو، خۆیشی لەگەڵ ئەو

کەسانە بەراورد کردبێت، کە خاوەنی موڵكو دارایین، ئەوا هەر خەمبارو دڵتەنگو ئاخ هەڵکێش بووەو، بەوپەڕی جۆشو پەلەقاژەو حەسرەتو شەوقەوە ئاواتەخوازی ئەوەبووە هەمان موڵكو داراییو کەرەسی دنیایی هەبێت.

بەڵام ئەو کەسەی ڕۆژی دواییی خواستووەو، داوای نیعمەتە بەردەوامەکەی کردووەو، خوازیاری خۆشیو خێروبێرەکانی بووەو، نرخی ژیانی دنیاو کەرەسەو داراییەکانی زانیوە، ئەوا هەرگیز لەخشتە نابرێت بەو موڵکەی کە موڵکداران لەدنیادا هەیانەو، ئاواتەخوازی موڵکەکەیان نییەو، بەحەسرەتو پەلەقاژەشەوە خۆی بۆ ناتوێنێتەوە، بەڵکو خۆی لەسەروو ئەو دیاردەو کەرەسە بێ نرخو بێ بەهایانەوە دادەنێت.

خودای پەروەردگار لەدیارترینو ڕۆشنترین ڕێنماییدا فەرموویەتی:

﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢١﴾ الحديد ﴾.

واتە: (چاك بزانن کە ژیانی دنیا تەنیا یاریو گەمەو ڕازاندنەوەو خۆ نواندنو بەخۆنازینی نێوان خۆتانو، زۆرکردنی ماڵو سامانو منالانە، وەك بارانێکی بەپیت کە ببێتە هۆی بەرهەمێکی زۆرو جوتیاران سەرسام کاتو پاشان وشك ببێتو زەرد هەڵگەڕێتو، دواتریش وردوخاش بێت، بێگومان لە ڕۆژی دواییدا سزای سەختو دژوار بۆ دنیا پەرستانەو، لێخۆشبوونو ڕەزامەندیی خوداش بۆ ئیماندارانی دنیا نەویستە.. بێگومان ژیانی دنیاش (بەبێ خواپەرستیو باوەڕداریتی) جگە لەوەی

ڕابواردنێکی کەم‌و هۆی هەڵخەڵەتانەو چەندان کەسی پێ لەخشتە دەبرێت، هیچی تر نییە.. کەواتە ئەی ئیمانداران پێشبڕکێ بکەن بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی‌و لێخۆشبوونێك، کە لە خودای پەروەردگارتانەوە دەست دەکەوێت‌و، بۆ بەدەست هێنانی بەهەشتێك، کە ڕووبەرەکەی وەك پانتایی ئاسمان‌و زەوییەو بۆ ئەو کەسانە ئامادەکراوە، کە باوەڕیان بەخوداو پێغەمبەرانی هێناوەو کرداری چاکیان کردووە. ئەمەش ڕێزێکی تایبەتییە لەلایەن خوداوە، کە بەخواستی خۆی دەیکاتە خەڵاتی هەر کەسێك لەوانەی شایستەین، خودا هەر خۆیشی خاوەنی فەزڵو بەخششی زۆر گەورەو نەبڕاوەیە).

## "کێ زۆر بەختەوەرە؟"

ئەوانەی خوازیاری ژیانی دنیابوون‌و، بەقارون هەڵخەڵەتان‌و گرفتاری ئەو موڵك‌و سامانەی بوون‌و، کاتێك قارونیان بەو دیاردەی خۆڕازاندن‌و کەشخەییەوە بینی، بەکەسێکی زۆر بەختەوەرو (ذو حظ عظيم)یان دانا.. بەختەوەریی‌و خۆشبەختی لەلای ئەوان خۆنواندنی دنیاییەو، دیاردەکانی نازو نیعمەت‌و زیادەڕۆیی کەرەسەکانی دنیایە، خاوەنی ئەم بەخت‌و بەشە گەورەیەی دنیاش هەرئەو کەسەیە، کە ئەو دیاردەو کەرەسەو ئامرازانەیان هەبێت، بەڵام ئایا باری ڕاستی‌و حەقیقەتی مەسەلەکە ئاوایە؟! ئایا ئەمە پێوەری بەختی زۆرو گەورەیە؟! ئایا هەر کەس خاوەنی ئەوەبێت بەختەوەرو دەسترۆیشتوو؟!

بەراستی دیاردەو ڕواڵەتەکانی ژیانی دنیاو، ڕەنگەکانی خۆڕازاندنەوەی نێو دنیا هەمیشەیی‌و نەمرنین، بەڵکو کاتی‌و سنووردارن، سەرەنجامیان نەمان‌و بڕانەوەیە، ئیدی چۆن موڵکدارێتیی ئەو ڕواڵەت‌و ڕەنگانە پێوەری خۆشبەختی‌و زۆریی بەخت‌و بەشن؟ چۆن شتەکان بە پێوەری کاتی‌و بڕاوە هەڵدەسەنگێنرێن؟! دیارە بەکارهێنان‌و

خۆشی چەشتن لەو ڕواڵەتو ڕەنگو ئامرازانە بەنازو نیعمەتو دەست بڵاویشەوە، هەمیشەیی‌و بەردەوامو هەتا هەتایی نیین، بەڵکو سەرەنجامیان هەر نەمانو تیاچوونەو، لەجێگەشیان دا هەژاری‌و بێ بەشی دەچەسپێنن، جا چۆن خاوەنەکەیان خۆشبەختو بەختەوەرە کە ئەمە سەرەنجامو ئاکامی بێت؟!

لەڕاستیشدا (قارون) خاوەنی بەختی گەورە (ذو حظ عظیم) نەبووە، ئەگەرچی ڕاستی‌و ڕادەی خۆڕازاندنەوەکەشی ئاوا بووبێت.. هەر ئەمەش چارەنووسی ڕابواردنو لێ حەوانەوەی بووە.. هەر کەسێکیش لەچۆنیەتی موڵکداریتی‌و خۆڕازاندنەوەو ژیانی دنیایدا وەك (قارون)بێت، ئەوا ئەویش بەختەوەرو خۆشبەخت نییە سەرەڕای ئەوەی کە هەڵخەڵەتاوانیش واگومان بەرن.. لەراستیدا مرۆڤی بەختەوەرو خاوەنی بەختی مەزن ئەو کەسەیە، کە حەقیقەتی زیندووی مەسەلەکانی دەسگیر بووبێت نەك دیاردە ساختەو لەخشتە بەرەکانی.. مرۆڤی بەختەوەر ئەوەیە لەحەقیقەتی ژیاندا بژی‌و تامو شیرینییەکەی چەشتبێت.. مرۆڤی خاوەن بەختی مەزن ئەو کەسەیە، کە باوەڕو قەناعەتو دڵنیایی‌و کامەرانیی دیبێتەوە.. مرۆڤی بەختەوەر ئەوەیە، کە بەخۆشییە نەبڕاوەکانو بەهەشتی هەمیشەیی‌و پڕ لەنیعمەتی خوداوە سەرکەوتوبێت. ئەمەش تەنها بۆ ئیمانداری ڕاستگۆو بەئارامو جیهادکارە.. وەك خوداش فەرموویەتی:

﴿وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ آل عمران﴾.

واتە: (ئەی پێغەمبەر.. خەفەت مەخۆ بۆ ئەوانەی بەپەلە بەرەو کفرو بێباوەڕیی دەچن، چونکە ئەوانە ناتوانن هیچ زەرەرێك بەخودا بگەیەنن، خوداش دەیەوێت هیچ بەختو بەشێکیان لەقیامەتدا پێ نەبەخشێتو، سزایەکی گەورەشیان بۆ ئامادەکراوە).

کەواتە بەختی مەزن (الحظ العظیم) ئەو بەختەوەرییەی رۆژی دواییە نەك هی دنیا.. خۆشیو حەوانەوەی نێو نازو نیعمەتی بەهەشتە، جا هەر کەسێك لەو نازو نیعمەتەی بەهەشت بێبەش بێت، ئەوە هیچ بەختێکی نیە. لەڕاستیدا کافرانیش بۆیە هیچ بەختێکیان نییە، چونکە لەو نیعمەتەی بەهەشت بێبەشن، راستیی بەختەوەریو بەختی راستەقینەش لەدنیادا ئەوەیە کە لەناخی رەوشتبەرزیو خۆڕازاندنەوە بەئەدەبو ئاکاری جوان دایەو، لەمامەڵە لەگەڵ کەسانی دی بەگیانی لەخۆبوردوویيو ساناییو لێبوردنو بەزەیی یەوەیەو لەچەشتنی تامی قەناعەتو دڵنیاییو کامەرانی دایە، خاوەن بەختی مەزن ئەو کەسەیە کە خودا ئەم فەزڵەی پێداوەو ئەو نیعمەتە گەورەیەی پێ بەخشیوە، خودا فەرموویە:

﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ (٣٤) وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ (٣٥) ﴾ فصلت

واتە: (بێگومان چاکەو خراپە وەك یەك نین، جا ئەی باوەڕدار بە جوانترینو چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپە ببەرەوەو چاکە لەگەڵ خراپەکارەکەدا بکە، ئەوسا دەبینیت ئەو کەسەی، کە دوژمنایەتییەکت لەگەڵیدا هەبووە بووە بەدۆستێکی پارێزەرو گیانی بەگیانی، ئەم سیفەتو ڕەفتارە جوانەی لەخۆبوردووییش هیچ کەسێك ناتوانێت بینوێنێت تەنها کەسانی ئارامگر نەبێت، هەروەها هیچ کەسێکیش هەڵوێستی ئاوای بۆ پیشان نادرێت، تەنها کەسێکی بەختەوەرو خاوەن بەختێکی گەورە نەبێت).

## " وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ "

دوای ئەوەی قورئان سیفەتی بەقارون فریودراوانمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو ڕازو نهێنیی پێ هەڵخەڵەتانیان دەردەخات، سیفەتی ئەو کەسانەشمان بۆ باس دەکات، کە پێی نەخەڵەتاون‌و لەو تاقیکردنەوەو گرفتاریتییەدا سەرکەوتووبوون، ئەو کەسانە ئەوانەن، کاتێك وتەو (خۆزگە بە قارون خواستنی فریودراوانیان گوێ لێدەبێت) کە حەز دەکەن هەمان سامان‌و دیاردەی خۆنواندنی ئەویان دەسکەوێت، خێرا بە ئاوات خواستنەوەی فریودراوە مەفتوونەکان پەست دەبن‌و، وەڵامێکیان دەدەنەوەو ڕاستیی مەسەلەکەیان پێدەڵێن‌و، تێڕوانینەکەشیان بۆ ڕاست دەکەنەوە، وەك خودا فەرموویە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ القصص ﴾.. واتە (ئەو کەسانەی بەهۆی زانست‌و شارەزاییەوە ڕاستییەکانی باوەڕیان پێ گەیشتبوو، بەو کەسە دنیا ویست‌و خۆزگە خوازانەیان گوت: (کوڕە قوڕبەسەرتان وریابن، ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە لەوەی پاداشتی خودا زۆر چاکترە بۆ ئەو کەسەی باوەڕێکی پتەوو دامەزراوی هەیەو کردەوەی چاکی کردووە. ئەو پاداشتەش تەنها ئارامگران‌و خۆڕاگران دەستیان دەکەوێت).

قورئان وەها مەسەلەکە دەخاتەڕوو، وەك ئەوەی بیەوێت ڕازو نهێنیی سەرکەوتن‌و بڵندی لەئاست دنیاو سەرفرازبوونی ئەو ئیماندارانەو، بنەمای ڕاستگۆیی حوکمەکانیان‌و، چاکی دامەزرانیان‌و دەروازەی تێڕوانینیانمان بۆ دەستنیشان کات، تاکو ئێمەش دەستخەینە سەریان‌و وەریان گرین‌و پەیڕەوییان بکەین.. ئەمەش هەر زانستە ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ﴾ بەڕاستی ئەوانەی زانست‌و شارەزاییان هەبوو، قارون‌و خۆنواندنەکەی‌و موڵك‌و

سامانه‌كه‌یان به‌ چاویلكه‌ی زانست ده‌بینن‌و به‌و شێوه‌ بینراوییه‌یان ده‌یانخسته‌ به‌رچاوی ئه‌وانه‌ی، كه‌ زانست‌و شاره‌زاییان نه‌بوو، مامه‌ڵه‌ له‌گه‌ڵ كردنیشیان هه‌ر له‌سه‌ر بناغه‌ی زانست بووو به‌ ته‌رازووی زانست قارون‌و سامانه‌كه‌یان ده‌كێشاو دیتیان هیچ شتێكی نیه‌و هه‌ژارو بێ نه‌واو نه‌گبه‌ته‌.. دیتیان فه‌وتاوو خه‌ساره‌تمه‌ندو بێ به‌شه‌.. دیتیان ئازاربارو به‌دبه‌خت‌و ده‌ركراو له‌ ڕه‌حمه‌تی خودایه‌، بۆیه‌ داوایان له‌ فریودراوانی تر كرد كه‌ ئه‌م راستییه‌ بزانن تاكو په‌رده‌ی سه‌رچاویان لاچێت. بێگومان زانست رازو بنه‌مایه‌و، پارێزراوی‌و ڕزگاریش به‌زانسته‌وه‌یه‌. واته‌: زانست له‌سه‌ڕ ڕاستیی شته‌كان.. زانست له‌سه‌ر هۆكارو دیارده‌و ڕه‌نگه‌كانی به‌خته‌وه‌ری‌و شادمانی‌و خێرو به‌ره‌كه‌ت، زانست ده‌رباره‌ی ئه‌نجامه‌ نه‌بڕاوه‌و هه‌میشه‌ییه‌كان‌و داواكردنیان‌و هه‌وڵ بۆدانیان، زانست له‌سه‌ر كاروبارو ڕواڵه‌ت‌و دیمه‌نه‌ ساخته‌و له‌نێوچووه‌كان‌و شانازی پێوه‌نه‌كردنیان. ئه‌مه‌یه‌ زانستی ڕاست‌و دروستی خودایی‌و، هیچ كه‌سێكی خاوه‌ن ئه‌م زانسته‌ فریو ناخوات‌و هیچ خاوه‌ن زانستێكی ئاواش له‌خۆبایی نابێت، هیچ كه‌سێكی خاوه‌ن زانست‌و زانیاریش خوازیاری دنیاو دیارده‌كانی خۆنواندنی دنیا نابێت‌و، ڕۆژی دوایی‌و پاداشتی خودای بیر ناچێت. وادیاره‌ بۆ جه‌خت كردنه‌ سه‌ر ئه‌م مانایه‌ خودا فه‌رموویه‌تی:

﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ الحديد ﴾.

(پێشتر واتای ئه‌م ئایه‌ته‌مان به‌كوردی لێك دایه‌وه‌).. سه‌ره‌تای ئه‌م ئایه‌ته‌ به‌وشه‌ی فه‌رمان پێكردن (أمر)ی (بزانن) (اعلموا) ده‌ست پێده‌كات، بزانن بزانن (اعلموا اعلموا) تاكو به‌هه‌ڵه‌ بۆ دنیا نه‌ڕوانن.. بزانن حه‌قیقه‌تی دنیاو جوانی‌و

ڕازاندنەوەکانی چییە هەتاکو پێی نەخەڵەتێن.. هیچ شتێکیش وەك زانین سوودتان پێ ناگەیەنێتو ڕزگارتان ناکات، مەگەر تەنها ئەوە نەبێت، کە لە کەسانی زانستمەندو بەهرەوەرانی زانین بن. ئەو کەسەی بەشێکی دیار لەژیانی دنیاو ئاڵاو واڵاو زینەتەکانیان پێ درابوو لە چ ئاستو پلەیەکی ئەو کەسانەدا بوون، کە زانستو زانیارییان پێ درابوو؟ ئایا هەردوولا وەك یەكو هاوشانی یەکدین؟ (هل یستوي الفریقان)؟.

## پاداشتی خودا لەژیانی دنیا بۆ کێ چاکترە ؟!

ئەوانەی زانیاریان پێ درابوو چییان گوت بەوانەی کە بەدیاردەکانی ژیانی دنیا خەڵەتابوون؟! پێیان گوت: (کوڕە وریابن پاداشتی خودا چاکترە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی بە خوداو پێغەمبەرانو سەرجەم مەخلووقاتی دیارو نادیاری هێناوەو کارو کردەوەی چاکی کردوە) ﴿ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴿٨٠﴾ القصص﴾

بێگومان ئەو فریودراوانەیان بانگ کرد بۆ زانینی باری ڕاستیی مەسەلەکانو، ئاراستەیان کردن بۆ داواکردنو بەئاوات خواستنی ئەو شتانەی، کە شایستەی داواکارییێن، ڕێنماییان کردن بۆ خواستنی پاداشتی گەورەو نەبڕاوەی خودا.

پاداشتی خوداش چاکترە، چاکترە لەماڵو موڵکی قارونو گەنجینەو کەرەسە ڕازێنەرەکانی، چاکترە لە دیاردەو نەخشو نیگارەکانی دنیا، چاکترە لەهەموو سامانو داراییەکی ساماندارەکان، چاکترەو چاکترە لەهەموویان، چونکە هەر پاداشتەکەی خودا دەمێنێتو هەمیشەیی یەو لەنێو ناچێت، چاکترە لەبەرئەوەی هەر بەو پاداشتە دڵو دەروون ئاشنا دەبێتو گیان شاد دەبێتو تامو چێژی ژیانیشی پێ خۆش دەبێت. چاکترە لەبەرئەوەی بەڵگەی خۆشەویستیی خوداو ڕەزامەندیو بەخششەکانیەتی. پاداشتی خودا چاکترەو، شایستەی ئەوەیە کە دڵو

دەروون بیخوازێتو چاوەکانی بۆی بڕوانن‌و خەڵکی بە ورەو سووربوونەوە بەرەو لای بڕۆن، هەروەها پاداشتی خودا شایستەی ئەوەشە، کە هەموو ماڵو کاتو تەمەنی مرۆڤی لەپێناودا تەرخان بکرێتو، هەموو وزەو تواناو ئیمکاناتێکیشی بۆ بخرێتە گەڕ. پاداشتی خودا بۆ ئیماندار چاکترە ﴿ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ چاکترە بۆ ئیمانداری چاکەکارو بەئەمەك..

پاداشتی خودا هەموو کەسێك بەتەمای نییەو، هەرکەسێکیش بەتەمای بێت دەستی دەکەوێت، هیچ کەسێکیش وەك بەهرەوەری زانیاریی ئیمانداریێتی بەتەمای پاداشتی خودا نییە.

هیچ کەسێك وەك ئەو کەسەی باوەڕی هێناوەو کاروڕەفتاری جوانی هەبووە پاداشتی خودای دەست ناکەوێت، چونکە ڕێگەی بەدەست هێنانی پاداشتی خوداو شاد بوون بەبەهەشتی هەمیشەیی، هەر باوەڕهێنان‌و چاکەکارییە، دیارە هەر تەنها بە ئاوات خواستن‌و بەخەیاڵو خەوبینین پاداشتی خودا دەسگیر نابێت. هەر بەگومان‌و بۆچوون‌و پروپاگەندەش دەسگیر نابێت، پاداشتی خودا تەنها بەرۆیشتن بەسەر ئەو ڕێگەیەدا دەسگیر دەبێت کە مرۆڤی پێ دەگەیەنێت، ئەویش ڕێگەی باوەڕهێنان‌و کرداری چاکەکردنە.. دەبا وریا بین ﴿وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ ، ئەمە وتەی زانستمەندان بوو، ئەوەی شایەتی لەسەر ڕاستیی ئەم وتەیەی بەختەوەرانی زانست دەدات، فەرمایشتێکی تری خودایە کە لە سوورەتی (کهف) تێیدا دەفەرموێت: ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ الكهف﴾.

هەندێك کەس تەنها ژیانی دنیاو جوانییەکانیان دەوێت، پاداشتی خودایان لەبیرکردووەو تەنها پاداشتی دنیایان مەبەستە.. دیارە ئیماندارانی چاکەکاریش

هـەن‌و تـەنها پاداشـتی خودایـان دەوێـت، بـەڵام خـودا پاداشـتی دنیـاش‌و ڕۆژی دواییشیان پـێ دەدات، وەك دەفـەرموێت: ﴿...وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ آل عمـران﴾.. هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ ...﴿١٣٤﴾ النسـاء﴾... بێگومـان خـودا بـەڵێنی داوە بەوانـەی باوەڕیـان هێناوەو کرداری چاکیان کردووەو بەتەمای پاداشتی خودان، ئەو پاداشتە چاك‌و بـێ وێنەیەیان لە ڕۆژی قیامەتدا پێ دەبەخشێت، وەك پێیان دەفەرموێت:

﴿...لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ آل عمران﴾.

## وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ

پاداشتی خودا بۆ ئیمانداری چاکەکار باشترە، بەڵێ ئەمە حەقیقەتێکی جوانو دروستو بنەبڕ (قاطع)ە کە هیچ گومانو شكو ناتەباییەکی تێدا نییە. بەڵام ئایا خەڵکی هەموویان پەی بەم حەقیقەتە دەبەنو دەیناسن؟! ئایا هەموو خەڵکی وەری دەگرنو مامەڵەی لەگەڵ دەکەن؟ نەخێر، چونکە کەسانێك هەنو پەردە لەسەر چاویانەو ئەم حەقیقەتە نابینن، لەسەر دڵیشیان هەر پەردەیەك هەیەو پەیی پێ نابەن.. لەعەقڵیشیان دا بیرێکی تێکەڵو پێکەڵو پڕ لەتەمو فرو شێواو هەیە، کە لێی بێدار نابێتەوە.

بێگومان قورئان هەواڵی داوە، کە تەنها کەسانی بەئارامو خۆڕاگر وەری دەگرنو پەیی پێ دەبەن ﴿وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ﴾.. سەبر (ئارام گرتن)یش مەرجی پێ زانینی ئەم حەقیقەتەو وەرگرتنیەتی.. مرۆڤی ئارامگریش ئەو کەسەیە، کە شایانی وەرگرتنیەتی لەخوداوە، کەسی بێ ئارامو ڕاڕاش لێی بێ بەشە.

بەڵام ئارام گرتن چییە؟ ئارام گرتن لەسەر بەڵاو گرفتارییو تاقیکردنەوەکان، ئارام گرتنە لەسەر فیتنەگێڕیی ستەمکارو، لەسەر مەینەتیی توندو ناڕەحەت. کاتێك مرۆڤی ئیماندار خاوەنانی ماڵو سامانو گەنجینە دەبینێت، بەهۆی ئارامگیرییەوە خۆی لەسەروو ئەوانەوە رادەگرێت، کاتێك دیاردە سەرنج ڕاکێشەکانو هەواو ئارەزووش دەبینێت، هەر بە ئارام گرتنەوە خۆی بەسەریان دا زاڵ دەکات، کاتێك کەسانی گرفتارو مەفتونو خەڵەتاو، بەزینەتی دنیاو خۆشییەکانی دنیا دەبینێت، تەنها بە ئارام گرتن خۆی لەئاستیان دا قایم دەکاتو، هیچ شتێکیش لەرووخانی وەك ئەوانی رزگار، ناکات تەنها ئارام گرتن نەبێت.

ئارامگرتن توێشوویەکی گەورەو کۆمەکێکی نەبڕاوەو، بەخششێکی تەواو

نەبووەو (وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ ) ئارامگرتوان (صابرون) ئەوانەن کە دەزانن هەر پاداشتی خودا چاکترەو هەر ئەوە چاکە کە لای خودایەو، هەر نیعمەتو بەهەشتی خوداش چاکن. بۆیە ئەم پاداشتەش بەئارام گرتن داوادەکات، بەئارامگرتن هەوڵی بۆ دەدات. بەئارام گرتن لەسەر هەڵوێستی خۆی دەمێنێت، بەئارام گرتن لەسەر ئەم ڕاستییە جێگیر دەبێت.

## "کۆتایی و سەرەنجامی -قاروون-"

خودا فەرموویەتی: ﴿ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ القصص ﴾، (خۆیو خانەوماڵیمان بەزەویدا بردە خوارێو، هیچ دەستەو تاقمێك بەبێ خودا نەیانتوانیوە یارمەتیدەری بنو، لە یارمەتیدراوانیش نەبوو).

(قارون) مایەی فیتنەو گرفتاریی بوو بۆ گەلەکەی، بەراستیش فیتنە رووی داو، تاقیکردنەوەش کۆتایی پێهات لەکاتێکدا وادەی کۆتایی هاتنی رۆڵی قارون هاتە پێش، بێگومان ماڵو سامان بۆ خودی قارونیش مایەی فیتنەو گرفتاریی بوو، ئەویش پێی تەفرەدراو مەفتونیو بووو لە تاقیکردنەوەکەشدا دەرنەچووو سەرەنجام: خۆی تووشی بووو سزای خۆی پێگەیشتو، شایانی ئەشکەنجەو ئازار بوو.

(قارون) ستەمی زیاد لەڕادەی لە گەلەکەی کردو لەسنوور دەرچوو، ئینجا سەرگەردانو لووتبەرزو بەزەبر دەرچوو، بەخۆی دەنازیو سەری لێ تێك چوو، بۆیە بەو شێوە خۆنواندنو خۆڕازاندنەوەیەوە بەنێو گەلەکەیدا سووڕایەوەو نازی دەرکردو پۆزی لێ دەداو کەشخەیی دەکرد، ئیدی خۆیو خەڵکیشی خراپ کرد، لەهەموو ئەو تاوانانەشدا ئەوپەڕی خراپیی گرتەبەر. تا لەئاکامدا کاتی چنینەوەی بەرهەمە

تاڵه‌كانی ئه‌و تاوانه‌ دزێوانه‌ی به‌سه‌رداهات.

بێگومان خودا مۆڵه‌تی به‌قارون دابوو تاكو به‌خۆیدا بچێته‌وه‌و بیر بكاته‌وه‌، به‌ڵام بیری نه‌كرده‌وه‌، ئامۆژگارانیش ئامۆژگارییان كردو هیچ ئامۆژگارییه‌كی نه‌بیست، به‌هه‌موو شێوازێكی ورياكردنه‌وه‌و په‌ندو ده‌رس دادان له‌گه‌ڵی خه‌ریك بوون‌و په‌ندو وته‌ی به‌سوودیان پێگه‌یاند، به‌ڵام هیچ په‌ندێكی وه‌رنه‌گرت‌و عاقڵ نه‌بوو.

(قارون) خودای په‌روه‌ردگاری بیر چووبووه‌وه‌، بۆیه‌ خوداش (قارون)ی به‌و ده‌روونه‌ دنیا په‌رسته‌ی خۆی سپارد، ئه‌ویش به‌ ماڵو گه‌نجینه‌كانی ده‌نازی بێ ئه‌وه‌ی سودی پێبگه‌یه‌نن‌و سه‌رخه‌ری بن‌و سزای خودای له‌سه‌ر لابه‌رن. ﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ﴾، (خۆی‌و خانه‌و ماڵیمان به‌ناخی زه‌ویدا برده‌ خواری) له‌نێوان ئه‌م دوو رسته‌یه‌دا ﴿فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ﴾ و ﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ﴾ په‌یوه‌ستی هه‌یه‌و ئامرازی په‌یوه‌ستییه‌كه‌ی نێوانیشیان پیتی (ف)ه‌، به‌ستنه‌وه‌ی رسته‌ی دووه‌میش به‌ رسته‌ی یه‌كه‌م به‌ پیتی (ف)و ده‌لاله‌تی پیته‌كه‌ش له‌سه‌ر رێكخستن‌و به‌دواداهاتن (وه‌ك زانایانی زمان ده‌ڵێن) مانای وایه‌، كه‌ (ڕسته‌ی دووه‌م) له‌سه‌ر(ڕسته‌ی یه‌كه‌م) رێكخراوه‌و، رسته‌ی یه‌كه‌میش هۆیه‌ك بووه‌ بۆ هاتنی دووه‌م، هه‌روه‌ها رسته‌ی دووه‌میش راسته‌وخۆ له‌دوای رسته‌ی یه‌كه‌مه‌وه‌ هاتووه‌.

دوای ئه‌م تێبینییه‌ش له‌سه‌ر مانای پیتی (ف)و به‌ستنه‌وه‌ی نێوانی هه‌ردوو ڕسته‌كه‌، بۆمان ڕوون ده‌بێته‌وه‌، كه‌ ده‌رچوون‌و سووڕانه‌وه‌ی قارون به‌و شێوه‌ خۆنواندنه‌وه‌ له‌نێوگه‌له‌كه‌ی داو به‌و هه‌ستی خۆ به‌زل زانی‌و به‌خۆشه‌یدابوونه‌ی، هۆیه‌كی ڕاسته‌وخۆی سزا به‌ خۆگه‌یاندن‌و به‌ناخی زه‌وی داچوونی خۆی‌و خانه‌و ماڵی بووه‌، واديارێشه‌ حیكمه‌ت له‌وه‌دا ئه‌وه‌یه‌ كه‌ئه‌و به‌دواقۆناغی خراپه‌و له‌ سته‌مدا رۆچوون‌و زوڵم‌و فه‌ساد گه‌یشتووه‌ كاتێك به‌و خۆڕازاندن‌و به‌خۆنازینه‌ به‌ناو

خەڵکیدا سووڕاوەتەوەو هیچ بوارێکی بۆ پاشگەزبوونەوە لەبەردەمدا نەماوەو هەموو شێوەو جۆرو ڕەنگێکی ئازاردانی گەلەکەی بەکارهێناوە، ئیدی چی بۆ ماوەتەوە؟!

ئەو بەم جۆرە گەڕانەی کە بەخۆیدا نازیوەو کەشخەیی پێوە کردووە ڕقو تووڕەیی خودای بەسەر خۆیدا هێناوەو داوای پێشخستنی سزاکەی کردووەو بەپەلەو هەڵەداوان خۆی پێ‌گەیاندووەو کەوتۆتە ناوی.

هەموو دەوڵەمەندە خۆ بەزل زانو لووتبەرزەکان بەم ڕەنگە ڕەفتار دەکەن، بەتایبەتیش هەتا لووتبەرزیو خۆ بەزل زانییان زیاتر بێت، ئەوا گوناهو سزاکەشیان زیاتر دەبێت، هەرچەندێکیش زیادەڕۆیی لەکەرەسەی خۆشی ڕابواردنو بەدڕەوشتیو بەخۆنازینو لەخۆبایی بوون دا بکەن، ئەوا بەشێوەیەکی زیاتر سزاو ڕقو تووڕەییی توندی خودا بەسەر خۆیاندا دێننو، پەلەیان لەکەوتنە نێو ئەو سزایەدا کردووە.

خوداش فەرموویە: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْۚ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓاْ إِثْمًاۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ١٧٨﴾ آل عمران، واتە: (ئەوانەی کافربوون وا نەزانن مۆڵەتمان داونو نازو نیعمەتی دنیامان پێ بەخشیون وگوایە ئەوە مایەی خێرو خۆشییە بۆیان، ئێمە بۆیە مۆڵەتیان دەدەین تا گوناهو تاوانیان زیاتر بێتو سزایەکی سەرشۆڕکەریش چاوەڕییانە).

تاوانی قارونیش کە بەخۆنواندنو خۆڕازاندنەوەی زیاد لەڕادەوە بەنێو گەلەکەیدا سووڕاوەتەوە، بووە هۆی بەناخی زەویدا بردنی خۆیو خانەوماڵی ﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ﴾ بەو ناخی زەویدابردنەش (قارون) کۆتایی پێ‌هاتووەو فیتنەو بەڵای نەماوەو ماڵو سامانیشی بزربووەو لەبەرچاوان نەماوە.. زەوی درزی داوەو قووتی داوە، خۆیو ئەو خانووەی قووت داوە، کە هەموو ماڵو سامانو گەنجینەکانی تێدابووە.

قورئان چۆنیەتیی ئەو بەناخی زەوی دابردنەی شی نەکردۆتەوەو بەدرێژی باسی

لێوه نەکردووه، لەبەر ئەوه بۆ ئێمه شیاو نییه که هیچ قسەو باسێك لەوبارەیەوه له وتـه هەڵبەسـتراوەکانی جوولەکـەو (اسـرائیلیات)یانـەوه وەرگـرین، بـەڵکو تـەنها شێوازی کورتکردنەوەی ئایەتەکەو ڕادەی زانراویـیو نـەزانراویی چـیرۆکەکه ڕەچـاو دەکەینو قورئان چۆنی هێناوه ئێمەش هەر هێنـدەی لـێ بـاس دەکـەینو پـتر لـه قورئان لەسەری ناڕۆین.

زانایانی تەفسیر لەڕێی گێرانەوەو لەمەڕ تەفسیری خۆیان بۆ ئەو بـەناخی زەوی دابردنه فەرموودەیەکیان بەپلەی (صـحیح) لـه پێغەمبـەرەوه ﷺ گێڕاوەتـەوه کـه فەرموویەتی: ((**بينما رجل يجر إزاره، اذا خسف به، فهو يتجلجل في الارض الى يوم القيامة**))[1]. واته (لەکاتێکدا پیاوێك شەرواڵو پانتۆڵەکەی لەبەر لوتبەرزی بەدوای خۆیدا دەخشێنێ، کتوپڕ بەناخی زەویدا بـراو تـا ڕۆژی قیامـەت هـەر بـەقووڵایی زەویدا دەبرێت). گوتوویانه (مەبەست لەم پیاوەی نێو فەرموودەکه — قارون-ە)..

زانای ئیـسلام (ابـن حجـر)، کـه نازنـاوی (الحافظ)ی هەیـه بـەهۆی ئـەوەی ژمارەیەکی هێجگار زۆری فەرموودەی لەبەربووه، لەکتێبەکەیدا (فتح الباری) ولـه شیکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا گوتوویەتی: (علامه الكلابادي) لەکتێبی (معـانی الاخبار)دا سووره لەسەر ئەوەی، که ئەو پیاوەی له فەرموودەکەدا باسـی هـاتووه- قـارون-ە هـەروەها زانـا (جـوهری)یـش لـه (صـحاح)دا هـەمان بـیروڕای هەیـه. (طـبري)یش له (التاريخ)دا له (قتادە)وه گێڕاوێتییەوه، کـه گووتوویـەتی: (بۆمـان باس کراوه که (قارون) هەموو ڕۆژێك بەقەد باڵای مرۆڤێك بەناخی زەویدا دەبرێتـه خوارەوەو، تا ڕۆژی قیامەت هەر بەنێو زەوی دادەبرێتو ناگاته بنەکەی ))[2].

ئەم وتەیەی (قتادە)، که (طبري) هێناوێتییەوه، هیچ بەڵگەیـەکی لەفـەرموودە (صحیح)ەکاندا لەسەر نییه، بۆیه ئێمەش لەئاستی دا بێ دەنگ دەبین وهیچ ناڵێین.

---

(١) البخاري: كتاب اللباس (٧٧) باب من جر ثوبه من خيلاء (٥) حديث رقم (٥٧٩٠).
(٢) فتح الباری- طبعة السلفيه (١٠:٢٦٠)

لێرەشدا گرنگ ئەوەیە، كە فەرمودەكە بەڕاشكاوی ناوی (قارون)ی نەهێناوە هەرچەندە وای لێ بفامرێتەوە، ئەم جۆرە فەهمو لێ تێگەیشتنەش بەدوور دانانرێتو ئەگەری شیاوی هەیە.

بەهەرحاڵ خودا (قارون)ی بەناخی زەویدا بردو، نەماڵ وسامانی سوودی پێ گەیاندو، نەگەنیجنەكان بەرگرییان لێكردو، نەهیچ كەسێكیش لە ئادەمیزاد سەرخەری بوو: ﴿فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ﴾.

(قاروون) ڕۆیشتو كەوتە نێو قوولاییەكانی زەوییەوە، گەنجینەكانیش تێیدا سەرنگوم بوونو، وەك ئەوەی لەم دنیایەشدا نە ژیابێتو خاوەن موڵكو سامان نەبووبێت.

(قاروون) ڕۆشتو تەنها چیرۆكو بەسەرهاتەكەی مایەوە، تاببێت بە پەندو دەرس بۆ گشت كەسێك، كە پەندی لێ وەربگرنو، وەك قارون ڕەفتار نەكەن، تاكو ئەو سزایەی، كە خودا بە قاروونی گەیاند بەر ئەوان نەكەوێت، چونكە گەر وەك ئەو ڕەفتار بكەن، ئەوا هیچ شتێك سوودیان پێ ناگەیەنێتو سزای خودایان لەسەر هەڵناگرێت وەك چۆن قارون هیچ شتێك سوودی پێنەدا..

## ﴿وَأَصْبَحَ الَّذِينَ تَمَنَّوْا مَكَانَهُ بِالْأَمْسِ يَقُولُونَ﴾

خودا لەبەرچاوی (بەنوئیسرائیل) بە هەردوو کۆمەڵەکەوە (کۆمەڵی ئیماندارە بە ئارامەکان) و(کۆمەڵی ساویلکە خەڵەتاوەکان) قارون وماڵ وسامانەکەی بەزەوی دابردە خوارەوە.

دیارە ئەو ئیماندارە بەئارامانەی بە (قارون) نەخەڵەتابوون، سوپاسی خودایان کرد لەسەر ئەوەی قارون وماڵی وسامانەکەی لەنێو بردو فیتنەو فەسادیی نەهێشت هەروەها دیارە کۆمەڵەکەی تریشیان (واتە کۆمەڵی هەڵخەڵەتاوانیان) بەئاگاهێناوەتەوە لەو قسانەی کەپێشتر پێیان گوتبوون.

بێگومان ئەو ئیماندارانە قەناعەت وباوەڕیان بەو ڕێساو بنەماو یاسایانەی خۆیان زیاترو زۆر تربوو، هەروەها باوەڕو متمانەو دڵنیاییو یەقینیشیان بەو ڕێساو بنەمایانە یان زیاتر بوو کەخودا پێی گەیاندوون.

بەڵام ئەو ساویلکەو نەفامانەی کە بەقارون هەڵخەڵەتابوون، لەقورئاندا هەڵوێستە نوێ یەکەیان تۆمار کرا کەچۆن بەجۆرە لاقرتێو فرۆشان و سەرسامیو سەرسوڕمانێکەوە ئەورووداوەیان بینی وکاری تێکردن پاشان هەرئەم ساویلکانە دووهەڵوێستی لێك جوداو دژ بەیەکیان هەبوو، ئەوە بوو تارۆژی دوێنێ کە- قارون- یان دەبینی بەوشێوە خۆنواندنەوە بەنێویاندا دەسوڕێتەوە پێی دەخەڵەتانو هیوایان دەخواست وەك ئەو دەوڵەمەندبنو، وایان دادەنا کەئەو زۆر بەختەوەرە بەهۆی ئەوگەنجینەو سامانو کەرەسانەی کەشخەییو خۆڕازاندنەوەیەوە، هەر بۆیە تادوێنێ دەیانگوت ﴿يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ القصص﴾ بەڵام ئەمڕۆ (واتە ڕۆژی تیاچوونی قارونو سامانەکەی) دوای

بەزەویدا دابردنی قارون هەڵوێستیان گۆڕاوەو، دەڵێن: (سوپاس بۆ خودا ئێمە وەك (قارون) نەبووینو وەك ئەو خاوەنی موڵكو وسامان نەبووین، دەنا گەر وەك ئەو بووینایە، ئەوا خودا ئێمەشی بەناخی زەویدا دەبردە خوارێ.. بەراستی خودا منەتو چاكەی لەسەرمان هەبووە، كە هەژار بووین).. جا سەیری ئەو گوتارە سەرزەنشتكارەی قورئان بكە، چۆن دەربارەیان دەدوێت: ﴿ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ القصص .. ئەو وشەیەی كە دركاندوویانە (ویكأن) چەندین بیروڕای زانایان لەسەر ماناكەی هەیە، امام (ابن كثیر) لەتەفسیرەكەیدا گرنگترین ئەو بیروڕاو وتانەی هێناوە، وەك:

١- هەندێكیان دەڵێن: وشەكە كورت كراوەی رستەی (ویلك اعلم ان...)، واتە (كورە وەیل بۆ تۆ بزانەكە) لەم رستەیەشدا پیتی (لام) لەو شەی (ویلك) لابراوە، هەروەها بۆ سووك كردنیش وشەی (أعلم) لابراوەو بووەبە (ویك ان) پاشان هەردوو وشەی (ویك)و (ان) پێكەوە لكێنراونو بووە بە (ویكأن).

٢- (قتادە)ش دەڵێت: واتە (ئایا نەت دیوەكە/ أَلَم تَرَ أن ..).

٣- چەند زانایەكیتریش دەڵێن: (وشەكە لە دوو وشە پێك هاتووە:-

أ- كەپیتی سەرسوڕمانە یان پیتی بەئاگاهێنانە.

ب- (كأن) بەمانای گومانم وایەو وای دادەنێم"..

جا ئەگەر سەرنج لەم سێ جۆرە بیروڕاو وتانە بدەین، دەبینین كەوتەی دووەمو سێیەم پەسەندنو لەگەڵ (مانای ئایەتەكەو ئەو شوێنەی تێیدا هاتووەو ئەو چیرۆكەی باسی لێوە دەكات"[1] دەگونجێن.

---

(١) بڕوانە تەفسیرەكەی (ابن كثیر-٣: ٤٠١).

ئەم کۆمەڵە کەسە سەرسام بوون بەو ڕووداوەی بەسەر —قارون-داهاتو، تووشی ڕاچڵەکانو دڵە خورپێ بوون. جائێستا کە ئەو ڕووداوە یان دیووەو بەچاوی خۆیان سەیریان کردووەو کارتێکراو بوون پێی، ئێستا باوەڕیان بەو ئیماندارە ئامۆژگارانەیان کردووە لەو ئامۆژگاریانەی پێشوویان دا، کە پێیان ڕاگەیاندبوون. ئێستا زانیویانە، کە خودارزقورۆزی دەدا بەهەر کەسێك، یان کەمی دەکاتەوە بەگوێرەی خواستی دانایانەی خۆی..

ئێستا زانیویانە، کە قاروون بەختەوەرو خاوەن بەختی زۆر نەبووە..ئێستا زانیویانە کەماڵو سامانەکەی هۆی لەنێو چوونی بووەو مایەی ڕقو تووڕەیی خوداش بووە،... ئێستا زانیویانە ئەوان خۆیان خاوەنی بەختی گەورە (حظ عظیم)و بەختەوەرن.. ئێستا زانیویانە، کە کەمیی ماڵو سامانیان منەتو نیعمەتێك بووە لە خوداوە. ئێستا زانیویانە، کە کافران شادو سەرکەوتوو نابن و لەدەست سزای خودا دەرباز نابن.

ئێستا هەموو ئەم واتاو ڕاستییانەیان زانیوە، بەڵام درەنگ زانیویانە، لەکاتێکدا باوەڕدارە بە ئارامەکان لەکاتێکی زووترەوە زانیبوویانو پەییان پێ بردبووو دڵنیابوون لێیو ئارامیشیان لەسەر گرتبوو، هەر لەسەرەتای فیتنەی گرفتاریی لەستەمدا ڕۆچوون قارونەوە.

بێگومان هەردوو لا (هەر دوو جۆرە کۆمەڵەکەی (بەنو ئیسرائیل)) وەك یەك نین، نە لە هەڵوێستو نە لە زانینو نە لە بڕوای بێگەرددا، یەکسانو وەك یەك نین، هەڵوێستێکی بەتینو دڵنیابەخش لەسەرەتای دەرکەوتنی یەکەم پریشکی فیتنەو توندیی تاقیکردنەوە قارونیەکەوە یەکسان نییە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەی، کە درەنگانێك لەدوای بینینی واقیعیی ڕاستیی مەسەلەکەوە دەگیرێتەبەر..

هەردوو زانینەکەش هەر یەکسانو چون یەك نین، واتە زانینی زووترو لەپێشتری کۆمەڵی ئیمانداران، کە زانینێکی بەتینو ڕێنماکار بووەو هیچ شكوگومانو

دڵەڕاوکێیەکی تێ نەکەوتووەو واقیعی قارونیش هەر چەندێك ستەمکارو بەهێزو لووتبەرز بوویێت ئەو زانینەی بۆ نە لە رزاندوون. ئەم زانینە وەك زانینی ئەو کۆمەڵەی دووەم نەبووە، کە زانینێکی لەناکاوو کتوپڕیی بووە، گەر دوای بینینی ڕووداوەکەش نەبوایە، نەیاندەدۆزییەوەو لایان سەری هەڵنەدەدا، بەتایبەتیش دوای ئەوە خەڵکی هەموویان لێی ئاگادار بوونو بڕوایان پێ کردووە (واتە بەو سەرەنجامەی —قارون).

بێگومان ئەم زانینەی کۆمەڵی دووەم، کە لای فریودراوانی (قارون) سەری هەڵداوەو، کە لەکاتێکی درەنگدا هەموو کەسێکی هەڵخەڵەتاوو فریودراوی وەك ئەوان، بێئەوەی پێوەی ماندووبن، هەستی پێ دەکەن، ئەمەش هیچ ئازایەتیو چاکەو تامو بەهایەکی تێدا نییە، چونکە دوای ڕووداوەکە پێیان زانیوە. بێگومان ڕووناکیی بەیان بۆ هەموو کەسێکی خاوەن دووچاو دەرکەوتو، حەقیقەتیش بۆ هەر بینەرێك ڕوون بۆوەو هەموان لەپەی پێبردنیدا یەکسان بوونو، لەوەدا کەس چاکەی بەسەر کەسەوە نییە.

پاشان ئاخۆ ڕۆڵی عەقڵ لەو زانینە پاشوەختەدا چی بێت؟

ئەی ئایا تێگەیشتنو هۆشیاریو زیرەکی، چ ڕۆڵێکیان هەبووە؟ بێگومان کەسانی ساویلکەو گەمژە ئەرکی ئەم بەهرەو وزانە پەك دەخەنو هەست بە زانینی ڕاستی مەسەلەکە، ناکەن تەنها دوای ڕووداو نەبێت، باوەڕ بە حەقیقەتیش ناکەن، تەنها دوای بەدی هاتنی نەبێت لە وێنەیەکی دەرەکیدا..

بێگومان گەورەییو شکۆو پێشکەوتنو ئەمەكو سەربڵندیی، چەند سیفەتێکی دیاری کۆمەڵی باوەڕدارە بەئارامەکانە، کە لە کاتێکی زووترەوە حەقیقەتیان زانیوە، ئەم زانینە بەتین و لە پێشینەشیان لە دەرەنجامی شارەزاییو زیرەکیو هۆشیاریو بەگەڕخستنی عەقڵیانو، گەورەیی باوەڕیانو، ڕاستیی تێڕوانینیانو،

هێزی چاوانیانەوەیە. هەردوو جۆرە زانینەکـە (پێـشینەکەو پاشـینەکە) وەك یـەك نین‌و جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەو کەسەی زووتر پێ دەزانێت‌و بەتەنها پێش خەڵکی تر پەی بەراستی دەبات، لەگـەڵ ئەوکەسـەی درەنـگ پـێ دەزانێـت‌و، لـە خەڵکیتر دوادەکەوێت.

هەروەها خوویەکی تر لەلای کۆمەڵێ ساویلکەو تەفرەدراوان بەدی دەکەین، کـە پەیوەسـتە بـە زانـینی دواکەوتوانـەی‌و، گەمژەییـە ئاشـکراکەی‌و، پەکخـستنی سیفەتەکانی شـارەزایی‌و زیرەکـی‌و هۆشـیاری‌و ژیـری‌و تیـژروانینی، خـووە بـەدی کراوەکەشـیان ئـەو لاسـەنگی‌و لێـك جوداییانـەی نێـو هەڵوێـست‌و ئـاوات‌و حوکمەکانیان‌و، هەڵەی نێو تیژروانین‌و هەڵسەنگاندنیانە.

تادوێنێ دەیانگوت: (خۆزگە ئێمەش وەك قارون ماڵ‌و سامانمان پێببەخشرایە)، ئەمڕۆش (دوای ڕووداوەکە) دەڵێن): (سوپاس بۆ خودا کە ئێمـە وەك قـارون مـاڵ‌و سامانمان پێ نەبەخشراوە).. تادوێنێ (قارون) خۆشبەخت‌و خاوەنی بـەختی گـەورە بوو، بەڵام ئەمڕۆ (دوای بەزەوی دابردنی (قـارون)) خۆیـان خۆشـبەخت وخاوەنـانی بەختی گەورەن.

تادوێنێ خۆیان بـە بێبـەش لـە نازونیعمـەت دادەنـا، ئـەمڕۆش خۆیـان بـەوە دادەنێن، کەوا خودا نازونیعمەتی زۆری پێ داون، جا ئاخۆ هۆکارو ڕازو نهێنیی ئەم شڵەژان‌و لاسەنگی‌و لێك نەچوونەی ئەو جۆرە کەسانە چی بێت؟ ڕازو نهێنیی ئەمە لە خوازیاریی ژیانی دنیادایە ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ﴾.

ئەی داخۆ ڕازو نهێنیی زیرەکـی‌و شـارەزایی کۆمـەڵی یەکـەم چـی بێـت؟ ڕازو نهێنیی ئەمەش ئەو زانست‌و زانیارییە بەتین‌و هەق بینەیە، کە خودا ئامـاژەی بـۆ کردووە: (قال الذین اوتوا العلم).. جالە کوێن ئەوانەی دەیانەوێت زانـست فێـربن‌و، پەندو وانە وەربگرن؟!!

## بەدواداچوونی قورئان لەسەر چیرۆکی (قاروون)

دوای ئەوەی (قارون) لەنێو چووەو، چیرۆکەکەی بەپێی ئەو مەنهەجە قورئانییەی خستنە رووی چیرۆکەکەکانی گێڕراوەتەوە لەشیاوترین حاڵەتی بەدوا داچوون وبڕیاردان دا کەدەروونەکان خرۆشان بەوەی بیستوویانەو، کەدڵەکانیش ئامادەن بۆ وەرگرتنی بەدوادا چوونی شیاوی قورئان، ئەم فەرمایشتەی خودا لەمەڕ بەسەرهاتەکەی قارونەوە هاتووەکە فەرموویە: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ القصص﴾، واتە: (ئەو خانەیەی رۆژی دوایی کە بەهەشتی بەرینە ئامادەمان کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە باڵادەستیی ستەمکارانەیان لەزەویدا ناوێتو فەسادو تاوان لەزەویدا بڵاوناکەنەوە. سەرەنجامی چاکیش هەربۆ کەسانی لەخواترسو پارێزکارە. هەرکەسێك کارێکی چاك ئەنجام بدات ئەوە چاکتر دێتە رێی، هەر کەسێکیش کارێکی خراپە بکات ئەوا سزای خراپەکاران و گوناهباران بەگوێرەی خراپەو گوناهەکانیانە).

لەم بەدواداچوونەی قورئاندا هەندێك ماناو ئاماژە دیاری دەکەین، وەك:

١- ئاراستەکردنی چاوو دڵو ژیانی گوێگرەکان بەرەو خانەی ئاخیرەتو، بانگکردنیان بۆ سەرنەکردنە سەردنیاو کە نابێت دنیا بەگەورەترین ئەندێشەیانو دوا پلەی زانینیانو ئەوپەڕی هیواو ئاواتیان دابنێن.

٢- دیاریکردنی سیفەتەکانی ئەوکەسانەی داوای خانەوماڵی ئاخیرەت دەکەن، هەروەها دیاریکردنی رەوشتەکانی ئەوکەسانەی، کە خودا خانەی رۆژی دوایی

پێ بەخشیون، کە ئەوانــەن ﴿لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا﴾- (بــالاّ دەستیو لووتبەرزییو خراپەیان لەسەر زەویدا ناوێت).

لەڕێی ئەم سیفەتانەشەوە رازو هۆکاری لەنێوچوونی قارون دەزانین، ئــەویش ئەوەبوو حەزی لەدنیابوو ئاخیرەتی نەدەویست، هەروەها خوازیاری بالاّ دەســتیی ستەمکاریوخراپەو شێواندن بوو لەزەویدا.

٣- هەرکەسێك خوازیــاری لووتبــەرزیو فەســادی ســەرزەوی بێــتو ژیانیــشی بــۆ ستەمکاریو فەسادی تەرخان کات ئەوە بێگومان هــەردوو ژیــانی دنیــاو رۆژی دواییشی دۆڕاندووە. لەژیانی دنیادا سزای خودای تووش دەبێت، لــەژیانی رۆژی دواییشیدا چارەنووسی هەرئاگری دۆزەخە. کەوابوو هەردوو خانەیدنیاو ئاخیرەت وەها دەدۆڕێنێت کە خانەی دنیای بەتیاچوونو ماڵکاولی لەدەست دەچــێتو لــە خانەی قیامەتیشدا دەبێتە سووتەمەنی ئاگری دۆزەخ. (قــارون) یــش دیــارترین نموونەی ئەم راستییەیەو پەندێکیشە بۆ ئەو کەسەی سوودی لێوەردەگرێت.

٤- سەرەنجام بۆ لــە خــواترسو پارێزکارانــە (العاقبــە للمــتقین).. لــەخوا ترســانو پارێزگاری (تقوی)و رازی پایەدار بوون لە دنیادا هــۆی پەســەندبوونی کردەوەیــە لای خوداو بەدەســت هێنــانی بەهەشــتەکەیەتی. ســەرەنجامی چــاك لــەم ســەر زەوییەشدا بۆ تەقوا کارو لەخواترســاوانە، چــونکە هــەر ئــەوان شایــستەی ئــەو ســەرەنجامەن، هــەر ئــەوانن ئیــصلاحی ســەر زەوی بەتــەقواو لەخواترســانیان دەکەنو، بەهای بەرزو بیروباوەڕی جوانو راستی یــەکانو کــرداری جــوانی تێــدا پــەخش دەکــەنو، رێــساکانی زوڵــمو ســتەمکاریو دەســدرێژیی تێــدا قەڵاچــۆ دەکەن.. بەڵام زۆردارانی لووتبەرزو بەدرەفتار هیچ سەرەنجامێکی باشیان لەسەر زەوی دانییە، چــونکە بیروبــاوەڕی زوڵــمو ناهــەقی تێــدا بلاودەکەنــەوەو تــۆوی فەسادو دوژمنکاریی تێدا دەچێننو، زەوی وێــران دەکــەنو ژیــان تێــك دەدەن، ئەوان یەکەم کەس خۆیان لەناو دەبەنو یەکەم جاریش کەسانی خۆیان.

ئه‌مـــه‌ش ده‌ســتوورێكی بنـــه‌بڕی خوداییــیه‌و، لـــه‌ هــیچ ســه‌رده‌مێك لـــه‌ سه‌رده‌مه‌كانی مێژووی مرۆڤایه‌تیدا دواناكه‌وێت، هه‌ر به‌م ڕێساو ده‌ستووره‌ش (العاقبة للمتقين).

چه‌ندین ئایه‌تی قورئان بۆ دووپاتكردنه‌وه‌و جه‌خت كردنه‌ سه‌ر ئه‌م ده‌ستووره‌ خوداییــیه‌ هــاتوون، بۆنموونــه‌ش: (موســا) كاتێــك گه‌له‌كــه‌ی لــه‌ (میــسر)دا بێده‌ســـه‌ڵات‌و بــێ‌هێز بــوون، پێــی گــووتن: ﴿...ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ الأعراف﴾، واته‌: ((موسا) به‌گه‌له‌كه‌ی گوت پشت به‌خودا ببه‌ستن‌و ئارامبگرن. چونكه‌ بێگومان مــوڵكی زه‌وی هــی خودایــه‌و ده‌یــدات بــه‌ هــه‌ر كه‌سێك لــه‌ به‌نده‌كانی به‌ شایسته‌یان بزانێت سه‌ره‌نجامی چاكی سه‌ربه‌رزی‌و سه‌رفرازییش لــه‌ دنیاو له‌ قیامه‌تدا هه‌ر بۆ كه‌سانی لــه‌خواترس‌و پارێزكارانــه‌)، ئــه‌م ئایه‌تانــه‌ی تریش هه‌مان ماناو مه‌به‌ستیان هه‌یه‌، وه‌ك خودا تیایاندا ده‌فه‌رموێت:

- ﴿ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾ الأنعام﴾.
- ﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ الحج﴾.
- ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِى هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوْمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ الأنبياء﴾.

واتای ئه‌م ئایانه‌ هه‌موی باسی سه‌ره‌نجامی چاكی دنیایه‌، كه‌ له‌ڕاستیدا هــه‌ر بۆ كه‌سانی له‌خواترس‌و پارێزكــاره‌، ســه‌باره‌ت بــه‌ڕۆژی دوایــیش، دیــاره‌ هــیچ كه‌سێك گومانی له‌وه‌دا نییــه‌، كــه‌ ســه‌ره‌نجامی چــاك لــه‌و ڕۆژه‌شــدا هــه‌ر بــۆ

پارێزکارە خواناسەکانە، بەهەشتیش تەنها بۆ ئەوانە، وەك خودا فەرموویە:

﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ الزمر ﴾.

واتە: (ئەوکەسانەی پارێزکارو ئیماندارو لەخواترسیو گوێڕایەڵی پەروەردگاریان بوونو کاریان بۆ ڕۆژی دوایی دەکرد دەستە دەستەو پۆل پۆل بەرێوە بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن کاتێك دەچنە بەهەشتەوەو دەرگاکانیان بۆدەکرێتەوە فریشتەکانی بەهەشت، کە بەرپرسو سەرپەرشتیاری بەهەشتن پێیان دەڵێن: (سڵاوتان لێ بێت، هێمنو ئاسوودەیی تەواوو هەمیشەییتان لەسەر بێت کەوا خۆتان لەپیسیو چەپەڵیی تاوانو ستەمکاری پاك کردۆتەوەو لە هەموو بەدکارییەك بەدوور بوون) فەرمون بچنە بەهەشتەوە لەگەڵ ژیانی بەردەوامو نەمریدا)، ئینجا ئەمانیش (واتە ئیماندارە بەتەقواو پارێزکارەکانی نێو بەهەشت دەڵێن (سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بەڵێنی خۆی بۆ بەدی هێناینو کردین بە خاوەنی سەرزەمینی بەهەشتو لە هەر جێیەكو لە هەرشوێنێکی بەهەشتدا بمانەوێت بەویستی خۆمان سەربەستانە ژیان دەبەینەسەر، ئای چەندە پاداشتی هەوڵدەرو کرێکارانی ڕێی باوەڕ چاكو گەورەو بەنرخە)).

٥- ئایەتەکەی دواییش ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ القصص ﴾ دووپاتکردنەوەی ڕێسا خوداییەکانە لەسەر پاداشتو سزاو، پاداشت دانەوەو سزادان، ئەو ڕێسایانەش لەسەر بنەمای دادپەروەریی ڕەهای ئیلاهیین،

هەرکەسێك چاکەیەك بکات، ئەوا خوداش بەچاکی مامەڵەی لەگەڵدا کـردووەو پاداشتێکی گەورەترو چاکتر لەکارە چاکەکەی دەداتەوە وچەندان هێنـدەش بـۆی زیاد دەکات چونکە خـودا بەچـاکە پاداشـتی چـاکە دەداتـەوە هەرکەسـێکیش خراپەیەك بکات ئەوا خۆی بەروبوومی دەچـنێتەوەو خـودا بەدادگـەرێتی خـۆی سزای دەداتو بەرەنجامی خراپەوکارە نابەجێکەی پێ دەگەیەنێت .

## پوختەی گرنگتـرین وانەو پەند لەم چیـرۆکەوە

لێرەدا گرنگترین ئەو وانەو پەندو ئاماژانە دیاری دەکەین کە دەشێت لە چیرۆکی (قارون)دا بەکورتی دەریان بێنین:-

١- ستەمکاران لەسەر سیفەتی ستەمکاریی پێك دەگـەن ئەگەرچـی ولاّتیـان لێـك جوداو رەگەزیشیان جیاواز بێت، هەر بۆیەش قورئان (قارون)-ی ئیـسرائیلی)ی لەگەڵ فیرعەون دا داناوەو، بە هاوشێوەو هاوکرداریی یەکدییان لەقەڵەمداوی.

٢- هۆکارەکانی ستەم لەلای ستەمکاران هەمەچەشنن، ستەمی هەندێکیان بەهۆی ماڵو سامانەوەیە، هەندێکیشیان بەهۆی پلەو پایەوەیـە، کۆڵکـەی هاوبەشـی هەموو چەشنەکانیشیان تەنها بەستەمو زۆرداری ناو دەبرێت.

٣- (قارون) بەزۆریی موڵكو ماڵو بارستایی گەنجینەکانی گرفتـارو شـەیدا ببـوو، هەر ئەمەشهۆی لەنێو چوونو خەسارەتمەندیی بوو.

٣- رای یەکلاکراوە لەسەرمانای (مفاتح)ی گەنجینەکانی قارون ئەو قاسـەو کۆگـاو مەخزەنانەیە کـە موڵـك ومـاڵی تێـدا دەپارێزێـت نـەك چـەندان کلیلـی ئـەو مەخزەنانەبێـت .

٥- دابەشبوونی (بەنوئیسرائیل) لەڕووی تێڕوانینیان بۆ -قارون-و هەڵوێستیان لـە گرفتکاری یەکەیەوە بەسەر دوو کۆمەڵدا، حاڵو بارودۆخی گشت نەتەوەیەکـەو

بەرامبەر ئەو جۆرە بەڵاو فیتنەیەی ماڵو سامان دەبنە دوو دەستەو کۆمەڵەوە.

٦- زۆرن ئەوانەی لەسەر ڕێگەی(قارون) دەڕۆنو، بەو ماڵ وسامانەی خودا پێیان دەبەخشێت لەخۆیان بایی دەبن. زۆریشن ئەو کەسانەی بەو قارونانەش دەخەڵەتێنو لەخشتە دەبرێن..

٧- پێویستە هەمیشە چەند کەسێکی باوەڕ دارو پیاو چاكو بەئارام هەبن کە ئامۆژگاریی ستەمکارو زۆرداران بکەن وەك چۆن ئیماندارانی (بەنو ئیسرائیل) ئامۆژگاریی (قارون) یان دەکرد.

٨- ڕێسایەکی گشتیی قورئان ئەوەیە: بێگومان خودا ئەو جۆرە کەسە خۆشحاڵو شادمانانەی خۆش ناوێت کە خۆشحاڵییان بە نازونیعمەتی خودا بەرەو لووتبەرزیو بەخۆ نازینو کەشخەییو لەخۆبایی بوونو زوڵمو بەدرەفتارییان دەبات.

٩- شادی لەئیسلام دا دوو جۆرە، جۆرێکیان ڕەواو ڕێ پێدراوە، تەنانەت، داواکراوو حەزلێ کراوە، ئەویش دڵشادیی مرۆڤی باوەڕدارە بەنازونیعمەتەکانی خوداو، قایل بوونە بەرادەو میقدارییانو، سوپاسکردنی خودایە لەسەریان جۆری دووەمیش نارەواو ڕێ لێ گیراوەو ئەوەیە مرۆڤ بەرەو لەخۆبایی بوونو بەخۆنازینو ستەمو نکوولی لەفەزڵی خوداو پێنەزانیان هەڵدەنێت.

١٠- دڵشادیی ڕاستەقینە ئەوەیە مرۆڤ بەشتێکی نەبڕاوەی هەمیشەیی دڵشاد بێت کە ئەوەش فەزلو ڕەحمەتو نیعمەتو بەهەشتی خودایە، بەڵام شادبوون بەشتێکی لاوەکیو بڕاوەی وەك دنیاو باقو بریقو ئاڵو والآکانی، ئەوە بەڵگەی ساویلکەییو بێئاگایی یە.

١١- ئیسلام چەند ڕێسایەکی هەمە لایەنەی بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی نیعمەتەکانی خودا داناوە.

أ- بە ئامانج دانانی خانەی ڕۆژی دوایی لە نیعمەتەکاندا.

ب- ته‌رخانكردنی به‌شێكی نیعمه‌ته‌كان بۆ خۆشی لێدیتنی ڕه‌وا له‌ ژیانی دنیادا.
ج- چاكه‌كردن له‌گه‌ڵ خوداداو، چاكه‌كردن له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی له‌ڕێی به‌كارهێنانی ئه‌و نیعمه‌تانه‌وه‌.
د- حه‌رامیی نه‌شیانی به‌كارهێنانی نیعمه‌ت له‌سته‌مو به‌دكاریو شێواندندا.
هـ- فاسیدو خراپه‌كاران ده‌كه‌ونه‌ به‌ر رقو تووڕه‌یی خوداو، خۆشه‌ویستی خودایان له‌كیس ده‌چێت، هه‌ر بۆیه‌ش ئه‌وان فه‌وتاوو دۆڕوان.

١٢- مرۆڤی باوه‌ڕدار هه‌موو ئه‌و نیعمه‌تانه‌ به‌ره‌و ڕۆژی دوایی ئاڕاسته‌ ده‌كات، به‌هه‌شتیان پێ ده‌خوازێت بێ ئه‌وه‌ی تاكه‌ نیعمه‌تێكیان بۆ دنیا لێ ببوێرێت.

١٣- ئیسلام مرۆڤ هانده‌دات بۆ به‌كار هێنانی ڕه‌وای نیعمه‌ته‌كانی خودا له‌ژیانی دنیاداو، ڕێ به‌كه‌س نادات ئه‌وه‌ حه‌رام كات، ته‌نانه‌ت به‌كارهێنانی ره‌وا به‌و عیباده‌ته‌ داده‌نێت كه‌ پاداشتی خوداشی له‌سه‌ره‌.

١٤- مرۆڤی موسڵمان دژایه‌تیی ماڵو سامان ناكاتو خۆیشی لێیان ناگرێته‌وه‌، به‌ڵكو به‌پێی چه‌ند ڕێسایه‌كی شه‌رعی لێی هه‌ڵده‌گرێتو خۆشی لێ ده‌بینێتو بۆی ده‌ڕوانێت.

١٥- پێویسته‌ له‌به‌رامبه‌ر چاكه‌و نازونیعمه‌تی خوادا مرۆڤ چاكه‌ له‌گه‌ڵ خوداو به‌نده‌كانی خوادا بكات، به‌و ڕه‌نگه‌ش چاكه‌ له‌گه‌ڵ خوادا ده‌كرێته‌وه‌، كه‌ سوپاسی شوكرانه‌ بژێریی خودایان له‌سه‌ر بكات، چاكه‌كردنیشی له‌گه‌ڵ خه‌ڵكیدا به‌و ڕه‌نگه‌یه‌، كه‌ له‌ڕێی نیعمه‌ته‌كانی خوداوه‌ سوودیان پێ بگه‌یه‌نێت ده‌ی ئایا پاداشتی چاكه‌ هه‌رچاكه‌ نیه‌ ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَـٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَـٰنُ ﴿٦٠﴾ الرحمن ﴾؟!.

١٦- چه‌ند هه‌ڵه‌ كارو ساویلكه‌یه‌، ئه‌وكه‌سه‌ی نیعمه‌ته‌كانی خودا له‌خراپه‌و تێكداندا به‌كاردێنێت!! به‌راستی به‌و ره‌فتاره‌ خۆی له‌ناو ده‌باتو ئه‌و

نیعمەتانەش لادەبات، چونکە خودا تێکدەرو بەدکارانی خۆش ناوێت.

١٧- کەسی لەخۆبایی‌و خەڵەتاو ئەوەیە لەبیری دەچێتەوە، کە بێگومان ئەم نیعمەتانە لەخوداوە پێی دراون، بەڵکو واگومان دەبات، کە بەکۆشش‌و هەوڵی خۆی پەیدای کردوون، یاخود بەهۆی شایستەیی‌و شایانبوونی خۆیەوە پێی دراوەو، وەك قاروون ئاسا دەڵێت: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾.

١٨- ڕێزلێنانی بنچینەیی خودا بۆ مرۆڤ، بە هیچ جۆرێك لەڕێی ماڵ‌و سامان‌و شکۆو گەورەیی و جوانی‌و بنەماڵەو ڕەگەزو پلەو پایەی نەبووە، بەڵکو لەڕێی باوەڕو لەخواترسان‌و پارێزکاری‌و کرداری چاك‌و سوودو خێرگەیاندنە بەخەڵکی.

١٩- ستەمکارانی بەدکارو لەستەمدا ڕۆچوو سوورن لەسەر دڵشکاندنی خەڵکی‌و چاندنی (هەست کردن بەتاڵی و بێبەش بوون) لە دەروونیاندا، بۆ ئەمەش خۆیان بەسەریاندا بادەدەن‌و، فیزیان بەسەردا دەکەن‌و بە هەموو زینەتێکیانەوە خۆیان پیشان دەدەن‌و، بەدکاری‌و بەدڕەوشتی خۆیان بەسەریاندا بڵاودەکەنەوە.

٢٠- خواستنی ژیانی دنیاو ئارەزوو لە زۆرکردنی کەرەسەکانی جوانکاری‌و ڕازاندنەوە، مرۆڤ دەخاتە چەند هەڵەیەکی دزێوەوە لە مەسەلەی تێڕوانین‌و حەزو حوکم دان‌و پێوانەو مەزەندەکاریدا، هەروەها ڕازو نهێنیی بەزینی ئەو کەسانە لەبەردەم کەسانی دەوڵەمەندی دنیاپەرست‌و بەدکاردا، کە وەك بەندەو کۆیلە دوایان دەکەون‌و لەدەوری خوان‌و سفرەو مێزەکانیان زمان دەدروێنن.

٢١- زۆرن ئەوکەسانەی واگومان دەبەن، کە (مرۆڤی بەختەوەرو خاوەن شانسی گەورەو فرە) ئەوکەسەیە، کەوا خاوەنی چەندین ئامرازو کەل‌وپەلی ناو ماڵەو، کەرەسەی جوانکاری‌و خۆشی ژیانی دنیای هەیەو، هیوا دەخوازن وەك ئەوبن.

٢٢- مرۆڤی بەختەوەرو خاوەن بەختی زۆر ئەو کەسەیە، کە نیعمەتی ئیمان‌و دڵنیایی‌و قایل بوون‌و متمانەی دەستکەوتووەو ڕزگار بووەو بەهەشتی نەمریی بردۆتەوە.

٢٣- ئەگەر خواستنی ژیانی دنیـا رازو نهێنیـی کـەوتنو سەرشـۆڕییو حەسـرەت بێت، بەڵام بەدەست هێنانی زانستو ژیانی باوەڕداری بەنیعمـەتی دنیـا، رازی سەکەوتنە بەسەر مەینەتیـداو، خۆڕاگرتنـە لەبـەردەم فیتنـەو گرفتـاریی داو، سەرفرازایی گەورەشە.

٢٤- پێویستە سەرنج بەلای پاداشتی خـوادا ببرێـتو دڵـیش بـەخوداوە پەیوەسـت بێت، هەرئەمەش چاكترە بۆ كەسێك كەباوەڕی بەخودا هێنابێت وكـاری چـاكی كردبێت.. بەراستی جیاوازییەكی دورو درێژ لەنێوان (كەسـێكی دنیـا خـواز)و (كەسێكی خواز یاری پاداشتی هەمیشەیی خوادا) هەیە.

٢٥- ئارامگرتنی جوانو گەورە كۆمـەكی هەمیـشەییو توێـشووی نەبڕاوەیـە لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی فـشاری فیتنـەو هێـزی فریـودانو، تونـدیی زۆرداریو بەخۆدانازین .. ئەم نەریتە بـەرزەی ئـارامگرتنیش تـەنها دەسـت ئـارامگران دەكەوێت.

٢٦- سـووڕانەوەی (قـارون) بـەنێو گەلەكەیـدا بـەو شـێوە خۆڕازاندنەوەیـەو، زیادەڕۆییشی لەگرفتاركردن وخەفەت پێ دانیانـدا هۆیـەكی ڕاسـتەوخۆی سـزا پێگەیشتنیو بەناخی زەویدا بردنی خۆیو مـاڵو موڵكەكـەی بـووە.. هـەموو دەوڵەمەندێكی بەدرەفتاریش ئاوا بوون. بەكردەوەو رەفتـاری ناشـیرینیان داوای پێشخستنی سزای خودایان كردووەو خودایان تووڕە كـردووە كەسـزای بەپەلـەو خێرایان بداتو لەنێویان بەرێت.

٢٧- (قارون) مایەی فیتنەو گرفتاریی گەلەكەی بوو، لەنێو گەلەكەشـیدا كەسـانی وا هەبوون پێی گرفتاربوون، كەسانی واش هەبوون، كە ورەیان بەرزو بـەئارامو لەسەرهەق جێگیر بوون، كاتێك فیتنەو تاقیكردنەوەكە تـەواو بـووو، (قـارون) ڕۆڵی خۆی نمایش كردو كاتی لەدنیا دەرچوونی هات، كەوتەبەر نەفرەتو سزای خوداو.. بەم رەنگە ژیاو ڕۆیشت.

٢٨- مرۆڤ لەدیاردەو رواڵەتەکانی ژیانی دنیا هەرچی یەکی لـەماڵو شـکۆو هێـزو دەسەڵاتی هەبێت، هیچیان لـەکاتی هـاتنی سـزای خـوادا سـوودی پێنـادەنو فریای ناکەونو لە سزای خودا رزگاری ناکەن داخـۆ زیـانی ئەوانـەی سـەرقاڵی دیاردەکانی دنیانو پشتی پێ دەبەستنو دەیکەنە ڕوانگە ئاواتەکانیانو رووگەی هیواکانیان چەند بێت!!.

٢٩- کاتێك خودا (قاروون)ی بەناخی زەویـدا بـردە خـوارێ، پـەردە لەسەرچـاوانی ساویلکەو تەفرە خواردوانی نەماو، یەکـسەر هەڵوێـستو ئاواتـەکانیان گـۆڕا، تادوێنێ هیواو خۆزگەیان پێ دەخواست، ئەمڕۆش سوپاسی خودا دەکـەن، کـە وەك ئەو نەبوون، ئیدی بەم رەنگـە، رازی لێـك جـودایی‌و شـپرزەیی وهەڵـەی ئەوانو —کەسانی وەك ئەوان تەنها ویستنی ژیانی دنیایە.

٣٠- هەردوو زانینەکەی ئەو دوو کۆمەڵـە کەسـەی هـۆزی (بـەنو ئیـسرائیل) زۆر لەیەك جودابوون، چەند جیاوازیشە زانینی باوەڕداران لەسەر ڕاسـتییەکان، کـە زانینێکی بنـچینەیی‌و ڕەگ داکوتـاوو دەرهاویـشتەی شـارەزایی‌و هۆشـیاری‌و زیرەکییە) لەگەڵ زانینی درەنگ‌و دواکەوتووی کەسانی ساویلکەو بێئاگا.

٣١- خودای گەورە خانەی ڕۆژی دوایی بۆ ئەو موسـڵمانە پـاك‌و سـاغ‌و سـاڵحانە دادەنێت، کە لووتبەرزی‌و ستەمکاری‌و فەسادییان لەسەر زەویدا ناوێت.

٣٢- سەرەنجامی چاك لە دنیاو لە رۆژی دواییشدا تەنها بـۆ کەسـانی پارێزکـارەو، نەخشەو پلانی خراپ‌و نامەردانەش لـە ئاکامـدا هـەر بـەزەرەرو لەناوچـوونی دارێژەرانی تەواو دەبێت.

٣٣- خودا بەرەحمەت‌و فەزڵ‌و بەخششی خۆی مامەڵە لەگەڵ چـاکەکاران دەکـات‌و پاداشتی چاکەکانیان بۆ زۆرو چـەندان هێنـدەی چـاکەکانیان دەکـات. لەگـەڵ خراپەکارانیش بە دادپەروەریی خۆی مامەڵە دەکات‌ولە ئەنجامی خراپەکانیانـدا سـزایان بەقـەد کـردەوە خراپـەکانیان دەدات. ئەمـەش رێـساو دەسـتووری هەمیشەیی خودایە.

## چیـرۆکی چوارەم

## چیرۆکی "وێـڵ بوونی -بەنو ئیسرائیل- له -سینا-دا"

ئەم چیرۆکە لە قورئاندا بەم جۆرەیە، کە خودا فەرموویە:-

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِى وَأَخِى ۖ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ۛ أَرْبَعِينَ سَنَةً ۛ يَتِيهُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ المائدة ﴾.

واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەو بەسەرهاتەیان بۆ باس بکە، کاتێك (موسا) بەگەلەکەی خۆی گوت: (ئەی گەلی خۆم ئەو بەخشش‌و نیعمەتە گەورەیەی خوداتان بەیاد بێننەو کە پێغەمبەرانی لەنێوتاندا ڕەوانەکردووەو، پادشای زۆریشی لەناوتانا

بەدیارخستووە، ئەوەی بەئێوەی بەخشیوە، پێشتر بەهیچ کەسێکی تری لەخەڵکی جیهانییان نەبەخشیوە، ئەی گەلی خۆم ئێوە بچنە نێو ئەو خاکە پیرۆزەوەی کە خودا بۆی بڕیاردراونو پاشەکشێی لێ مەکەن، چونکە گەر پاشەکشێی لێ بکەن زەرەرمەندو دۆڕاون)، بەڵام ئەوان گوتیان: (ئەی موسا بێگومان لەو خاکەدا خەڵکێکی ئازاو بەزەبری لێیەو، ئێمە هەرگیز ناڕۆینە ناوەوە تا ئەوانی لێ دەرنەچن، جا ئەگەر ئەوان لێی دەرچوون، ئێمەش دەچینە ناوی.

ئینجا دوو پیاو لەوانەی کە خودا نیعمەتی باوەڕو دڵنیایی پێ بەخشیبوون، گوتیان: (لەدەروازەی شارەکەوە بچنە سەریانو (یەك هێرشی گەورە ببەن)و هەر کە ئێوەش چوونە ژوورەوە ئێوە سەرکەوتوو دەبن، جا بۆ ئەم سەرکەوتنەش پشت بەخودا ببەستن ئەگەر ئێوە ئیمانداری ڕاستەقینەن).

دووبارە گەلەکەی موسا گوتیان: (ئەی موسا ئێمە هەرگیز ناچینە ئەو شارەوەو رووی تێ ناکەین، هەتا ئەو جەنگاوەرانەی تێدابێت، لەبەرئەوە تۆ بڕۆ خۆتو خودای پەروەردگارت جەنگ بکەنو، وا ئێمەش لێرەدا دانیشتووینو چاوەڕێی ئەنجامین)، موسا ڕووی کردە خوداو گوتی: (ئەی پەروەردگارم من تەنها دەسەڵاتی خۆمو براکەم (هارون) هەیە، کە ئامادەی بەجێهێنانی هەموو فەرمانێکتین، جا داواکارین کە ئێمە لەو خەڵکە تاوانبارو بەدکارە جیابکەیتەوە).

خوداش لەوەڵامیدا فەرمووی: (تا ماوەی چل ساڵ لەسەر ئەو گەلە چوونە نێو شارەکەو رزگارکردنی حەرامە، دەبێت وێڵو سەرگەردان بن لەزەویدا ﴿واتە لە بیابانی (سینا)دا ون بن﴾ ئیتر تۆش بۆ گەلی بەدکارو تاوانبار خەمبار مەبە).

ئەمە کورتترین واتای ئایەتەکانی تایبەت بەم چیرۆکە بوو، لەم بەشەی کتێبەکەشدا ئایەتەکان بەدرێژی لەڕێی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەوە شیدەکەینەوە.

## "کـورتەی چـیرۆکەکە"

خودا (بەنو ئیسرائیل)ی لە چنگی فیرعەون رزگارکردو بە سەرۆکایەتی (موسـا) ـ سلاوی لیّ بێت ـ گەیاندییە سینا، لە بیابانی (سینا)دا چەندین نیعمەتی گەورەی بەسەردا رژاندن، ئەوەبوو دوازدە کانیی لەبەردەکەوە بـۆ تەقاندنــەوەو سـێبەری بـە هەورەکان بۆ کردنو لەگەزۆو باڵندەی (قشقارە)ش خۆراکی بۆ دابین کردن.

دوای ئەم هەموو چاکەو بەخششو نیعمەتە زۆرانەی خـودا بـۆ (بەنوئیـسرائیل) (موسا) داوای لێکردن کە بچنە نێو خاکی پیرۆز (فەلەستین)ەوەو، هەواڵی ئەوەشـی پیّگەیاندن کە بێگومـان خودا ئەوان بەسەر دوژمنــە کافرەکـانی نێـو ئـەو خاکـەدا سەرخاتو ئەوانیش تەنها ئەوەیان لەسەر شانە کە لەپێناوی خودا بجەنگن.

بەڵام دیارە جوولەکەکان واتــە: گـەلی (بـەنو ئیـسرائیل) کـە لـە دێرزەمانـەوە خوویـان بــە ترســنۆکیو سەرشـۆڕییەوە گرتــووەو، هــەرگیز رێگـەی ئازایــەتیو مەردایەتییان نەزانیوە، فەرمانی (موسا)یـان رەت کـردەوەو جیّبـەجییان نـەکردو گوتیان: (بێگومان گـەلێکی ئـازاو بـەزەبر لـەو خاکـەدا هەیـەو ئێمـەش توانـای جەنگینی ئەوانمان نییە، لەبەر ئەوەتا خۆیان لێی دەرنەچن، ئێمە ناچـینە نـاوی).. لەو کاتەدا دوو پیاو لـەنێو ئـەو خەڵکـەدا هاتنـە دەرەوەو ئـەم دوو پیـاوە خـودا نیعمەتی ئازایــەتیو هێـزی پـیّ بەخـشیبوونو سـەریان لەهەڵوێـستی گەلەکـەیان سوورمابوو، بۆیە هەردووکیان رێگەی جەنگینو سەرکەوتنیان بۆ خەڵکەکـە کێـشاو پێیان گوتن: (ئێوە لەدەروازەی شارەوە بچنە ژوورەوەو خۆتـان یەکـەم جـار دەسـت بەهێرش بردن بکەن (سەرکەوتنیش بۆ ئەو لایەنەیە کە هێرشـی کـردووەو جـەنگی دەست پێکردووە)، جا ئەگەر ئێوە واتان کرد ئـەوا بێگومـان سـەردەکەون، پاشـان بێگومان خودا خۆی سەرکەوتنەکەی بۆ مسۆگەر کردوون، دە ئێوەش پشت بـەخودا

ببەستنو نزاو داوای سەرکەوتنی لیّ بکەن). لەو کاتەدا جوولەکەکان هەستیان بەوە کرد، کە ئەو دوو پیاوە دەمکوتیان کردونو بەبەڵگەوە ڕاستیان بۆ سەلماندوونو، هیچ پاساوێکیان بۆ نەهێشتوون، بەڵام شەرم نەیگرتنو شەرمەزار نەبوون، بەڵکو یاخی بوونی خۆیان دەربڕیو بە(موسا) یان گوت: (ئێمە هەتا ئەو گەلە بەزەبرەی تێدابێت ناچینە ناو شارەکەوە، ئیتر ئەی موسا تۆ بڕۆ خۆتو خوداکەت بجەنگنو ئێمەش وا لێرە دانیشتووین).

لەو کاتەدا (موسا) تەنها ئەوەندەی لەتوانادابوو کە بەدەم پاڕانەوەوە رووبکاتە خودای پەروەردگاریو بڵێت: (خودایە من تەنها دەسەڵاتم بەسەر خۆمو براکەمدا هەیە، لەبەر ئەوە منو براکەم لەو گەلە بەدڕەفتارە جیاکەرەوە).. سزای خودا بۆ ئەو نەوە ترسنۆکەی جوولەکە ئەوەبوو لە (شەڕەفو ڕێزی ئازایەتیو جیهادو خۆشیی سەرکەوتنو نیعمەتی چوونە نێو خاکی پیرۆزەوە) بێبەشی کردنو، بڕیاریدا بۆ ماوەی چل ساڵ لە بیابانی (سینا)دا ون بن. ئەوەش ماوەیەکی تەواوە تا ئەو نەوە سەرشۆڕ ڕێسواو ترسنۆکە دەمرنو لەجیاتی ئەوان نەوەیەکی نوێ پەیدا ببێتو لەسەر بارگرانیو نارەحەتیو چەلەنگیو ئارام گرتن گۆش کرابنو لە کەشو هەوای بیاباندا ژیابنو توانای جەنگینی کافرانیان هەبێتو، خوداش سەرکەوتنی بۆ نووسیبن.. بۆیە خودا لەوەڵامی نزای (موسا)دا دەربارەی ئەو نەوە ترسنۆكو نالەبارەی (بنو ئیسرائیل) فەرمووی: (ئەی (موسا) چوونە نێو ئەو شارە بۆ ئەوان حەرامەو دەبێت، هەتا چل ساڵ لەزەویی بیاباندا ون بنو بێنو بچن، تۆش بۆ گەلی تاوانکارو بەدڕەفتار خەمبار مەبە).

## "چەند وتەیەکی هەڵبەستراوی جوولەکەکان دەربارەی چیرۆکی وێڵ بوونەکە"

زانایانی تەفسیرو گێڕانەوەی بەسەرهات، چەندین گێڕانەوەو وتەیان لە دەقە هەڵبەستراوەکانی ناوبراو بە (ئیسرائیلیات) دەربارەی درێژەو شیکاری چیرۆکەکە هێناوەتەوەو، لەنێویاندا چەندین وتەی گێڕراوەی ناڕاستو خەیاڵیو ئەفسانە چێتی تێدایە.

لەو گێڕانەوەو ڕیوایەتانەش، دیاریکردنی ناوی ئەو شارەیە، کە موسا -سڵاوی لێ بێت- فەرمانی چوونە ناوییەوە پێکردنو گوایە شاری (ئەریحا)یە، کە دەکەوێتە لێژاییی ناوەڕاستی فەلەستینەوە، هەروەها دیاریکردنی بارستایی لاشەی هەریەکە لەو گەلە بەزەبرەی نێو شارەکە، کە جوولەکەکان گوتبوویان: (ان فيها قوماً جبارين) لەو ریوایەتەدا گوتویانە گوایە: (موسا ـ سڵاوی خودای لێ بێت ـ دوازدە کەسی لە (بەنو ئیسرائیل) ناردووە بۆ زانینی هەواڵی شارەکەو، ئەوانیش چوونەتە قەراغی شارەکەو پیاوێکیان دیوە، کە بەرەو ڕوویان هاتووەو زۆر بەسامو بەزەبر دیاربووە، ئەوانیش لێی ترساونو لەنێو گژو گیاو دەغڵو داندا خۆیان شاردۆتەوە.. ئەو پیاوە زلەش چۆتە نێو کێڵگەکەوەو جوولەکەکان دیویانە تیایداو، خۆیان لەبەردەمیدا لە کورتە باڵاکان بچووکتر دیوە، ئەویش دەستی کردوە بە گرتنیانو خستوونیەتە نێو قۆڵی کراسەکەیو بە پشتێنو پزووی شەڕواڵەکەیدا هەڵیواسیون.

ئینجا هەڵیگرتوونو گەیاندوونیەتە کۆشکی پادشاو هەموویانی لەبەردەستی پادشاو پیاوەکانیدا هەڵڕشتووەو، ئەوانیش سەریان لە بچووکیی جەستەو بارستاییان سووڕماوە، پادشا لەو کاتەدا لەو پیاوەی پرسیوە: (ئەمانە کێن؟) گوایە باوەڕیشی نەکردووە ئەمانە لە مرۆڤ بن.. کاتێك زانیویەتی ئەمانە لە جوولەکەکانن، ڕێزی لێناونو هێشوویەك تریێ پێداون، کە هەر دەنکێکیشی

پیاوێکی تێرکردووە. گوتووشیانە گوایە ئەو گەلە بەسامو هەیبەتە (عوج ی کوڕی عناق)یشیان لەگەڵدا بووە کە ناوبراو کەسێتییەکی ئەفسانەییی خەیاڵیی خۆرئاوایە، بە ئیدیعای ئەفسانە چییە درۆزنەکان لەگەڵ بێباوەڕەکانی گەلی (نوح)دا بووەو لەو لافاوە گەورەیەش رزگاری بووە کە لوتکەی چیا بەرزەکانیشی داپۆشیوە، بەڵام ئەو لافاوە سەرتاپاگیرەی هەموو شوێنە بەرزو نزمەکانی سەرزەمین نەگەشتۆتە هەردوو پاژنەی (عوجی کوڕی عناق)و گوایە بەهێمنیو سەلامەتییەوە، بەناوەڕاستی لافاوەکەدا رۆیشتووە، کاتێك برسیشی ببوایە بەئاسانی دەستی درێژ دەکرد تا دەگەشتە بنی دەریاو ماسیی لێ دەگرتو دەردەهێناو، ئینجا دەستی بۆ سەرەوە بەرەو رێڕەوی خۆر بەرز دەکردەوەو ماسییەکەی بەدەستی خۆی دەبرژاندو بەگەرما سوتێنەرەکەی ئەو خۆرە دەیکولاند. هەر لەم ڕووەوە ئیسرائیلییە ئەفسانە چییە درۆزنەکان گوتوویانە: (عوجی کوڕی عناق) بەزیندوویی تا سەردەمی (بەنوئیسرائیل) (ماوەتەوەو لە شاری (ئەریحا) شاری گەلە بەزەبرو بەهەیبەتەکان نیشتەجێ بووەو لەریزی ئەواندا لەدژی (موسا)جەنگیوە). هەروەها گوتوویانە: (درێژی (عوجی کوڕی عناق)سێ هەزارو سێ سەدو سیو سێ باڵو سێ یەکی باڵێکیش (٣٣٣٣ ١/٣) بووە. ئەو کاتەی (عوج) بەرەو ڕووی سوپاکەی موسا بۆتەوە تا (موسا) بکوژێت، لوتکەی چیایەکی گەورەی لەبن هێناوە تا بیڕووخێنێت بەسەر موساو ئەوانەی لەگەڵیدابوون، بەڵام باڵندەیەك هاتووەو ئەو چیا بەردینە گەورەیەی بەدەنووك کون کردووەو ئیتر چیاکە بووەتە کۆتو پێوەندێك لەملی (عوجی کوڕی عناق) ئالاوە، ئینجا موساش هەڵمەتی بردۆتە سەریو بازێکی بەدرێژایی دە باڵ داوەو (موسا) خۆیشی درێژییەکەی هەر دە باڵ بووەو گۆچانێکی بەدەستەوە بووە، کە درێژاییەکەی دە باڵ بووەو، گەیشتۆتە لای پاژنەی (عوج)و کوشتوویەتی. بەم ڕەنگەش (لافاوەکە) ئەم کابرایەی بۆ لەناو نەبراوە، بەڵام تەنها گوایە (بەنو ئیسرائیل) کوشتوویانە، هەروەها دەربارەی بارستایی ئەو کەسە بەزەبرو لاشە گەورانە گوتوویانە: (حەفتا پیاو لە هۆزی (بنو اسرائیل) لەژێر

سێبەری بنی پیاوێك لەپیاوە زلو لاشە گەورەکاندا وەستاون) هەروەها گوتووشیانە: (خۆیو بەچکەکانی لەنێوان دووچاوی پیاوێکی لاشە گەورەی بەهێزدا ڕاکشاون)[1].

## " ئیمام -ابن کثیر- ئەو دەقە هەڵبەستراوەی ئیسرائیلیانە ڕەت دەکاتەوە"

لەمبارەیەوە چەند پەرۆشی وتەی (امام ابن کثیر)م ـ خودا لێی خۆشبێت ـ لە حوکمدانیدا، لەسەر ئەو قسە پووچەڵو ئەفسانە ئیسرائلیانەو کە دەڵێت: (زۆر کەس لەوانەی بە تەفسیرو راڤەکارییەوە خەریك بوون چەندین وتەی بێگەردو بێ ناوەرۆکیان هێناوە کە عەقڵو نەقڵو (منطق)یش پەسەندیان ناکەن، وەك ئەو وتەیەی گوتوویانە گوایە خەڵکی ئەو ناوچەیە هێجگار زلو قەبەو ترسناك بوون). دوای ئەوەش لە کتێبی مێژووەکەیدا هەندێك لەو وتە ئیسرائیلیانەی هێناوەو گوتوویەتی: (ئەمە لە ـ نوف البکالی ـ یەوە دەیگێڕنەوەو، ـ ابن جریر ـ یش لە (ابن عباس)ەوە هێناویەتیو، بەلاّم سەرنجو تێبینی لەسەر ماناو خستنە پاڵ (اسناد)ەکەی هەیە، سەرەڕای ئەمەش ئەمانە هەمووی لەوتەی هەڵبەستراوی ئیسرائیلیاتنو، نەفامەکانی ـ بنو اسرائیل ـ دایاننـاون، چونکە بەسەرهاتی درۆ لەلای ئەوان زۆربووەو راستو ناراستیان لێك جیاناکرێتەوە، پاشان ئەگەر ئەوە راست بوایە ئەوا هۆزی (بنو اسرائیل) لێبوردراو (معذور) دەبوون لەو نکوولّی کردنەیان لەسەر جەنگو کوشتاری دانیشتوانی شارەکە. بەلاّم خودا لەسەر ئەو نکوولّی کردنە سەرزەنشتی کردوونو بەسزای ون بوونو وێڵبوونی بیابانەکەی گەیاندوون لەسەر ئەوەی کە جیهادەکەیان پشت گوێ خستووەو سەرپێچیشیان لە فەرمانی پێغەمبەرەکەیان کردووە)[2].

---

١) الدارالمنثور، للسیوطي، (٦: ٤٨-٤٩)، والبدایة والنهایة (١: ٢٧٧-٢٧٨).

٢) البدایة والنهایة، ١: ٢٧٨.

## "وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ "

-موسا- لەم ڕستەیەی ئایەتەکەدا هەندێك نیعمەتو بەخششی خودا بەبیر (بنو اسرائیل) دێنێتەوە، وەك خوداش لەسەر زاری ئەو فەرموویەتی: ﴿...يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾﴾ المائدة کاتێك سەرنج لەم ئایەتە دەدەین، دەبینین ئاماژە بۆ هەندێك نیعمەتی خودا بۆ سەر (بەنو ئیسرائیل) دەکات، وەك:-

١- لە ئێوە پێغەمبەرانی رەوانەکردووە ﴿إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ﴾ وجودی پێغەمبەران لەنێو ئەواندا دیاردەیەکە لەدیاردەکانی نیعمەتی خودا لەسەریان، چونکە پێغەمبەران رێنماییان دەکەن بۆ چاکەو، بەهەقو دادگەریی حوکمیان دەکەنو، بەرەو بەختیارییان دەبەن.

٢- لە ئێوە پادشایانی داناوە ﴿وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾، دیارە مانای ئەوە نییە، کە هەموویان بووبن بەپادشا، چونکە ناشێت هەر کەسێك لەوان پادشایەك بێتو ئەگەر هەریەکەیان پادشا بێت، پادشای کێ بێتو، ئەو گەلەش لەکوێیە، کە حوکمڕانییان بکات؟ بۆیە مانای ﴿وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾، واتە: (هەر لەنێو ئێوەدا تواناو شایستەیی بۆ بوونە پادشا هەیە ئەگەر بارودۆخی گونجاوتان بۆ هەڵکەوێت).

لەمبارەیەوە (امام راغبی اصفهانی) گوتوویەتی: (پادشایەتی (مەلیکایەتی)) دووجۆرە:

(أ) بوون بە پادشاو لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی، بۆ ئەم مانایەش خودا

فەرموویـــە: ﴿...إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرْيَةً... ﴿٣٤﴾ النمــل﴾. لێـــرەدا وشەی (ملوك) واتە: مەلیکەکان- پادشاکان..

(ب) مەلیکایەتی واتە هێز لەسـەر ئـەو کـارە، سـا ئـیتر کارەکـەی لەئەسـتۆ گرتبێت یان نا، وەك خـودا فەرموویـە: ﴿إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾.. لێرەدا پێغەمبەرێتیی بەتایبەتی بۆ چەند کەسـێکی کـەم دانـاوە، بەڵام پادشایەتیی بەگشتی داناوە، کەواتـە مانـای پادشـایەتی لێـرەدا ئـەو هێزەیە کە بۆ سیاسەت سازو پاڵێوراو دەکات، بـەڵام نـەك هـەموویان ئـەو کارە بگرنـە دەسـت، چـونکە ئەمـە پێـچەوانەی راسـتیو حیکمەتـە، وەك گوتراویشە (خێر لەزۆریی سەرۆکاندا نیە)[1].

٣- ﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾... کاتێـك ئـەم نیعمەتـەی تـریش ئەوەیە کە خودا لەسەردەمی موسادا- سـڵاوی لـێ بێـت - چـەندین بەخشـشی گەورەی دابوو بە (بنو اسرائیل)، کە بـەهیچ کەسـێکی دیکـەی لـە خـەڵکانی جیهان نەدابوو، ئەوەبوو سەرکەوتنو دەسەڵاتی پێدان، لەفیرعـەونو سـوپاکەی رزگاری کـردن، دوژمنــە بـێ باوەڕەکانیـانی تـەفروتوونا کـرد. بێگومـان ئـەم نیعمەتانە تەنها لە سەردەمێکی دیاریکراوو بۆ چەند گەلو هۆزێکی دیـاریکراو بوونو، گشتی نییە بۆ هـەموو گـەلو تایەفەیـەکی جوولەکـە لەگـشت کـاتو جێیەکـدا وەك ئـەوەی، کـە ئـەمڕۆ جوولەکـەکان پروپاگەنـدەی پـێ دەکـەنو دەشیانەوێت بەوە قەناعەت بەکەسانی تریش بکەن، بۆ نموونە دەڵێن: (بێگومان خودا بەخششو نیعمەتی وەهای بەئێمە داوە، کـە بـەهیچ کەسـێکی تـری لـە خەڵکی جیهانییان نـەداوە، ئەمـەش لـە قورئانـدا کـە کتـێبی موسـڵمانەکانە

---

(١) المفردات في غريب القرآن — ص٤٧٢.

باسکراوە، نەك هەر لە کتێبی خۆماندا کە -تەوراتە- ئەو بەخششانەی خودا بۆ ئێمە بەو پێودانگەمانە کە جوولەکەین، ئەمەش تا رۆژی قیامەت بەردەوامە).. لەوانەیە چەند کەسێك بەم پروپاگەندە ئیسرائیلیانە تەفرە بدرێت.

بێگومان مانای ﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ نزیکە لە مانای ئەم فریشتەی‌تری خودا ﴿...وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ البقرة﴾. لەم فەرمایشتەدا کە خوا پییان دەفەرموێت : (من لە خەڵکانی تری جیهانم بەچاکتر داناون) مەبەست لەو خەڵکانەی تر خەڵکە بێ باوەڕەکانی وەك فیرعەونو سەربازانو دەستو پێوەندەکەیەتیو، وەك ئەو بێ باوەڕانەش کە لەخاکی پیرۆزدا نیشتەجێ ببوون.. بێگومان خوداش کە (بنو اسرائیل)ی لەو خەڵکە بێباوەڕە بەباشتر داناوە، لەبەر رەگەزو رەچەڵەکیان نیە، بەڵکو لەبەر بیروباوەڕو ئیمانەکەیانە. ئەوێ رۆژێ تەنها ئەو جوولەکانەی (بنو اسرائیل) لەنێو هەموو گەلو هۆزە کافرەکاندا باوەڕداربوون، شتێکی سروشتییشە کە خودا باوەڕداران لەکافران بەچاکتر دابنێتو بەخششو مژدەیەکی وەهایان پێ بدات کە بەهیچ کەسێکی لەکافران نەدابێت.

بەڵام دوای ئەو سەردەمە خودا ئەو رێزەی لەسەر جوولەکە لابرد، واتە دوای ئەوەی کافر بوونو ستەمو دەسدرێژییان کردو خراپەیان لەزەویدا بڵاوکردەوە.. ئینجا خودا دوایین پێغەمبەری خۆی (محمد) ﷺ ناردووەو- ئیسلامیشی کردووە بە ئایینی هەموو خەڵکی دنیاو موسڵمانان باشترین نەتەوە بوون کە نێرراون بۆ لای خەڵکیو نەتەوەکانی دیو گەیاندنی پەیامی خودا.

# "ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ"

خاکی پیرۆز (الارض المقدسة) ـ فەلەستینە ـ و ئەو خاکە بەپیتو پڕ بەرەکەت کراوەشە، کە خودا لەبارەیەوە لە یەکەم ئایەتی سوورەتی (اسراء )یشدا فەرموویەتی: ﴿سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَـٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ ﴿١﴾ الإسراء﴾.. واتە: (پاکیو بێگەردیو ستایش بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕۆیی بەبەندەی خۆی ـ محمدەوە ﷺ کرد لەمزگەوتی حورمەت لێ گیراو (کە کەعبەی پیرۆزە) بۆ مزگەوتی (اقصی) لە ـ بیت المقدس ـ کە دەوروبەریمان پیرۆزو پڕ بەرەکەت کردووە). هەروەها خودا دەبارەی ئەم خاکە پیرۆزە لە باسی بەسەرهاتی (ئیبراهیم)یشدا ـ درووودی خودای لێ بێت- فەرموویەتی: ﴿ وَنَجَّيْنَـٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَـٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ الأنبياء﴾ .. واتە: (ئێمە ـ ئیبراهیم ـو ـ لوط ـ مان رزگارکردو ناردمانن بۆ ئەو خاکەی کە پیتو بەرەکەتمان بۆ هەموو خەڵکی سەردەمەکان تێدا ڕشتووە).

لەم ئایەتانەی تایبەت بە چیرۆکەکەشدا (موسا) ڕووی گوتاری کردۆتە گەلەکەیو پێی گوتوون: ﴿ يَـٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَـٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ المائدة﴾.. ئەو تەفسیرەی، کە پێشتر بۆ ڕستەی ﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ خستمانە ڕوو هەمان تەفسیرو شیکارمان بۆ ئەو خاکە پیرۆزەش هەیە کە خودا بۆی نووسیبوونو بڕیاری بۆ دابوون، کە بچنە ناوی. بێگومان هەمیشە جوولەکەکان وای دادەنێن، کە مافی تەواوی خۆیان لەخاکی پیرۆز، واتە لە (فەلەستین)دا هەیە، ئەمەش بە مافێکی

بەردەوام تا هاتنی قیامەت دەزانن، وایشی دادەنێن گوایە کاتێك داوای ئەم خاکە دەکەن واتە داوای ئەو مافەیان دەکەن کە خودا بڕیاری بۆیان داوە، هەروەها کاتێك بۆیشی دەگەڕێنەوە، واتە بۆ ئەو خاکە دەگەڕێنەوە، کە خودا بۆی نووسیون، ئیتر گەڕانەوەشیان لەم سەردەمەدا بۆ فەلەستینو داگیرکردنیو دامەزراندنی دەوڵەتێك بۆ خۆیان تێیداو، دەرکردنی دانیشتوانە موسڵمانەکەیو، هەموو ئەمانە (بەڕای خۆیان) بە دوژمنکارییو ستەمو نارەوایی دانانرێت. بەڵکو بەدیهێنانی ئەو بەڵێنەی خودایە، کە لە زووەوە پێیداون. ئەوان دەیانەوێت قەناعەت بەگەلو نەتەوەکانی تری دنیا بەم پروپاگەندانە بکەن، ئەم ئایەتەش دەکەنە بەڵگەو دەڵێن قورئان دانی پێداناوەو ئەوا ئێمەش دەگەڕێینەوە ناوی، ئیدی بۆچی عەرەبو موسڵمانانو گەلانی دی ناهێڵن بگەڕێینەوە بۆ ئەو خاکەی، کە قورئان بڕیاری بۆ داوین؟ دیارە چەند کەسێکیش باوەڕ بەم پڕو پاگەندەیەی جوولەکە دەکەنو، چەند کەسێکیش بەم شێواندنەی قورئانو بەم هەڵە لێکدانەوەیە هەڵدەخەڵەتێن.

بەڵێ ڕاستە، کە فەڵەستین خاکێکی بەرەکەت پێدراوو پیرۆزە، بەڵێ ڕاستیشە کە خودا بۆ (بنو اسرائیل)ی نووسیبووو بڕیار درابوو، کە بچنە ناویەوە.

بەڵام کێن ئەو (بنو اسرائیل)ەی، کە خودا بڕیاری چوونە نێو خاکی پیرۆزەوەی بۆ دابوون؟ ئایا ئەم نووسینو بڕیارەی خودا هەمیشەییو بەردەوامە؟ ئایا بۆ هەموو جوولەکەیەکە، تا ڕۆژی قیامەت؟

ئەوانەی خودا بڕیاری چوونە نێو خاکی پیرۆزی بۆ دابوون، ئەو ڕۆڵانەی (بنو اسرائیل) بوون، کە باوەڕیان بە موسا - هێنابووو لەگەڵیدا- بۆ میسر- دەرچوو بوون، هەروەها ئەو ڕۆڵانەی تری (بنو اسرائیل)ن، کە ئیماندار بوونو دوای موسا هاتنو، شوێنکەوتووی پێغەمبەرانی تریان بوونو باوەڕیان پێیان هێنابوو، وەك (داود)و (سلێمان) - دروودیان لەسەر بێت-، خودا بۆ ئەو باوەڕدارانەی ئەوسای (بنو اسرائیل)ی نووسیوە، کە بچنە خاکی پیرۆزەوە، نەك لەبەر ڕەگەزیان، یان

ڕەنگو ڕوویان، یان ڕەچەڵەكو بنەماڵەیان، بەڵکو تەنها لەبەر دینداریو ئیمانو بیروباوەڕەکەیان، ئەمانە لەو سەردەمەدا لەنێو چەندان گەلی کافری میسرو خاکی پیرۆزدا تەنها خۆیان ئیماندار بوون، شتێکی ئاشکراو زانراویشە، کە خودا، باوەڕدار بەسەر کافردا گەورەو بەرێز دەکات.. هەر بۆیەش خاکی پیرۆزی دانا بۆ ئیماندارەکانی (بنو اسرائیل)و بەهۆی باوەڕەکەیانەوە بڕیاری سەرخستنو چوونە ژوورەوەی بۆ دان.

بەڵام دوای ئەمە جوولەکەکان گۆڕانو پێغەمبەری خودا (محمد)یان ﷺ بەدرۆ خستەوەو، باوەڕیان بەو ئاینە نەهێنا، کە پێی ڕەوانەکرا، بەم ڕەنگەش بەکافرو ستەمکارو دەستدرێژکار دانرانو، هیچ مافێکیان لەخاکی پیرۆزدا نەما، چونکە خودا ئەو مافەی لێ سەندنەوەو دای بە بەندە چاكو باوەڕدارەکانی. ئەمەش هاوڕێکی ئەو دەستوورە نەگۆڕەی خودایە، کە زەویو میراتگیریی زەوی دەدات بە بەندە چاکەکانی.. لەمبارەیەوە چەندین ئایەتی ڕۆشن، جەخت لەسەر ئەم دەستوورەی خودا دەکەنو، ئەو حەقیقەتەش ڕوون دەکەنەوە، وەك ئەم ئایەتانە:-

خودا فەرموویە: ﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ١٢٤﴾ البقرة..

واتە: (ئەی پێغەمبەر ئەوە بەیاد بێنەوە، کە خودای پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی بەچەند فەرمانێکی دیاریکراو تاقیکردەوە، ئەویش بەچاکی جێبەجێی کردن، خوداش پێی فەرموو: (من بڕیارم داوە بتکەم بە پێشەوای خەڵکی).. ئیبراهیم گوتی: (حەز دەکەم نەوەکانیشم ئەم کارەیان پێ بسپێررێت).. خودا لەوەڵامدا فەرمووی: پەیامو پەیمانی من بەزاڵمو ستەمکاران نادرێت).

هەروەها خودا فەرموویە: ﴿وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ

ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّـٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ الأنبياء﴾.. واتە: (ئێمـــە لە کتێبی -زەبوور- دا کە بۆ (داود)مان لەدوای زیکر (تەورات) ناردووە بڕیارمــان داوە، کـە خاوەنی زەوی لەدنیادا تەنها بەندە چاکەکانم دەبن).

هەروەها خودا فەرمووویە: ﴿وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبۡعَثَنَّ عَلَيۡهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَـٰمَةِ مَن يَسُومُهُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلۡعِقَابِۖ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٦٧﴾ وَقَطَّعۡنَـٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُمَمٗاۖ ...﴾(الاعـراف: ١٦٧-١٦٨).. واتــە: (ئــەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بەیادبێنەوە کە پەروەردگارت بڕیــاری داوە نــەهێڵێت تـا ڕۆژی قیامەت کافرانو ستەمکارانی یەهوود بحەسێنەوەو دەبێــت هەمیــشە کەسـانێکیان تــوش کــات کــە ئـازوارو ئەشــکەنجەی ســەختیان بـدەن، بەڕاســتی پــەروەردگارت بەخێرایی تۆڵە لەستەمکاران دەسێنێت، هەروەها لەهــەمان کاتــدا زۆر لێبــوردووو میهرەبانیشە بــۆ تەوبــەکارانو پاشــگەزبوونی ئیمانــدار. ئێمــە لــەئاکام دانــەوەی ئیسرائیل (بنو اسرائیل)مــان کــرد بــە چــەند بەشــێکەوە لەســەر زەویو بەزەویــدا پەرتەوازەمان کردن).

کەوابوو خودا خاکە پیرۆزەکەی بۆ نــەوەی هــەرە پێــشووی (بنــو اســرائیل) کــە ئیماندار بوون، نووسیوە، ئەم نووسینو بڕیار بۆدانەش هاوتاو هــاوڕێکی دەســتووری خودایــە لــە بــەرزتر دانــانی ئیمانــداران بەســەر کافرانــدا، هــەر بــەگوێرەی ئــەم دەستوورەش خودا خاکە پیرۆزەکەی لە نەوەکانی دواتری جوولەکە سەندۆتەوە.

# " فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ"

كاتێك موسا - سلاوی خودای لێبێت- داوای لـه (بنـو اسـرائیل) كـرد بـچنه خاكی پیرۆزەوەو سەركەوتنیشی لەلایەن خـوداوه بەسـەر دوژمنانـدا بـۆ مـسۆگەر كردبوون، ئەوان لەجەنگ ترسانو، كاری چوونه ناوەوەیـان رەت كـردەوه، داواكـەی موساشیان بەو پاساوه ڕەت كردەوه گوایـه توانـای چـوونه نێـو خاكەكـەیان نییـه چونكه گەلێكی بەسامو بەزەبری تێدایـەو ئـەمان وزەو توانـای بەرەنگاربوونـەوەی ئەوانیان نیه: ﴿ قَالُواْ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ ﴾.

هەندێك لەراڤـەكاران (مفـسرين) زۆر دوور كەوتوونـەوه لـەو راسـتییه كاتێـك شێوەو روخساری ئەو گەله بەزەبرەیان لەخەیاڵی خۆیاندا كێـشاوه، بـەم هۆیەشـەوه لەبۆتەی شیاو (معقول) دەرچوونو پەنایان بردۆته بەر مەسەله خـەیاڵیو پووچـەڵو ئەفسانەكانی خۆرئاواو، بـەڕای خۆیـان وای دادەنـێن گوایـه دانیـشتوانی شـارەكه خاوەنی لاشەی گەورەو نامۆبوون (وەك پێشتریش لـەكاتی لێـدوانمان لەسـەر دەقـه هەڵبەستراوه ئیسرائیلییەكانی ئەم چیرۆكه نموونەمان لیٚ دیاری كرد).

ئێمه وای دەبینین كه ئـەو ئەفـسانەچییانه سەرپێـچیان لـه بەرنامـەی راسـتو توێژینەوەی ماقووڵ كردووەو، لەسنووری سرووشتی قورئان تێپەڕیونو گەیشتوونەته دروست كردنی شتی پووچەڵو بیٚ نێـوەرۆك.. جـا خۆزگـه خۆیـان بـەوەوه خـەریك نەدەكردو لەچوارچێوەی دەقه ساغەكانی قورئاندا بمانایه.

لـه ڕسـتەی ﴿إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ ﴾دا وشـەی ﴿جَبَّارِينَ ﴾ مانـای (زەبركـاریو زۆركاری (تجبر وجبروت) لەرێی گەورەیی لاشەو مەزنیی ڕوخسار)ەوه ناگەیـەنێت، بۆ نموونه دەبینین كەسێكی بەزەبری دەسەڵاتدارو لەسـتەم دارۆچـوو هەیـەو، بـەڵام

لاشەی بچووکەو بارستاییی کەمەو جەستەی لاوازەو باڵاشی کورتە. لەوانەشە مرۆڤی قەبەو زلو درێژو قەڵەویش هەبێت بێ هێزو بێ دەسەڵات بێت.

لەوانەیە گەلە بەزەبرو هەیبەتەکەی نێو خاکی پیرۆز باڵا بەرزو درێژ بووبن، لەوانەشە کورتە باڵا بووبن، لەوانەشە قەبەو زلو قەڵەو بووبن، یان لەوانەشە بێ هێزو لەڕو لاواز بووبن، جا ئیتر ئەگەر باڵاو جەستەیان بەهەر شکڵو شێوەیەك بووبێت، گرنگ ئەوەیە بەزەبرو بەسامو هەیبەت بووبن پاشان ئەگەر وەك گەلێکی باڵادەست و بەزوبرو زەنگیش دیاربووبن ئەوە بێگومان لەدیدوتێڕوانینی جوولەکەکان دا بووەو ئەوان هێزو توانایان هەڵسەنگاندووون.. بەڵام کێ دەزانێت؟ تۆ بڵێی جوولەکەکان لەو هەڵسەنگاندنەیان دا ڕاستگۆبووبن؟ ئەی تۆ بڵێی ئەوە باری ڕاستەقینەی گەلەکەی نێو شارەکە بووبێت؟ ئەی ئایا ناشێت جوولەکەکان لەو بۆچوونو هەڵسەنگاندنانەیاندا زیادەڕۆییان کردبێتو، وێنەی لایەنی دوژمنیان بەقەبەو گەورە هاتبێتە پێش چاو؟ تا بەم ڕەنگەش پاساو بۆ نەتوانینیان لەبەرەنگاربوونەوەدا دەرخەن.. ئەی ئایا ناشێت پاڵنەری گوتنی ئەو ڕستەیەیان ترسو لەرزو ترسنۆکییان بێت؟ هەر ئەم ترسەش وێنەی دوژمنیانی بۆ گەورەو زل کردوونو لەلایان وا دەرکەوتووە کە گەورەترن لەوەی هەن.

بێگومان خەیاڵی مرۆڤی ترسنۆكو بێ دەسەڵات شتەکانی لەلا گەورە دەکات تاکو ترسو لەرزەکەی زیاتر بێت. شاعیری عەرەب (المتنبي) لەوێناکردنی ترس لەرزی مرۆڤی ترسنۆکی هەڵاتوودا گوتوویەتی:-

**وضـاقت الأرض حتى كـان هاربهـم**
**اذا رأى غير شـيء ظنـه رجـلاً**

واتە: (زەوی لەلایان هێندە تەسك دەبێتەوە تا دەگاتە ئەوەی ڕاکردووەکەیان ئەگەر شتێکی تریش بەدی بکات، وادەزانێت پیاوێکە).

## "لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا "

وەك لەئایەتەکەدا هاتووە، کە خودا فەرموویە:

﴿ قَالُوا يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ المائدة﴾..

هەر ترسنۆکیی جوولەکەکان خۆیان، وێنەی دوژمنانی لەبەرچاو زل کردن.. هەر ئەم ترسنۆکییەشیان رێی جەنگینو ڕووبەڕووبوونەوەی لێ گرتن.. هەر ئەم ترسنۆکییەش رێی چوونە نێو خاکی پیرۆزی لێ گرتن.. هەر ئەم ترسنۆکییە وای لێکردن لەو بڕوایەدابن کەوا مرۆڤە بەزەبرو زلەکان لەوانەیە لە خاکە پیرۆزەکە دەرچن بێ ئەوەی جەنگیان لەدژ بگێڕن.. هەر بۆیەش لێی دانیشتنو پاڵیان لێ دایەوەو چاوەڕوانیی دەرچوونی ئەو گەلەیان دەکرد کە بەشکم لەخۆیانەوە دەرچنو تا ئەمانیش بەئاسانی بچنە ناوی، ئەوەبوو گوتیان ﴿...لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴾.. (ئێمە هەرگیز ناچینە ناو شارەکەوە تاکو ئەوان لێی دەردەچن، خۆ ئەگەر لێی دەرچوون ئەوا ئێمە دەچینە ناوی).. لەم ئایەتەدا رستەی ﴿لَن نَّدْخُلَهَا ﴾=" هەرگیز ناچینە ناوی" مانای نکوولی کردنێکی هەمیشەیی (النفی التأبیدی) دەگەیەنێت، کە بەئامرازی هەمیشەیی (لن = هەرگیز)ەوە ئاماژە دەکات. بەمانای ئێمە هەرگیز خۆمان ناچینە ناوی، ئێمە هەرگیز لەدژی گەلێکی بەزەبرو گەورە شەڕ ناکەین، هەرگیز جەنگیان لەدژ ناگێڕین.

﴿وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا مِنْهَا ﴾... واتە: (هەر دەمێنینەوەو چاوەڕوانیی دەرچونیان دەکەین، جا ئەگەر لێی دەرچوون، دەچینە ناوی).

لێرەدا من (نووسەری کتێبەکە) داوا دەکەم سەرنجی ورد لـە فـەرمانی دووبـارە بوونەوەی رانەبردوو (الفعل المضارع المكرر) بدرێت، لەو وتەیەیانـدا کـە گوتوویانـە ﴿...حَتَّىٰ يَخْرُجُواْ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُواْ مِنْهَا ...﴾ .. ئەمـەش فـەرمانی زانـراو (مبنی لمعلوم)ەو بکەر (فاعل)ەکەشی، پیتی (واو-و)ی کۆمەڵ (جەماعە)یـەو بـۆ گەلە بەزەبرو هەیبەتەکە دەگەڕێتەوە.

بیناکردنی فەرمانی رانەبردووش بۆ زانراو چـەندین ئامـاژەی بـەهاداری هەیـە، وەك ئەوەی کە: گەلە بەزەبرو دەسەڵاتەکە خۆیان لـەخاکی پـیرۆز دەربـچن، خۆیـان بەجەستەو گیانی خۆیانو بە خواستو ئیرادەی خۆیان دەرچنو، هیچ کەسێك بـەزۆر ناچـاری دەرچـوونیان نـەکات. ئـا ئەمەیـە روانـینی جوولەکـە ترسـنۆکەکان بـۆ باڵادەستیو سەرکەوتن.. بێگومان خودا خۆی بەڵێنی رزگـارکردنی خـاکی پـیرۆزی پێدابوون، بەڵام ئەوان بەبێ شەڕو کوشتار خوازیاری بوون. ئەوان چاوەڕوان بوون کە دانیشتوانەکەی لێی دەرچێت تاکو خۆیان بچنە جێگەیان.

ئەمەش روانینی گشت کەسێکی تەمەڵو ترسنۆكو سەرشـۆڕە.. بـەم رەنگـەش جەنگ لەدژی گەلانی تر ناگێڕێـت، هـەر بـەم رەنگـەش وڵاتـان رزگـار نـاکرێن. هەرگیز بەخەیاڵمان دا نەهاتووە، کە گـەلێکی سـەرکەوتوو بەخواسـتو ئـارەزووی خۆیان دەست لە سەرکەوتنەکەیان هـەڵگرنو ئـەو خاکـەی کـە بەخواسـتی خۆیـان گرتوویانە لێی دەرچنو بکشێنەوە.

بێگومان جوولەکەکان خاکێکیان بەبێ کوشتار دەویستو چاوەڕوانی ئەوە بـوون دانیشتوانەکەی لێی دەرچن تا ئەوسا بچنە ناویەوە.

ئەوەی جێی داخو کەسەریـشە، ئەوەیـە ئـەمڕۆ هـەمان روانـینی ترسـنۆکانەو سەرشۆڕانەی جوولەکە ئاسا، یەخەی بەهەندێك گەلانی عەرەبو موسڵمان گرتووەو هەمان روانینی ئەو جوولەکانەی زەمانی (بنو اسرائیل)یان بۆ دروسـت بـووە، بـەم

هۆیەشەوە جوولەکەکانی ئەمڕۆ توانیویانە فەلەستینو چەند پارچە زەوییەکی تری عەرەب داگیرکەن، عەرەبەکانیش لەکاری بەرەنگاربوونەوەی جوولەکەو رزگارکردنی خاکی پیرۆزیان دا ترسنۆكو لاواز دەرچوون.

ئەم ترسنۆکیو لاوازییەشیان خستوونیە مەسەلەیەکی خەیاڵیی وەها، کە مەگەر هەر واهیمەچییانو خەون دیتوانو خەیاڵ پڵاوان بەدیی بکەن.. ئەوان (واتە عەرەبەکان) چاوەڕوانی ئەوە دەکەن، کە جوولەکەکان خۆیان لەو خاکە داگیرکراوانە دەرچن، بەتایبەتیش لەو خاکەی لەدوای سالّی (١٩٦٧ زایینی ی مەسیحییەوە) گرتیانو، عەرەبەکانیش لە چاوەڕوانیی ئەوەدان، کەوا جوولەکە رێزیان لێ بنێنو بۆیان چۆڵ کەنو بەخواستو ئیرادەی خۆیان لێی بکشێنەوەو بیدەنەوە بەعەرەبە ستەم لێکراوەکان.. زمانی حالّی عەرەبە لاوازەکانیش دەڵێت: ﴿وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴾.

## "ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ " و .. جەنگی هێرش بردن

کاتێك جوولەکە ترسنۆکەکانی (بنو اسرائیل) فەرمانی (چوونە نێو خاکی پیرۆزیان بەجیهاد) رەت کردەوەو دانیشتن لەچاوەڕوانیی دەرچوونی دانیشتوانەکەیدا بەخواستی خۆیان، لەو کاتەدا دوو پیاوی ئازا لەنێویاندا هەستانو رێگەی جەنگو سەرکەوتنیان بۆ روون کردنەوە:

﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ المائدة

وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە دوو پیاو لەنێو ئەو کۆمەڵە ترساوو ترسنۆکەدا هاتنە دەرەوە ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ﴾. واتە: دوو پیاو لەنێو ئەوانەی، کە دەترسانو لەوانەش بوون، کە خودا نیعمەتی ئازایەتیو بوێریو خۆڕاگریی پێ دابوون کۆنترۆڵی ترسو لەرزیان کردبووو بەسەر ترسنۆکیو لاوازیدا سەرکەوتبوون، قسەیان کرد بۆ گەلەکەیان.

بەڕاستی مرۆڤ سەری دەسوڕمێت لەو کۆمەڵە سەر شۆڕو ترسنۆکەی، کە تەنها دوو پیاویان تێدا هەڵکەوتووەو خاوەنی ئازایەتیو هێز بوون.. ئەی داخۆ ئەم جۆرە کۆمەڵە ترسنۆکە کێ بن؟ بێگومان کۆمەڵێکی (بنو اسرائیل)ن، کە خودا لە دەست (فیرعەون) ڕزگاری کردنو گەیاندنییە قەراغی خاکە پیرۆزەکەو، لەگەڵ ئەوەشدا ترسو دڵەڕاوکێ باڵی بەسەردا کێشابوونو دڵو دەروونی هەڵتەکاندبوون.

(قال رجلان) خودا بە (پیاو) وەسفی کردوون لەم جێیەدا ئەمەش حیکمەتێکی درەوشاوەی هەیە، چونکە ئەوان دوو پیاوی نێو کۆمەڵێکن، کە هیچ پیاوەتییەکیان تیادا نەماوە. هەروەها جیاوازییشی کردووە لەنێوان ئەو (سیفەتی نێرینە

(ذکورة)یەی کە پێچەوانەی مێینەییە)و ئەو (سیفەتی پیاوەتییەش، کە مانای هێزو ئازایەتیو سەربەزری دەگەیەنێت)، چونکە هەموو پیاوێك نێرە، بەڵام هەموو نێرێك پیاو نییە.. خوداش راستی فەرمووە کاتێك باوەڕدارانی بەو پیاوانە لەقەڵەداوە کە لەگەڵ پەیمانی خۆیاندا راستگۆبوون ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ ... ﴿٢٣﴾ الأحزاب﴾ ... ئەی داخۆ ئەم دوو پیاوە چییان بەترسنۆکە ترساوەکان گوتبێت؟ پێیان گوتوون: (لە دەروازەی شارەوە بچنە سەریان (ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ ) بەمانای ئێوە دەست بەهەڵمەت بردن بکەن). جا کاتێك لەم وتە راستپێکە ورد دەبینەوە، دەبینین چەندین ئاماژەو رێنمایی گرنگی لە بابەت جیهادو جەنگو سەرکەوتنەوە لەخۆگرتووە، وەك:

١- ئاماژە بۆ تیۆرێکی گرنگی جیهادی دەکات، کە تیۆری جەنگی هێرش بردنە (نظرية الحرب الهجومية)، کە پسپۆرانی بواری سەربازی دانیان پێداناوە لەسەر ئەوەی، کە ئەمە رێگەی سەرکەوتنە. هەرکەسێکیش خوازیاری بردنەوەی جەنگ بێت، ئەوە پێویستە لەسەری، کە خۆی دەست بە هێرشبردن بکاتو هەڵکوتێتە سەر دوژمنەکەی لەخاکی ئەو دوژمنەیداو بچێتە نێو خانەو لانەیەوە، ئەمەش هەمووی مانای ئەو رستەیە (ادخلوا علیم الباب) دەگەیەنێت.

ئەوەی پاڵپشتی راستبێژیی ئەم تیۆرە قورئانییە جیهادییە هێرشکارییەیە، فەرمایشتێکی دیکەی خودایە، کە دەفەرموێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ التوبة﴾

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، دژی کافرە نزیکەکانی دەوروبەرتان بجەنگن، با لەو جەنگینەتاندا توندوتیژیو سامو بەهێزییتان لێ بەدی بکەن).

هەروەها ئەم فەرمایشتەی تری خوداش پاڵپشتی تیۆرە جیهادییەکەی قورئانە، کە دەربارەی جەنگی هێرشبردن فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ النساء﴾... واتە: (لەکاری سۆراخ کردنی دوژمنو هەڵکوتانە سەریان، هیچ سستیو لاوازییەك مەنوێنن، خۆ ئەگەر ئێوە ئێش و ئازاری ماندوێتیو شەڕو برینداری بچێژن، ئەوانیش وەك ئێوە دەیچێژن، بەڵام ئەوەی کە ئێوە ئاواتی بۆ دەخوازن (کە ڕەزامەندیو پاداشتی خودایە) ئەوان بە تەمای نینو ئاواتی بۆ ناخوازن).

بێگومان هەموو هەڵوێستە جیهادییەکانی پێغەمبەر ﷺ بەپێی ئەم تیۆری هێرش بردنەی نێو قورئانە (ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ )، ئەوەبوو لەزۆربەی جارەکاندا خۆی دەسپێشکەریی هەڵمەتی بۆ سەر دوژمن دەکردو شاڵاوی دەبردە سەر خاكو بنکەو بارەگایانو، لەناکاودا پەلاماری دەدان، بەتایبەتیش لەجیهادیدا دژی جوولەکەکان لەشاری (مەدینە)و دەوروبەری.. شێوازی پێغەمبەر ﷺ ئاوابوو، چ لەکاتی هێرشو غەزای بۆ سەر جوولەکەکانی (بنو قینقاع)و، جوولەکەکانی (بنو النضیر)و، جوولەکەکانی (بنو قریظە)و، جوولەکەکانی (خەیبەر)، لەکاتی فەتحکردنی مەککەشداو لە جەنگی دژی (هەوازن)و لە بەڕێکەوتنیشی بۆ (تەبوك)دا هەمان شێوازی جەنگیی هەبوە، هەروەها سوپای بۆ (موئتە)ش ناردووە، ئەو سوپایەشی سازو ئامادەو پڕ چەكو ئازووخە کردووە، کە (ئوسامە)ی کردبووە فەرماندەی.

هاوەڵان (صحابە) بەرێزەکانیش -خودا لێیان ڕازی بێت- لە قورئانەوە لەم ئاماژەو ڕێنماییە هۆشیار ببوونەوەو لە پێغەمبەریشەوە ﷺ ئەم وانەیەیان لەبەر کردبووو، ئەوانیش هەڵوێستە جیهادییەکانیان بەپێی ئەو تیۆرە قورئانییەی هێرش

بردن بووە. (علی کوڕی ابوطالب) ﷺ گوتوویەتی: (هەر گەلێك لەناوجەرگەی ولاتی خۆیاندا هێرشیان کرابێتە سەر، لە ئاکامدا هەر بەزیون).

لە سەردەمی ئەمڕۆشماندا جوولەکەکان لەم دەرسە جەنگسازییە تێگەیشتوون، تیۆری (ادخلوا علیهم الباب)یان لەسەر عەرەبەکان پەیڕەو کردووە، هێرشی لەناکاو دەکەنە سەر عەرەبو دەسپێشکەریی هەڵگیرساندنی شەڕ دەکەنو یەکەم زەبر ئاراستەی عەرەب دەکەن، بەلاّم عەرەبەکان بەبەرگرییەکی لاوازو ترسنۆکانەو شکستەوە بەرەو ڕووی هێرشی جوولەکە بوونەتەوە.. هەر بۆیەش جوولەکەکان خولەکانی جەنگیان دەبردەوەو عەرەبیش دەیاندۆڕاند، چونکە هەڵوێستی هێرشبەر بەهێزەو، هەڵوێستی بەرگریکار لاوازە.

کاتێك عەرەبەکانیش بیریان کردەوە کە جارێك خۆیان دەست بەهێرش بکەنو بەپێی تیۆرە قورئانییەکەی هێرش بردن (ادخلوا علیهم الباب) بجوولێنەوەو یەکەمین زەبریان بەجوولەکە گەیاند. جوولەکەکانیان ڕاچڵەکاندو پەشۆکاندو بەزاندنیان (واتە لەسەرەتاکانی جەنگدا شکاندنیان)، بەلاّم ئەگەر لەکاتی جەنگەکەدا چەند گەمەو پیلانو ناپاکییەکی ژێربەژێریی نەبوایە ئەوا خاکی موسڵمانان بەتەواوەتی بە موسڵمانەکانیشەوە ڕزگار دەکرا. ئەمەش لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٩٣.ك) بەرامبەر مانگی تشرینی یەکەمی (١٩٧٣ز)بوو، ئەوەبوو لەسەرەتای جەنگەکەدا جەنگاوەرە موسڵمانە عەرەبەکان هێڵە پتەوەکەی جوولەکەیان کە ناوی (هێلی بارلیف) بووو لەسەر سوێس دروست کرابوو، شکاندو چوونە نێو قووڵایی خاکی (سینا)وەو ڕووبەرێکی گەورەیان لێ ڕزگار کرد.

## "إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا"

ئایا ئـەو کۆمەڵـە جوولەکـە ترسـنۆکە چ وەڵامێکـی ئامۆژگـاریی دووپیـاوە ئازاکەیان دایەوەو چییان کرد؟ ئایا شوێنەواری ئامۆژگارییەکـە لەسـەریان چـیبوو؟ ئەی داخۆ هەڵوێستیان لەبەرامبەر دیدوبۆچـوونی جیهادییانـەی هـەردوو پیاوەکـە لەمەڕ هێرش بردن چی بوو؟

وەك قورئان دەیگێڕێتەوە گوتوویانە: ئەی موسا ئێمە هەرگیز ناچینە ناو خاکـە پیرۆزەکەوە مادام ئەو خەڵکە بەسامو هەیبەتەی تێدابێت، لەبەرئەوە خۆتو خودای پەروەردگارت بڕۆن بۆ جـەنگو کوشـتار، وا ئێمـەش لێـرە دانیـشتووین: ﴿قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ ... فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ المائـــــدة.. بەمانای ئەوەیان لەموسا خواستووە، کە بێ هیوابێت لێیـانو دەسـت لەهانـدانیان هەڵگرێتو خۆی بە هەڵنانو هاندانیانەوە ماندوو نەکات.

﴿لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا﴾ لـەم وتەیـەدا بـە دوو وشـەی (لـن)ی هەمیشەییو، (ابداً)ی هەمیشەیی مەبەستی خۆیان دووپات کردۆتەوە.

بەهەمیشەیی کردنی مەبەستەکەشیان پەیوەسـتە بـە مانـەوەی گەلـە بـەهێزو تواناکـەی نێـو خاکـە پیرۆزەکـەوە، چـونکە ئەگـەر ئـەوانی لـێ دەرچـن، ئـەوا جوولەکەکانیش دەچنە ناوی. سووربوونیان لەسەر جەنگ نەکردنو دووپاتکردنەوەی ئەو سووربوونەش ئەو ئاماژەیە بەدەسـتەوە دەدات کـە ئـەوان خوازیـاری شـێوازی عەسـکەریو جیهـادی نـەبوونو، ڕێگـای پیـاوەتیو سـەربەرزیو خۆبـەختکاریو بەهەشتیان ناوێت، بەڵکو ڕێگای سەرشۆڕیو ترسنۆکیو لاوازی هەڵدەبژێرن.

بێگومان ترسنۆکیی جوولەکەو ترسو سەرشۆڕییان، ئەو جەنگینو جیهادەی لەلا بێزراندوونو هانی داون بۆ دانیشتنو خۆبەدەستەوە دان.

هەر ئەم ترسنۆکیو ترسو لەرزەش، سەرچاوەی دەردو پەتای هەر نەتەوەیەکـە، کە رێـچکەی ئـەم جوولەکانـە بگرێتـە بـەر، چـونکە رێگـەی کوشـتارو جیهـادو شەهیدبوون رەت دەکەنەوەو، هۆگری رێگەی سەرشۆڕیو لاوازیو تەسلیم بوونو خۆ فریودان بەوەهمو خەیاڵن. ئەم جۆرە نەتەوەیە، وەهمی سەرکەوتنی بەسەر دوژمنـدا لەبواری فشاری ئاشتیانە، یـاخود دانوسـتانی ڕاسـتەوخۆ، یـان ناڕاسـتەوخۆدا بـۆ دروست دەبێت. یان چاوەڕوانی دەرچوونی دوژمنانن لە وڵاتیانو، گوایە بەخواسـتی لەخۆبوردوانەو بەخشندەیەتیی خۆیان لەمەیدان دەکـشێنەوە، سـەیر لەوەدایـە ئـەم بۆچوونەی خۆیان بەبەرزترین پلەی هۆشیاریو زیرەکیو ژیریو واقیعیو میـانڕەوی دادەنێن. ئایا ئەم نەریتە، نەریتی هەندێك عەرەبی ئەم سەردەمە نییـە لەشـێوازی تێروانینیانـدا بـۆ ناکۆکییـان لەگـەڵ جوولەکـەو، گێڕانـەوەی ئـەو خاکـەی، کـە جوولەکەکان دوای ساڵی (١٩٦٧) داگیریان کرد؟

ئیدی بەهۆی ئەم روانینە ترسنۆکانەو، ئەو بۆچوونە کـورتبڕەو ئـەو تێگەیـشتنە ساویلکانەیەوە دەبینین، کە کێشەی موسـڵمانانی فەڵەسـتین بـەردەوام لەدواکـەوتن دایـەو، عەرەبـەکانیش لەهـەموو لایـەنو مەوقیعێکـەوە لەبەرامبـەر جوولەکـەدا تێشکاوو زەرەرمەندن. خۆ ئەگەر ئەو عەرەبانە رێگەی تریان هەڵبژاردایـە، ئەگـەر رێگەی جەنگی هێرش بردنو تیۆری (ادخلوا علیهم الباب)یان بگرتایەتە بەر، ئـەوا بـەخێرایی: (کۆتـایی پێهێنـانی کێـشەکە)و (چارەسـەری گرفتەکـە)و (بـەزینی دوژمنان)و (ڕزگارکردنی نیـشتمان) بەئـەنجام دەگەیـشت، هـەر ئـەم رێگەچارەیە ڕاستەو هیچ رێچکەیەکی دی سوودی نییە، ئایا عەرەبەکان کاری پێ دەکەن؟ ئایـا ڕێگەی ڕاست دەگرنەبەر؟ ئایا لە دەرگاوە هەڵمەتیان دەبەنە سەر؟ ئایا ڕزگارکـەری وڵاتن؟ ئایا بەسەر جوولەکەدا سەردەکەون؟

## "فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ ....إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ "

جوولەکەکان موسای پێغەمبەریان ئاگادارکرد لەوەی، کە ڕێگە چارەی سەربازیی جیهادی ڕەت دەکەنەوە، بەلام خۆزگە تەنیا بەو تاوانە ترسنۆکانەو زەلیلانەیەوە دەوەستانو، گوناهو سەرپێچییتریان لێ نەبینرایە، ئەوان دوای ئەمە تاوانێکی دزێوتریان کردو خراپەیەکی گەورەتریان پیشان دا، کە بەزمان درکاندیان، ئەوەبوو گوتیان: (ئەی موسا بڕۆ خۆتو خوداکەت بجەنگن، بێگومان ئێمەش لێرە لێی دانیشتووینو چاوەڕێی ئەنجام دەکەین) ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ﴾.. کاتێك سەرنج لەم دەربڕینە دەدەین، چەند ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگری تێدا ڕەچاو دەکەین، وەك:-

١- بەراستی جوولەکە ترسنۆکن، ئەو ترسنۆکییەشیان بەربەستە لەبەردەم شەرەفی جیهادکاریدا، چونکە مرۆڤی سەرشۆڕو ترسنۆك ناجەنگێت، تەنانەت گەر چەندین هۆکاری هاندەرو هەڵنەرو جوانکاریو خەلاتی هەمە جۆریشی بۆ دابنرێت.

٢- ئەوان بێ شەرمییان بەرامبەر (موسا) کردووەو بەئەدەبێکی جوان لەگەڵیدا نەجووڵاونەتەوە، بەڵکو پێیان گوتووە: (بڕۆ خۆتو خوداکەت بجەنگن).

بەراستی مرۆڤی ترسنۆك شەرم ناکاتو هەردوو نەریتی ترسنۆکیو بێ شەرمیی لەخۆیدا هەڵدەگرێت، جا ئەگەر کابرای ترسنۆك شەرمەزار کراو هەموو دەرگایەکی لێ داخرایەوەو گشت پاساوو چارەسەرە بێ ناوەرۆکەکانی پووچەڵ کرانەوەو، بەڵگەی ژیرانەی ڕۆشنی خرایە ئەستۆو هیچ پاکانەیەکی

نەما، ئـەوا بێشـەرمی دەنوێنێـتو هەڵـسوکەوتی خـراپ دەردەخـاتو جنێـو دەداتو قسەی ناشیرین دەکات.

٣- جوولەکەی ترسنۆك وازیان لە پێغەمبـەرە رزگارکـارو فریادڕەسـەکەیان هێنـاو بەجێیان هێشت، کە خۆی بەتەنیا بجەنگێت، ئەمـە هەڵـسوکەوتی هەمیـشەیی ترسنۆکانە بەرامبەر موجاهیـدە ئازاکـان، کـە وازیـان لـێ دێـننو لەمەیـدان بەجێیان دێڵن بەو بیانووەی گوایە ئەم موجاهیدانە توندڕەوو هاندراوو بێ باکن.

٤- جوولەکـەکان بەموسـایان گوتـووە: ﴿فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ﴾ لـەم رسـتەیەدا وشەی (ربك) تاك (مفرد)ە، ئەمەش وەك ئەوەی گوایە خـودای موسـاش، هـەر خودای موسایە، نەك خودای ئەوانیش بێت، لەمەشدا بـێ ئەدەبییـەك دەرهـەق خودا کراوەو وایان پیشان داوە، کە ئەم خودایەیان ناوێت، کـەوا داوای جیهـادو جەنگییان لێ دەکات، بۆیە وای دادەنێن، کـە گوایـە تـەنها خـودای موسـایە. بێگومان کەسانی لاوازترو ترسنۆك، نایانەوێت هیچ ئەركو بارگرانیو قوربـانی دانێکیان لەسەر شان بێت، هەر بۆیەش ڕقیان لەو ئەرکانە دەبێتەوەو ڕقیان لەو کەسەشە، کە ئەو جۆرە ئەرکانەیان پێ بسپێرێت.

ئـای لـەم سـەردەمەدا چـەند لاوازو ترسـنۆکیش هـەنو، هـەمان وتـەی جوولەکەکان بە بانگەوازکارو موجاهیدان دەڵێنـەوە، کـە بەموسـایان گوتبـوو، ترسنۆکانی ئەمڕۆ بەموجاهیدانی ئەم سەردەمە دەڵێن: (بڕۆن خۆتانو خوداتـان بجـەنگن، وا ئێمـەش لێـرە دانیـشتووین، جـا ئەگـەر ڕاسـتگۆن لـەوەدا، کـە جوولەکەکان لە فەڵەستین دەردەکەنو، سەردەکەون بەسەریانداو، کـە خوداشـتان لەگەڵدایە، دە بڕۆن خۆتانو خوداتـان جـەنگ لـەدژی جوولەکـە بگێـڕنو ئـەو ئەرکەی، کە توانای بەجێهێنانیمان نییە، بەسەر ئێمە دامەدەن).

٥- ﴿إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾.... ئەوان سەرەڕای ئەو هەموو هاندانو گردکردنەوەو قەناعەت پێهێنانەش، هەر سەرپێچییان کردو دانیشتن.. بۆچی لێــی دانیـشتن؟ بێگومان کەمیی ورەو هیممەتیان داینیشاندن، ئیمان لەدڵیاندا کزو لاواز ببوو، واتاکانی سەربەرزیو شکۆمەندی لەدڵیاندا نەمابوو، واتاکانی جیهادو حەز لــە شەهادەت کردن لەدەروونیانــدا مردبــوو.. بۆیــە هــەرزانترین ئــەركو کــەمترین قوربانییان لەلا خۆشەویست بوو، کە دانیشتنو بێ دەنگــی بــوو. بەترســنۆکیو لاوازیو سەرشۆڕییەوە لێی دانیشتن، ئەمەش حاڵی هــەموو ئەوانەیــە، کــە لــە جیهاد دانیشتوونو سەرەڕای هۆکارە پێویستکارەکانی جیهاد، کەچی پاڵیان لێ داوەتەوەو پشتگوێیان خستووە.

# " لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ "

(موسا) سلاوی لێ بێت، دوای ئەوەی لەگەلە ترسنۆکەکەیەوە وەلامی تەواوو بنەبڕی نەگۆڕی دەربارەی نەجەنگینیان بیستو، دوای ئەوەی ئەو گەلە بێ ئەدەبیو بێشەرمییان بەرامبەر موساو بەرامبەر خوداش نواند، ئینجا (موسا) ڕووی کردە خودای پەروەردگاریو سکالای لەدەست گەلەکەیو یاخی بوونیان کردو، رایگەیاند، کە تەنها دەسەلاتی بەسەر خۆیو براکەیدا هەیە: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ ... ﴿٢٥﴾ المائدة ﴾ کەوابوو توانای بەسەر ئەو کۆمەلەی (بنواسرائیل)دا نیەو ناتوانێت بەزۆر ڕایانسپێرێت ، چونکە لێی هەلگەڕاونەتەوەو سەرپێچییان لە فەرمانەکانی کردووە.

بۆچی لێی هەلگەڕانەوەو سەرپێچییان لە فەرمانەکانی کرد؟ ئەو چیی لێ داوا کردبوون؟ ئەی چ هۆیەك لەپشت هەلگەڕانەوەو یاخی بوونیانەوە بوو؟

بێگومان (موسا) داوای لێکردن بچنە خاکە پیرۆزەکەوەو، جیهاد بکەنو بجەنگنو، ڕێی سەربەرزیو سەرکەوتنو دەسەلاتدارێتی بگرنە بەر.. دەی ئایا ئەم داوایە لەباری دایە، کە هەلگەڕانەوەو یاخی بون بخاتەوە؟ بەراستی هیچ کەسێك ئەم ڕەفتارە نانوێنێت تەنها ترسنۆكو سەرشۆڕان نەبێت.

کەی (موسا) ـ سلاوی لێ بێت ـ لێیان بێئومێد بووو دەستی لێ هەلگرتنو خۆی لێ بەریی کردن؟ ئەمە دوای چەندین سالی دوورو درێژ بوو کە لە(میسر)و (سینا) بردییە سەر لەگەلیان داو، دوای هەولو تەقەللایەکی لەخۆبوردوانەش بوو کە سەرقالی پەروەردەکردنیانو گۆش کردنیانو ڕاستکردنەوەیان بووو، هەروەها

دوای شاره‌زاییه‌كی زۆریش له‌ناسینی دڵو ده‌روونیان.

جا دوای ئه‌وه‌ی (موسا) - سلاوی لیّ بیّت- لیّیان به‌ری‌و بیّتاوان بوو، داوای له‌خودای په‌روه‌ردگاری كرد كه‌ له‌وانی جیابكاته‌وه‌ ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٥﴾ المائدة.. ئیدی ئه‌وان شایانی ئه‌وه‌نه‌بوون، كه‌ له‌گه‌ڵ موسادابن‌و، پیاوی ئه‌وه‌ش نه‌بوون، كه‌ به‌هاوڕێیه‌تی موسا شه‌ره‌فمه‌ند بن، چونكه‌ به‌دكارو یاخی‌و، سه‌رشۆڕو ترسنۆك بوون، هه‌ر كه‌سێكیش ئاوا بێت شایانی ئه‌وه‌ نییه‌، كه‌ هاوڕێی پیاوانی جیهادكار بێت.

## " فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ "

﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ﴾ بەهۆی ئەوەی لەجیهادو جەنگیندا ترسنۆك بوون، خوداش حەرامی کرد لەسەریان بچنە خاکە پیرۆزەکەوەو، شەرەفی رزگارکردنیو تیایدا نیشتەجێ بوونیشی لێ حەرام کردن، ئیدی ئەو خاکە پیرۆزەی کە خودای پەروەردگار بۆی نووسیبوونو بۆی بڕیار دابوون کە بچنە ناوی، حەرام کرا لێیان.. بۆچی؟!

بێگومان (موسا) ڕێگەی رزگارکردنی خاکە پیرۆزەکەو زەفەر پێبردنی پیشاندان، کەچی ئەوان ئەو تاکە ڕێگە شیاوەیان رەت کردەوە.. بێگومان موسا دەیویست سوودو بەرژەوەندیی ئەوان بەدیی بێنێتو، خوازیاری سەربەرزیو شکۆمەندیو سەرکەوتنو دەسەڵات وەرگرتن بوو بۆیان، هەروەها خوازیاری ئەوە بوو کە ئەوان ببنە گەورەو مامۆستای خەڵکانی تر.

تاکە ڕێگەی بەدیهێنانی ئەم ئامانجانەش هەر جیهادو جەنگین بوو، جا کاتێك ئەو ڕێگەیەیان رەت کردەوە، دیارە لەهەموو بەروبوومە خۆشو گەورەکانیشی بێ بەش کراون.

ئەوان نەفسو تەمەنو خوێنی خۆیان لەلا گرانو گرنگ بووو قوربانییان بەمانە لەپێناوی خوادا نەدەداو، نەیاندەکردە بەهایەك بۆ سەرەنجامە مسۆگەرو گەورەکە.

دەبینین لەجیهاددا قوربانیی گەورەو گران هەیە، ڕێگەکەش قورسو درێژو سەختە، دیارە نەفسیش لەسەرەتادا ئەمەی پێ خۆش نیە (وەك لەدەقی قورئاندا هاتووە) هەموو ئەمانە راستنو نکوولیی لێ ناکرێت.. بەڵام ئەنجامی جیهادەکە

گەورەیەو، بەهاکەشی خوازراوو ویستراوەو، ئامانجەکەشی بەرزو پیرۆزە، ئەم هەموو ئەنجامو بەهاو ئامانجانەش شایستەی بەگەڕخستنی گشت هەوڵو توانایەکن کە بە ماڵو نەفس لەپێناویدا خەرج بکرێت.

هەر بۆیەش باوەڕدارانی جیهادکار نەفسو خوێنو سامانو گشت موڵكو ماڵێکیان لەلا کەمو بێ بایەخ دەبێت لەکاتی جیهادداو بەوپەڕی قایل بوونو باوەڕو دڵسۆزییەوە دەیانکەنە قوربانی.

ئەرێ لەکەیەوە پەیداکردنی سەرکەوتنو دەسەڵات بەبێ قوربانیدان بووە؟ ئەرێ لەکەیەوە پیاوەتی بەبێ باج دان بووە؟ ئەرێ لەکەیەوە ژیان بەبێ نارەحەتیو مەینەتی بوە؟ ئەرێ لەکەیەوە بەهەشت بەبێ نرخ بووە؟

لەخەونو خەیاڵدا دەژین ئەوانەی خوازیاری سەرکەوتنو رزگاربوونن و کەچی لێی دانیشتوون.. لەخەونو خەیاڵدا دەژین ئەوانەی سەربەرزیو شکۆمەندیو سەروەرییان دەوێتو کەچی ترسنۆكو لاوازن.. لەخەونو خەیاڵدا دەژین ئەوانەی بەبێ جیهادو داوای شەهادەت بەهەشتی خودایان دەوێت.

جا لەبەرئەوەی جوولەکەکانی سەردەمی موسا دانیشتنی زەلیلیو ترسنۆکانەیان هەڵبژارد لەو خواستی هەڵبژاردنەدا شکستیان هێناو، لە تاقیکردنەوەکەشدا کەوتن.. بەم هۆیەشەوە لەشەرەفو شکۆمەندیی رزگارکردنی خاکی پیرۆز بێبەش کران، لەو رێگەیە بێبەش کران کە دڵانی پیاوان بۆی لێ دەدات‌و، دەروونیان شەیدایەتیو، چاوانیان تیشکی روانینی بەردەوامیان خستۆتە سەر.

ئەمڕۆش عەرەبو موسڵمانەکان روویان لە جەنگینیان وەرگێڕاوەو، رێگەی پیاوەتیو سەربەرزیو رزگاریو سەرکەوتنیان رەت کردۆتەوە، واتە رێگەی جیهادیان رەت کردۆتەوە، رێگەی لاوازیو بێ دەسەڵاتیو سواڵ کردنیان هەڵبژاردووەو، وایان لێ هاتووە سواڵو داوای یارمەتی لە جوولەکەو دەسەڵاتدارانی

دی دەکەن تاکو بەشێکی کەم لە خاکی وڵاتیـان بـەخێری خۆیـان پـێ ببەخـشنەوە تەنانەت گەر زۆر بـچووكو کـەمیش بێـت.. ئـیتر شمشێرەکانیـشیان پێـچاوەتەوەو چەکەکانیان فرێداوەو، لقـی دار زەیتوونیـان بـەرز کردۆتـەوەو، کـۆتری ئاشـتییان هەڵداوەو، هیچ شتێکیشیان دەسگیرنەبووەو، هەرگیز (تا لەسەر ئەو ئاکارەش بـن) هیچ شتێکیان دەسگیر نابێت.. ئەوان بەهۆی هەڵبژاردنی ئەو تراویلکە (سـەراب)ە فریـو دەرەوە رێگـای جهـادو شـەهادەتخوازییان ون کـردو، پلـەو رێـزی رزگارییـان لەدەست داو، ژیـانی زەلیلـیو ترسـنۆکیو لاوازییـان بەباشـترزانی.. لەبـەر ئـەوە خوداش لە رێزو شەرەفی جیهادکاریو رزگارکردن بـێ بەشـی کـردن، کتومـت وەك ئەوەی برگەی (أنَّها مُحرّمة عليهم) بەتەواوی بەسەر ئەوانیشدا بچەسپێت.

بێگومـان جیهـادکردنو رزگـارکردنو، گێڕاندنـەوەی وڵاتو شـوێنو دیـاردە پیرۆزەکان، رێزو پلەیەکی گەورەیـەو، مەدالیایـەکی بـەرزەو، بەخششێکی پـیرۆزو بەهاداری خوداییە.. خوداش نایەوێت ئەم شەرەفە بدات بەو کەسەی، کە شـایانی نییە، چونکە نەوەی بەزیو، سەرکەوتن دروسـت ناکـاتو خوازیـارانی سەرشـۆڕیش (کە هێمای زەلیلین) رێنیشاندەری سەربەرزی نیین.

## چل ساڵ وێڵ بوون " أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الْأَرْضِ "

خودا شەرەفی جیهادو رزگاری‌و، دەسەلاتداریێتیی نێو خاکی پیرۆزی لەو ترسنۆکانەی جوولەکە حەرام کردو، وێلی‌و گومبوونی نێو خاکی (سینا)ی بۆ بڕیاردان. ماوەی ون بوونەکەشیانی بە چل (٤٠) ساڵ دانا.. بۆچی چل ساڵ؟ بێگومان ماوەی چل ساڵ ژیانی دوو نەوە (جیل) دەگرێتەوە. حیکمەت لەم دیاریکردنەش ئەوە بوو کە ئەو نەوە ترسنۆکەی (بنو اسرائیل) نەمێنن‌و دواییان پێ بێت، چونکە هیچ ئامۆژگاری‌و وتەیەکی هاندەرانەو پاڵنان‌و چالاك کردن سوودی نەبوو بۆیان. ئەو کۆمەڵە کەسە نەوە (جیل)ێك بوون، کە جیهادیان لێڕانەدەبینرا، چونکە هیچ هیممەت‌و ورەیەکیان نەمابوو.. بۆیە دەبێت چاوەڕوانی بکرێت، تاکو ئەو نەوەیە دەمرن‌و، دوای ئەوان نەوەیەکی تازە بێنە پێشەوەو توانای جەنگ‌و رزگارکردنیان تێدا بێت، چل ساڵەکەش ماوەیەکی بەسە بۆ قڕبوونی ئەو نەوەیە، ئەی داخۆ ئەم نەوە ترسنۆکە، کە چاوەڕوانیی نزیکبوونی کۆتاییان دەکەن، چی بکەن؟ ئەوان لە بیاباندا ون بون ﴿سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الْأَرْضِ﴾... لەڕاستیشدا لە (سینا)دا ون بون‌و هەر لەو بیابانەدا ژیان‌و تاڵیی ژیان‌و بارگرانیی گوزەرانیان چەشت.

مرۆڤ سەری سووڕ دەمێنێت لەو ڕووداوەی، کە بەسەر ئەو نەوە ترسنۆکەی (بەنوئیسرائیل)دا هات.. بێگومان خودا ڕێگەی پیاوەتی‌و سەربەرزیی بۆ والاکردن‌و، ئەوانیش پیایدا نەڕۆیشتن.. بێگومان بانگی کردن بۆ وەرگرتنی نیعمەت‌و خێرو بەرەکەتەکانی خاکی پیرۆز بەو مەرجەی نرخەکەی بدەن، کە جیهاد

بوو، بەڵام ئەوان ڕوویان لێ وەرچەرخاند، خوداش ئەو نیعمەتە ڕەتکراوەیان بە (وون بوونی نێو بیابان) بۆ گۆڕین. چۆن ئەم گۆڕینەیان پەسەند کرد؟ واتە چۆن (وون بوون لە بیابان) لەجیاتی (خاکی پیرۆز)یان پەسەند کردو چۆن خوازیاری گۆڕینی چاکتر بەخراپتر بوون؟ چی پاڵی پێوەنان بۆ قایل بوون بەو ڕێکەوتنە زیانبارە؟ بێگومان هەر ترس و لەرزو سەرشۆڕیو لاوازیو بێهێزیو سووربوون لەسەر ژیان پاڵی پێوەنان، ئایا ئەوان لەبیابانەکەدا زیندوو نەبوون؟ ئایا پەرۆشی پاراستنی گیانو خوێنیان نەبوون؟ جا ئیتر کە ژیانو رۆحیان بۆ خۆیان مسۆگەر کرد، بۆچی لە رۆیشتن بەرێگای خاکە پیرۆزەکەدا دەیخەنە مەترسییەوە؟ دە کەوابوو با واز لە خاکە پیرۆزەکە بێننو بەو بیابانە قایل بن، کە ژیانیان بۆ بەدی دێنێت. خودا لە شوێنێکی تری قورئاندا دەربارەی ئەو نەریتی ژیان خۆشویستنەی جوولەکە فەرموویەتی: ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ... ﴿٩٦﴾ البقرة ﴾. لە ونبوونی نێو بیابانیشیاندا چەند حیکمەتێك بەدیی دەکەین، وەك:

١- وێڵ بوونەکە لە بریتی (بدیل)ی ژیانی نێو خاکە پیرۆزەکەیە، هەردوو ڕێگاشیان لەبەردەم دا بووەو، ڕێگەیەکی سێهەمی نەبووە، یان ڕێگای سەربەرزیو شکۆمەندیو سەرکەوتنو بالادەستیو جەنگ لەدژی دوژمنانو رزگارکردنی ولات، یان ڕێگەی ترسنۆکیو لاوازیو سوور بوون لەسەر ژیانی دنیاو چاوچنۆکی نواندن لەبەخشینی گیانو ساماندا.. دیارە ئەم ڕێگەیەش مرۆڤ بەرەو ونبوونو گومڕاییو وێڵ بوون دەبات. ئەو نەوەیەی جوولەکانیش ڕێگەی دووەمیان هەڵبژاردو، بەهۆیەوە شایستەی ئەو سەرەنجامە بوونو لە زەویدا ویڵو سەرگەردان بوون.

٢- ونبوون خۆی لەخۆیدا لەبەرچاو نەمانو گومڕاییە، ئەم دیاردەیەش تووشی هەر کەسێك دەبێت لەوانەی ڕێگەی جیهاد (ڕێگەی پیاوانی جیهادکارو پاڵەوان)یان وەبەر نەناوە.

بێگومان ئەوانەی لەپێناوی خودا جیهاد ناکەنو لەدژی دوژمنیان ناجەنگن، وێڵو ون دەبنو زیان دەکەن.. ئای نەتەوەش چەندە لەژیانو وجودو وزەی لەدەست دەچێت کاتێك واز لەرێگەی جیهادکردن دێنێت. بەراستی ئەوەیە ون بوونی تەواوو زیانی هەمە چەشنو هەمەلایەنەکە مالو سامانو وەختو تەمەنو بەهرەو تواناو وزەو بازوو کۆششو گەنجیو نیشتمانو ئاواتو مێژووو بوونو بەختیارییان تیا لەدەست دەدەنو ونی دەکەن، کەوابوو زەرەرو زیانیان لەپشتگوێ خستنی جیهاددا چەندە؟

ئێمە لەم سەردەمەدا ئەم ئاکامە لەم نەتەوەیە دەبینینو دەستی دەخەینە سەر، چونکە رێگای جەنگو کوشتاریان لەدژی جوولەکە داگیرکەرەکان ڕەت کردۆتەوەو، رێگەی ئاشتییەکی گرانو سەرشۆڕانەیان هەڵبژاردووەو، بەم پییەش کەوتوونە نێو وێڵبوونێکی ڕەهاو، ونبوونێکی هەمەلاینەو زیانێکی گشتییەوە.

٣- بێگومان وێڵ بوونەکە بەو مەبەستە بووە کە با ئەو نەوە ترسنۆکە بمرن، چونکە مرۆڤی سەرشۆڕو ترسنۆك بەدەم بانگەوازی جیهادەوە نایەت سەرەڕای ئەوەی هەر چەندێك ئەو بانگەوازە بەڕاستو هەقیش دەرکەوێت. لەبەر ئەوە ئەگەر ئەوە بۆ خەڵکی ویسترا، کە بە ڕێگەی جیهاددا برۆن، دەبێت نەوە ترسنۆکەکە (الجیل الجبان) پشتگوێ بخرێت، چونکە ئەو نەوەیە خەڵکی ماندوو دەکەنو بەدەمیانەوە ناچن، بۆیە نەوەی ترسنۆك فەرامۆش دەکرێت تا ئەوکاتەی دەمرنو لەدوایانەوە نەوەیەکی نوێ پێ دەگەن. جا بۆ ئەوەی هەوڵو تەقەللاکان بەربگرن دەبێت نەوەیەکی نوێی بۆ ئاڕاستە بکرێت کە لەسەر چەند بنەماو ڕێبازو شێوازێکی نوێ گۆش کرابن.

بۆچی هەندێك کەس لەم سەردەمەماندا خۆیان ماندووو شپرزە دەکەنو، کاتو هەوڵی خۆیان لەدواندنی چەند کەسێکی ترسنۆکدا بەفیڕۆ دەدەنو داوای جیهادکردنو ڕزگارکردنی وڵاتیان لێدەکەنو، نەخشەو پلانیان پێشکەش

دەکەنو، هیواو ئاواتیان لەسەر هەڵدەچنن؟؟ ئێ خۆ ئەوان لەم زمانە تێناگەنو، ئەم دەنگە نابیستنو بەدەم ئەم هاوارو بانگەوازەوە نایەن..

انه لا حياة لمن تنادي

وما لجرح بميت أيلام

کۆششو کاتتان بۆ ئەوە بەکاربێنن کە نەوەیەکی نوێی پێ بێننە کایەو ئەو نەوەیەش لەسەر ڕێسای پیاوەتی گەشە بکاتو ڕقی لەسەرشۆڕیو ترسنۆکی ببێتەوەو، حەز لەجیهادو شەهید بوون بکاتو، هەر ئەم جۆرە نەوەیەش قسەو ئامۆژگاری دەبیسێتو قسە بۆ کردنو دواندنیان سوودی دەبێت لەگەڵیان داو پەروەردەکردنیشیان کارێکی سەرکەوتوو دەبێت.

٤- هەر لە حیکمەتەکانی وێڵ بوونی ئەو هۆزە لە بیابانی (سینا)دا ئەوەیە، (سینا) بیابانێکە کەشو هەوایەکی سەختو بارودۆخێکی سروشتیی گرانو ژیانێکی نارەحەتی تێدایە، خوداش بۆیە ئەو شوێنەی دەستنیشان کرد تا ببێتە مەڵبەندێکی نەوەی نوێی (بنواسرائیل)و بەشێوەیەکی پەروەردەیی نوێ گۆش بکرێنو، بەتایبەتی سازو ئامادە بکرێن بۆ ئەوەی شایستەی چوونە نێو خاکی پیرۆزەوە بنو لەدەست مرۆڤە زلو بەهەیبەتەکان ڕزگاری بکەن.. لەڕاستیشدا هەروا بووو ئاکامەکەی وادەرچوو.. ئەمەش ڕامان دەکێشێت بۆ گرنگیی دۆزینەوەی نەوەی جیهاد خوازو، چەق خستنە سەر دەستەبەرکردنی کەشو هەوای گونجاو بۆی تاکو لەسەر ئەو واتا بەرزانە پێ بگات.. هەر بۆیەش زۆر پێویستە کە ڕواڵەتەکانی کەشخەییو لووتبەرزیو زیادەڕۆیی لابرێنو، لەژیانی بێباکیو گومڕاییو گاڵتەجاڕی دەرچنو، بەخۆنازینو خۆبادانی بەدکردارانە

بەنیعمەتەوەو، بەختەوەریی کوشندەی دەست بڵاویی فەرامۆش بکرێنو، مـرۆڤ کۆیلەو بەندەی هەواو ئارەزووو شتە جوانکراوەکانی دنیا نەبێت.

هەر دەبێت کە نەوەی جیهادو تێکۆشان لـەو دیـاردە بەکاربەرییـە جوانکارانـە (المظاهر الاستهلاكية الكماليـة) کەم کەنەوەو، لەسەر نەویستن (الزهـد) لـە دنیـادا گەشـە بکـەنو، خۆیـان لەسـەروو فیتنـەو بـەڵاو شـتە سـەرنج ڕاکـێشو هەسـت وروژێنەکانو چێژ بەخشەکانەوە بگرن، دیـلو یەخـسیریان نـەبنو، لـە جیهادیـان دانەبڕنو، تاکو لە ڕووبەڕووبوونـەوەی دوژمنـان نەترسـنو سـەرنەکەنە سـەر ئـەو کەرەسەو ئامرازە فریودەرانە.

# " فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ "

ئەم ڕستەیە( ﴿ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ المائدة ﴾..بۆ گەلی کافران خەمبار مەبە) دڵنەوایی کردنی موسایە دوای ئەوەی بەو (سووربوونەی گەلەکەی لەسەر ترسنۆکی) دڵ بریندار‌بوو، ئەم ڕستەیە خەم ڕەواندنەوەی موسایەو فەرمانێکی خودایە بۆی کە (بۆ گەلی بەدکارو ناحاڵی) دڵتەنگو خەمگین نەبێت.

موساش هیچ کەمتەرخەمییەکی لە پەروەردە کردنیانو هاندانیاندا نەکردووە، بەڵام ئەوان قایل نەبوون، کە فەرمانی خودای لەگەڵدا جێبەجێ بکەن، یاخود بەدەم داواکەیەوە بچن، چونکە یاخیو بەدڕەفتار بوون، ئیدی بۆچی موساش خەفەت بۆ یاخیو بەدڕەفتاران بخوات؟!

هەروەها ئەم ڕستەیە دەلالەت لەو هۆیە دەکات کە هانی دان بۆ ڕەت کردنەوەی فەرمانەکانی موسا- هۆیەکەش یاخی بوونە (الفسق)..

یاخی بوون، واتە دەرچوون لەفەرمانەکانی خودا.. بۆ نموونە لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێت (فسقت الفأرة إذا خرجت من حجرها)، واتە (مشکەکە ئەگەر لەکونەی دەرچێت ئەوا فاسق، واتە یاخی بووە). ئەو گەلەش یاخیو بەدکاربوون، چونکە لەو سنوورە دەرچوون کە خودا بۆی کێشابوونو لەو فەرمانانەش یاخی بوون کە بۆیان دەرکرا بوون.

وشەی (الفاسقین) دووجار لەم چیرۆکەدا هاتووە:

یەکەم/ کاتێك موسا- سڵاوی بێت- گوتی: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَأَخِيۖ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ المائدة ﴾.. واتە (خودایە

من دەسەلاتم تەنها بەسەر خۆمو براکەمدا هەیە، دەتۆش ئێمە لەو لەگەڵە یاخیو بەدکارە جیابکەرەوە).

دووەم/ کاتێك خودا فەرموویەتی ﴿فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، واتە: (ئەی موسا بۆ گەلی کافرو بێ باوەڕان خەم مەخۆ).

ئەوان یاخی بوون، بۆیە موساش خۆی لێ بەریی کردن، ئەوان یاخی بوونو خوداش داوای لە(موسا) کرد کە بۆیان خەم نەخوات.. ئەمەش هەمیشە نەریتی گشت بەدکارو یاخییەکە.

## (کورتەی گرنگترین وانەی ئەم چیرۆکە)

١- ئەم چیرۆکە پەردە لەسەر دڵو دەروونی جوولەکان هەڵدەداتەوە، کە خوویان بە سەرشۆڕیو ترسنۆکیو لاوازییەوە وەرگرتووە.

٢- ئەم چیرۆکە دەلالەت لەسەر هەڵگەڕانەوەی (بەنو ئیسرائیل) دەکات، کە چۆن لە پێغەمبەرەکەیان (موسا) هەڵگەڕاونەتەوەو فەرمانەکانیان جێبەجێ نەکردووەو ڕەتیان کردوونەوە.

٣- ئەم چیرۆکە بەڵگەیە لەسەر بێ ئەدەبییان لەگەڵ خودای پاكو باڵادەستو، لەگەڵ پێغەمبەرەکەشیان (موسا) - سڵاوی لێ بێت -.

٤- بێگومان خاکی پیرۆز (فەڵەستین) خودا بۆنەوەیەکی تایبەتی، جوولەکانی بڕیار دابوو، کە بچنە ناوی، ئەوانیش ئەو باوەڕەدا نەبوون، کە لە بیابانەدا گۆشکرانو پێگەیشتنو بە نەریتی پیاوانەو باوەڕدارێتی پەروەردەکران. بەڵام دوای ئەمان (واتە نەوە کافرەکانیان، کە باوەڕیان بەهەق نەهێناو، کە لە دژی هەق جەنگان، هیچ مافێکیان لەو خاکەپیرۆزەدا نییە).

٥- خودا لەکاتێکدا، کە بەنوئیسرائیلی بەسەر خەڵکی جیهانـدا ڕێزدارترکـردووەو، ئەوەی کەپێشیی داون بـەهیچ کەسـێکی تـری خـەڵکی دنیـای نـەداوە، ئەمـە گشتیو هەمەلایەنەو سەرتاپاگیرەو تایبەتە بەئیمانـدارەکانیان کـەپێش هـاتنی پەیامی (محمد) ﷺ هاتوون.

٦- بێگومان ترسو لەرزی جوولەکە وای لێ کـردوون، کـە دەسـت لـە چارەسـەری جیهادییانــە هــەڵگرنو چارەســەرێکی خەیاڵییانــە بــە چــاکتر بــزانن، ئــەو چارەسەرەشیان لەوەدا ڕەنگدەداتەوە کەلێی دانیشتوونو چاوەڕوانیی دەرچـوونی کەسە بە زەبرو گەورەکان بوون تاکو بەخواستو ئیرادەی خۆیان بۆیان دەربکەن.

٧- لەو نەوە ترسنۆکانەدا تەنها دوو پیـاوی ئـازاو چـاونەترس هـەبوون، ئـەوانیش بەهۆی گوڕو تینی ئیمانەکەیانەوە ئازابوون.

٨- ترسان تەنها لە خوداو نەترسان لە غەیری خودا، نیعمـەتێکی گـەورەو گرانـەو خودا بە خواستی خۆی بەو عەبدانەی دەبەخشێت، کە شایانی بوون.

٩- ئەم چیرۆکە ئاماژە بۆ چاکترین ڕێسای سەرکەوتنی جەنگ دەکات، کە جـەنگی هێرش بردنە یاخود تیۆری (ادخلوا عليهم البـاب) وەك ئایەتـەکان بەڕاشـکاوی باسیان کردبوون.

١٠- بێگومان خـاوەنو دانیـشتووی خاکەکـە بـە خواسـتو ئـیرادەی خـۆی لێـی دەرناچـێت، بـەرەی سـەرکەوتوانیش دەسـت لـە سـەرکەوتنەکەیان هـەڵناگرن تەنانەت گەر دەسدرێژکارو ستەمکاریش بووبن، وەك (جوولەکەکانی ئەمڕۆ لـە فەڵەستین)، کە دەست لە سەرکەوتنی سـتەمکارانەیان هـەڵناگرنو بەخواسـتو ئیرادەی خۆیان لێی دەرناچن، هەرگیز بەڕێزو بەخشندەیی خۆیـشیان لـەو خاکـە دەرناچن کە داگیریان کردووە.

١١- بێگومان مرۆڤی ترسـنۆكو تەمـەڵ هـەر دانیـشتنی لـەلا خۆشـترە وەك لـە

کارکردنو جیهادکردن.

١٢- بێگومان مرۆڤی ترسنۆكو لاوازو تەمەڵ لە ڕێزو شەرەفی جیهادو ڕزگاریو شەهیدبوون بێ بەش دەکرێت، هەر بۆیەش داوای نواندنی ئەم ئاکارە بەرزانەی لێ ناکرێت، چونکە ئەهلو شایستەی ئەوانە نییە.

١٣- بێگومان نەوە (جیل)ی شکست خواردوو وەك نەوەی ڕزگارکردنو سەرفرازی نییە، هەر کەسێکیش لەسەر ترسنۆکیو زەلیلی پێگەیشتبێت، ئەرکی جیهادکردنی پێ ناسپێررێت، لەبەرئەوە هیواو ئاواتیشی لێ ناخوازرێت.

١٤- بێگومان وازهێنان لە جیهادو جەنگ دەبێتە هۆی وێڵ بوونو سەرگەردانیو، نەتەوەش ئەم حاڵەتە لە گشت بوارەکانی ژیاندا بەدی دەکات.. تەنها جیهادیشە، کە ڕۆڵەکانی نەتەوە کۆدەکاتەوەو، نیگەرانیو دڵەڕاوکێی بۆ لەناو دەباتو، حاڵەتی ون بوونی بۆ دەسڕێتەوەو، وتەو بیروڕایان بۆ یەك دەخات.

١٥- پێویست بونی ئامادەو سازدانی کات بۆ جیهادو حەز لە شەهادەت کردن، هەروەها ئامادەکردنو جۆشدانی پیاوان بۆ ڕزگاریو ڕزگارکردنی وڵات، ئەمەش بەسازدانی جیهادییانەو لە ژینگەیەکی گونجاوی جیهادییانەدا، کە بتوانن وازبێنن لە شتە باقو بریقەکانی دنیاو لە لووتبەرزیو بێ باکیو دنیا پەرستی، تاکو لە ژیانی جیدیو تێکۆشانو پیاوانەدا بژینو، ئارەزوومەندی شەهیدیو خوازیاری بەهەشت بن.

# چیـرۆکی پێنجـــەم

## چـیرۆکی مانگاکـەی ( بنو اسـرائیل )

ئەم چیرۆکە لە قورئاندا بەم شێوەیە گێڕاوەتەوە کە خودا فەرموویەتی:

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا۟ ٱلْـَٰٔنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَْٰٔتُمْ فِيهَا ۖ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾ البقرة ﴾.

واتە: (ئەی پێغەمبەر ئەو بەسەرهاتەیان بۆ بگێڕەوە، کاتێك (موسا) بە گەلەکەی خۆی گوت: ئەوا خودا فەرمانتان پێ دەکات، کە مانگایەك سەربڕن (ئەو فەرمانەش دوای ئەو رووداوە هات، کە یەکێکیان لێ کوژرابووو بکوژەکەیان نەدەناسیو هاناو هاواریان بۆ موسا بردبوو)و موساش ئەو فەرمانەی خودای پێ راگەیاندن کە با مانگایەك سەربڕن، بەڵام ئەوان لەوەڵامدا گوتیان: (ئایا دەمانکەیتە گاڵتەجاڕی خۆت)؟ موساش گوتی: (پەنا بەخوا دەگرم لەوەی بچمە ریزی نەفامو جاهیلانەوە- لەوەی کە گاڵتەتان بکەمو لە خۆمەوە فەرمانی خوداتان پێ بگەیەنم). گوتیان: (دەباشە داوا لەخودای پەروەردگارت بکە تابۆمان دیاری کات کە ئاخۆ ئەو مانگایە چۆنە)، موساش گوتی: (خودا دەفەرموویێت ئەو مانگایە نەپیرەو نەپارێنە، بەڵکو میانە ساڵە، کەواتە (هێندە لێی مەکۆڵنەوە)و هەر فەرمانێکتان پێ دراوە جێبەجێ بکەن) بەڵام دووبارە گوتیان: (داوا بکەرەوە لە پەروەردگارت رەنگەکەیمان بۆ دیاری بکات) موساش گوتی (خودا دەفەرمووێت رەنگی ئەو مانگایە زەردی تۆخەو لە جوانیی رەنگەکەیدا بینەرانی دڵخۆش دەبن) کەچی لێیان پرسییەوەو گوتیان: (لە پەروەردگارت داوابکە تا بەتەواوەتی بۆمان روون بکاتەوە، کە ئەمە چۆن مانگایەکە؟ بەراستی ئێمە بۆمان نادۆزرێتەوەو، ئەگەر خودا خواستی لەسەربێت دەیدۆزێتەوەو رێگەکەی پێ دەزانین) (موسا)گوتی: (ئەو مانگایە هێشتا رانەهێنراوە بۆ جووتکردنو زەوی کێڵانو ئاودێریی کشتوکاڵیی پێ نەکراوە، یەك رەنگەو پەڵە پەڵەنییەو رەنگی زەردە)..

ئینجا گوتیان (ئێستا هەواڵێ راستەقینەت پێداین) ئیتر (دوای هەوڵو کۆششێکی زۆر کەلەگەڵیاندا خەریك بوو) سەریان بڕی، هەرچەندە خەریك بوو مانگاکەیان سەرنەدەبری.. لە کاتێکیشدا (ئەگەر لەبیرتانە)چۆن کەسێکتان کوشتو ئاژاوە لەنێوتاندا پەیدا بوو، خوداش ئەوەی شاردبووتانەوە لەکاروباری ئەو بکوژەی کە نەتاندەویست لەلای حاکم ئاشکرا بێت، پێی دەرخستن، کە (بکوژەکە کێیە)!!

ئینجا گوتمان پارچەیەك لەمانگا سەربڕاوەکە بدەن بەلاشەی کوژراوەکەداو (دیارە بەویستی خودا کوژراوەکە زیندوو بۆتەوەو ناوی بکوژەکەی خۆی گوتووە) جا بەو شێوەیەو بەئاسانی خودا مردووەکان زیندوو دەکاتەوەوو دەسەڵاتی خۆیتان پیشان دەدات تاکو تێ بگەنو ژیر ببن. بەڵام دوای ئەوەش دڵەکانتان رەق بووەوە وەك بەرد تەنانەت لەبەردیش رەقتر، چونکە بەڕاستی بەردی واهەیە، کە ڕوباری لێو هەڵدەقوڵێت، هەشیانەلەت لەت دەبێتو ئاوی لێ دێتە دەروە، هەشیانە لە ترسی خودا لە لوتکەی شاخەکان بەردەبێتەوە.. خوداش بێ ئاگانییە لەو کارو کردەوانەی، کە ئەنجامی دەدەن).

## پوختەی چیرۆکەکە لەڕێی ئایەتەکانەوە

لەنێو (بنو اسرائیل)دا تاوانێکی کوشتن روودەدات کە هەر لەسەر دەمی ژیانی موسادا دەبێت، بکوژەکەش دیارنابێت، ئەوانیش دەیخەنە سەریەکدیو هەندێکیان هەندێکی تریان تاوانبار دەکەن بەوەی گوایە بکوژەکەیە. تالە ئەنجامدا مەسەلەکە دەگەیەننە لای موسا، بۆ ئەوەی دادوەرییان لەنێواندا بکات.

خوداش ویستوویەتی بکوژەکەیان بۆ دەرخات، ئەمەش بەهۆی موعجیزەیەکی ماددیی هەستپێکراوەوە، ئەوەبوو سروشی بۆ (موسا) نارد، کە فەرمانیان بەسەربڕینی مانگایەك پێ بکات، هەر مانگایەك بێت، بێ ئەوەی نیشانەکانی دیاری بکات، خۆ ئەگەر هەر مانگایەکیان بگرتایەو سەربیبڕیایە ئەوا کارەکەیان بەجێ دەگەینرا، بەڵام بە نەریتی مشتومڕو سستیو درێغی کردنی خۆیان ئامادەی راپەڕاندنی ئەو فەرمانە نەبوون. هەربۆیە بەو نەریتی درێژدا دڕیو زۆر گوتنەیان لە موسایان پرسی (تەمەنی ئەو مانگایە چەندە)؟ ئەویش گوتی (نە بچووکەو نە بەساڵاچووە بەڵکو تەمەنێکی مام ناوەندیی هەیە).

ئینجا دەربارەی رەنگی مانگا کە پرسییانو ئەویش گوتی (زەردێکی تێرەو تەماشاکارانی شەیداو دڵخۆش دەکات. پاشان دەربارەی تواناو کاری مانگاکە پرسییان، ئەویش گوتی (لەلای خاوەنەکەی بەنازو خۆشەویست بووەو هیچ کارێکی پێ نەکردووە، نەلەکێڵانی زەویدا کاردەکاتو نە لە ئاودێریو ئاوڕاکێشان بۆ زەوییە کشتوکاڵییەکانیشدا کاردەکات. لەدواییدا ئەو جۆرە مانگایە سەر دەبڕن هەرچەندە خەریك بووە کە سەریشی نەبڕن. دوای ئەوە موسا سلاوی خوای لێ بێت- فەرمانی پێ کردوون، کە بە پارچەیەکی مانگا سەربڕراوەکە لەلاشەی پیاوەکوژراوە مردووەکەیان بدەن، ئەوانیش ئەو فەرمانە جێبەجێ دەکەنو، یەکسەر خودا کوژراوەکە زیندوو دەکاتەوەو گیانی بەبەردا دێتەوەو هەواڵی بکوژەکەیان پێ دەگەیەنێتو دەڵێت (فلان کەس منی کوشت). دوای ئەوە دەمرێتەوە، ئەمەش هەمووی لە ناوەندی سەرسوڕمانی خەڵکی -بنو اسرائیل- دا، کە زۆر سەرسام دەبن لەوەی دەیبینن.

## چەند وتەیەکی هەڵبەستراوی ئیسرائیلییەکان لەبارەی ئەم چیرۆکەوە

ئەوانەی بەسەرهاتو داستانەکانیان گێراوەتەوەو چاویان بە وتە هەڵبەستراوەکانی ناسراو بە (ئیسرائیلیات)دا خشاندووە ئەم بەسەرهاتەیان بەم جۆرە نەقڵ کردووە:- گەنجێك لە (بنو اسرائیل)دا هەبوو، کە مامێکی دەوڵەمەندی خاوەن ماڵو سامانی زۆری هەبوو، هەروەها کچێکی جوانیشی هەبوو، برازاکەی بەپەلە هەمیشە چاوەڕوانی مردنی بوو تاکو کچەکەی بخوازێتو میراتگری ماڵو سامانەکەی بێت. بەڵام ئەم پیاوە دەوڵەمەندە تەمەنی درێژ بووو نەدەمرد. گەنجەکەش حەزی دەکرد ئەم مامەی زوو بمرێتو پەلەی بوو لە مردنی، بۆیە

بەئانقەست هەڵی کوتایە سەریو کوشتی، بۆ ئەوەی تاوانەکەش لەنێو خەڵکیدا ون ببێتو هیچ کەسێك بە کوشتنی مامی خەتاباری نەکەن تەرمەکەی هەڵدایە بەر دەرگای ماڵێك لەماڵانی خەڵکیو لەبەردەگاکەش لێی دانیشتو دەگریاو، خاوەنانی ئەوماڵەی بەکوشتنی مامی تاوانبار دەکردو داوای هەقی خوێنەکەی لێ دەکردن، ئەوانیش سوێندیان خوارد کەئەمان نەیانکوشتووە. کاتێك مەسەلەکەیان خستە بەردەم (موسا) فەرمانی پێکردن، کە مانگایەك سەرببڕن. بۆیە ئەوان سەرسام بوون لەو فەرمانەو وای بۆچوون، کە ئەمە هیچ پەیوەندیەکی بە کێشەکەیانەوە نییە، لەبەر ئەمە بەرهەڵستیی موسایان لەسەر ئەو فەرمانە کردو، ئەویش فەرمانەکەی بۆ دووپات کردنەوە..

ئینجا کەوتنە پرسیار لێکردنی لەسەر تەمەنی ئەو مانگایەو لەسەر ڕەنگیو لەسەر توانای کارکردنی، ئەویش وەڵامی هەموو پرسیارەکانیانی دایەوەو، وایان لێ هات تەنگیان بە دەروونی خۆیان هەڵچنی.. هەموو ئەو نیشانانەی مانگاکەیان لە موسا وەرگرتو، دەستیان کرد بەگەڕان بەدوای جۆرە مانگایەکدا کەئەو سیفەتانەی هەبێت.

لەلای هۆزی (بەنو ئیسرائیل) گەڕان بەدوایداو تەنها یەك مانگایان بەو سیفەتانەوە بینی.... ئەو مانگایە بەسەرهاتێکی تریشی هەیە (بێگومان هەر بەسەرهاتێکی هەڵبەستراوی ئیسرائیلیانەی هەیە) ئەو مانگایە هی لاوێکی هەتیوو هەژار بوو، ئەم لاوە چاکە کارو بەئەمەك بوو بۆ ئەو باوکەی کەمردبوو، بۆ دایکیشی کە لەژیاندا بوو هەرئاوا بە ئەمەك بوو، ئیتر کەوتنە سەوداو ئاڵوێرییەوە لەگەڵیو ئەویش سەودای لەگەڵ کردنو لەکاتی سەودای کڕینو فرۆشتنەکەیاندا وردەوردە نرخەکەی لەسەر زیاد دەکردن، ئەوانیش دەگەڕانەوە بۆ لایو سەودایان لەگەڵ دەکردەوە تاکو لەگەڵی ڕێککەون.. بەڵام ئەو لاوە نرخەکەی لەسەد دنیارەوە زیاتر کرد بۆ دووسەد دینار، پاشان بۆ چوارسەد، پاشان بۆ هەشت سەد دینار،

پاشان داوای لێ کردن بیخەنە قەپانەوەو بیکێشن‌و بەقەد کێش (مانگاکە)ی خۆی ئاڵتوون بدەن لە نرخیدا. ئەوانیش ناچار بوون بەو مامەڵەیە قایل بن لەبەر ئەوەی هیچ مانگایەکی تری هاوشێوەی نییەو، ئەو نرخەی کە لاوەکە داوای دەکرد پێیانداو، ئەویش بووە یەکێك لە دەوڵەمەندە گەورەکان، ئەمەش گوایە بەهۆی چاکی‌و بەئەمەکیی لەگەل باوك‌و دایکیدا.

مانگاکەیان وەرگرت‌و سەریان بڕی، پاشان بەشێك لەلاشەی مانگاکەیان هەڵگرت‌و دایان بەجەستەی کوژراوەکەدا (لێرەدا ئەوانەی دەقە ئیسرائیلییەکانیان گێراوەتەوە جیاوازییەکی گەورە لە وتەو بیروڕایاندا هەیە لەمەڕ دیاری کردنی ئەو بەشەی مانگاکەکە داخۆ دەستی بووە، یان قاچی، یان ڕانی یان سەری یان..؟! بەهەرحاڵ بەوبەشەی مانگا سەربڕراوە، کە لە تەرمی کوژراوەکەیان داوەو ئیدی خوداش کابرای کوژراوی زیندوو کردۆتەوەو کابرا هاتۆتە زمان‌و پێی گوتوون (فلانکەس کە برازای خۆمە منی کوشت) دوای ئەم وتەیە مردووەتەوە ئینجا گەنجە بکوژەکەش لە میراتی مامی بێبەش کراوەو ئەمەش سزایەك بووە لەسەر تاوانەکەی، لەو رۆژەشەوە هیچ بکوژێك میراتگری کوژراوەکە نەبووە"[١].

ئەم بەسەرهاتە ئیسرائیلیانە، بەتایبەتیش وەك ئەوەی، کە لەو ئایەتانەی چیرۆکەکەی سوورەتی (بقرە)شدا باسکراوە لێی وەردەگرین‌و پێوەی پابەند دەبین‌و دەیلێینەوە مادام لە قورئانیشدا هاوشێوەیەکی بەدی بکەین، هەندێك بەسەرهات‌و ریوایەتی وایشیان هەیە، کە ئایەتەکانی قورئان هیچ باسێکی لێوە نەکردوون‌و ئێمەش هیچ باسێکی لێوە ناکەین‌و نایلێینەوە، رێگە بەخۆمان‌و کەسانی تریش نادەین، کە سەر بکەنە سەر ئەو بەسەرهاتە پووچەڵ‌و ئەفسانەو ئیسرائیلیاتەو نابێت فەرمایشتی خودایان پێ تەفسیر بکەین.

---

(١) بۆ ئەم ریوایەتانە بڕوانە (الدر المنثور-/ ١: ١٨٦-١٩٧).

## وشە گرانەکانی نێو ئایەتەکانی ئەم چیرۆکە[1]

١- ﴿أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا﴾:- أتتخذنا سخرية/ واتە: (ئایا بەگاڵتە جاڕو گاڵتە پێکراوی خۆمان دادەنێت)؟!

٢- ﴿فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ﴾ :- لاعجوز منه ولا صغيرة فتية/ واتە: (مانگاکە نەپیرو بەساڵا چووەو، نەبچکۆلەو کەم تەمەنە).

٣- ﴿عَوَانٌ بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾ :- وسط في العمرين/ واتە: (لەنێوە ڕاستی هەردوو تەمەنەکە دایە).

٤- ﴿فَاقِعٌ لَّوْنُهَا﴾:- اصغر شديد الصفر (ڕەنگەکەی زەردێکی تێروتۆخە).

٥- ﴿لَّا ذَلُولٌ﴾ ليست هنية سهلة الانقياد/ واتە: (بە ئاسایی رام نەکراوەو ڕانەهێنراوە).

٦- ﴿تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ﴾:- تقلب الارض للزراعة/ واتە: (زەوی دەکێڵێت بۆ چاندن).

٧- ﴿تَسْقِى ٱلْحَرْثَ﴾:- تسقي الزرع/ واتە: (ئاوی پێ دەبرێت بۆ زەویی ئامادەکراوی کشتوکاڵی)

٨- ﴿مُسَلَّمَةٌ﴾:- سالمة من العيوب/ واتە: (لە هەموو خەوش و نەنگییەك پارێزراوە).

---

(١) من بۆ خوێنەرانی بەڕێزی کورد تەرجەمەی ئەم بڕگەیەی چیرۆکەکەم بەپێویست نەدەزانی .. بەڵام لەبەر پاراستنی مافی نووسەرو گەیاندنی ئەمانەتی کارەکە مانای ئەم وشانە (چ مانا عەرەبییەکانی نووسەرو چ مانا کوردییەکانی خۆیشم) داناوە .. (وەرگێڕ)

٩- ﴿لَّا شِيَةَ ﴾: لاعلامة لها، ولا لون غير الاصفر/ واتە: (هیچ نیشانەو هێماو ڕەنگێکی جگە لە ڕەنگی زەرد پێوەنییە.

١٠- ﴿فَٱدَّٰرَءۡتُمۡ فِيهَاۖ ﴾ :- تدافعتهم وتخاصمتم في القاتل للنفس: (واتان لێ هات هەرکەسە گومانی کوشتنی کابرای لەسەر خۆی لادەبردو ناکۆکیتان لەسەری تێکەوت).

## "إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗۖ "

موسا – دروودی لەسەر بێت – داوای لە گەلەکەی کرد، کە (مانگایەك) سەربڕن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ﴾ ئەمە فەرمانی خودای پاكو بێخەوشە، نەك فەرمانی (موسا).. فەرمانی خوداش دەبێت بە پەسەندكردنو تەسلیم بوونو جێبەجێ كردنەوە پێشوازیی لێ بكرێت.

(موسا) بۆیە بەفەرمانی خودا پاڵپشتی داواكەی كرد، وەك ئەوەی زانیبێتی نەریتی گەلەكەی چۆنەو، لە جێبەجی كردنی داواكاندا دوادەكەونو فرۆفێڵ لە كاروبارەكاندا دەكەن، موساش دەیەوێت لە ڕاپەڕاندنی كارەكەدا دەستوبرد بكەن، جا ئەگەر ئەو فەرمانەی بدایەتە پاڵ خۆی، لەوانەیە مشتومڕێكی زۆریان لەگەڵیدا بكردایەو فەرمانەكەشیان ڕەت بكردبایەوە، ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا، كە بێگومان پابەندیی بە فەرمانی ئەو پێغەمبەرەوە (سڵاوی لێ بێت) پێویست (واجب)ە، چونكە پێغەمبەرەكە خۆی فەرمان بەهیچ شتێك بۆ خۆی ناكات، بەڵكو بە فەرمانی خودایە، بۆیە گوێرایەڵیكردنی ئەو پێغەمبەرە گوێرایەڵیكردنی خودایە هەمدیسان موسا پێی ڕاگەیاندن كە فەرمانی خودا ڕوونو دیاریكراوو بێ گرێو گۆڵە ئەوەیە، كە مانگایەك سەربڕن (أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗۖ )..وشەی (بقرة) بەبێ (أل-ی تعریف)- (نكرة)یە، واتە نەزانراوە ومەبەست پێی هەر مانگایەك بێت، نەزانراویی (تنكير)ی مانگاكە ئاماژەیە بۆ گشت مانگایەك...مانگایەك سەربڕن (اذبحوا بقرة) هەر مانگایەك بێت، ئیدی گرنگ مانگایەكە، هەر مانگایەكی نێو مانگایان... كەواتە ناشێت فەرمانەكە ئاڵۆز بێت لەلای ئەوكەسەی، كە دەیەوێت پابەندبێت پێوەیو جێبەجێ بكات، چونكە فەرمانەكە بەو دەربڕینە ڕوونەیەوە هاتووە ..

## " قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًاۖ "

جوولەکەکان دەستبەجێ فەرمانەکەیان ڕانەپەڕاندو گوێڕایەڵیی خوداو پێغەمبەرەکەیان نەکرد، ئاخر ئەوان لەکوێوە ئەو فەرمانە جێبەجێ بکەن، کە خاوەنی دڵە پەیڕەوکارو بەجێگەیەنەرەکان نین؟ ئەوان لەجیاتی ئەوەی ڕێز لە پێغەمبەرەکەیان بگرنو فەرمانەکەی بەجێ بگەیەنن، کەچی بێحورمەتیو بێئەدەبییان بەرامبەریی نواندو، بەرهەڵستیشیان کرد بەوەی، کە گوتیان (ئەری تۆ ئێمە بەگاڵتە چیی خۆت دادەنێیت؟ (أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًاۖ ).. ئایا گاڵتەو سووکایەتیمان پێ دەکەیت لەکاتێکدا ئەم داوایەمان لێ دەکەین؟ سەربڕینی مانگاکە چ پەیوەندییەکی بە ئاشکراکردنی ناسنامەی بکوژەکەوە هەیە؟ ئێمە هاتووین کێشەکەمان بۆ چارەسەر بکەیت، دەمانەوێت بکوژەکەبناسین، جا لە بەر ئەوەی تۆ پێغەمبەرێکیتو بە یارمەتی خودا لەکاری نادیار (غیب) دەزانیت، ئەوا پێویستە هەواڵمان لەسەر بکوژەکە پێ بگەیەنێت، کەچی تۆ لەجیاتی ئەوەی بکوژەکە ئاشکراکەیت داوای سەربڕینی مانگامان لێ دەکەیت، ئەمەش داوایەکی نامۆیەو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گاڵتەمان پێ بکەیت.

ئەم بەرهەڵستی کردنەی جوولەکە بەرامبەر پێغەمبەرەکەیان پەردە لەسەر (سروشتی جوولەکەکانو، شێوازی پەیوەندییان بە پێغەمبەرانیانو، هەڵوێستیان لەئاست فەرمانەکانی خودایان) هەڵدەداتەوە:-

١- ئەوان فەرمانی خودا بەجۆرێك لەگاڵتەو گاڵتەجاڕی دادەنێن.

٢- ئەوان واگومان دەبەن، کە موسا بەم داواکارییە دەیەوێت خەریکیان کاتو لە

مەسەلە بنچینەییەكەیان دووربخاتەوە.

٣- ئەوان وا گومان دەبەن گوایە پێغەمبەرە دڵسۆزو جیددییەكەیان، لەڕێی ئەو فەرمانانەوەی پێیان دەگەیەنێت گاڵتەیان پێ دەكاتو گەمەو وازیو لاقرتێیان پێ دەكات.

ئەمەش وتەی گەلەكەی (ئیبراهیم)مان بیردێنێتەوە، كاتێك (ئیبراهیم) سڵاوی خودای لێ بێت داوای لێكردن، كە تەنها خودای تاكو تەنیا بپەرستنو واز لە پەرستنی بتەكان بێنن، وەك خوداش لەمەڕ بەسەرهاتەكە فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ الأنبياء ﴾.

واتە: (ئێمە ژیریو هۆشمەندیمان پێشتر بە ئیبراهیم بەخشیو چاك لە دەروونی ئەو شارەزابووین (ئەو ژیرییەمان پێ بەخشی، كە هەرشایستەی پێغەمبەرانە بۆ زانینی ڕێی چاكسازیو هیدایەت لە دینو دنیاو ڕێبەرایەتی كردنی خەڵكی بۆ یاسا ئیلاهییەكانی ئێمە ئاوا ئەومان دەناسیو لێی شارەزابووین، كاتێك بەباوكیو بە گەلەكەشی گوت (ئەرێ ئەم پەیكەرانە چییە، كە ئێوە بەردەوامن لەسەر پەرستنیان) ئەوانیش گوتیان: (ئەرێ تۆ حەقت بۆ ئێمە هێناوە، یان گاڵتەمان پێ دەكەیت)؟ ئیبراهیم لە وەڵامدا گوتی: (من گاڵتە ناكەم، بەڵكو دەمەوێت تێ بگەن لەوەی، كە پەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەكانو زەوییە، كە دروستی كردوونو بەدیی هێناونو بۆیە من لەسەر ئەو بیروباوەڕە لە شاهیدو ئاگادارانم).. واتە

دەبێت پەروەردگاری خۆتان، کە پەرروەردگاری ئاسمانەکانو زەوییە، هەر ئەو بپەرستن.. ئیتر ئەمە چ گاڵتە پێکردنێکی تێدایە؟.. کەوابوو گەلە بێباوەڕەکەی ئیبراهیم ناڕەزاییان لەسەر ئەوەهەبووە گوایە گاڵتەیان پێ دەکات، بۆیە پێیان گوتوە: (ئەرێ تۆ هەقت بۆ هێناوین، یان گاڵتەمان پێ دەکەیت) ﴿أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ﴾؟

گەلەکەی موساش هەرچەندە پڕوپاگاندەی ئیمانداریێتیان بۆ خۆیشیان کردووە، ناڕەزاییان لێ دەربڕیوە گوایە گاڵتەیان پێدەکات، بۆ پێیان گوتووە: ﴿أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا﴾ جیاوازی نێوان ئەم دوو ناڕەزاییە چییە؟

هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆیان تێدا بەدیی ناکەین، سەرباری لێك جودایی ناڕەزاچییەکان، ڕاستە، کە گەلەکەی (ئیبراهیم) - دروودی لەسەر بێت- کافربوونو بتیان دەپەرستو، گەلەکەی (موسا)ش - دروودی لەسەر بێت- باوەڕیان پێ هێنابوو، بەڵام ئاخر چ وەسفێك بۆ (گەلێکی ئیماندار بە پێغەمبەرەکەیان) دادەنێیت، کە ئەوەیان بەخەیاڵ دابێتو گومانیان وابێت گوایە ئەو پێغەمبەرەی باوەڕیان پێ هێناوەو پەیڕەویی دەکەن، سووکایەتیو گاڵتەیان پێ بکات؟

## "قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ "

وەڵامی (موسا) - درودی لێ بێت- لەسەر نارەزایی گەلەکەی، ئەوەبوو تێی گەیاندن کە ئەو نەریتی گاڵتە پێکردنو سووکایەتیی تێدانییەو ئەوەشی بەجەهلو نەفامی لەقەڵەمداو گوتی: ﴿قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾، (پەنا دەگرم بەخوا لەو نەریتەی، کە من لە جاهیلو نەفامان بم)... ئەمەش دەلالەتە لەسەر ئەوەی کەوا سووکایەتیو گاڵتەپێکردن نەفامییە بەتایبەتی ئەگەر لە مەسەلە ئایینییەکانو حوکمە شەرعییەکاندا بێت.

-جاهیلن ئەوانەی ئاینەکەیان بە گاڵتەوگەپ گرتووەو، ئەوانەش کە هەموو شتێك بە وازیو گاڵتەوگەپ دادەنێن، تەنانەت دینەکەیانو ئیسلامەکەیانو حوکمەکانی ئیسلامیش بەگاڵتە دادەنێن.

-جاهیلن ئەوانەی کەیفو خۆشییان تەنها بە نوکتەبازی لەسەر بەها ئایینییەکان دێتو، ئەوانەی ژیانی خۆیانو خەڵکی تریشیان کردووە بە پێکەنینێکی هەمیشەییو نوکتەبازیی نەبڕاوەو، کۆمیدیای بەردەوام.

بەڕاستی موسڵمانی ڕاستگۆو جیددیو وابەستەیە لەو کەسانەیە کاتێك، لەوانەیە قسەیەکی خۆش بۆ پێکەنین بکات، بەڵام لەوەشدا جگە لە هەقو ڕاستی، شتێکی دی ناڵێت، لەوانەشە پێ بکەنێت بەڵام بە ئەدەبو ڕێزو ویقارێکەوە پێدەکەنێت، دەنا یان دەبێت ژیانی هەموو بکات بە گاڵتەجاڕیو سووکایەتیو یاریو ڕابواردن، ئەمەش پێچەوانەی پەیامو ئامانجی ژیانیەتی.. دیارە ئەم موسڵمانە جیددیو دڵسۆزەش ڕازی نییە، کە ببێتە یەکێك لە نەفام وجاهیلان.

## " قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ "

ئەم برگەیە بێشەرمییەکی تەواوە لە بێشەرمییەکانی جوولەکە تێدایەو، بێئەدەبییەکیشە لە دواندنی پێغەمبەرەکەیانداو، لە شێوازی ئاخاوتنیشیان دەربارەی خودای پەروەردگاری جیهانیاندا.. لە رستەی فەرمانباری (ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ)دا وشەی (ربك) هاتوو واتە (خودای خۆت، پەروەردگاری تۆ) بەمانای خودایان تەنها بەخودای –موسا- داناوەو بێ ئەوەی باسی خۆیان بکەن.. دیارە جیاوازییەکی گەورەش لە نێوان وتەی (خودای تۆ) و(خودای ئێمە)دا هەیە، وەك ئەوەیە بڵێن (ئەوە خودای تۆیە) نەك (خودای ئێمە)، خودای تۆیە، کە ئەم فەرمانەی پێکردووین، دەتۆش داوای لێبکە مەبەستەکەمان بۆ روون بکاتەوەو فەرمانەکەمان بۆ ئاشکرا بکاتو، تەمو مژی تێدا نەهێڵێت.

بێگومان ئەم وتەیەی، کە لە جوولەکەکانەوە دەرچووەو، کە پەردە لەسەر سرووشتو نەریتیان هەڵدەتەوە لەکوێی وتەی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەری ئیسلام محمدﷺ دایەو (خودا لێیان رازی بێت) کاتێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەدوان هەموو وتەیەکیان رێزو ئەدەب وشکۆی تێدابوو، وەك خوداش ستایشی کردوونو لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ...

﴿...وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن

قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ البقرة ﴾

واته‌ (پێغه‌مبه‌رو هاوه‌ڵانیشی پێكه‌وه‌گوتیان (خودایه‌ فه‌رمانی تۆمان بیستو گوێرایه‌ڵو په‌یڕه‌وكاریی بووین، ئه‌ی خودای په‌روه‌ردگارمان تۆش لێمان خۆش به‌، سه‌رئه‌نجامو گه‌ڕانه‌وه‌مان هه‌ربۆ لای تۆیه‌. خوداش كار به‌هیچ نه‌فسێك ناسپێرێت، ته‌نها به‌گوێره‌ی تواناو وزه‌ی ئه‌و نه‌فسه‌ نه‌بێت، هه‌ر كارێكی چاك ئه‌نجام بدات بۆ سوودو به‌رژه‌وه‌ندیی‌و سه‌رفرازیی خۆیه‌تی، هه‌ر كارێكی خراپو ناله‌باریش ئه‌نجام بدات له‌زه‌ره‌رو سزای خۆی دایه‌.. ئه‌ی خودای په‌روه‌ردگارمان سزامان مه‌ده‌، ئه‌گه‌ر شتێكمان فه‌رمۆش كرد، یان هه‌ڵه‌یه‌كمان له‌ده‌ست ده‌رچوو، ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان وامان لێ نه‌كه‌یت بارێكی قورسو گران له‌سه‌رشانمان دانێیت (واته‌ ئه‌و ئه‌ركه‌ زۆر قورسانه‌مان نه‌خه‌یته‌ ئه‌ستۆ، كه‌ وره‌و وزه‌ی مرۆڤیان تیادا خاو ده‌بێته‌وه‌)و، كه‌ خستبووته‌ ئه‌ستۆی گه‌لانی پێش ئێمه‌. ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان ئه‌ركێك مه‌ده‌ به‌سه‌رماندا، كه‌ نه‌توانین رۆژانه‌ جێبه‌جێی بكه‌ین‌و توانامان تیایدا نه‌بێت. چاوپۆشیی له‌ گوناهانمان بكه‌و، لێمان ببووره‌و، به‌زه‌ییت پیامان دابێته‌وه‌، هه‌ر خۆت پشتو په‌ناو خاوه‌نی ئێمه‌ت، سه‌رمانخه‌ به‌سه‌ر گه‌لی كافرو بێباوه‌ڕاندا).

## پرسیار له‌سه‌ر ته‌مه‌نی مانگاكه‌

خودا ده‌فه‌رموێت: ﴿ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ وَلَا بِكۡرٌ عَوَانُۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَۖ ...﴿٦٨﴾ البقرة ﴾.. گومانیان وابووه‌، كه‌ نادیاری‌و نه‌زانراویی ته‌مه‌نی مانگاكه‌ لایه‌نێكی باشه‌، تا پیشانی ده‌ن، كه‌ ئه‌گه‌ر بتوانێت ته‌مه‌نی مانگاكه‌یان بۆ دیاری بكات، ئه‌وا ده‌یناسن، هه‌ر بۆیه‌ش

پرسیاریان لەسەر تەمەنی مانگاکە لە (موسا) کردو گوتیان- (ما هي)؟ ئەویش لە وەڵامی پرسیارەکەیاندا گوتی: (انـه يقـول..) بێگومـان خـودا دەفـەرمووێت: کـە تەمەنی مام ناوەندییـە، واتـە بـە فەرمایـشتی خـودا وەڵامـی دانـەوە، تـاکو وا دەرنەچێت، کە ئەمە وتەی خۆیـەتیو پاشـان تـاکو لـەنێو دڵیانـدا هانـدەرێك بـۆ وابەستەیيو هۆکارێك بۆ جێبەجێ کـردن بخولْقێنێـت، چـونکە ئەمـە فەرمایـشتی خودایەو پێویستە لەسەرتان بەخێرایی فەرمان و فەرمایشتی خودا جێبەجی بکەن.

تەمەنی مانگاکەش (بەپێی فەرمایشتی خودا) میانە ساڵە، نە پیرێکی بەسـاڵا چووەو، نە گۆلکێکی بچکۆلەش.. وادیارە بەهۆی میانەساڵیی تەمەنی مانگاکـەوە ئاماژە بۆ خۆشترین گۆشـتی ئـاژەڵانیش کرابێـت کـە بەچـێژترین تـامو باشـترین خۆراکیش هەبێت ئەوەیە لەتەمەندا میانە ساڵ بن، چونکە گۆشتی ئاژەڵی بـچووك کە هێشتا لەسەرەتای گەشەکردنی دایە هەندێك سوودی خـۆراکیی کـەم دەبێتـەوە ئەگەر بخورێت، گۆشتی ئاژەڵی پیروگەورەش جیڕو وشـكو رەقـەو هەنـدێك سـوودی خۆراکیی تیادانەماوە.

## "فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ "

(موسا) سەری سوڕما لە سستیو دڕێغیی گەلەکەی لە جێبەجێکردنی فەرمانی خوادا، هەروەها وەڕس بوو بەو زۆربڵێییو چەنەبازییەیانو بەزۆریی پرسیاریان، کە هیچ پێداویستیو سوودێکی تیادا نەبووەو، تەنها بەفیرۆدانی داواکارییەکەو خۆ دواخستن لە جێبەجێ کردن بووە، لەبەر ئەمەش ئاراستەی کردوون بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکەو پێی گوتوون: ﴿فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ﴾ بەم رستەیەش بانگی کردوون بۆ گۆڕینو چاکردنی هەڵوێستیان بەرامبەر فەرمانەکانی خوداو، ئەم فەرمانەش بەپەلەو خێرایی بەجێ بگەیەنرێتو، سووریش بن لەسەر جێبەجێ کردنی.

کەواتە پێویستە فەرمانی خودا بەراپەڕاندنیەوە پێشوازی لێ بکەن، نەك بە نارەزاییو هەڵوێستی میزاجیانەوە.

جیاوازیی نێوان (ئەم هەڵوێستەی جولەکەکان) و(هەڵوێستی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خودا لێیان رازی بێت- لەئاست فەرمانەکانی خوادا ئەوەیە، هاوەڵان فەرمانی خودایان، تەنها بۆ جێبەجێ کردنو بەئەنجام گەیاندنو پێوەپابەندبوون، لەم وەرگرتووە لەم بوارەشدا چەندین نموونەی بەرزو چەندین وێنەی بەهاداریان خستۆتەڕوو.

## پرســـیاریان دەربارەی ڕەنگـــی مانگاکە

ئەوان دوای پرسیاریان لەسەر تەمەنی مانگا کەش داواکـاریی موسـایان بـەجێ نەهێناو، خێرا مانگاکەیان سەر نەبڕی، بەڵکو سەر کێشیو عینادییـان هـانی دان بۆ پرسیارێکی تازە.

کاتێك موسا تەمەنی مانگاکەی بەفەرمایشتی خودا پـێ گـوتن‌و، هـیچ تـەم‌و مژێك لەوە دانەما، دووبارە وایان بۆ دەرخست کە هێشتا تەم‌و مژ لەسـەر لایـەکی دییە، لەسەر ڕەنگییەتی، ئەی داخۆ رەنگی چۆنابێت، ئەمان نازانن ڕەنگـی چـۆنە، گـەر بیـزانن سـەری دەبـڕن: ﴿قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا﴾ موسـا ئەوەشـی بـۆ دەرخسـتن‌و گـوتی: ﴿يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّـٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾ البقـرة﴾... بـۆ ڕوونکردنـەوە، کـە زەردێکـی تۆخـەو هێنـدە زەردێکی ساف‌و بێ گەردە، کە هیچ تێکەڵی‌و لەیەك چوونێکی لەگەڵ رەنگێکیـدی دا نییە، تەنانەت تاڵێك لە تووکەکەشیی نییە کە زەردێکی تۆخ نەبێت.

بێگومان خودا بەم رەنگ‌و تەمەن دیاریکردنە کارەکەی لەسـەریان تونـدو گـران کردۆتەوەو خستوونییە تەنگانەیەکی سەختەوە، ئەمەش وەك سزایەك بۆیان، چونکە مانگای رەنـگ زەرد کەمـەو، مانگایـەك، کـە رەنگێکـی زەردی تـۆخی هـەبێت دەگمەنەو بەزەحمەت پەیدا دەکرێت، جگە لەوەی، کە خەڵکی تەماشاکاری دڵخۆش بکات (تسر النـاظرین) ئەگەر سەرنجی ورد لەم رستەیە بدەین چەند خاڵێکی گرنگی تیادا بەدیی دەکەین:-

١- بێگومان مانگای رەنگ زەردی تۆخ لەلای خـاوەنی زۆر خۆشەویسـتە چـونکە

تەماشاکاران دڵخۆش دەکاتو خەڵك حەز دەکەن هەرسەیری بکەن، بۆیە بەنرخێکی هێجگار زۆر نەبێت نایفرۆشن.. دیارە ئەمەش تەنگی بەهۆزەکەی (موسا) هەڵچنیوە.

٢- بێگومان ڕەنگی زەردی تۆخ ڕەنگێکی جوانەو هەموو دەروونێك حەزی لێ دەکاتو تەماشاکاران دڵشادوخۆ شحاڵ دەکات.

٣- بێگومان مرۆڤی خاوەن فیطرەت ڕاستو وسروشتی ساغ واخولقێنراوەکە رەنگە جوانەکانی خۆش بوێت، خۆ شویستنی جوانییش بەرهەڵستیی ئایین ناکاتو سەرپێچی لەپابەندبوونن ناکات، بەڵکو ئەحکامی ئایین هاندەری ئەم سیفەتەیەو ئاماژەشی بۆ دەکات، بەڵام چەند مەرج ورێکخەرێکی بۆ داناوە تاکو نەگاتە رادەی حەزی بەرەڵلاییو ئارەزووی ئاژەڵیانە.

٤- باشتروایە بۆ موسڵمان کاتێك شتێك هەڵدەبژێرێت یان کەرەسەیەك دەکرێت کە بەجوانی دەسنیشانی بکات تاکو تەماشاکارانی دڵخۆش کات سائیتر کەرەسە جوانەکە ئاژەڵێك، یان میوەیەك یان خۆراکێك یان جلو بەرگێك، یان راخەرو شتومەکی ناومالّ بێت، چونکە "هەستی هونەریی" بناغەی هەڵبژاردنو دەست نیشان کردنە.

٥- بێگومان ئەم ڕاستی یە بانگەوازێکیشە بۆ جوان کردنی ژیانی موسوڵمانو شادی پێ دانی بەوەی بۆی دەڕوانێت، لەبەر ئەمە ژیانیشی بەجوانی دەباتەسەرو فەرمانو کاروباریشی بەجوانیو بەشادمانیی دەروونیو، بەزەوقێکی هونەریو، هەستێکی جوانکاریانەوە جێبەجێ دەکات.

## "إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا"

پرسیاری سێیەم لە (موسا) دەکەن وای بۆ دەرخەن، کە ئێستا تەمومژ لەسەر چۆنیەتی کار پێ‌کردنی مانگاکەیە، کە ئاخۆ لای خاوەنەکەی چ ئیشێکی بۆ دەکات.. ﴿ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ ﴾؟! تەنها لێرەشدا هەستیان بەنکوولی‌و دواکەوتن‌و تەمەڵیی خۆیان‌و گەڕان بەدوای ئەوەی خێری تیادانییە، کردووە، بۆیە پاساویان بۆ (موسا) لەسەر پرسیارکردنیان وخۆ دواخستنیان لە ڕاپەڕاندنی فەرمانەکەدا بەوە هێناوەتەوە کە گوتوویانە: ﴿... إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ﴿٧٠﴾ البقرة﴾.. بەمانای ئێمە نازانین چ مانگایەکە چونکە، بەهۆی لەیەك چوونی مانگاکان‌و تێکەڵ بوونی کاروبار لەسەرمان، نازانین کامەیان خوازراوە لەنێو مانگایاندا؟! لای ئەوان مانگاکان لەیەك چوون، بەڵێ وایە، بەڵام کێ سەبەبکاری ئەوەیە؟ هەرخۆیانن، دەنا گەر هیچ پرسیارێکیان لە (موسا) نەکردایەو هەر لەسەرەتادا کارەکەیان بۆ جێبەجێ بکردایەو هەر مانگایەکیان لەنێو مانگاکانی تردا بگرتایەو سەربڕیایە، ئەوا سەریان لێ تێك نەدەچووو مانگاکان لەبەرچاویان لەیەکتر نەدەچوون‌و، ئەرکی خۆیشیان بەئەنجام دەگەیاندو داواکاریەکەشیان ڕادەپەراند بەڕاستی شوبهەکاری‌و گومان بردن‌و دڵەڕاوکێ، ئەو باجانەن، کە پێویستە گشت کەسێك لەوانەی شەرعی ئاسانی خودا پشتگوێ دەخەن‌و پەنادەبەنە بەر خەستکردنەوەو ئاڵۆزکاری‌و، دەگەڕێت بەدوای شتی بێ سوودو خێردا..

ئایا چەند کەس دەبینین لە نموونەی خەڵکانێك، کە فەرمانی ئاسان‌و خێردارو

ڕۆشنی نێو شـەرعی خودایـان ڕەت کردۆتـەوەو، لەئاکامـدا تووشـی ئاڵۆزکـاریو تەنگەبەریو بارگرانیو شەرمەزاریو سەرلێتێك چوونو تێکـەڵکاریو شـوبهەکردن بوون.

(موسا)- سلاوی لێ بێت- وەلامـی ئـەو پرسیارەشـیانی بـەوە داوەتـەوە، کـە چۆنیەتی کارکردنی مانگاکەی لـەلای خاوەنـەکانی بـۆ باسـکردوونو گوتوویـەتی:

﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ... ﴿٧١﴾ البقرة﴾، ئەم مانگایە بۆکارکردن ڕانە هێنراوەو، زەویش ناکێڵێتو، ئاویـشی بـۆ کـشتوکاڵ پێناکێـشرێتو بـۆ ئـاودێری بـەکارناهێنرێت، بـەلام زۆر خۆشەویستو بەنازە لەلای خاوەنەکانیو، هەروەها سـاغە ﴿مُسَلَّمَةٌ﴾ واتـە لـەش ساغو تەندروستە وهیچ کەموکووڕیو عەیبو دەردێکیشی نیە، شائیدی لە لاشەی، یان لەگۆشتەکەی، یان لە ڕەنگو دیمـەنی، یـان لـە تەمـەنیو ژیـانی، یـاخود لـە کارکردنو فەرمانیدا. لە هیچ ڕوویەك لەم ڕوانەوە خـەوشو نـەنگیو کـەموکووڕیی نییە هەروەها بێ نیشانەو خاڵو پەڵەیە ﴿لَّا شِيَةَ فِيهَا﴾ واتە: هـیچ نیـشانەیەکی ناسینەوەو جیاکردنەوەی نییـەو تاکـە تـاڵێکی تووکەکـەی ڕەنگـی جیـاواز نییـەو هەموو لەشی لەدەرەوە زەردێکی تۆخە ئەمەیە ئەو مانگایەی، کە لێیان داواکراوە، جا لە کوێ دەیدۆزنەوە؟ کەی دیدۆزنەوە؟ نرخی چەند دەبێت؟!

## "قَالُوا۟ ٱلْـَٔـٰنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ "

دوای ئەوەی (موسا) سلاوی لێ بێت ئەو زانیاریانەی بە گەلەکەی گەیاندو وەلامی پرسیارەکانیانی دایەوە، ئەوانیش پێیان گوت: ﴿ٱلْـَٔـٰنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ﴾. لەم دەستەواژەیەوە لە ڕەوشتی نزمی جوولەکەو بێ حورمەتیی بەدکارانەیان‌و هەڵسوکەوتی خراپیان شارەزادەبین، کە چۆن لە وتەو گفتارو کرداریانداو لە هەڵوێستیان بەرامبەر پێغەمبەراندا ڕەنگ دەداتەوە. ئەوان قسەی ناشایستەی خۆیان بە (موسا) گوتووە. بەلام (موسا) کییە؟

ئەو پێغەمبەریانە، کە ئیددیعایان دەکرد لەسەر ئەوەی گوایە باوەڕیان پێ هێناوەو لە سەرشۆڕی وبێ دەسەلاتی ڕزگاریی کردوون‌و، بەرەو سەربەرستی‌و دەسەلاتداریێتی بردوون.

(گوتوویانە: ئێستا هەقت بۆ هێناین/ قَالُوا۟ ٱلْـَٔـٰنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ)هەر تەنیا ئێستا، وەك ئەوەی گوایە پێشتر هەقی بۆنەهێنابن، وەك ئەوەی گوایە پێشتر دەربارەی (ناهەق/ باطل) قسەی بۆکردبن، وەك ئەوەی گوایە گفتوگۆی نێوان خۆی‌و ئەوان پێشتر لەسەر ناهەق‌و باطیل بووبێت، وەك ئەوەی گوایە (موسا)ی پێغەمبەری بەرێز بەناهەق بانگەوازی کردبن .. وەك ئەوەی گوایە کاتێك فەرمانی سەربڕینی مانگاکەی پێ گەیاندن‌و تەمەن‌و ڕەنگ‌و ئیشەکەی پێ گوتن هەمووی بەناهەق بووبێت.. وەك ئەوەی کاتێك پێی گوتون ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ﴾، بەناهەق پێی گوتبن، وەك ئەوەی هەموو وتەکانی تری ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ﴾ و ﴿فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ﴾ی بەناهەق پێ گوتبن:- وەك ئەوەی هەموو ئەو شتانەی ڕابردوو ناهەق‌و پووچەڵ‌و نارەوابووبن‌و، تەنیا ئەوەی ئێستا باسی دەکات هەق بێت ئیتر ئەوە جوولەکەیەو، ئەوە نەریتی جوولەکەیەو، ئائەوەش ڕەوشتی جوولەکەیە.

## "فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ "

لەدواییدا جوولەکان فەرمانەکەیان جێبەجێ کردو، مانگاکەیان سەربڕی. دوای عینادیو زۆر گوتنو پرسیاری زۆرو سستی نواندنو خۆ دواخستن سەریان بڕی. سەریان بڕی، بەڵام وەك ئەوەی سەریان نەبڕی بێت. خۆ ئەگەر ئەوان لە دەرچوونی یەکەم فەرمانەوە بۆیان سەربڕدرایە، ئەوا بە (جێبەجێکاری فەرمانەکە)و (دەست و برد لێکاری)و (پاداشت وەرگرانی)و (بەهرەمەندان)ی دادەنران.

بەڵام ئێستا دوای ئەو هەموو پرسیارانەو دوای دواخستنو تەمەڵی نواندن، چەند نەریتو رەوشتو تایبەتمەندیەکیان لەدەست داوە، وەك نەریتی خێراکردن لە ڕاپەڕاندنداو، سیفەتی سەربازێتی بۆخوداو، خواستی پابەندی بەفەرمانەکانو دەست کەوتنی رەزامەندیی خودا، لەبەر ئەمەیە خودا فەرموویە ﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ﴾، (مانگاکەیان سەبڕی، بەڵام وەخت بوو سەری نەبڕن)، لەم فەرمایشتەدا وشەی (ما کادوا) دەلالەتە لەسەر بەئەنجام گەیاندنی کردار لەپاش بارگرانیو زەحمەتێکی زۆر، هەروەها دەلالەتە لەسەر خاوو خلیچکییان لە ڕاپەڕاندنو، فێڵبازیو تەڵەکەبازیی تیایدا بەجۆرێك، کە هەتا ناچارو شەرمەزار نەبوون فەرمانەکەیان ڕانەپەڕاندووە.

(ئیمام (راغب)ی اصفهانی) دەربارەی وشەی (کاد) گوتوویەتی: "کاد الزند: اذا تباطأ بأخراج نارە... واتە کرداری (کاد الزند)- (خەریك بوو ئاگر پژێنەکە ئاگرەکە دەرکات ئەمە لەکاتێکدا دەگوترێت، کە لە دەرکردنی ئاگرەکەدا سستیی نواندبێت، لێرەدا (کاد) بۆ نزیك خستنەوەی کردارەکەیە، هەروەها دەگوترێت: (کاد یفعل) خەریك بوو بیکات ئەگەر نەیکردبوو (اذا لم یکن قد فعل)، خۆ ئەگەر پێتی

(نفی)ی لەگەڵ دابێت ئەوا بۆ ڕوودانی کردارەکەیەو، نزیکیش دەبێت لەوەی ڕوونەدات"[1].

بێگومان ئەوکەسەی بەناچاریو شەرمەزاری فەرمانێك جێبەجێ بکات، وەك ئەوەیە، کە نەیکردبێت، چونکە خودا ئەوەی لە فەرمانپێکراو دەوێت، کە فەرمانەکە بەچالاکیو هیمەتو دلفراوانیو حەزو پەرۆشییەوە جێبەجێ بکات، هەروەها بەئارەزوومەندیو خۆشەویستیو قایل بوونەوە جێبەجێی بکات. خودا دەیەوێت هەموو قەوارەی مرۆڤ لەتامو لەزەتی ڕاپەڕاندنو پابەندیو ئامادەباشی دابێت، ئەمەش تەنها لەکاتی پەلەکردن لە ڕاپەڕندنو، چالاکیو گورجو گۆڵیی بەئەنجام گەیاندندا بەدیی دێت.

جا ئەو کەسەی فەرمانێك بەدرەنگ جێبەجێ دەکاتو پێش جێبەجێکردنەکە تەمەڵیو فرۆفێڵو پێچو پەناو خۆ لێدزینەوەی تێدا دەنوێنێت، ئەگەر لە هەموو ئەم هەولانەدا شکست بێنێتو بەناچاریو زۆر لێکراویو سەرکزییەوە جێبەجێی بکات، وەك ئەوە وایە، کە جێبەجێی نەکردبێت، چونکە هەموو قەوارەی جەستەو گیانی بەشداریی لەزەتی ڕاپەڕاندنەکەیان نەکردووە، بەڵکو تەنها ئەندامەکانی، یان چەند ئەندامێکی لاشەی، بەم ڕەنگەش حیکمەت لەو فەرمانو ڕاسپاردەیەدا بەدی نەهاتووە، چونکە جێبەجێ کردنو نەکردنی وەك لە ڕووی ڕەهەندی پەروەردەییو ڕێنماییەوە.

خودای مەزن دەربارەی قوربانییەکانو دیارییەکان (الهدى)، کە حاجییەکان لە حەجدا سەریان دەبڕن: ﴿ وَٱلۡبُدۡنَ جَعَلۡنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞۖ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّۖ فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ

---

(١) المفردات فی غریب القران س(٤٤٣).

كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾ الحج

واته: (ئێمه ئەوەی بەدیاری دەبرێت بۆ ماڵی خودا لەحوشترو لەمانگا کردوومانه بەدروشمێکی خودا کە (پێویستەلەکاتی حەجو جەژنی قوربان دا ئەنجام بدرێت) بێگومان ئەوه خێری زۆری بۆ ئێوه تێدایەو ئێوەش ناوی خودا لەکاتی سەربڕین دابەن و بڵێن: (بسم الله .. الله اکبر) کاتێك قوربانییەکان بەمردوویی کەوتنه سەرزەوی لەدوای سەربڕینیانو (کەوەختی لێ خواردنیان هات، لێ یان بخۆنو بەشی هەژارانو داواکارانی لێ بدەن، ئێمه بەو شێوەیە ئاژەڵ ومالاتمان بۆ ئێوه بەیدەست (تسخیر) کردووه تاکو سوپاسگوزارو شوکرانه بژێربن. خوداش هەرگیز گۆشتەکەیو خوێنەکەی پێ ناگات، بەڵکو تەقواو پارێزکاریی ئێوەی پێ دەگات. ئابەو شێوەیەخودا مەڕو مالاتی بۆ ئێوه بەیدەست کردووه، تا لەکاتی سەربڕیندا خودا بەگەوره بگرنو بڵێن: (الله اکبر)و ڕێزو قەدری گەورەیی خودا بزانن لەسەر ئەوەی، کە ڕێنمایی کردوونو بۆ ڕێی ڕاستی عیبادەت، جا ئەی پێغەمبەر مژده بەچاکەکاران، خێرخوازان بده).

له فەرمانه خودایی یەکاندا چێژو لەززەت ناخوازرێت (هەرچەنده پێویسته لەسەر مرۆڤی موسڵمان بەو شێوازەی شەرع دیاریی کردووه جێبەجێیان بکات) بەڵکو بەروبوومو ئامانجو کاریگەریی لەسەر موسڵمانەکه دەخوازرێت.

مرۆڤی موسڵمان لەڕێی فەرمانه خوداییەکانەوه دووکاری پێکەوه گرێدراوی لێ خوازراوه، یەکەمیان: ڕاپەڕاندنی فەرمانەکه بەوشێوەیەی، کە ئیسلام دیاریی کردووه، دووەمیشیان: بەدیهێنانی ئامانجی فەرمانەکەیه لەسەر ژیانیو قەوارەو ڕەفتاری، بەلام ئەو جوولەکانەی کە لە درەنگانێکدا مانگاکەیان سەربڕی،

حیکمەتی ئەو فەرمانەیان بەدیی نەهێنا، چونکە دەستبەجێ لەکاتی خۆیدا جێبەجێیان نەکردو، قەوارەی لەشیو گیانیشیان لەززەتی ئامادەگیی سەربازییانەو وابەستەییی بەرنەکەوت، جا لەبەرئەوەی ئەو ئاسەوارە گەورانەو ئەو مانا بەرزانەیان لەدەستدابوو خوداش لەبارەیانەوە فەرموویە: ﴿...فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ... ﴿٧١﴾ البقرة﴾.

## هۆی سەربڕینی مانگاکە

خودا فەرموویە: ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَءْتُمْ فِيهَا ۖ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ ...﴿٧٣﴾ البقرة﴾.. قورئان باسی هۆی فەرمانی سەربڕینی مانگاکەی خستۆتە دواوەی چیرۆکەکە، خوێنەریش لەسەرەتادا لەسەر ئەوە دەوەستێت کەفەرمانێك بەو گەلەکراوە بەسەربڕینی مانگاکە، پاشان سستیو کەمتەرخەمییان لە ڕاپەراندنی فەرمانەکەدا بەدی دەکات.. داخۆ بۆچی خوێنەری چیرۆکەکە هۆی سەربڕینی مانگاکە لەم کۆتاییەدا دەزانێت؟!

ئەمەش شێوازێکی هونەریی چیرۆك گێڕانەوەی قورئانە.. (سید قطب) خودا لێی خۆشبێتو پلەی بەرزکات- لەتە فسیرەکەیدا (في ظلال القرآن) دەڵێت: (لەکۆتاییدا دێینە سەرجوانیی خستنە ڕووی چیرۆکەکەو ڕێکخستنی لەگەڵ ئەم بەشەی دواییدا.. ئەمە چیرۆکێکی کورتەو لەسەرەتادا ئێمە لەبەردەم نادیار (مجهول)ێکدا دەوەستین، کە نازانین چیی لەدواوەیە .. ئێمە لە سەرەتای چیرۆکەکەدا نازانین بۆچی خودا فەرمان بە (بنواسرائیل) دەکات، کە مانگایەك سەربڕن، هەروەها (بنو ئیسرائیل)یش لەوکارەدا نەیانزانیوە بۆچییە، لەمەشدا تاقیکردنەوەیەك بۆ ڕادەی پەیڕەوکردنو بەدەمەوەهاتنو پێ تەسلیم بوونی ئەوان

هەیە.. پاشان گفتوگۆی نێوان موساو گەلەکەی لەچیرۆکەکەدا رێچکە دەگرێتەبەرو، دەبینین گفتوگۆکە ناپچڕێت تاکو ئەوەی لەنێوان موساو خودای پەروەردگاریدا هەبووە بسەلمێت، لەکاتێکدا ئەوان هەموو جارێك داوایان لە موسا دەکرد پرسیارێك لە پەروەردگاری بکات، ئەویش پرسیارەکانی پێ دەگەیاندو وەڵامی لەلایەن خوداوە بۆ دەهێنانەوە.. بەڵام ئاراستەی چیرۆکەکە واناڵێت، کە هەر پرسیاری لە پەروەردگاری کردبێتەوەو، کە ئەویش هەر وەڵامی بۆیان دابێتەوە، بەڵکو هەر بێدەنگییە، کە شایستەی گەورەیی خودایە، ئەو گەورەیییەی کە ناشێت لەرێگەی عینادیو نکوولّیی (بنواسرائیل)دا بەراورد بکرێت پاشان کۆتایی چیرۆکەکە بەو رووداوە لەناکاوە دێنێت ﴿وەك چۆن (بنو اسرائیل)یش لەناکاودا بینیان﴾، کە پیاوە مردووەکە زیندوو دەبێتەوەو رادەپەرێت، ئەوەش بەهۆی ئەوەی بەشێکی مانگایەکی بێدەنگی سەربڕاوی پیادا دەکێشن، ئەو مانگایەی کە ژیانی تیانەماوەو مادەیەکی ژیانیشی تیادا نەبوو، لەوێشەوە (جوانیی راگەیاندنی دەربڕین) لەگەڵ (حیکمەت خستنەرووی بابەتیانە) لە کورتە چیرۆکێکی جوانی قورئانیدا یەك دەگرنو پێك دەگەن)[1].

لەوانەیە حیکمەت لە دواخستنی دیاریکردنی هۆیەکەش ئەوەبێت تا بیسەرو گوێ بیستی ئەم بەرسەرهاتە ئاگاداری نموونەیەك لە نەفس نزمیی جوولەکەو لە ئاکاری خراپیانو، لە هەڵوێستیان بەرامبەر پێغەمبەرانیانو فەرمانەکانی پەروەردگاریان بێت.

ئەوان خۆیان ئاتاجیان بەسەر بڕینی مانگاکە هەبووەو هەر خۆیشیان سوودیان لێبینیوە، کەچی سەرەڕای ئەوەش ئەو ڕەفتارانەیان نواند کە باسمان کرد، ئەی ئەگەر سوودیان لەوە نەبینیبایە ئاخۆ چ ڕەفتارو هەڵسوکەوتێکی تریان بنواندایە؟!

(١) (في ظلال القرآن)، ١: ٨٠.

خودا خواستی وابووە ئەوەی شاردوویانەتەوە دەریخاتو پەردە لەسەر بکوژی ڕاستەقینە هەڵداتەوە. هەرواش بووە، بەشێك لە لاشەی مانگا سەربڕراوەکەیان داوە بە لەشی مرۆڤە مردووە کوژراوەکەداو گیانی بە بەرداهاتۆتەوەو ژیانی بۆ گەڕاوەتەوەو باسی بکوژەکەی خۆی بۆ کردوون ﴿ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَاۚ ﴾ هەندێك لە کەسانی پێشین بیروڕای جیاوازیان لەسەر ئەوبەشەی لاشەی مانگاکە هەیە، کە پێیان داوە لە تەرمی کابرا کوژراوەکە، بەڵام ئێمە جیاوازیی بیروڕاو وتەکانیان باس ناکەینو بەشیاوی نازانین قووڵ ببینەوە بۆ هەوڵی دیاریکردنی ئەو بەشەی مانگاکە، ئەمەش بەهۆی نەبوونی سوود لە زانینیو لە پێداگرتن لەسەری.

(ئیمامی: طبري) مەسەلەی جیاوازی وتەو بیروڕای ئەو کەسانەی بە شتێکی باش دانەناوەو گوتوویەتی: (هەواڵی ڕاست لای ئێمە هەر ئەو فەرمایشتەی قورئانە ﴿ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَاۚ ﴾، تەفسیری ئەم فەرمایشتەش تەنیا ئەوەیە خودا فەرمانی پێکردوون بەشێکی لاشەی مانگاکە (یان بە پارچەیەکی لاشەکەی لە تەرمی کابرای کوژراو بدەن تاکو تەرمە لێدراوەکە زیندوو دەبێتەوە ئیدی هیچ ئاماژەو دەلالەتێکی دی لە ئایەتەکەدا نییەو هیچ هەواڵێکی ئەوتۆش نییە، کە بکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کام بەشو پارچەی مانگاکە فەرمانی لەسەر پێکراوە، تا پێی بدرێت لە جەستەی کوژراوەکە. دەشێت ئەوە نەرمی شانی بووبێت، یان هەر لاو پارچەیەکی تری بووبێت نەزانینی ئەو پارچەیەی، کە لە تەرمی پیاوە کوژراوەکەیان پێداوە، هیچ زیانێکی نییەو زانینیشی سوودمەندنییە، ئەگەرچی دان بنرێت بەوەدا، کە ڕاستە ئەو گەلە بەهەر پارچەیەکی مانگا سەر بڕراوەکە لە تەرمی کوژراوەکەیان داوە، خوداش کابرای کوژراوی بۆ زیندوو کردوونەوە"[1].

---

(١) تفسير الامام الطبري بعناية محمود شاكر ٢: ٢٣١.

## " كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ "

خودا فەرموویە: ﴿ فَقُلۡنَا ٱضۡرِبُوهُ بِبَعۡضِهَاۚ كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٧٣﴾ البقرة ﴾.. بێگومان سەربڕینی مانگاکە خۆی لەخۆیدا ئامانجی خوازراونەبووە، بەڵکو ئامرازێك بووە بۆ بەدییهێنانی ئامانجێکی تر، ئەویش دروست کردنی بەڵگەی کردەییی واقیعی لەسەر توانای خودا لە زیندووکردنەوەی مردواندا، تاکو باوەڕداران باوەڕیان زیاتر بێتو، کەسانی تریش لە مەوقیعی گومانەوە بچنە نێو مەوقیعی باوەڕو ئیمانەوە.

بێگومان تەواوە ﴿كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ بەچاوی خۆتان دیتان، کە (موعجیزەیەکی ڕۆشنی خودایی)تان پیشان دراو ئەوەبوو: مرۆڤێکی مردوو، لاشەیەکی بێگیانو بێجووڵەو، مانگایەکی بێعەقڵو بێ زمان، کە خۆتان سەرتان بڕیوەو بۆتە لاشەیەکی بێ گیانو بێجووڵەو، ئینجا بەشێك، یان پارچەیەکی بێگیان لە پارچەکانی مانگا مردووەکەتان هێناوەو، بەو پارچەیە داوتانە لە تەرمی مرۆڤە مردووەکەو، ئەو گۆڕانە لەناکاوەش ڕایچڵەکاندوون، کە ژیان بەبەر مرۆڤە مردووەکەدا کراوەتەوە (بەهۆی ئەو لێدانەوە)، وەك زیندووەکان دەستی بە جمووجووڵ کردۆتەوەو وەك زیندوانیش قسەی کردووە.. ئەو دیمەنەی دیتان ئاوایە (کذلك) ئاوا خودا مردوان زیندوو دەکاتەوە ﴿كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾و لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوویان دەکاتەوەو، ئەوانیش بە هەموو تایبەتمەندییەکانی ژیانو دیاردەو ڕاستییەکانیەوە لە گۆڕەکانیان دەردەچن.

جا قورئانیش، کە چیرۆکی مانگاکەی وەك بەڵگەیەك لەسەر توانای ڕەهای

خوداو لەسەر زیندووکردنەوەی مردوان لـە ڕۆژی قیامەتـدا خـستۆتەگەڕ، شـێوازی سـەلماندنی ڕاسـتییەکانی بـاوەڕو بنـەماکانی تێـڕوانینی ئیـسلامیو، هێنانـەوە بەڵگەکان لەسەریان دەخاتە بەرچاومان.

قورئان ڕاستییەکانی باوەڕمان، تەنها لەلایەنێکی سـەربەخۆو دابـڕاوەوە پیـشان نادات، بەڵکو دەیانلکێنێت بە بەڵگە بەهێزەکانەوە، ئـەم بەڵگانـەش لـە جیهـانی بینراوی واقیعەوە دەرهێنراون، لەوحاڵەتو بارودۆخانەوە وەرگـیراون، کـە خـەڵکی تیایاندا دەژیو پەییان پێ دەبەنو مامەڵەیان پێ دەکەن. بـەم ڕەنگـەش (بەڵگـەی قورئانی) سانایی‌و ئاسایی‌و هێزو کارایی‌و، گـوڕوتینو زیندوویـەتی‌و، سـەرکەوتنی لە چەسپاندنی ڕاستییە لێدواوەکانیدا دەبێت.

هـەروەها قورئـان لـە چـیرۆکەکانیدا ئـامراز دروسـت دەکـات بـۆ سـەلماندنی ڕاستییەکانی باوەڕو، گێڕانەوەی ئەو چیرۆکانەش دەبێتە بوارێـك بـۆ خـستنە ڕووی ئەو ڕاستییانەو جەخت لەسەرکردنیان.

ئەمەش بەڵگەی ئەو قسەیەمانە، کە دەڵێین: (چیرۆکەکانی قورئان لـە نـاواخنو کرۆکیاندا تەنها بۆ باسی چەند بەسەرهاتو سەربردەیەك نییـەو، مەبەسـت لێیـان چێژی چیرۆكو لەززەتی دەرونی نییە، (چونکە ئەم مەبەستە، یان هـەر تێـدا بـەدی دێت) بەڵام لەڕاستیدا قورئان ئەم چیرۆکانە بۆ نیازێکی بەرزو پیرۆز بـاس دەکـات، ئەویش چەسپاندنی ڕاستییەکانی بـاوەڕو، بەڵگـە لەسـەر هێنانەوەیانـە. بۆیـە لـە سەربڕینی مانگاکەو لە لێدانی تەرمی پیاوەکوژراوەکەش بە پارچەیەك لـە لاشـەی مانگاکەو لە هەستانەوەی کوژراوەکەشدا بە زیندوویی، خـودا چـەند مەبەسـتێکی تیایدا بەدیهێناوە.

١- بۆ ئاشکراکردنی بکوژی ڕاستەقینەو ناساندنی بە جوولەکەکان.

٢- بـۆ دارشـتنی بەڵگـەی کردەیـی (عەمـەلی) لەسـەر توانـای خـودا لـە زیندووکردنەوەی مردواندا.

٣- بۆ خستنەڕووی نیشانەیەك لە نیشانەكانی خوداو، موعجیزەیەك لەو موعجیزانەی، کە سنووری ڕێسا ئاساییەکانو دەستوورەكانی گەردوونی تێپەڕاندووە، چونکە هەرگیز ئەوە ڕووینەداوە، کە مردوویەك بە لێدانی پارچە گۆشتی مانگایەكی سەربڕاو زیندوو بووبێتەوە، مەگەر تەنها لە ڕێی موعجیزەیەكی دڵفڕێنی خوداییەوە نەبێت.

٤- ئەم چیرۆکە لە نەریتی جوولەکە شارەزامان دەكات، ئەویش لەڕێی ڕوانینیان بۆ فەرمانەكانی خوداو، چۆنیەتی مامەڵەیان لەگەڵ پێغەمبەرانیاندا.

٥- بۆ وریاکردنەوەی ئیمانداران لەوەی، کە هەمان خوو نەریتی نالەباری جوولەکەكانیان نەبێت.

## " ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ "

خــودا فەرموویــەتی: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ...﴿٧٤﴾ البقرة﴾، ئاکامی دوای سەربڕینی مانگاکەو، زیندووکردنەوەی پیاوە کوژراوەکە لەلای جوولەکە چی بـووو چـیی لێکەوتـەوە؟ کاریگـەریی ئـەو ڕووداوە لەسەر دڵانو ژیانیان چی بـوو؟ بێگومـان دڵیـان ڕەق بـووەوە، واتـە لـەدوای ئـەو موعجیزانەش، دڵی ئەوان ڕەق بۆتەوە (وەك بەرد) تەنانەت لە بەردیش ڕەقتر..

بەڕاستیو بێگومان جوولەکە – جوولەکەیە- و دڵێکی جوولەکانەی عـەجیبیان هەیە.. مرۆڤ سەری لەوجۆرە دڵانەو ڕەقبوونیان سوڕ دەمێنێت، کە وایانلێهـاتووە لـە بـەردی ڕەقـیش ڕەقـتر بـن.. هۆکـاری سەرلێـسوڕمانیش ئەوەیـە، ئـەو دڵـە بەشەرییانەی، کە جێگەی هەستو سۆزو عـاتیفەو خرۆشانە، کەچی لـە بـەردی ڕەق ڕەقتر بن، ئەو دڵانە لە بەردی بێگیان ڕەقو توند ڕەقترو بێگیان تـرو تونـدترن، کـە ناخرۆشێنو کارلێکراو نابنو، هیچ خۆشەویستیو ڕقو تووڕەییو ڕەزامەندییـەکیان تێدا نییە.

ئەی داخۆ چ ئومێدێك لەو کەسە بخوازرێت، کە دڵێکی لە بەرد ڕەقـتری هەیـە؟ ئەی داخۆ چ شتێك لەو تەنە ماددییـەی، کـە بـە (مرۆڤـی جوولەکـە)ی ناودەبـەن ماوەتەوە؟ ئەی چ ئومێدێك بەو کەسانی وەك ئەوان دەخوازرێـت، کاتێـك دڵـی ون دەکات؟ چیی لێ دەمێنێتەوە ئەگـەر ئـەو پارچـە گۆشـتە (واتـە ئـەو دڵـە) تێـك بچێتو، بە تێکچوونیشی هەموو ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤیش تێك بچن؟

بەڵام بە چاکبوونی ئـەو پارچـە گۆشـتە، هـەموو جەسـتەی چـاك دەبـن، وەك پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: **((الاّ ان في الجسد لمضغة، اذا صلحت الجسد كله،**

﴿وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ئەم راستییە ئاتاجی بە نمایشکاریو نواندن نییە، چونکە جوولەکەکان خۆیان وخەڵکیتریش دەیزانن، ئەی لەکوێوە کانیاوو رووبارەکان هەڵدەقولێنو دەتەقێنەوە؟ ئایا لەچیاکانەوە نییە؟ بێگومان بەردی چیاکان نەرم بۆتەوە، تاکو ڕووباری لێ بتەقێتەوەو دەرچێت.

﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ﴾ ئەم رووداوەش جوولەکەکان بەچاوی خۆیان بینیویانە.. ئەوەبوو لەبیاباندا تینوویان بوو، داوایان لە موسا- کرد، کە ئاویان پێ بدات (موسا)ش -سلاوی خوای لێ بێت- داوای ئاوی لە خودا کرد. خوداش فەرمانی پێکرد، کە بە داردەستەکەی لە زەوی بدات ئەویش وایکرد، جوولەکانیش بینیان ئەوا دوازدە کانی (لەنێو بەردەکانەوە وەك قۆناغی یەکەم بە فیچقە دەردەچن بۆ تەقینەوە، پاشان بەشێوەی تەقینەوە دەرکەوتو ئاوێکی زۆری بەلێشاو لێ دەڕۆی. لەمبارەیەوە خودا فەرموویەتی: ﴿وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ...﴿٦٠﴾ البقرة﴾.

﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ ئەمەش نموویەکی کردەیی (عەمەلی)ی دیکەیە، کەوا جوولەکەکان لەرێی (موسا)ی پێغەمبەریانەوە زانیاریان لەسەری دەسکەوتووە. چونکە ئەم نموونەیە لە خودی موسا خۆیدا بەدی هاتووە، ئەوەبوو کاتێك چووە خزمەت خوداو ڕووی دوعاو پاڕانەوەی لێکرد، داوای لێکرد ببینێت، خوداش لە وەڵامدا پێی راگەیاند، کە موسا ناتوانێت لەدنیادا — خودا ببینێت- بەڵام خودا خۆی پیشانی چیایەکداو چیاکەش سووتاو وردوخاش بوو، واتە بێگومان ئەو چیایە لەترسی خودا کەوتو ورد بوو، وەك لەمبارەیەوە فەرمویەتی: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى

وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ ...﴿١٤٣﴾ الأعراف ﴾.

## نەریتی جوولەکەو خووڕەوشتیان لەڕێی چیرۆکی مانگاکەوە

گوتمان چیرۆکی مانگاکە، نەریتی دیارو دەرخراوی جوولەکەمان پیشان دەداتو ئەو جۆرە ئەخلاقو خوو ڕەوشتەشیانمان لەسەرباری حەقیقەتو واقیعی خۆی بۆ روون دەکاتەوە. لێرەشدا هەوڵ دەدەین چەند دابو نەریتو هەڵسوکەوتێکی نالەباریان لەم خاڵانەدا دەسنیشان کەین:-

١- هەوڵ دانیان بۆ شاردنەوەی ڕاستییەکان. ئەوەبوو خۆیان لە بکوژی پیاوەکەو تۆمەتی کوشتنەکە دەپاراستو دەیاندایە پاڵ یەکدی، هەروەها هەولێشیاندا ئەو تۆمەتە بخەنە پاڵ بێ تاوانەکان.

٢- بێئەدەبیان بەرامبەر پێغەمبەرانیانو ڕێز لێ نەگرتنیان ئەوەبوو چەند پرسیارێکی وەهایان لە پێغەمەرەکەیان کرد، کە هیچ هۆکارو پێویستییەکی تێدانەبوو، بەروبوومیشی نەبوو. لەو وتەیەشیاندا هەربێ ئەدەبیان نواند، کە پێیان گوت: (ئەرێ تۆ ئێمە بەگاڵتە جاڕی خۆت دادەنێیت) لە دواییشدا، کە پێیان گوتووە (ئێستا هەقو راستیت بۆهێناین) هەر بێئەدەبییان بەرامبەری نواندووە.

٣- ڕێزنەگرتنیان لە فەرمانەکانی خوداو لە حوکمو ڕێنماییەکانیو هەوڵی خۆلێدزینەوەو فرۆفێڵ تێداکردنیان.

٤- خۆ دواخستن‌و سستی کردن لەراپەراندنی فەرمانەکانی خوادا چونکە لەدواییداو لە کاتێکی درەنگداو بەناچاری‌و شەرمەزارییەوە فەرمانەکەیان راپەراند، وەك ئەوەش وایە، هەر رایانپەراند بێت ﴿...فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ البقرة﴾.

٥- نکوولّی کردنیان‌و زۆریی پرسیاریان لەسەر ئەو مەسەلانەی پێویست نین.

٦- خۆ خەریککردنیان بەوکارەی سوودی نیە، گەرانیان بەدوای ئەوشتەی بێ‌کەلّکە.

٧- بایەخ دانیان بە مەسەلە روالّەتی‌و لاوەکییەکان‌و ئاوردانەوەیان لەکارە بەرکەنارو لە پەراوێزخراوو مام ناوەندییەکان لەسەر حسابی مەسەلە بنچینەییەکان‌و کارە گرنگ‌و سەرەکییەکان.

٨- ئەوان بەو نەریتە خاوو دەروونە شل‌و شێواوەیانەوە، شایستەی ئەوەبوون کە، خودا کاری قورس‌و نارەحەتیان بەسەردا بدات‌و ئەو شتەخۆش‌و پاکانەشیان لێ حەرام بکات، کە پێشتر بۆی حەلاّلّ کردبوون.

٩- هەروەها ئەوان بەو نەریتە نالەبارانەیان شایستەی ئەوەبوون، کە خودا سزایەکی سەختیان بدات، سزاکەش ئەوەبوو دلّێکی رەقی پێدان.. دیارە مرۆڤی دلّرەقیش تووشی سزای توند دەبێت، کە سزاکانی تر گەلێك لەوە سووکترن، چونکە ئەگەر خاوەنی دلّێکی خواویست‌و نەرم بێت، ئەوا دەتوانێت رەوتی خۆی راستکاتەوەو پەنا بباتەبەر چاکەو تۆبەکردن‌و پەشیمانی. خۆ ئەگەر دلّێکی رەقی هەبێت ئەوا دەردەکە لە بنچینەدایە، لە درەختەکەدایە، نەك لە بەروبوومەکەدا.

١٠- بەردو شتە رەقە بێ گیانەکانی دی گەلێك نەرمترو هێواش ترو ملکەچ ترن لە دلاّنی جوولەکەکان.. ئیدی ئەو جوولەکانە چییان بۆ ماوەتەوە؟!

# "چیرۆکی مانگاکـەو شـێوازی جوولەکەکان لەدانوستان دا"

بێگومان چیرۆکی مانگاکە راستییەکی بنەبڕ (قاطع) دەردەخات، کـە شـێوازی جوولەکـەمان لـە دانوسـتان (مفاوضـات)دا پـێ دەناسـێنێت، باشـتروایە ئێمـەی موسڵمانانی ئـەم سـەردەمەش، هەڵوێـستەی لەبەردەمـدا بکـەین، تـاکو رێـسای بەسوودی بـۆ خۆمـان دەربێنـێنو، شـێوازی ڕاسـتەقینەش بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی جوولەکەکانو سەودا لەگەڵکردنیان بزانین.

ئەها سەیرکە لەگـەڵ پێغەمبەرەکەشـیاندا چـۆن بـوونو، چـەندجار پرسـیاریان لێکرد؟ ئـەی چـەند جـاری تـر لێیـان دووبـارە کـردەوە؟ ئـەی چـەندجاری تـریش بەرهەڵستییان کرد؟ ئێ خۆ ئەوە پێغەمبەریانو سەرکردەیان بوو، ئـەی داخـۆ وتو وێژو دانوسـتان لەگـەڵ دوژمنانیانـدا چـۆن بکـەن؟ ئـەی چـۆن مامەڵـەو سـەوداو ئاڵوێرییان لەگەڵ دەکەن؟

لەلایەکی ترەوە چیرۆکی مانگاکـە مەسـەلەیەکی سـووكو سـانا بـووو لقێکـی بچووکی کارە بنەڕەتییەکانەو، پاشـان پەیوەسـت بـووە بـەخۆیانو جـێی بایـەخو سوودو بەرژەوەندیی خۆیان بووە، کەچی سەرباری ئەوەش چـەندە لـەکاتی خۆیـانو کاتی موساشیان پێ گرتو چەندە خۆیانو موسایان پـێ شـپرزەکرد؟! ئـەی چـەندە هەوڵیاندا بۆ فروفێڵ تێداکردنو خۆ دەربازکردنو خۆدزینەوە لە ئەرکەکە.

بێگومان جوولەکەکان هـەرگیز لـە دانوسـتاندا وەڕسو مانـدوو پەسـت نـابن، چونکە هونـەری ڕاکـردنو خۆدزینـەوەو سـاختەکاری دەزانـن، هـەروەها لـەبواری دانوستاندا پشووو درێژنو دەمارەخانـە (اعـصاب)ێکـی سـاردو هێمنیـان هەیـەو ئامادەشن، کە هەوڵو کاتێکی فرەی تێدا بەفیـڕۆ بدەنو، پاشان چەندەها جاری تـر

بگەڕێنەوە سەر ئەوخاڵەی، کە لێیەوە دەستیان پێکردبوو.

بێگومان ئەوان بێ‌ئەوەی وەڕس و پەست بن بە مەسەلەیەکی ڕواڵەتیی بچووکەوە، کە وەختێکی زۆر وەك (چەند مانگێك، یان چەند ساڵێك) لەخۆیان و لەلایەکی بەرامبەریش بگرێت خۆیان خەریك دەکەن و لە کێشەیەکی بچووکیشدا بەخواست و ئارەزووی خۆیان پیایدا دێنەوەو لێی زیاد دەکەن و هەڵوێستەی لەبەردەمدا دەکەن و، تەنانەت چەندین کتێب و یادداشتی لەبارەوە دەنووسن و چەندین سەفەرو سەردانی تیادا دەکەن، بەڵکو گرنگ ئەوەیە ئەوان سووربن لەسەر هەڵپەرساردنی ئەو گرفتەو دواخستنی چارەسەرەکەی. هەروەها لەلای ئەوان دەرخستنی هەق گرنگ نییە، بەڵکو هەرسووربن لەسەر بەرتەسك کردنەوەی ئەو هەقە، هەمدیسان لای ئەوان گەیشتن بەئەنجامێکی ماقووڵ گرنگ نییە، بەڵکو هەرسووربن لەسەر هێشتنەوەی کێشەکە لە تەم و مژو بارودۆخی ئاڵۆزداو ئیدی ڕکەبەرانیان لە بەتاڵیو وێڵ بووندا بهێڵنەوە.

لە چیرۆکی مانگاکەوە ئەم ڕاستییەمان لەبارەی جوولەکەوە زانیوە، لەگشت مێژوو بەسەرهاتێکیشیاندا هەر ئاوا ناسیومانن. لەم سەردەمەشدا بەشێوەیەکی ڕوونترو دیارتر ئەو شێوازەیان دەبینرێت، ئەویش لەڕێی دانوستانە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆکان، کە لەگەڵ نەیارانیاندا تاوتوێیان دەکەن.

ئەوەبوو جوولەکەکان (ساڵی (١٩٧٦ زاینیی) کەناری خۆرئاواو چەند ناوچەیەکی تری فەلەستنیان داگیرکرد، ئەنجوومەنی ئاسایش نێو دەوڵەتییش بڕیاری ژمارە (٢٤٢)ی دەرکرد، کە تیایدا داوا لە جوولەکەکان دەکات لەوخاکە عەرەب نشینانە بکشێنەوە، کە لەو ساڵەدا داگیریان کردووە. جێی باسە خودی (لۆرد کاروادۆن)ی نوێنەری (بەریتانیا) لە ئەنجوومی ئاسایش بڕیارەکەی داڕشتبوو، بەڵام جوولەکەکان فڕۆفێڵیان لەئاست ئەم بڕیارەدا نواندو، بەشێوە تێگەیشتنێکی جوولەکانەوە لێی تێگەیشتن و بەشێوازی تایبەتیی خۆیشیان دانوستانیان تێدا

دەکرد، ئەوەبوو دانوستانێکی دوورودرێژو سەختو دژواریان لەڕێی نێرراوە نێودەوڵەتییەکانەوە لەگەڵدا کرا، کە بە (جوناریارنج)ی یەکەم نێرراو دەستی پێکرا.. بەڵام هیچ سوودو کەڵکێکی تێدانەبوو. لەو ڕووەوە جوولەکەکان دەیانگوت (ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی داوای پاشەکشێ لە هەموو زەویوزارە داگیرکراوەکانی کاتی جەنگمان لێ ناکات، بەڵکو داوای کشانەوە لە (چەند زەوییەك)ی داگیرکراومان لێ دەکات، بۆیە دیاری کردنو دەسنیشانکردنی ئەو زەویانەش ئاتاجی بە دانوستانێکی ڕاستەوخۆی نێوان ئێمەو عەرەبەکانە). جا ئایا ئەوان بەپێی (شێوە تێگەیشتنی عەرەب لە بڕیارەکە لە خاکە داگیرکراوەکان کشانەوەتەوە، یان ئایا بەپێی (شێوە تێگەیشتنی جوولەکانەش) لە (چەند خاکێکی داگیراو) کشاونەتەوە؟ ئەم مەسەلەیە پتر لە بیست ساڵی خایاندو تا ئێستاش ئەنجامێکی لێ نەکەوتۆتەوە.

کاتێك دەوڵەتێکی عەرەبیی وەك (میسر)یش کەوتە نێو تەڵەی ئەمەریکاو جوولەکەوەو ڕێکەوتننامە بەناوبانگەکەی (کامپ دێڤید)ی لەگەڵ جوولەکەدا بەستو، جوولەکەکانیش لە زۆربەی خاکی (سینا) لە بەرامبەر (کۆتایی پێهێنانی حاڵەتی جەنگی نێوان هەردوو وڵات)و (دامەزراندانی پەیوەندیی دیپلۆماسی لە نێوانیاندا)و (لە بەرامبەر چەند شتێکی تری پەنهانییشدا، کە بۆ خەڵکی ڕانەگەیەنرا) کشانەوە، لەگەڵ ئەو کشانەوەیە، یان لە خاکی (سینا)دا جوولەکەکان گرفتێکی نارێکیان لەبەردەم حکومەتی (میسر)دا خرۆشاند، ئەویش گرفتی (طابا) بوو، کە ئامادەنەبوون لەوێ بکشێنەوە بەو پێودانگەی گوایە خاکێکی جوولەکەکانە. (میسر)یش داوای لێ کردن، کە بکشێنەوە لەوێش بەو پێودانگەی، کە خاکێکی (میسر)ە جوولەکەکان گوتیان: (لەنێوان ئێمەو ئێوەدا دانوستان هەیەو، کۆمیسیۆنەکانی دادوەریی کردنی نێو دەوڵەتیو، نێرراوانی نێو دەوڵەتیو شارەزایانو پارێزەرانیش لەنێوانمان دان) ئیدی دەستیان بە دانوستان کردەوەو تا

ئەمڕۆ پتر له دەساڵ (واتە تا نووسینی ئـەم کتێبـه) پـتر لـه دەسـاڵێ خایانـدووەو قەیرانەکەش کۆتایی پێ نەهاتو پاشەکشێکەش تەواو نەکرا. جێی باسیشه خاکی (طابا) پارچه زەوییەکی بچووکەو ڕووبەرەکەی له ڕووبەری یاریگایـەکی تـۆپی پـێ تێپەڕ ناکات.

جا ئەگەر پاشەکشێی ئەوان له پارچه زەوییەکی هێندەی ڕووبەری یاریگایـەکی تۆپی پێ پتر له دە ساڵی پێ بچێت، ئەی داخۆ عەرەبەکان ماوەی چەند سـاڵی تـر دابنێن بـۆ پاشەکـشێی جوولەکـەکان لـه کـەناری خۆرئـاواو جـۆلانو (باشـووری لوبنان)[1] ؟

ئـەی داخـۆ عەرەبـەکان چـەندە لـه کـاتو تەمـەنو هـەوڵو مـاڵو سـامانو ئەعصابو باری دەروونییان بۆ دانوستانیان لەگەڵ جوولەکەدا خەرج دەکەن تاکو له خاکیان دەکشێنەوە؟ بەڕاستیشدا جگه له لاوازبوونو کەمبوونەوەی هێـزو سـامیان هیچ شتێکیتر له جوولەکان وەرناگرن.

دەسا ئەی گەلی عـەرەبو موسڵمانان، بەڕاسـتی جوولەکـەکان هونـەری پـێچو پەناو فڕوفێڵی نێو دانوستان چاك دەزانـنو بـەدەم هـیچ دەنگێکـەوە نایـەن تـەنها دەنگی هێز نەبێت، بەهیچ شێوازێکیش له فەلەستین دەرناکرێن تەنها بـه شـێوازی جیهادو کوشتار نەبێت.

(١) سەبارەت بەباشووری (لوبنان) جوولەکەکان بەزەبری هێز لێـی دەکـرانو، ئـەوەبوو سـاڵی (١٩٩٩ز) دوای بەرەنگارییەکی گـەورەو بـێ وێنـەی موسـڵمانانی لوبنـانو (حـزب الله) ی تێکۆشەر توانییان جوولەکەکانو سـوپا دڕندانەکـەیان لـه باشـووری لوبنـان ڕاونـێن، واتـه جوولەکەکانی بەخواستی خۆیان لەوێ نەکشانەوە. (وەرگێڕ)

## "گرنگتـرین وانە لە چیـرۆکی مانگاکەوە"

لێـرەدا بـەکورتی گـرنگترین ئـەو وانـەو پەنـدو ئامۆژگاریانـەی لـە چیرۆکی (مانگاکە)وە وەردەگیرێن، دیاری دەکەین..

١- پێویست بوونی وەرگـرتنی فەرمانـەکانی خـوداو حوکمـەکانی شـەریعەت بـۆ جێبەجێکردنیانو کارپێکردنیانو وابەستەییی تەواو پێیانەوە..ئەمەش بەمانای ئەوەی دەبێت فەرمان پێکراوان بەگورجی کاری لەسەر بکەنو رایپەڕێنن.

٢- بەکارنەهێنانی هیچ فڕوفێڵێك لە فەرمانەکانی خـودا، یـان لێـدەرباز نـەبوونو خۆلێنەدزینەوەیان.

٣- بێگومان هۆکاری ڕاستەوخۆ لە پابەندبوون، یان پابەندنەبوون (دڵە). ئەگـەر دڵ پڕبێت لەباوەڕ بەخوداو بەگەورەدانانو ڕێزگرتنی فەرمانەکانی، ئەوا ئارەزووشی لـە بـەجێهێنان تیـادا پەیـدا دەبێـتو نیـازی بـەخێرایی ڕاپەرانـدنی تیـادا دەخولقێـت، ئینجـا هـەر دڵەکەیـە فـەرمانی خـۆی بـۆ قـەوارە مرۆییەکـە دەردەکاتو هەموو دەزگاکانی ئـەو قەوارەیـەش (واتـە هـەموو ئەندامـەکانی جەستەی مرۆڤـ) دەسبەجێ بەدەم فەرمانەکەیەوە بچن.

خۆ ئەگەر دڵ سامو شکۆ بۆ خودا دانەنێتو ڕێز لە فەرمانەکانی نـەگرێتو، بەتەمای بەجێگەیاندنیان نەبێت، ئەوا هەوڵی پاساو هێنانـەوەو خۆلێدزینـەوەو بیـانووگرتن دەدات وەك ئـەوەی گوایـە فـەرمانی بـۆ قەوارەکـە دەرکـردووەو دەزگاکان لە جێبەجێ کردن شکست بوون.

جا ئەگەر مرۆڤێکی چالاك ببینین، کە پەلـە لـە گوێڕایـەڵیی فەرمانـەکانی دەکاتو، پێشبڕکێ لەبواری خێرو چاکەدا دەکـاتو، لـە پابەنـدییو جێبـەجێ کردنیشدا جوامێرو بەجەرگـە، ئـەوا دەزانـین، کـە ئـەم مرۆڤـە دڵـی سـاغەو

بەپەرۆشەو باوەڕدارە بەخوداو، خوا بەگەورە دەگرێت. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر مرۆڤێکی تەمەڵو لاوازو بێ توانا ببینین، کە لە حوکمەکانی خوادا فڕوفێڵ دەکاتو لێیان ڕادەکات، ئەوا دەزانین، کە دڵی نەخۆشەو دەردەکە لە دڵێدایە، لەکاتێکدا نیشتگەی دەردەکەش دەدۆزرێتەوە، ئەوا دەسنیشانکردنی نەخۆشییەکەش ڕاست دەردەچێتو ڕێی چارەسەر ئاسان دەکاتو کاری پەروەردەش سەرکەوتوو دەبێت.

٤- خۆ خەریك نەکردن بە کاروباری لابەلاو مەسەلە لاوەکییەکانەوە، چونکە لێکۆڵینەوەو کۆڵ پێوە هەڵگرتنیان هیچ کەڵكو سوودێکی نابێتو، بەفیڕۆدەری کاتو کۆششەو، بەربەست لەبەردەم جێبەجێکردنیشدا دروست دەکات.

٥- فەرمانەکانی خودا وەها وەردگیرێن، کە خودا فەرمانی لەسەرداون، ئیدی هیچ ئاتاجێك بە زیادکردنو کەمکردنەوەیان نییە، هەروەها هیچ ئاتاجێك بە زۆرکردنی مەسەلەکانو بە شیکارو لقو پۆکانی نییەو هیچ پێویستیکانمان پێیان نییە.

٦- ئاڵۆزکاریو تەگەرە خستنە سەر کارو فەرمانە دیارەکان باجێکەو دەکەوێتە سەر هەر کەسێك لەوانەی بەفەرمانی ڕوونو ئاشکرای خوداوە پابەند نابن، هەروەها ئاکامێکی بەدی هاتووە لەسەر ئەوانەی لە ڕێگەی ڕۆشنو ئاسان لادەدەنو دەچنە سەر ئەو شیکارو درێژە پێدانە لاوەکییانەی، کە هیچ پێداویستییەکیان تیادا نییەو، کە هیچ بەرووبوومێکیشیان نییە.

ئەوەتا جوولەکەکان فەرمانەکەیان لەسەر خۆیان ئاڵۆزکردو، خوداش بارودۆخی ئاڵۆزی بەسەرداهێنان، خۆ ئەگەر هەر مانگایەکیشیان سەرببڕیایە، کارێکی شیاو بوو بۆیان هەر لەبەرئەمەشە خودا داوای لە ئیمانداران کردووە، کە دوورە پەرێزبن لەو درێژەپێدانو قووڵکردنەوەیەی، کە هیچ پێداویستییەکیان

تیایدا نییەو، ئەو پرسیارە زۆرانەش نەکەن، کە هیچ سوودێکیان تیادا نییە..

وەك فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ (١٠١) قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا بِهَا كَافِرِينَ (١٠٢) المائدة﴾، واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پرسیار دەربارەی هەندێك شت مەکەن، کە ئەگەر ڕوون بکرێتەوەو فەرز بکرێت بەسەرتاندا وەڕستان دەکات، خۆ ئەگەر پرسیاریان لەبارەوە بکەن لەوکاتەدا، کە قورئان دێتە خوارەوە، ئەوا بۆتان ڕوون دەبێتەوە، کە خودا چاوپۆشی لە زۆر شت کردووەو خوداش هەر لێخۆشبووو بەئارامە بێگومان چەندین گەلو کەس پێش ئێوە پرسیاریان دەربارەی زۆرشت دەکردو کاتێك بۆیان ڕوون دەبووەوە باوەڕیان پێی نەدەماو یاخی دەبوون- کەواتە ئێوە ئەی ئیمانداران وەك ئەو کەسانە مەبنو زۆر لە شتەکاندا قووڵ مەبنەوەو زۆر بلێیی یان تیادا مەکەن).

هەر لەمبارەیەوە (مسلم) لە (ابو هريرة)وە -خودا لێی رازی بێت- فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی ((**خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ فَرَضَ اللهُ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ فَحُجُّوا. فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَسَكَتَ حَتَّى قَالَهَا ثَلاثاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ قُلْتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ، ثُمَّ قَالَ: ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ**))[1].

واتە: (مسلم) لە (ئەبو هورەیرەوە) ﷺ گێڕاوێتییەوە، کە گوتوویەتی:

---

(١) مسلم: كتاب الحج ١٥، باب فرض الحج مرة في العمر ٧٣، حديث رقم (١٣٣٧).

پێغەمبەر ﷺ وتارێکی بۆ داین‌و فەرمووی: (خەڵکینـه خـودا حـەجی لەسـەر فەرز کردوون ئێوەش حەج بکەن). پیاوێك گوتی: (ئەی پێغەمبەری خـودا ئایـا هەموو ساڵێك حەج بکەین)؟ واته: ئایا هەر کەسێك لـه سـاڵێکدا یـەك حـەج بکات)؟ پێغەمەر ﷺ بێ دەنگ بوو، تا کابرا سێ جار لێی پرسـییەوە. ئینجـا پێغەمبەر ﷺ له وەڵامیدا فەرمووی: (ئەگەر بڵێم- بەڵێ- ئەوا فـەرز دەبێـت‌و ئێوەش ناتوانن ساڵانە هەرکەسەو حـەجێك بکـات). پاشـان فـەرمووی: (چیم بۆدانان پێی دابین بن‌و، واز له پرسیار لێکردنم بێنن، چونکه بێگومان کەسـان‌و گـەلانی پـێش ئێـوه بـەهۆی (زۆریـی پرسـیارکردن)و (جیـاوازیی بـیروڕاو ئیختیلافیان لەگەڵ پێغەمبەرانیان) لەناوچوون‌و تووشی سزای خـودا بـوو. جـا ئەگەر فەرمانم بەشتێك پێکردن یەکسەر بەپێی تواناتان جێبـەجێ بکـەن، خـۆ ئەگەر شتێکیشم لێ قەدەغەکردن ئەوا وازی لێبێنن).

هەروەها (موسلیم) له (سعدی کوڕێ ابو وقاص)ەوە ﷺ گێڕاویێتییـەوە، کـه گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**اعظم المسلمين في المسلمين جرما، من سأل عن شيء لم يحرم فحرم على الناس من اجل مسألته**))[1]، واتـه: (خـراپترین کەسـی موسـلمان، کـه تـاوانی دەرهـەق موسـڵمانان کردبێـت ئەوکەسەیە، که پرسیاری دەربارەی شتێك کردبێـت، کـه لـه خـەڵکی حـەرام نەکرابێت‌و بەهۆی پرسیارەکانی ئەوەوە حەرام کرابێت).

٧- پێویست بوونی ڕێزگرتنی پێغەمەران‌و نێرراوانی خوداو، زانایـانی کـارگوزارو، ئاخاوتن لەگەڵیان‌و لەبارەیانەوە بەوپەڕی شەرمەو ئەدەبەوە.

٨- مرۆڤی زاناو بانگەوازکار دەبێت دڵانی موسڵمانان بدوێنێت‌و دەستی سـۆز لـه پەڕەکانی دڵیان بدات (واتـه دڵیـان ڕازی بکـات) تـاکو کـارتێکردن‌و کارلێـك

---

١) مسلم: كتاب الفضائل ٤٣، باب (ﷺ) (٣٧)، حديث رقم (٢٣٥٨).

بوونیش بخولقێت خۆ ئەگەر سستیو تەمەڵییەکیشی تێدا بینین ئەوا بەدانایی‌و حیکمەتەوە چارەی دەکات.

٩- بێگومان پابەندبوون بە فەرمانە خوداییەکان‌و بەجێگەیاندنیانەوە مرۆڤ بەرەو نەرم‌و نیانیی دڵ‌و چاکبوونی دەروون‌و، چاککردنی ژیانی دەبات، بەڵام پابەندی‌و بەجێگەیاندنی فەرمانەکان مرۆڤ بەرەو ڕەقترین‌و توندترین سزا دەبات کە دروست بوونی دڵڕەقییە.

١٠- ئیسلام ئەوە لە مرۆڤی موسڵمان دەخوازێت، کە فەرمانەکانی خودا بەدڵ‌و گیان‌و بەخۆشی‌و چالاکی‌و گورج‌و گۆڵییەوە جێبەجێ بکات‌و، هەموو قەوارەی جەستەشی بەشداریی تام‌و چێژی کارلێک‌و ڕەزامەندیی‌و بەجێگەیاندنەکە بکات، واتە هەست‌و ئەقڵ‌و خەیاڵ‌و دەروون‌و ئەندامەکانی هەستکردن‌و سەرجەم ئەندامەکانی تری جەستەی (بەشداری)ی ئەو کردارە خواپەرستییانە بکات .

ئەمەش تەنها لەکاتی خێراکردن لە بەجێگەیاندن‌و دەستپێکردنی ڕاستەوخۆی ڕاپەڕاندندا بەدیی دێت، بەڵام خۆ ئەگەر مرۆڤی موسڵمان هەوڵی هەڵاتن‌و خۆلێدزینەوەو فڕوفێڵکاریی بدات، ئەوا ئارەزووەکەی خاو دەبێتەوەو، ورەی لاواز دەبێت‌و هەستی قایل بوون‌و پەسەندکاریی لەلا نامێنێت‌و، ئینجا ئەندامە هەستەوەرییەکانیشی چێژی بەشداریی لەدەست دەدەن، ئەوسا ئەگەر بەناچارییش فەرمانەکە جێبەجێ بکات، ئەوە جێبەجێکردنێکی ساردو مردوو دەبێت‌و خواستی بەجێگەیاندنیشی هەر ڕەق‌و بێگیان دەبێت، واتە: (وەك ئەو جوولەکانەی مانگاکەیان سەربڕی‌و بەڵام وەك ئەوە وابوو، کە هەر سەریشیان نەبڕیبێت) ﴿...فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ البقرة ﴾

# چیـرۆكی شـەشـەم

## چیـرۆكی خـەڵكانی شـەممان

## اصحاب السـبت

ئەم چیرۆكە له قورئان بەم جۆره هاتوه، كه خودا فەرمووییەتی:

﴿ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٣ وَإِذۡ قَالَتۡ أُمَّةٞ مِّنۡهُمۡ لِمَ تَعِظُونَ قَوۡمًا ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ أَوۡ مُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗاۖ قَالُواْ مَعۡذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ١٦٤ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٥ فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ١٦٦ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبۡعَثَنَّ عَلَيۡهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَن يَسُومُهُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٦٧ وَقَطَّعۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُمَمٗاۖ مِّنۡهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنۡهُمۡ دُونَ ذَٰلِكَۖ وَبَلَوۡنَٰهُم بِٱلۡحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ١٦٨ الأعراف ﴾.

واته: (ئەی پێغەمەر ﷺ پرسیار بكه دەربارەی ئەو شارەی، كـه لەسـەر رۆخـی دەریابوو، كاتێك سنووری رێسای ڕۆژانی شەممانیان شكاند (كه بێگومـان بڕیـاربوو ڕۆژانی شەممه تەرخان بێت بۆ خواپەرستیو، بـۆ سەربەسـتی ماسـییەكان) ـبـەڵام

ئـەوان بـۆ تاقیکردنـەوەو گرفتاربوونیـان لـە ڕۆژی شـەموانیاندا ماسـییەکان بـە سەربەستی دەهاتن‌و دەچوون‌و وەك چەتر سەر ڕووی ئاوەکـەیان دادەپۆشـی‌و نزیـك کەناری دەریا دەبوونەوەو هەستیان بە هێمنی دەکرد، بەڵام ئەو ڕۆژەی، کـە شـەممە نەبوایە بەو شێوەیە نەدەهاتنە ڕوو، ئێمە بەوڕەنگە تاقیمان کردنەوە بـەهۆی لادان‌و یاخی بوونیانەوە. دەستەیەك لە پیاو چاکانیان دەستیان کرد بە ئامۆژگاری کردنیان بەڵام دەستەیەکی تری ئیمانداران بـەوانیان گـوت: (بۆچـی ئامۆژگـاری کەسـانێك دەکەن، کە خودا هەر لەنێویان دەبات، یان سزایەکی توندیان دەدات؟) ئەوانیش لـە وەڵامدا گوتیان:﴿ئاخر با بەڵگەیەکی (دڵسۆزی‌و خەمخۆریمان) بۆ خودای پەروەرگارتان پێ بێت‌و، پاشان بەشکم ئەو ستەمکارانەش خۆ بپارێزن‌و پاشگەزبنەوە).

کاتێك ئەوانیش ئەو وەبیرخستن وبەیاد هێنانەوەیان فەرامۆش کرد، سەرەتا ئـەو کەسانەمان ڕزگار کرد، کە قەدەغەو ڕێگرییان لەو کـارە ناڕەوایـە دەکـرد، ئینجـا ئەوانەی ئەو ستەمەیان دەکـرد تووشـی سـزایەکی ئازاربـەخش‌و تونـدمان کـردن، چونکە لە سنووری ڕێساکان تێپەڕیبوون. لەکاتێکیشدا هەر لووتبەرزو یـاخی بـوون لەوکارە ناڕەوایەیانداو کۆتاییان پێ نەدەهێنا پێمـان گـوتن: دەبـن بـەو مەیموونـە سەرشۆڕو دەربەدەرانەو، وەك ئەوانتان لێ بێت. هەروەها ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیان بەیادبێنەوە، کەوا خودای پەروەردگارت بڕیاری خـۆی داوە لەسـەرئەوەی نـەهێڵێت ئەوان تاڕۆژی قیامەت بحەسێنەوەو هەمیشە تاکۆتـایی دنیـا کەسـانێکی وابکاتـە دوژمن‌و ڕکەبەریان، کە ئازارو ئەشکەنجەی سەختیان پێ بچێژن، بێگومـان خـودای پەروەردگارت بەخێرایی تۆڵە لە ستەمکاران دەسێنێت.

هەروەها زۆر لێبوردەو میهرەبانیشە (بۆ ئەوانەی باوەڕ دەهێنن‌و تەوبە دەکـەن) لە دواییـدا جوولەکـەکانمان لەسـەر زەویـدا کـرد بـە چـەند بەشـێکەوەو بـەدنیادا پەرتەوازەمان کردن، وەك چەند کۆمەڵێکی لێکـدابڕویان لـێ هـات، هەنـدێك لـەو کۆمەڵانە چاك‌و لەخواترس بـوون‌و، هەندێکیـشیان لـە پلەیـەکی نـزمتری چـاکی‌و

لەخواترسانی ئەوان دابوون، هەروەها بە (خێرو خۆشییەکان)و بە زیانو ناخۆشییەکان) تاقیمان کردنەوەو گرفتارمان کردن تاکو بگەڕێنەوە سەر ڕێی ڕاستی دینداریو خواپەرستیو مرۆڤایەتی.

## "کورتەی چیرۆکەکە"

ئەم ئایەتانە دەربارەی چیرۆکی ئاوایییەك (شارۆچکەیەك)ی جوولەکەکان دەدوێن، کە کەوتبووە سەر کەناری دەریا، شارۆچکەکەش یەکێك بوو لەو چەندان شارۆچکەیە، کە جوولەکەکان لەو سەردەمەدا تیایدا دەژیانو کەوتبووە سەر ڕۆخی دەریایەك لەو دەریایانە (واتە نەزانراوە، کە کام شارۆچکەو لەسەر ڕۆخی کام دەریا بووە).

جوولەکەکانی دانیشتووی ئەو شارۆچکەیە فەرمانی ئەوەیان پێکرابوو، کە لە ڕۆژی شەممەدا ماسیو نەهەنگەکان ڕاو نەکەن، بەڵام لە تەواوی ڕۆژەکانی تری هەفتەدا بۆیان ڕەوا بوو، کە ڕاوەماسی بکەن. خودا بەم ڕاسپاردەیە تاقی کردبوونەوە، چونکە لە ڕۆژانی مۆڵەتی ڕێ پێدراوی ڕاوەماسییاندا ماسییەکان لێیان دووردەکەوتنەوە، لەکاتێکدا لە ڕۆژانی شەممەدا ئەو ماسییانە "بەزۆریی وەك چەتر (شرعاً) لە کەناری دەریایەکی" کۆدەبوونەوە. شەیتانیش وەسوەسەو خەیاڵی خراپی خستە نێو دەروونی کۆمەڵێك لە خەڵکی شارۆچکەکەوەو کاری ڕاوکردنی ماسیەکانی لەدڵدا بۆ جوان کردن.... بەڵام ئاخر چۆن فرِوفێڵ لە فەرمانی خوادا دەکەن؟ شەیتانەکەیان ڕێگەی فێڵێکی وردی شەیتانیانەی پیشان دانو ڕێنمایی کردن بۆ شێوازێکی دی، کە ڕۆژانی شەممە ڕاوی ماسییەکانی تێدا بکەن.

خەڵکی شارۆچکەکەش لەئاست هەڵسوکەوتی ئەو کۆمەڵە دەستدرێژکارەدا بوونە دوو تاقم:-

تاقیمی یەکەم: ئەوکەسە پیاوچاكو بانگەوازکارانە بوون، کە ئەرکی خۆیان لە بانگەوازدا بەجیٚگەیاندو بەرپەرچی فێڵبازەکانیان دایەوەو ئیدانەی فڕوفێڵیان کردن، کە لە فەرمانی خوادا دەیانکردو ئیدانەی دەستدرێژیو ڕاوکردنی ڕۆژانی شەممەیان کردن.

تاقمی دووەم: ئەوکەسە بێدەنگو بیٚ هەڵوێستانە بوون، کە لەئاست دەستدرێژیی دەستدرێژکاراندا بیٚدەنگ بوونو، تەنانەت گەلێك گازاندەشیان لە پیاوچاکە بانگەوازکارەکان دەکرد لەسەر ئەوەی، گوایە هیچ سوودێك لە ئامۆژگاریو پەند دادانی گەلی لەنێو چووی سزا دراودا نییە.

بێگومان چاکە خوازەکانیش وەلاٚمیان بۆ لۆمەکارانی بیٚدەنگ ئەوەبوو مەبەستی ئەمان لەم بەربەرەکانییەی دەستدرێژکارەکان ئەوەیە، بەڵگە بخەنە بەردەم خودا، کە ڕێگرییان لە خراپە کردووەو، ئەرکی سەرشانیان بەجیٚهێناوەو، پاشان بەشکم ئەو گەلە لە سنوور تێپەڕیوە وریاببنەوەو لە ئاکامی کارەکەیان بترسن. جا کاتێك سزای خودا تووشی دەستدرێژکارو لە سنوور تێپەڕبوان بوو، خودا ڕوخساری وەك مەیمونی دەربەدەرکراو ناشیرین کردنو ئەم ناشیرینەکردنەش بەبارێکی واقیعیو ڕاستەقینە بووەو، دوای ئەوەش ئەو (بە مەیموون کراوانە) زاووزێیان نەکردووەو، نەوەی وەك خۆیان نەخستۆتەوەو، تا ماوەیەکی کەم ژیاونو قڕیان تێکەوتووە.

هەروەها خودا تاقمە چاکەخوازو بانگەوازکارەکەی لەو سزایە پاراستووە. ئیدی قورئانیش دەربارەی چارەنووسی تاقمە بیٚدەنگەکە هیچی باس نەکردووە، بۆیەش هیچی وای لەبارەوە باس نەکردوون، چونکە لاوازو کەمتەرخەم بوون لەپاراستنی ڕێسای خوادا، جا لەبەرئەوەش، کە لەگەڵ ڕزگاربواندا باسیان نەکراوە، لەوانەیە لەگەڵ ناشیرین کراوەکاندا تیا چووبن (واللە اعلم).

## چەنـد وتەیەکی هەڵبەسـتراوی جوولەکـان لەسـەر ئەم چـیرۆکە

ئەوانەی وتە هەڵبەستراوەکانی جوولەکەیان گێڕاوەتەوەو برەویـان پێـداون چـەند شتێکی زیادەیان خستۆتە سەر ئەوەی، کە قورئان باسی کردوە بۆ نموونە هەندێکیان ناوی گوندەکە، یان شارۆچکەکەیان وادیاری کردووە، کە گوایە نـاوی (ئیلـە)، یـان (ئیلان)، یان (عەقەبە)ی سەرکەنداوی (عەقەبە) بـووە، چـەند کەسـێکی تریـشیان گوتوویانە گوایە شارۆچکەی (تەبەرییە/ طبریە)ی سەر دەریاچەی (طبریە) بووە.

هەروەها گووتویانـە گوایـە لـە گوندەکـەدا دوو بـت لەسـەر کـەناری دەریاکـە هەبوون، یەکێکیان ناوی (لقـیم)ی لـێنراوەو، ئـەوەی تریـشیان نـاوی (لقمانـە)ی لێنراوەو، خوداش سرووشی (واتە- وەحی) داوە بە ماسییەکان، کە ڕۆژانـی شـەممە لەلای ئەو دوو بتەوە حەج بکەن، ئینجا خودا داوای لە جوولەکـەکان کـردووە، کـە ڕۆژانی شەممە ماسی ڕاو نەکەن لەبەر ئەوەی ماسییەکان دێن بۆ حەج.

بێگومان ڕۆژانی شەممە ماسییەکان خۆیـان بەشـێوەیەکی زۆرتـر دەهـاتن‌و وەك چەترو چارۆکە دەردەکەوتن‌و بەسەر ڕووی ئاوەکەدا دەڕۆشتن، بەڵام لە ڕۆژانـی تـردا لە کەناری ئاوەکەو لەسەر ڕووی ئاوەکە دوور دەکەوتنەوە.

هەندێك لە جوولەکەکان گوتیان: ئێمە راوکردنی رۆژانی شەممەمان لـێ قەدەغـە کراوە، جا وەرن با چەند ئەستێرك‌و حەوزێك بۆ ماسییەکان دروست بکـەین تـا لـە ڕۆژی شـەممەدا تێـی کـەون، ئینجـا لەدواییـدا دەیـانگرین‌و دەیـانخۆین، ئیـدی دەستدرێژکارەکان ئەو تاوان‌و دەستدرێژییەی خۆیان ئەنجامدا. کۆمەڵێك لە خـەڵکی گوندەکەش دەستیان کرد بـە ڕێگریـی لـە دسـتدرێژکاران‌و نەیاندەهێـشت خراپـەو

سنوورشکێنی بکەن. بەڵام کۆمەڵێکی تر بێدەنگ بوون و لۆمەی ئەو کۆمەڵەیان کرد، کە بەربەرەکانی سنوربەزێنەکانیان دەکرد.. چەند کەسێکی تریش گوتیان: (ئەمشەو لەم گوندە لەگەڵتاندا نامێنینەوە).

ئینجا دەرچوون و لەکەناری گوندەکە مانەوە. لەکاتی بەیانیدا دیتیان هیچ مرۆڤێك لە مرۆڤە دەستدرێژکارەکانی گوندەکەو لە مرۆڤە بێدەنگەو بێ هەڵوێستەکانیش لەوێ دەرنەچوون و بەڵام هیچ ماڵێکیش دەرگای نەکردۆتەوە.. لەمە سەرسام بوون، بۆیە پیاوێکیان لە خۆیان بۆ ناو گوندەکە ناردەوە تاکو هەواڵی ئەم گۆڕانکارییەیان پێ بدات، ئەویش ڕۆشتەوە بۆ ناو گوندەکەو سەیری نێو ماڵێکی کرد، دیتی خاوەنانی ئەو ماڵە بوون بە مەیموون، سەیری ماڵێکی تریشی کردو دیتی ئەوا دانیشتوانەکانی بوونەتە مەیموون، بەم ڕەنگە لە هەموو ماڵێکدا بوون بە مەیموون.

پاشان پیاوە نێرراوەکە گەڕایەوە بۆلای کۆمەڵەکەی خۆی و ئەو هەواڵەی پێدان، ئەوانیش هاتنەوەو دەرگاکانیان کردنەوەو دیتیان هەموو دانیشتوانەکان بوونەتە مەیموون.. هەرپیاوێك لە گەڕاوەکان ئاماژەی بۆ مەیموونێك دەکردو بەئاماژە لێی دەپرسی (ئەرێ تۆ فلان کەسیت)؟ مەیموونەکەش سەری دەجووڵاندو بەسەر وەڵامی دەدایەوە (بەڵێ فلان کەسم)و لەگەڵ ئەم وەڵامدا دەگریا.

ئینجا کەسە گەڕاوەکانی قەراخ گوندەکە پێیان گوتن: (ئێمە ئاگادارمان کردنەوە) پاشان دەرگاکانی ماڵەکانیان بۆ کردنەوەو ئەوانیش بە سەرشۆڕی دەرچوون و ڕوویان کردە دەشت و ساراو هەر لەوێش دوای ماوەیەك مردن[1].

---

(١) بڕوانە (الدر المنثور)ی (سیوطي) بەرگی (٣) لاپەڕە (٥٨٧-٥٩٢).

## مانای چەند وشــەیەکی گران لەئایەتەکاندا

١- حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ / واتە (لەسەر کەناری دەریابووە).

٢- يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ / واتە (لە ڕۆژی شــەممەدا بــە سەرپێــچی کردنیــان لــە فەرمانی خودا دەستدرێژکار بوون).

٣- ٱلسَّبۡتِ / ڕیشەی وشەی (سەبت)ە، واتە: (بڕاندنەوەو دابڕان) بۆیــەش نــاوبراوە بە ڕۆژی (السبت- شەممە)، چونکە خــودا لــەماوەی شــەش ڕۆژدا ئاسمانــەکانو زەویی خەلق کردووە، واتە لە ڕۆژی یەك شەممەوە بۆ ڕۆژی هەینی.

٤- يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ / واتە: (ڕۆژی دابڕانیانو کارنەکردنیان، کە ڕۆژی شەممەیە).

٥- شُرَّعٗا / واتە: (بەسەر ڕووی ئاوەکەدا، وەك دیاردەیەکی دەرکەوتوو دەرۆشتن کە لە چەترو چارۆکە دەچوون).

٦- نَبۡلُوهُم / واتە: (تاقییان دەکەینەوەو هەڵیان دەسەنگێنین).

٧- بِعَذَابِۢ بَـِٔيسِۢ / واتە: (سزایەکی سەختی بە ئازارو ئەشکەنجە).

٨- عَتَوۡاْ / واتە: هەڵگەڕانەوەو خۆیان بەدەسەڵاتدارو گەورەبینی).

٩- خَٰسِـِٔينَ / واتە: (سەر شۆڕان) بیَ دەسەڵاتان و سزادراوان...

## "( شـــارەکەی ســەرکەناری دەریـــا )

## "(القرية التي كانت حاضرة البحر)"

خـــودا فەرمووبیــــەتی: ﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ ... ﴿١٦٣﴾ الأعراف﴾، خودا لەم ڕستەیەدا فـەرمان بـە پێغەمبـەری خـۆی (محمد المصطفى) ﷺ دەکـات، کـە بـەم چیرۆکەوە ڕووبـەڕووی ئـەو جوولەکانـەی سەردەمی خۆی ببێتەوە، کە بەسەر کۆمەڵە کەسێکی پێشبینی خۆیاندا هـاتووەو، نیشتەجێی شارێکی سەرکەناری دەریابوون.

ئەم چیرۆکەش بەڵگە یەکە لەسـەر ئـەوەی، کـە ئـەم ئایەتانـەی (تایبـەت بـە چیرۆکەکە) لە شاری مەدینەدا هاتوونە خوارەوەو لە سوورەتێکی مەککی (واتە لـە سوورەتێکدا، کە لە شاری مەککەدا هاتۆتـە خـوارەوە، کـە سـوورەتی (أعـراف)ە دانراون، وەك زانراویشە ڕێکخستنی ئایەتەکان لە سورەتەکاندا لەکاروباری خودایەو بەڕاو کۆششکاریی (اجتهاد)ی هـاوەڵان نـەبووە.. هەربۆیـەش زانایـان گوتوویانـە ﴿ئایەتەکانی (١٦٣-١٧٠)ی سوورەتی (الأعراف)، لە مەدینـە هاتوونـە خـوارەوە چونکە دەربارەی (اصحاب السبت) دەدوێتو فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکـەن کـە بەوئایەتانـــە ڕووبـــەڕووی جوولەکـــەکان ببێتـــەوەو پرســـیاریان لـــەبارەی بەسەرهاتەکەیانەوە لێ بکات﴾ دیارە جوولەکانیش هەر لـە (مەدینـە)دا هـەبوونو پێش هیجرەتی پێغەمبەرو هاوەڵان لـە شـاری مەککـەدا هـیچ ڕووبەڕووبوونـەوەو بەرهەڵستکاریەك لەنێوان پێغەمبەرو جوولەکەکاندا نەبووە.

مەبەست لە پرسیارکردنی پێغەمبەریش ﷺ لە جوولەکەکان دەربارەی سەربردەو بەسەرهاتی پێشینە دەستدرێژکارەکانیان بۆ ئەوەنەبووە، کـە گوایـە پێغەمبـەر ﷺ

چه‌ند زانیارییه‌كی مێژوویی له‌ جووله‌كه‌كانه‌وه‌ وه‌رگرێت، چونكه‌ هه‌ر له‌ سه‌ره‌تاوه‌ خودا نه‌یهێشتووه‌ هیچ شتێكیان لێ وه‌رگرێت‌و، هیچیان لێ فێربێت‌و پرسیارو فه‌تواى هیچ كارێكشیان لێ داواكات. هه‌روه‌ها چونكه‌ ئه‌وان ده‌ستكاریی رووداوه‌كانیان كردووه‌و مێژووشیان شێواندووه‌و، متمانه‌ى هیچ زانست‌و زانیاری یه‌كیان پێ ناكرێت.

پرسیاركردنیشی له‌مباره‌یه‌وه‌ له‌ جووله‌كه‌كان پرسیاركردنێكی سه‌رزه‌نشتكارانه‌و شه‌رمه‌زاركارو سووكایه‌تی پێكردنه‌، چونكه‌ ئه‌وان كاتێك ئاگادار ده‌بن له‌وه‌ى، كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ زانیویه‌تی، كه‌وا كۆمه‌ڵێك له‌ باب‌و باپیرانیان وه‌ك مه‌یموون‌و به‌رازیان لێكراوه‌، ئه‌وسا ده‌كه‌ونه‌ نێو دۆخێكی سه‌ر شۆڕی‌و خه‌جاڵه‌تی‌و لاوازی‌و ریسواییه‌وه‌.

﴿ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ﴾ واته‌: (شاری سه‌ر كه‌نار ده‌ریاكه‌، كه‌ رووداوه‌كانی ئه‌م چیرۆكه‌ى تیادایه‌ له‌ قورئاندا شیكاری زانیارییه‌كانی تایبه‌ت (به‌ناوی شاره‌كه‌و، پێگه‌ى جوگرافی (واته‌ مه‌وقیعه‌كه‌ى)و سه‌رده‌می به‌سه‌رهاته‌كه‌و ورده‌كارییه‌كانی دی) باس نه‌كراون. له‌وانه‌یه‌ ئه‌و گونده‌، یان (ئه‌و شاره‌) (ئیله‌)، یان (ئیلات)، یان (عه‌قه‌به‌)، یان (طبریه‌) بێت، یان هه‌ر شارێكی دی... له‌وانه‌شه‌ ئه‌م چیرۆكه‌ له‌ سه‌رده‌می (موسا)، یان داود، یان (سلیمان)، یان هه‌ر پێغه‌مبه‌رێكی تری (بنو اسرائیل)دا بووبێت -سلاویان لێ بێت-.

به‌ڵام ئامرازێكی ته‌واوی جێی متمانه‌و، هۆكارێكی زانستیی واشمان له‌به‌ر ده‌ستدا نییه‌، كه‌ یه‌كێك له‌و ئه‌گه‌رانه‌ى شوێن‌و سه‌رده‌مه‌كانی پێ ده‌سنیشان كه‌ین، یاخود یه‌كێك له‌و ئه‌گه‌رانه‌ى پێ یه‌كلایی (ترجیح) بكه‌ینه‌وه‌، هه‌روه‌ها ئه‌م ده‌سنیشان كردن‌و یه‌كلاییكردنه‌وه‌یه‌، هیچ سوودێك به‌بێ ئه‌و ئامرازو هۆكاره‌ زانستییانه‌ نابه‌خشێت، چونكه‌ ئه‌مه‌ش له‌ شته‌ شاراوه‌كانی قورئانه‌و ئه‌م شاراوانانه‌ش ته‌نها له‌ قورئان، یان له‌ فه‌رموده‌ى راست (صحیح)ه‌وه‌ دیاری

دەکرێن، خۆ گەر لەرێی ئـەم دوو سەرچـاوەیەی (قورئـانو سـوونـنەت)ەوە دیـاری نەکرێن ئەوا هەر بە نەزانراویو شارراوەیی دەمێننەوە، ئەمەیە شـێوازی مامەڵـەی ئێمە لەگەڵ چیرۆکی پێشینەکان لە قورئاندا.

## جوولـەکـەو شـــەممە

ئیمام (راغبی اصفهانی) لە (مفردات)دا گوتوویەتی: (ڕیشەی (السبت) وشەی (قطع)ە، واتە: (بڕینەوە)... بۆ نموونە دەڵێن: (سـبت الـسیر- أي قطعـة)، ڕێگـای بڕی، هەروەها دەڵێن: (سبت شعره (أي قـصة) واتـە قـژی بـڕی، گوتراویـشە ڕۆژی شەممە - السبت- ی پێ ناونراوە، چونکە خودا کاتێك ئاسمانەکانو زەویی لـە ڕۆژی یەك شەممەوە لە شەش ڕۆژدا خەلق کرد، لە ڕۆژی شەممەدا کارەکەی بـڕیو تـەواوی کرد، ئیدی بـەوناوەوە نـاوبراوە. هـەروەها خـەویش بـە (سـبات) نـاوبراوە، واتـە ڕاوەستێنەری کار، مرۆڤی خەوتوو لەکار دادەبڕێت لەماوەی خەوتندا)[1].

ڕۆژی شەممە بە جوولەکەکانەوە لکێنراوەو پڕ بەپێـستی خۆیـشیانە، چ لـە ڕووی ناوەکـەیو ماناکەشـیەوە.. لـەقورئانی پیرۆزیـدا وشـەی (الـسبت)و مانـا دەرهاوێژراوەکانی (حەوت) جار لە قورئاندا هـاتوون، هـەر حـەوت جارەکـەش لـە بۆتەی یەك بابەتدا هاتوون، ئەویش لە باسو لێـدوان لـەبارەی جوولەکەوەیـە.. بـۆ نموونەش:

- هەر لەو ئایەتانەی تایبەت بە چیرۆکەکەدا سێ جـار وشـەی (سـبت)و مانـا لێـــدەرهێنراوەکانی هـــاتووە: ﴿ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا

---

١) (المفردات)ی (راغب)- لاپەڕە (٢٢٠) بەدەسكارییەوە.

﴿... وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ ... ﴿١٦٣﴾ الأعراف﴾.

- یەك جاریش لەم ئایەتەی سوورەتی (النحل)دا هاتووە: ﴿ إِنَّمَا جُعِلَ السَّبْتُ عَلَى الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ النحل﴾.

- یەك جاریش لەم ئایەتەی سوورەتی (النساء)دا هاتووە: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ آمِنُوا بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِمَا مَعَكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَى أَدْبَارِهَا أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ ... ﴿٤٧﴾ النساء﴾.

- یەك جاریش لە سوورەتی (البقرە) هاتووە: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَوْا مِنْكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿٦٥﴾ البقرة﴾.

-(کەواتە حەوت جار وەك لەم ئایەتانەی سەرەوەدا خودا دەربارەیان فەرموویەو باسی لێوەکردوون وشەی (السبت)و مانا دەرهاوێژراوکانی هاتوون).. بۆیەش وشەی (السبت) بۆ جوولەکەکانەو داوایان لێکراوە تاکو لەو ڕۆژەدا خۆیان لەکار دابڕن هیچ کارێکی تێدانەکەن، وەك خوداش فەرموویەتی پێیان: (لاتعدو في السبت)، واتە (لە ڕۆژانی شەممەدا دەستدرێژیی بە هۆی ڕاوکردنی ماسییەکانەوە مەکەنو سنوور مەبەزێنن).

- بەڵام ئەو جوولەکانەی کە لەسەر سەرپێچیو ئەنجامدانی کاری قەدەغەکراو پێکەیشتوون، لە خودایان یاخی بوونو سەرپێچیان لە فەرمانەکەی کردو، لە شەممەدا دەسدرێژییان کردو، کاری قەدەغەلێکراویان ئەنجامدا.. ئیدی نەفرەتی خودایان بەرکەوت: ﴿...أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ ... ﴿٤٧﴾ النساء﴾، هەروەها خودا بەوەش سزای دان، کە ڕوخساری ناشرین کردنو گۆڕینی بۆ

مەیـموونو بەراز: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ البقرة﴾، هەروەها پێغەمبەریش ﷺ هەواڵی ئـەوەی پێـداوین، کە خودا ڕۆژی هـەینی (جومعـە)ی لەسـەر جوولـەکان فـەرزکرد، بـەڵام بـۆ ڕۆژی شەممەی ڕاوکردنو، ئێمەی موسڵمانیشی بۆ ڕۆژی هەینی ڕێنمایی کردووە.

وەك (مسلم) لە کتێبی (صحیح)ی خۆیدا لە (ابو هریرە)وە ﷺ گێڕاویێتییـەوە، کە گوتوویەتی: ((**نحن الاخرون السابقون يوم القيامة بيد ان كل امة اوتيت الكتاب من قبلنا واوتيناه من بعدهمثم هذا اليوم الذي كتبه الله علينـا، هـدانا الله لـه، فالناس لنافيه تبع، اليهود غدا، والنصارى بعد غد**))، واتــە: ﴿ئێمـەی نەتـەوەی موسڵمان، کە لـەدوای هـەموو نەتـەوەکانی تـرەوە لـەدنیادا هـاتووین، لـە ڕۆژی قیامەتدا لەپێش هەموویانەوەین، سەرەڕای ئەوەی گشت نەتەوەیەك لەپێش ئێمەدا پەیامو کتێبی خودایان بۆ هاتووە، ئێمەش دوای ئـەوان... ئـەم ڕۆژەش (هـەینی)، کە خودا بۆی نووسیوینو ڕێنمایی عیبادەتو خواپەرستیی بۆ کردووینو، خـەڵکی نەتەوەکانی تریش ڕۆژانی دوای ئێمەیان بـۆ دانـراوە، جوولەکـەکان ڕۆژی سـبەینێ (واتــە —شـــەممە)یـــان بـــۆ پـــشوودانو کارنـــەکردن دانـــراوەو، بـــۆ دیانـــەکان (نەسرانییەکانی)یش ڕۆژی دووسبەی (واتە یەك شەممەیان) بە پشوو بۆ دانراوە﴾.

لە ڕیوایەتێکی هاوماناو هاوشێوەی تری ئەم فەرموودەیەدا، کە هـەر (مـسلم) لە (ابو هریرە)وە گێڕاویێتییـەوە، کـە پێغەمبــەر ﷺ تیایـدا فەرموویـەتی: ((**نحـن الآخرون، الأولون يوم القيامة، ونحن أول من يدخل الجنّة، بيد أنهم أوتو الكتاب من قبلنا واوتيناه من بعدهم فاختلفوا، فهدانا الله لما اختلفـوا فيـه مـن الحق، فهـذا يومهم الذي اختلفـوا فيـه، هـدانا الله يـوم الجمعـة- فـاليوم لنـا، وغـداً لليهـود، ويعدتـمو للنصارى**))[1].

---

١) مسلم — لە کتاب الجمعة، ژمارە (٧)دا گێڕاویێتییەوە، باب هداية هذه الامة ليوم الجمعـة- رقم (٦) حديث رقم (٨٥٥).

هەروەها (مسلم) لە (حذیفة)ی کوڕی یمانو لە (ابو هریرة)شەوە ﷺ، فەرموودەیەکی تری لەسەر هەمان بابەتو بە هاومانای فەرموودەکەی پێشوو لە پێغەمەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە، کە فەرموویەتی: ((**أضل الله عن الجمع من كان قبلنا، فكان لليهود يوم السبت، وكان للنصارى يوم الاحد، فجاء الله بنا، فهدا الله ليوم الجمعة- فجعل الجمعة والسبت والاحد وكذلك هم تبعانا يوم القيامة نحن الاخرون من اهل الدنيا والاولون يوم القيامة، المقضي لهم قبل الخلائف**))[1].

بێگومان جوولەکەکان، کە ڕۆژی (هەینی)یان ڕەت کردۆتەوە، ڕۆژی (شەممە)یان هەڵبژاردووە، بەڵگەیەکە لەسەر میزاجو نەریتی کینە بەرایەتیان لە وەرگرتنی فەرمانەکانی خوادا.. هەروەها ڕۆژی (هەینی) ئەو جیاوازییە دیارەی نێوان (چۆنیەتی ڕەفتاری میزاجییانەی جوولەکەیە لە وەرگرتنی فەرمانەکانی خوادا)و (چۆنیەتی وەرگرتنی ملکەچانەی هاوەڵانی پێغەمبەریشە بۆ ڕاپەڕاندن فەرمانەکانی خوداو پابەندبوونیان پێوەی.

## تاقیکردنەوەی خودا بۆ دانیشتوانە جوولەکانی نێو شارەکە

خودا جوولەکەکانی نیشتەجێی ئەو شارەی بەوە تاقیکردەوە، کە ڕێی ڕاوکردنی لە ڕۆژانی شەمواندا لێگرتن، وەك دەفەرموێت: ﴿...كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ الأعراف﴾، لەم ڕاستەیەدا وشەی (نبلوهم)، کە لە (ابتلاء)ەوەیە بەمانای تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنە، واتە ڕایسپاردوون بە ئەرکێك، کە گرفتاریی بوون.. ڕاسپاردنیش تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنە، خوداش

---

١) مسلم- لە هەمان سەرچاوە گێڕاوێتییەوە، حدیث رقم (٨٥٦).

لەم تاقیکردنەوەی ڕاسپاردنەدا چەند حیکمەتێکی کاریگەری داناوە.

بێگومان مرۆڤێك، کە بە ئەرکە شەرعیەکان ڕانەسپێررابێت، لە ڕێگای کۆششکردنەوە ناڕواتو لە ڕاگیرکردنی خۆیو پەروەردەکردنی دەرونیدا سەرکەوتوو نابێت، خوداش ئەوە لە مرۆڤ دەخوازێت، کە کۆشش لەگەڵ خۆیدا بکاتو جیهادی نەفسی خۆی بکاتو، پەروەردەی خۆی بکاتو خۆی ڕێکخاتو، لە هەڵچوونو خرۆشان بیگرێتەوەو، لە ئارەزووەکانو دابڕێتو، بەسەر لاوازییدا سەردەکەوێتو، مانا جوانەکانی خێرو چاکە لەدڵی گەشە دەکەنو لەدوایشدا شایستەی خەڵاتی خوداو چوونە نێو بەهەشتەکەی دەبێت.

خۆ ئەگەر ئەرکەکانی نەبوونایە، ئەوا مرۆڤی تێکۆشەرو جیهادکار لە مرۆڤی غافڵو بێئاگا جیانەدەکرایەوەو، پیاوچاك لە پیاوخراپو، بەهێز لە بێهێزو، خەمخۆر لە بێ باكو، سەرکەوتوو لە زەرەرمەندیش جیا نەدەکرانەوە.

سەبارەت بە تاقیکردنەوە (ابتلاء)ی ئیمانداراانیش، خودا لە چەند ئایەتێکدا ئاماژەی بۆ حیکمەتەکانی کردووەو فەرموویەتی:

- ﴿...وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾ الأنبیاء﴾، واتە: (ئێمە ئێوە تاقی دەکەینەوە بە (ناخۆشیو بەڵاو کارەسات)و، بە (خۆشیو ئاسوودەییو دەستڕۆیشتوویی)و سەرەنجام گەڕانەوەشتان بۆ لای ئێمەیە تاکو سزای خراپەکانتان، یان پاداشتی چاکەو خۆراگرتنیان دەسکەوێت).

- هەروەها ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾ محمد﴾، واتە: (ئێمە تاقیتان دەکەینەوە تاکو کەسانی جیهادکارو خۆراگر لەنێوتاندا بناسینو بەئەرکە گرانەکانیش تاقیتان دەکەینەوە، تا لە دواییدا هەواڵی کاروکردەوەکانتان دەرخەینو ئاشکرایانکەین).

- هــەروەها فەرموویــەتی: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ الملـك﴾، واتــە: (خــودای بالآدەســتو پــەروەردگار ئــەو خودایەیە، کە لە ئەزەلەوە مردنو ژیانی بۆ خولّقاندوون، تــاکو تاقیتــان بکاتــەوە بەخۆشیو ناخۆشیەکانی دنیا، کە کامتان کردەوەی چاکترو پەسەندتری هەیە).

تاقیکردنەوەی خوداش بۆ جوولەکەکان لەپێناوی ئەوەدا بووە، کە ئــەوان بەســەر ئارەزووکانیاندا زالّ بنو بەسەر لاوازو بێ هێزییاندا سەرکەون.

بێگومــان ســەرکەوتن بەســەر ئارەزووەکــانو بەســەر دەروونیــشدا، ڕێگایــەکی سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا، بەڵام ئاخر جوولەکە چۆنو کــەی لــە تاقیکردنــەوەدا سەردەکەون؟!

## لەنێوان تاقیکردنەوەی جوولەکەکانو تاقیکردنەوەی موسـلماناندا

لە تاقیکردنەوەی خــوداوە بــۆ جوولەکــەکان، بینیمــان چــۆن کۆمــەڵێك لــەوان ساختەکارییان لە فەرمانەکاندا کردو، کاری قەدەغەکراویان ئەنجام داو، کۆمەڵێکی تریــشیان لەئاســتیاندا بــێدەنگ بــوونو، هــیچ ئامۆژگــاریو بەربەرەکانییــەکیان نەکردن.

لەپێش ئیسلامدا زۆربەی جوولەکەکان لە تاقیکردنەوەدا دەرنەدەچوونو لە بەڵاو گرفتارییشدا خۆڕاگر نەبوون. بەڵام مسوڵمانان بە فەرمانی خوداوە پابەندبوون و لــە تاقیکردنەوەو گرفتارییەکاندا سەرکەوتوو بوون.

خودا مــوسڵمانانی تاقیکردەوە بەوەی، کــە ڕووگــەی نوێــژ (قبلـةِ الـصلاةِ)ی لــە (بيت المقدس)ەوە بۆ (مسجد الحرام) پێگۆڕینو، (کەعبە)ی کردە ڕووگەی تازەیــان،

قورئان حیکمەتی ئەم گۆڕانکارییەی ڕوون کردۆتەوە، وەك لەم فەرمایشتەی خـوادا هـاتووە: ﴿...وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ...﴿١٤٣﴾ البقرة﴾..

واتە: (ئەو ڕووگەیەی پێشووش، کە (بیت المقدس) بووو پێشتر ڕووتـان لەنوێـژدا تێدەکرد گۆڕیـمان بۆ کەعبە، تابزانیت کێ بەڕاستی شوێنکەوتووی پێغەمبـەرەو، کێیش لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوەو بۆ سەر کوفر دەچێتەوە، هەرچەندە گۆڕینی ئـەم قیبلەیە بەڕاستی کـارێکی قورسـە لـەلای خـەڵکی، بـەڵام ئەوانـەی ڕێی ڕاسـتی خودایان هەڵبژاردوەو خـودا هیدایـەتی داون کـارێکی قـورس نییـە، جـا خـوداش (پاداشتی خۆڕاگریی ئێوە لەسەر باوەڕو ئیمانداریتیان ون ناکـات). موسـڵمانانیش لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتن و، ئەو فەرمانە خوداییەشیان دەستبەجێ بـەوردی جێبەجێ کردو پێوەی پابەند بوون.

سـەبارەت بـە مەسـەلەی حـەج و ڕاوکـردن و ئیحـرام بەسـتنیش، خـودا کـاری ڕاوکردنی لە موسڵمانان قەدەغە کردوە لە نێو شوێنە پیرۆزەکانی مەککەو مەدینەو لەکاتی ئیحرام بەستنیاندا. حیکمەتی ئەم قەدەغەکردنەشـی بـۆ ڕوون کردوونـەوەو فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٤﴾ المائدة﴾.

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتـان هێنـاوە، خـودا بەهەنـدێك نێـچیر تاقیتـان دەکاتەوە، کە دێنە پێشەوەو لێتان نزیك دەبنەوە، تا دەتوانن بەدەست بیانگرن، یان بە ڕمەکانتان ڕاوی بکەن لەکاتی ئیحرامدا بۆ حەج و عومرەدا، خودا بەوە تاقیتـان

دەکاتەوە، که لەکاتی نادیاریو پێ نەزانینی خەڵکیدا دەرکـەوێت، کێ لـە خـودا دەترسێتو سەرپێچی فەرمانی خودا ناکات، جا هەر کەسێك لـەئێوە دوای ئەمـە لەکاتی (ئیحرامدا ڕاو بکات)، ئەوا سزایەکی ئازاربەخشمان بۆ ئامـادە کـردووە).
کەوابوو شیاو نییە بۆ موسڵمانان له کاتی حەج، یان عومرەدا ڕاو بکەن، تەنانـەت گەر نێچیرەکە زۆر زۆر نزیکیش ببێتەوە لێیان، بە جۆرێك، کە بەدەستیان، یـان بـە ڕمەکانیان ڕاوبکرێن.

بەڵام بۆچی ئەم ڕاسپاردەیەیان خراوەتە سەرشان؟ بۆچـی پێـی تاقیکراونەتـەوە؟ تاکو خودا بزانێ کێ لەکاتی نادیاردا لێـی دەترسـێت.. ﴿لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ﴾ ئـێ خۆ بێگومان خودا خۆی پێشترو پێش ئەو تاقیکردنەوەیەش هەر دەیزانیو دەزانێـت کێ لەکاتی نادیارو بەپەنهانی لێی دەترسێتو کێش لێی ناترسێت، بەڵام ئەمـە بـۆ ئەوەیە، تاکو خەڵکی خۆیان بزانن‌و تاکو زانستی خـودا بـۆ خـەڵکی دەرکـەوێتو، تاکو خەڵکی بەچاوی خۆیان ببینن‌و، بزانن کێ لەخودا دەترسێتو، کێ لێی ناترسێت تا هەرکەسەو خۆی بناسێـتو خۆی بۆ تاقیی ببێتەوە، کە ئایا لەخواترسە، یان نا؟ ئایا بەئاشکراو پەنهان له هەردوو حاڵەتەکەدا وەك یەك لەخودا دەترسێت؟! پاشـان بۆ ئەوەی لێپرسینەوەو دادگاییکردنی خەڵکی لەسەر کارو کردەوەکانیان بێـت، کـە چییان بەخۆیان کردووە، نەك خودا پێی کردبن.

مانای ﴿مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ﴾ واتە: (ئەوکەسەی چاودێریی خودا دەکاتو دڵیی لە باوەڕ پڕ دەکات، له ترس لە خوداو له خواستنی پاداشتیـشی ئیـدی بـە فـەرمانو ئەرکەکانەوە پابەند دەبێت، سا ئیتر لەنێو خەڵکیدا بێت، یان بزربێـتو بەتـەنهاش بێت هەر له خودا دەترسێتو پابەندی ئەركو فەرمانەکانیـەتی، چـونکە دەزانێـت، کە بێگومان خودا لێی بێ ئاگاو بزر نییەو، هـیچ کـارێکی نادیـارو پـەنهایی لـێ ناشاررێتەوە.

خودا جوولەکەکانی (بە نەهێشتنی ڕاوی ئاژەڵی کێویلە کاتی ئیحرامی حەج، یان عومرەدا) تاقی کردۆتەوە﴿...وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا... ﴿٩٦﴾ المائدة﴾، موسڵمانانیش بەو فەرمانەوە پابەندبوون وگوێڕایەڵییان کرد.

ئەم دوو ڕەفتارە چەند لەیەکتر دورن (ساختەکاری جوولەکەکان) (پابەندیی موسڵمانان) لە هەردوو حاڵەتی تاقیکردنەوەکانی (جوولەکەکان)و (موسڵمانەکان)دا ئامرازی فریودان بۆ سەرپێچیو بەجێنەهێنانی فەرمان لەئارادان, لەلای جوولەکەکان ئامرازی فریودان ئەوەبوو، کە ڕۆژانی شەممە ماسیو نەهەنگەکان بە زۆریو بە چڕیی دەهاتن، بەڵام ڕۆژانی دی بەو ڕەنگە نەبوو ﴿تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ... ﴿١٦٣﴾ الأعراف﴾.

لەلای موسڵمانانیش ئامرازی فریودان ئەوەبوو، نێچیرەکە زۆر لێیان نزیك بۆتەوە، تەنانەت لەبەردەستو بەرنووکی ڕمەکانیان دابووە ﴿...بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ... ﴿٩٤﴾ المائدة﴾. بەڵام جوولەکەکان لە تاقیکردنەوەی خۆیاندا کەوتنو, موسڵمانانیش تێیدا سەرکەوتن.

هۆی کەوتنی جوولەکە لەو تاقیکردنەوەیەدا، سەرپێچیو هەڵگەڕانەوەیانە لە فەرمانەکانی خودا﴿..كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ .. ﴿١٦٣﴾ الأعراف﴾.

هۆی سەرکەتنی موسڵمانانیش لە تاقیکردنەوەکەیاندا ئەوەیە، کە لە خودا دەترسن ﴿...لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ... ﴿٩٤﴾ المائدة﴾.

## ماسییه‌كان جوله‌كه‌كان فریوده‌ده‌ن و خولی ڕۆژانیان له‌گه‌ڵ ده‌به‌نه‌سه‌ر

خودا فه‌رموویه‌: ﴿...إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ...﴿١٦٣﴾ الأعراف﴾.

له‌م ئایه‌ته‌دا سێ جۆره‌ تاقیكردنه‌وه‌ هه‌یه‌:-

یه‌كه‌م: ڕێ گرتنیان له‌ ڕاوكردن له‌ ڕۆژی شه‌ممه‌دا.

دووه‌م: هاتنی ماسییه‌كانیش به‌چڕیی‌و به‌زۆریی بۆ سه‌ر ڕۆخی ده‌ریاكه‌ له‌ ڕۆژانی شه‌ممه‌دا، كه‌ وه‌ك چارۆكه‌ له‌سه‌ر ڕووی ئاوه‌كه‌ ده‌رده‌كه‌وتن‌و لێیان نزیك ده‌بوونه‌وه‌، ئه‌مه‌ش هۆیه‌كی فریوده‌ری جووله‌كه‌كان بوو، تا ڕاویان بكه‌ن.

سێیه‌م: نه‌هاتنی ماسییه‌كان له‌ ڕۆژانی تردا‌و گه‌ڕانه‌وه‌یان‌و دیارنه‌بوونیان كاتێك ده‌چوون بۆ ڕاوكردنیان له‌ ڕۆژانی غه‌یری شه‌ممه‌دا.

سه‌باره‌ت به‌ دیارنه‌بوونی ماسییه‌كان له‌ ڕۆژانی تردا ئه‌وه‌ مه‌سه‌له‌یه‌كی سروشتی‌و لۆژیكی (منطقي)یه‌، چونكه‌ چۆن خۆیان به‌ ئاسانی ده‌ده‌نه‌ ده‌ست ڕاوكه‌ران‌و چۆن ده‌بنه‌ نێچیری تۆڕه‌كانیان.

به‌ڵام هاتنی ئه‌و ماسیانه‌ بۆ لایان له‌ ڕۆژانی شه‌ممه‌داو به‌و شێوه‌ چڕییه‌ له‌سه‌ر ئاوه‌كه‌، ئه‌وه‌ بێگومان تاقیكردنه‌وه‌و گرفتاركردنیان بووه‌، چونكه‌ ئه‌وان له‌ ڕۆژانی تری جگه‌ له‌ شه‌ممه‌دا به‌دوای ماسییه‌كاندا ده‌گه‌ڕان‌و نه‌یانده‌بینین، به‌ڵام وا له‌ ڕۆژی شه‌ممه‌دا دێنه‌ به‌رده‌ستیان‌و فریویان ده‌ده‌ن تا بیانگرن، ئه‌مه‌ش له‌گه‌ڵ داسووڕانه‌وه‌و

خول بردنەسەری ڕۆژانیانو بزواندنی تەماعو چاوچنۆکیو ئارەزوویانە.

جا ئایا ئارەزووبازو چاوچنۆکان لەبەردەم ئەم دیاردە فریودەرەدا خۆ ڕادەگرن؟ ئایا بە ورەی خۆیانەوە بەسەر ئەو ئارەزوانەدا زاڵ دەبن؟ ئایا هۆکارەکانی جیهادی نەفسو ئارام گرتنو ئارام لەسەر خۆگرتنو دان بەخۆ داگرتن لە مەسەلەکەدا دەخەنە گەڕ؟ ئایا هاوارەکانی دەسدرێژکاریو فێلکاریو سەرپێچی کاریی، کە لە (دەروونیانەوە دەردەچێت) بێ دەنگ دەکەن؟

وادیارە ئەمەیە حیکمەتی ئەو سووڕانو خول خواردنی ڕۆژانە، کە لە شەممەدا بۆیان دەردەکەونو لە ڕۆژانی تردا لێیان ون دەبوونو حیکمەتی فریودا نیشان لەلایەن ماسییەکانەوە. بەڵام ئارەزووبازە دەستدرێژکارەکان خۆیان ڕانەگرتو ئارامیان نەگرتو سەرنەکەوتن، بەڵکو فێڵی وردو زیرەکانەیان بۆ گرتەبەر تەنها خۆشیان هەڵخەڵەتان.

## فێڵ و ساختەکاریی جوولەکەکان لە فەرمانی خوادا

کۆمەڵێك لە دانیشتوانی شارەکە خۆیان لەبەردەم ئەو دیاردە فریودەرانەیەی ماسییەکاندا ڕانەگرت، بەڵکو فێڵێکیان لە فەرمانەکەی خوادا دروست کردو بەو فێڵەش لە ڕۆژی ڕێ پێنەدراوی ڕاوکردنیاندا ڕاوی ماسییەکانیان کرد. هەندێك لە زانایانی تەفسیر چەند زانیارییەکی ڕوونکەرەوەیان لەسەر ئەو فێڵەی جوولەکەکان دیاری کردووە، کە لە دەقە ئیسرائیلییەکانەوە هێناویانە، ئەوان گوتوویانە: (فێڵبازەکانی جوولەکە چەند ئەستێركو حەوزێکیان لە تەنیشت دەریاکەوە هەڵکەندووەو، ئاویش لە حاڵەتی هەڵکشان (مد)ی دەریادا ئەو ئەستێركو حەوزانەی پڕکردۆتەوەو ماسییەکانی تێکەوتون، کاتێك ئاوی دەریاکەش لە حاڵەتی داکشان (الجزر)دا کەمبۆتەوەو لەو چاڵو حەوزانە بڕاوە، ماسییەکانی تێدا ماون،

ئیدی جوولەکەکان لە ڕۆژی یەك شەمەدا هاتوونو ماسیکانیان گرتووەو سەرەڕای ئەوەش گوتوویانە (ئێمە بە فەرمانی خوداوە پابەندین، چونکە لە ڕۆژی شەممەدا ڕاوی ماسیەکانمان نەکردووە، بەڵکو لە ڕۆژی یەك شەممەدا ڕاومان کردووە).

ئەم شیکارو زانیارییەش لە فەرموودەی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەر ﷺ نییەو نەهاتوە، بۆیە ئێمەش نایلێینەوەو هیچ شتێکی تریشی لەسەر نالێینەوە، لەوانەشە جوولەکەکان ئەو کارەیان بەو ڕەنگە کردبێت، لەوانەشە نەیانکردبێتو کردارێکی تریان کردبێت، چونکە ئێمە نەمانزانیوە چۆن فێڵیان کردووەو، ڕاویان کردوون، بەلاشمانەوە گرنگ نیە، کە بزانینو لە نەزانینیشماندا زیانمان پێ نەگەیشتووە، هەروەك بە زانینیشی هیچ زانستو سوودێکمان چنگ ناکەوێت.

جا لەجیاتی ئەوەی سەربکەینە سەر دەقە هەڵبەستراوە ئیسرائیلییەکانو کاتی خۆمان بەشتی بێسوودەوە بەفیڕۆ بدەین پێویستە لەو هەڵسوکەوتەی جوولەکەکان وردبینەوەو بپرسین! بۆچی سنوور بەزێنانو دەدسدرێژکاران فێڵیان لە فەرمانی خودادا کردووە.؟

بەڕاستی هیچ خاوەن دڵێك، کە دڵی بەخوداوە پەیوەستەو، دڵی پڕە لە باوەڕ بە خوداو، خودا بە گەورەو شکۆدار دەگرێتو، بەتەمای بەهەشتی خودایە فێڵو ساختە کاریی لەسەر فەرمانەکانی خودا ناکات. بێگومان دڵی باوەڕدار لەسەر ڕێگای خودا بەردەوامو جێگیرو وابەستەی فەرمانەکانی خودایەو بەشەوو بەڕۆژ لەسەر ئەو حاڵەتەشە.

بەڕاستی تەنها کەسێك، کە دڵی لەخودا دوورە، فێڵ لە فەرمانی خوادا دەکات، چونکە کاتێك دڵ لە بەرنامەی خودا لادەداتو لە ڕێگای خودا دەردەچێت، ئیدی هەر بە فێڵو پێچو پەناو لاریو لاسارییەوە، مامەڵە لەگەڵ فەرمانەکاندا دەکات.

بێگومان تەنها دڵی باوەڕدارو لەخواترس، پارێزگاریی شەریعەتو فەرمانو

ئەرکەکان دەکات، دەنا دڵەکانی دیکە، هەرخەریکی زۆر کردنی فرِوفێڵن لە ئاست فەرمانو ئەرکەکاندا، وەك چۆن جوولەکەکان کردیان.

ئا ئەمەشە ڕازو نهێنیی سەرکەوتنی ئیسلام لە یاساو دەقەکانیدا، کە توانیویەتی دڵانی باوەڕداران بژێنێتەوەو بە خوداوە پەیوەستیان کات، دڵەکانیش وابەستەی دەقو یاساکان بوون، هەر ئەمەشە ڕازو نهێنیی شکستیی ڕژێمو بەرنامەو یاسا دەستکردەکان، چونکە چاویان لە (سەودا لەگەڵ دڵەکاندا) پۆشیوەو دڵانی خەڵکییان پێ نەدواندووە، هەر بۆیەش تەنها پشتیان بەچەند یاسایەكو چەند دادوەرێكو چەند پۆلیسو پاسەوانێك بەستوە، دەی چەند ئاسانە کە مرۆڤ لەدەست ئەمانە دەرچێتو هیچ پابەندیەکی پێیانەوە نەبێتو پەنابباتە بەر فروفێڵو لادان.. (چونکە ترسی خودای لەدڵ نەچێنراوە).

## دانیشتوانی شارەکە سێ (ئوممەت) بوون

دانیشتوانی شارەکە لەئاست سەرپێچی سنووربەزێنو فەرمان شکێنەکاندا ببوونە سێ دەستە، یان باشتر بڵێین (بەدەربڕینی وردتری دەقی قورئان ببونە سێ ئوممەت):

١- ئوممەتێکی فەرمان شکێنو سنووربەزێن، کە لە ڕۆژی شەممەدا ماسییان ڕاوکردووە.

٢- ئوممەتێکی پەندداتەرو باش، کە پەندو ئامۆژگاریی سەرپێچیکارانیان داداوە.

٣- ئوممەتێکی بێدەنگو بێ هەڵوێست، کە گلەییان لە ئامۆژگاران کردوە لەجیاتی ئەوەی گلەییەکەیان لە خراپەکاران بکردایە. وەك خودا لەبارەیانەوە فەرمویەتی: ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ

عَذَابًا شَدِيدًا ...﴿١٦٤﴾ الأعراف﴾.

دەربڕینی وشەی (ئوممەت) لە ئایەتەکەدا نەختێك هەڵوێستەمان پێ دەکات وە دەبێت لێی وردبینەوە، خەڵکی شارەکە سێ نەتەوە (ئوممەت)ن لە ئایەتەکەدا، بۆ سێ نەتەوە دابەش بوون، لەکاتێکدا لەیەك ڕەگەزو یەك ڕەچەڵەکن‌و لەیەك شاردا نیشتەجێن‌و پەیوەندییەکی ڕەگەزی‌و نەتەوەیی‌و کۆمەڵایەتی‌و ژینگەییان لەنێواندایەو پێکەوەی بەستوون؟!

بێگومان ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە نەتەوە (ئوممەت) لە چەمکی قورئانی‌و تێڕوانینی ئیسلامیدا، مانایەکی دیکەی پێچەوانەی چەمکە جاهیلییەکە هەیە. لە چەمکی جاهیلیدا نەتەوە:-

(کۆمەڵە کەسێکن کە لە یەك هەرێمدا دەژین‌و یەك مێژووو یەك زمان کۆیان دەکاتەوە).

بەڵام پێناسەی نەتەوە لە چەمکی قورئانیدا وەك (راغب الاصفهانی)یش لە (مفردات)ەکەیدا باسی لێ کردووە، ئەوەیە گوتوویەتی: (کۆمەڵێکن کەمەسەلەیەك کۆیان دەکاتەوە، وەك ئەوەی ئاینێك، یان سەردەمێك، یان جێگەیەك، سائیتر ئەو هۆکارە کۆکەرەوەیان بە ناچار کردن، یان بەخواستی خۆیان بووبێت)[1].

(سید قطب)یش ـ خوا لێی خۆش بێت ـ دەربارەی واتای (ئوممەت) لە پێناسەی ئیسلامیدا، گوتوویەتی: (نەتەوە لەپێناسەی ئیسلامیدا: ئەو کۆمەڵە کەسەن کە بەیەك عەقیدەو یەك تێڕوانینەوە دیندارن‌و ملکەچی سەرکردایەتیین، نەك بەپێی ئەو بۆچوون‌و تێڕوانینە جاهیلییە دێرین‌و نوێیەش بێت، کە پێناسەیان ئاوایە گوایە: نەتەوە کۆمەڵەکەسێکی دانیشتووی یەك هەرێمی سەرزەوین‌و یەك دەوڵەت

---

١) (المفردات)ی —راغب الأصفهاني- ص(٢٣).

حوکمیان دەکات).

هەروەها (سید قطب) دەربارەی دابەش بوونی خەڵکی شارەکەی سەر کەناری دەریا، گوتوویەتی: (دانیشتوانی ئەو شارە بۆ سێ نەتەوە دابەش ببوون:

١- نەتەوەیەکی یاخیو ساختەکار.

٢- نەتەوەیەکی بەرهەڵستکاری دژی تاوانو سەرپێچی کاریو فێڵکارییکە بەشێوەیەکی چاکو لەبارو بەنکوولی لێکردنو ڕێنماییو ئامۆژگاری کردنەوە دژی سەرپێچی کاران وەستان).

٣- نەتەوەیەکی ڕێ خۆشکار بۆ خراپەو خراپەکاران، کە هەڵوێستێکی نالەباری پێ ناخۆش بوونیشیان گرتۆتەبەر، هەرچەندە تاوانەکەیان پێ ناخۆش بووە، بەڵام بە هەنگاوێکی چاکو لەبار بەرپەرچیان نەداونەتەوە.

ئەم شێوازانەش چەند شێوازو ڕێچکەیەکی هەمەجۆرن لە تێڕوانینو هەڵسوکەوت، کە هەرسێ کۆمەڵەکەی دانیشتوانی شارەکەی کردۆتە سێ نەتەوە)[١]

ئەمەش دەلالەتە لەسەر ئەوەی، کە (ئیسلامو ئیمان) یەك نەتەوە بۆ دووبەشو بۆ دوو نەتەوەی دی دابەش دەکات. ئەم دابەشکارییەش لەسەر بنچینەیەکی باوەڕدارانەی ئیسلامییە، نەك لەسەر بنچینەیەکی پۆلێنکاریو دابەشکردنی جاهیلیانە بێت.

دیارە هەر کۆمەڵگەیەکیش، چەندین کەسی لە ئیماندارو کافر تێدایەو بۆ دوو نەتەوەش دابەش دەبن:-

١- نەتەوەی یەکەم: نەتەوەی باوەڕدارە موسڵمانەکانن، واتە: ئەوانەن، کە ئەم ئاینە کۆی کردوونەتەوەو وتەو گوتارو دروشمێك یەکی خستوونو، دڵی

---

١) (في ظلال القران) ی- سید قطب- بەرگی (٣) لاپەڕە(١٣٨٥).

هەموویانی لەسەری پێکەوە هێشتۆتەوە.

٢- نەتەوەی دووەم: نەتەوەی بێباوەڕان (کافران)، ئەوانەن کە (کوفرو باوەڕنەهێنانیان بەم ئاینە)و (دژایەتی کردنی شوێنکەوتوانی ئەم ئاینە) کۆی کردوونەوە.

## "لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا" ؟

خـــودا فەرمووییـــەتی: ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ...﴿١٦٤﴾ الأعـراف﴾. ئەمەیـە لۆژیـكو گوتـاری نەتـەوەی بێدەنگ بوو له خراپە، ئەمە هەڵوێستی هەموو کەسێکی تری بـێ دەنگیـشه، کـه لەئاست خراپەکاراندا قرِوقەپی لێ دەکەنو، له هەمـوو کـاتو جێگەیەکـــدا پـاڵی لێ دەدەنەوەو ئامۆگارییـەکی یاخییـەکان ناکـەنو، هـیچ فـەرمانو ئاگاداریـەکی خودایان بەبیرناخەنەوە. هەڵوێستو ئاکاری ئەم جـۆرە کەسـانه لـەم چـەند خاڵـەدا پوخت دەکرێـتەوە:-

١- چاوپۆشینیان له بڵاوبوونەوەی خراپەو وازهێنانیان لـه خراپـەکارانیش تـا هـەر سەرقاڵی خراپەبن، هـەروەها خۆدابڕینیـان لەوکۆمەڵگەیـەی، کـه سـەرگەرمی خراپەکاریین.

٢- دانیشتنو وازهێنانیان لەکاری ئیجابیو لەبار، له مەسەلەی فـەرمان بەچـاکەو ڕێگریی له خراپەدا.

٣- دابین بوون به نکوولیی دڵ لەئاست کاری نالەباردا، واته: (نکۆڵی کردنی خراپه تەنها بەدڵ)، که ئەمه لاوازترین باوەڕە .

٤- ئاراستەکردنی گلەییو سەرزەنشت بۆ چاکەخوازو بانگەوازکارو ئامۆژگاران.

٥- حوکمدان لەسەر خراپەکاران بەوەی، که (خودا هەر لـەناویان دەبـات سـزایەکی سەختیان دەدات) و بـەم پێیـەش گوایـه هـیچ سـوودێك لـه ئامۆژگـاریکردنو یادخستنەوەی فەرمانەکاندا نیه.

# "قَالُواْ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ "

ئەم چاکەخوازو بانگەوازکارانەی، کە ئامۆژگاریی‌و بەرهەڵستی خراپەکارانیان دەکرد، لە وەڵامی کەسانی بێدەنگدا، کە پێیان گوتبوون واز لە خراپەکاران بێنن گوتیان: (ئێمە بۆیە ئامۆژگاریان دەکەین، تاکو بەڵگەی کەمتەرخەمی نەکردنی خۆمان بخەینە بەردەم خوداو بەشکم لەهەمان کاتدا لەو خراپەکارانەش پاشگەزبنەوەو لەخودا بترسن، وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە، کە: ﴿...مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ الأعراف﴾، کەواتە دوو پاڵنەر وایان لێکردوون :-

١/ <u>پاڵنەری یەکەم</u>: (مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ )- (بەڵگەی کەمتەرخەمی نەکردنمان بخەینەڕوو بۆ پەروەردگارتان).

ئەمەش وەك ئەوەی پێیان بڵێن: (دەمانەوێت پاساوی خۆمان بخەینە بەردەم خودا تاکو لە لێپرسرینەوەو سزا ڕزگار بین).

ئێمە لەکاتێکدا نکوڵی لەخراپە دەکەین‌و ڕێی لێدەگرین، سوورین لەسەر ئەوەی، کە ئەم مەبەستانە بەدی بێنین:

١- ئەو ئەرکە بەجێ بگەیەنین، کە خودا لە زۆربەی ئایەت‌و فەرمایشتەکاندا پێی ڕاسپاردووین، چونکە ئەگەر ئەرکەکە بەجێ نەگەیەنین، ئەوا دەکەوینە بەر سزای خودا.

٢- پاساوو داوای لێبوردن بخەینە بەردەم خوداو خۆمان پاك کەینەوەو، چونکە هەوڵ‌و توانای خۆمان خستۆتەگەڕو، ئەوەی لێمان خوازراوە، جێبەجێمان کردوە.

یەکێك لە ڕەحمەتەکانی خوداش ئەوەیە، کە ئەنجامەکانی لێ داوا نەکردووین (واتە بەدەمەوەهاتنی خراپەکاران و گوێرایەڵی کردنیان بۆ ئامۆژگارییەکانمان لەسەر ئێمەیە)، چونکە ئێمە هەوڵ و کۆششی تەواوی خۆمان خستۆتە گەڕ، خوداش لەسەر بەرهەمی، لەسەر ئەنجامەکەی لێمان ناپرسێتەوە.. ئێمە تەنها ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەمان لەسەرە، لەکاتێکدا ڕێساو فەرمانەکان بەبیر خەڵکی دێنینەوەو ئامۆژگارییان دەکەین و ڕێگریی خراپەیان لێ دەکەین، خۆ ئەگەر خەڵکیش بەدەم ئامۆژگارییەکانمانەوە نەیەن و باش نەبن، ئەوە لە لێپرسراوێتیی ئێمەدا نیە، وەك خوداش بە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ فەرمووە:

﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ الغاشية ﴾.

هەروەها کاتێك بەرهەڵستیی خراپەکاران دەکەین و ئامۆژگارییان دەکەین و بەڵگەی بەریبوونی خۆمان لێیان دەخەینە بەردەم خودا، ئەوا بێگومان خۆمان لەو سزا دنیاییەش دەپارێزین، کە لەدنیادا هەندێك جار تووشی خراپەکارو سەرپێچی کاران دەبێت، وەك خوداش فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾ هود ﴾.

٣- تاکو بەڵگە لەسەر خراپەکاران تۆمارکەین، کە بێگومان ئەوان مافی ئەوەیان لەسەرمانە، کە ئامۆژگارییان بکەین و ڕێسا شەرعی یەکانیان وەبیرخەینەوە. ئەمەش مافێکی بڕیاردراوی قورئان و سووننەتیشە، چونکە لەوانەیە ئامۆژگاری و بەیادهێنانەوەو ڕێگریی لێکردنیان سوودمەندو بەکەڵك بێت بۆیان، ئەوان لەخراپەکانیان بکشێنەوە. خۆئەگەر ئامۆژگاریی دادی نەدان و بەیادهێنانەوە سوودی بۆیان نەبوو، لە ڕێکبوونەوەو ڕاست بوونەوەو چاك بوون، نزیك نەبوونەوە، ئەوا ئێمە بەڵگەی خۆمان لەسەریان تۆمار کردووەو هەرلە خۆیاندا شاهیدمان لەسەر خۆیان ڕاگرتووە.

## "وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ "

**٢/ پاڵنەری دووەم/** ئەوەیە بەشکم لەخودا بترسن (وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ )، واتە بەشکم پەند دادانو ئامۆژگاری کردنیان تەقواو لەخواترسانو گوێرایەڵیو پابەندی یەکیان بۆبەدیی بێنێت، چونکە بێگومان کاتێك بانگەوازکارو چاکەخوازان ئەرکی (ئامۆژگاریو ڕوون کردنەوەو فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لەخراپە) بەجێ دەگەیەنن، لەوانەیە ئەمە پارێزکاریو تەقواو بەندایەتیو باوەڕو پابەندیی لەلای خەڵکی بجوڵێنێت لەوانەشە هەندێك کەس لە خەڵکی (کە خۆیان ئامۆژگاریو ڕێنمایی کەس ناکەن) بەرهەڵستییەکی بانگەوازکارو چاکە خوازان بکەنو وایان بۆ دەرخەن گوایە " هەوڵو کۆششی چاکسازیو ئامۆژگاری کردنیان بەفیڕۆ دەڕواتو، هیچ بەروبوومو ئەنجامێکی نییە، چونکە کالاّی ئەوان تەنها قسەکردنەو، قسەش سوودبەخشو بەردار نییەو، خەڵکیش بەقسەو ئامۆژگاری وابەستە نابن، چونکە گوایە تێریان خواردووە لە قسەو باس، ئیدی چاکە خوازانیش هەوڵو کۆششی خۆیان بهێڵنەوەو دەمو قوڕگی خۆیان بپارێزنو دەنگو قسەو باسیان پاشەکەوت کەن".

وتەی ئەم جۆرە کەسانە ناپەسندەو، بەرهەڵستییەکەیان ناڕەوایەو، چەندین هەڵەو کەموکورتیی تێدایە، هەرکەسێك ئەم وتەیە بڵێت ئەوا، یان کەسێکی دڵ پڕ لەقینو دوژمنی بانگەوازە، یاخود بێ ئاگایە لە بانگەوازو هیچ لەبارەی هێزی قسەو کاریگەرییەکەیەوە نازانێت.

لە جیهانی فیکرو بیروباوەرو بانگەوازکاریدا (وتە)و قسەوباسو ئاخاوتن هێزێکی ڕەچاوکراوی هەیە چونکە هەموو بانگەوازو بیروباوەڕەکان لەسەر وتەو

ئاخاوتن بنیات نراون.

بێگومان پێغەمبەرانو نێرراوان هیوایان لەسەر وتەو بانگەوازو بەیاد هێنانەوەو ئامۆژگاری هەڵچنیوە. ئەمەش لەکاتی بانگکردنی گەلەکەنیاندا بۆ دینداری. هەریەکە لەو پێغەمبەرانەش (سلاوی خودایان لێ بێت) یەك داواکاریی بنەڕەتیو دیاریکراوی لە گەلەی هەبووە، ئەوەبوو، کە: تەنها خودا (الله) بپەرستنو هیچ پەرستراوێکی ترتان نییە: ﴿...ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ...﴿٥٠﴾ هود﴾.

ئایینی ئیسلامی ئێمەش لەسەر وتەو ئاخاوتن بنیات نراوەو، یەکەمینو شەش، کە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە خوارەوە فەرمان پێکردنی بوو، کە بخوێنێت بەناوی پەروەردگاری خالقەوە ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ العلق﴾.

هەروەها قورئان داوا لە موسڵمانان دەکات کە قورئان بە کافران بگەیەننو فەرمایشتی خودایان بەگوێدا بدەن: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبۡلِغۡهُ مَأۡمَنَهُۥ...﴿٦﴾ التوبة﴾...، واتە: (ئەی پێغەمبەر لەویشەوە بۆ (باوەڕداران) ئەگەر یەکێك لەوانەی هاوەڵیان بۆ خودا داناوە داوای پەنای لێ کردیتو پەنای بۆ هێنایت، تۆش دالدەی بدە، هەتا گوێی لە فەرمایشتی خودا لە قورئان دەبێت، ئینجا بۆ شوێنی خۆی ڕەوانە بکە، کە جێی هێمنو متمانەی خۆیەتیی لە ماڵو گیانیو ژیانیدا، بۆیەش پێویستە فەرمایشتی خودایان پێ بگەیەنن، چونکە ئەوان کەسانێکی نەزاننو لەوەو پێش تێنەگەیشتوونو نەیانزانیوە).

ئەمەش تەنها پەی بردنە بە هێزی بەو باوەڕهێنانە بە کاریگەرییەکەی لە دەروونی بیسەری بانگراودا.. بەڵام بەدەستهێنانی نرخو بەهای وتەو ئامۆژگاریو، بەجێگەیاندنی ڕۆڵ و ئەرکیانو، دەرکەوتنی هێزوتینیان، تەنها لەڕێی باوەڕی

جیددیی بانگەوازکارەکەوەیە بەوەی، کە دەیلێتو دەری دەبڕێتو، پاشان بە پابەندیی کردەیی (عملی)یەوە بەوەی بانگەوازی بۆ دەکات، هەروەها بە گەیاندنی وتاری خۆی بە خەڵکی بەوپەڕی تواناو ڕاشکاویو جورئەتو بەشێوازی جوانو ئەدەبو ڕاستگۆیی دەربڕینی زامو ژانەکاندا، تاکو بیسەر بزانێت کە ئەم قسانە لەدڵەوە دەردەچنو تێکەڵ بەخوێنی خاوەنەکەی بووەو لەدڵیدا چەکەرەکەی کردووەو سەراپای وجودو عەقڵو ژیانی گرتۆتەوە، چونکە وەك شینو زاریی شیوەنکاران نیە.

## "لەبیر چوونەوەی حوکمەکان سەرەتایەکی سزادانە"

خودا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ﴾، دەبینین ئەم ئایەتە سزای بە لەبیرچوونەوەوە بەستۆتەوە ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ۝١٦٥ الأعراف﴾.

لەم شێوە ڕێکخستنەی قورئان بۆ کاروباری سزاو لەبیرچوونەوەدا مەسەلەیەکی گرنگ وەردەگرین، ئەویش پێویست بوونی بەیادهێنانەوەی فەرمانەکانی خوداو حوکمەکانی وەبیرهێنانەوەی نەتەوەیە پێیانو بەردەوامیی سازکردنو هێشتنەوەی فەرمانەکان بەچاکەو ڕێگریەکان لە خراپە لە تێڕوانینو هەستو فیکری هەر تاکێکی ئەم نەتەوەیەدا، چونکە هەر ئەمە زامنی هێشتنەوەی ڕۆڵەکانی نەتەوەیە لە سنووری خۆیانداو، لەوابەستەییانو، دوورکەوتنەوەیان لە سەرپێچی کردنو لە بەزاندنی سنوورەکان، هەروەها لەم شێوە ڕێکخستنەدا مەسەلەیەکی تری گرنگ بەدیی دەکەین، ئەویش ترسناکیی لەبیرکردنی ئەرکەکانو ئامۆژگاریەکانە لەلایەن ڕۆڵەکانی نەتەوەوە، چونکە لەبیرکردنیانو ولێ بێئاگابوونیان حاڵەتێکی

سـووكایه‌تی پێكـردن‌و بێبـاكی لـه‌لای خـه‌ڵكی دروسـت ده‌كـات، ئه‌مـه‌ش سه‌رده‌كێشێت بۆ سنوور شكاندنیان‌و سه‌رپێچی لێكردنیان، جا ئه‌گه‌ر ئه‌و ڕۆڵانـه‌ی نه‌ته‌وه‌ له‌ بێ‌باكی‌و له‌بیرچوونه‌وه‌دا سـه‌رنگووم بـن، ئـه‌وا ڕاسـتییه‌ ئایینییـه‌كان‌و سوننه‌ته‌ خوداییه‌كان‌و، حوكمه‌ شه‌رعییه‌كانیان له‌بیرده‌چێته‌وه‌، بـه‌م ڕه‌نگـه‌ش لـه‌ بازنه‌ی هزرو تێڕوانین‌و هه‌ستیشیان ده‌رده‌كه‌ن دوای ئه‌وه‌ی له‌ بازنه‌ی به‌بیرهێنانه‌وه‌و بایه‌خ‌و پابه‌ندیی‌و كارپێكردن ده‌ریان كردبوو. خۆ ئه‌گه‌ر ڕۆڵـه‌كانی نه‌تـه‌وه‌ بگه‌نـه‌ ئه‌م پله‌ی له‌بیرچوون‌و بێئاگاییه‌، ئه‌وا گشت، په‌یوه‌ندییه‌كیشیان بـه‌خودا، یـان بـه‌ ئایین، یان به‌شه‌رعه‌وه‌ له‌ده‌ست داوه‌و ئیدی شایسته‌ی كه‌وتنه‌به‌ر سزای خودابوون.

ئه‌مه‌ش هه‌موو له‌و ڕێكخستنه‌وه‌ وه‌رده‌گرین، كه‌ چۆن سزا بۆ فه‌رمانشكێنه‌كان ڕێك ده‌خات به‌هۆی له‌بیرخۆ بردنه‌وه‌ی ئه‌و حوكمانـه‌ی كـه‌ بـه‌یادو هزریـان هێنـرا بـــــووه‌وه‌: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ أَنْجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ الأعراف﴾.

بێگومان له‌م ڕووه‌وه‌ چه‌ندین ئایه‌تی تر هـاتون‌و بڕیـار له‌سـه‌ر ئـه‌م حه‌قیقه‌تـه‌ ده‌ده‌ن‌و ئاماژه‌ بۆ ئه‌و سوننه‌ت‌و ده‌ستووره‌ خوداییه‌ ده‌كه‌ن، كه‌ خـه‌ڵكی حـوكم و فه‌رمان‌و ڕێسا شه‌رعییه‌كانیان له‌بیریان خۆیان بردۆتـه‌وه‌، یـان بـه‌هۆی سـه‌ركردنه‌ سه‌ر دنیاو سته‌مكارییه‌وه‌ له‌بیرچوونه‌ته‌وه‌:

- خـــودا فه‌رموویـــه‌تی: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَىٰ أُمَمٍ مِنْ قَبْلِكَ فَأَخَذْنَاهُمْ بِالْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَا إِذْ جَاءَهُمْ بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا وَلَٰكِنْ قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٥﴾ الأنعام﴾.

- هـــەروەها فەرموویـــەتی: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩٥﴾ الأعراف ﴾.

هەروەها قورئان جەختیـشی لەسـەر ئـەوە کردۆتـەوە، کـەوا بـەبیر هێنانـەوەی بێدارانەو ئاگایانەی بەردەوام، ڕێگەیەکـە بـۆ پابەنـدبوون بەحوکمەکانەوەو،بـەوەش سەرکەوتن بەسەر وەسوەسەو خورپەی شەیتاندا بەدیی دێت: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ الأعراف ﴾.

بۆیە بە یادهێنانەوەی حوکمە خوداییەکان، ڕێگەیەکە بـۆ پێـوە پابەنـدبوونو، ڕێگەیەکیشە بۆ لابردنی سزا، بەڵام لەبیرچوونەوەی حوکمە خوداییەکان، ڕێگەیەکە بۆ بەسەردا تێپەڕبوونیانو سنووربەزاندنیانو، ڕێگەیەکیـشە بـۆ هـاتنی سـزا. لـە نەتەوەشدا چەند کەسێك هەنو سوورن لەسەر لەبیرخۆبردنەوەی فەرمانەکانی خوداو سووریشن لەسەر ئەوەی، کە لەبیر خەڵکی تریشی بەرنـەوە. ئـەوان دەیانخەنـە نێـو کەشێکی بێئاگاییو لەبیرچوونەوەوە، تاکو ئەو حومکانە لـەیادەوەرییو شـعوریان دوورخەنەوە، دوای ئەوەی لە (واقیـع و کـارپێکردنو گـوزەران پێکـردن) دووریـان خستوونەوە.

بۆیە لەسەر بانگەوازکارو چـاکەخوازان پێویـستە، کـە لـە ئامۆژگـاری کردنـی ڕۆڵەکانی نەتەوەو لە پەندو ڕێنمایی کردنو بەبیرهێنانـەوەیان بـەردەوام بـن، تـاکو هەمیـشە یـاداوەریی نەتـەوە سـازو ڕێکخـراو بێـت بـۆ پـەیرەوکردنی ڕێنمـاییو حوکمـەکانو، هـــەروەها تـــاکو بیرکردنـــەوەو تێفکـــرین لـــە حـــەڵاڵ وحـــەرام، لـــە

قەدەغەکراوو ڕێ پێدراو کردارێکی زیندووی نێو شعوری نەتەوە بێت. پێویستە لەسەر نەتەوەش پەی بە ترسناکیی بیرچوونەوەی ڕێسا خوداییەکان ببات، چونکە ڕێگەی سزاو وێرانییە. لەسەر بانگەوازکارە بەپەرۆشەکانیش پێویستە، کە کارو کۆشش بکەن بۆ ئەوەی هەمیشە نەتەوەکەیان ڕێنماییو فەرمانە خوداییەکانیان لە بیروهزردا بمێنێتو بەردەوام بن لە یادهێنانەوەیانو ئامۆژگاریو ڕێنموونی کردنیان، تاکو ئاڕاستەیان بکەن بۆ بازنەی پابەندیو زەمینەی ئاسوودەیی.

## ڕزگاربوونی بانگەوازکارەکان :

خودا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ ... ﴿١٦٥﴾ الأعراف﴾. کاتێك سزای خودا تووشی دانیشتوانی شارەکە بوو، خودا ئەوکەسانەی لێ ڕزگار کرد، کە ڕێگرییان لە خراپەو تاوانەکە دەکرد، ئەوانیش کۆمەڵێ بانگەوازکارو ئامۆژگارو چاکەخواز بوون.

ئەمەش سرووش (وحی)ی پێویستی بانگەواز بۆ لای خوداو ئامۆژگاری کردنی نەتەوەو بەیادخستنەوەی حوکمەکانی خودامان) پیشان دەدات، چونکە ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکە بەتەنیا خۆی ڕێگەی رزگاریی بانگەوازکارانە لە سزا لەوکاتەدا، کە تووشی یاخیو سەرپێچی کاران دەبێت.

خودا لەمبارەیەوە لە جێگەیەکی تری قورئاندا فەرموویەتی: ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُو۟لُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَآ أُتْرِفُوا۟ فِيهِ وَكَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾ هود﴾.

(دەبوایە لەنێو خەڵکی زەمانی پێش ئێوەدا کەسانی ژیرو چاکەخوازو دیندار هەبوایە، کە ڕێگرییان لە خراپەو تاوان بکردایە لەسەر زەوی، کەچی لەوانەی ڕزگارمان کردن کەم بوون، چونکە زۆربەی خەڵکی لە سنووری فەرمانی خودا دەرچوونو دوای هەواو ئارەزووو خۆشیەکانی دنیا کەوتن. ئیدی بەو کردارە نابەجێیانەیان چوونە ڕیزی تاوانکارانەوە، خودای پەروەردگاریش هەرگیز بەناڕەوا خەڵکی شارو دێهاتەکانی لەناو نەبردووە، ئەگەر خەڵکە نیشتەجێکانیان کەسانی چاکەخوازو باش بووبن).

بەڕاستی کاتێك سەرپێچیو خراپەکاریی هەموو ئوممەت دەگرێتەوە، لەوکاتەدا پێویستە بانگەوازکاران ئەرکی ئامۆژگاریو بەیادخستنەوە بەجێ بگەیەننو ڕێگریی لە خراپەو بەدکاریی بکەن، تاکو خۆیان لە سزای ڕزگارکەن، چونکە هەر ئەوەیە ڕێگەی ڕزگاریو سەرفرازیی.

## "بۆچی فەرمان شکێنەکان وەك مەیموونیان لێکرا..؟!"

خودا فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾ الأعراف ﴾..فەرمان شکێنەکان ستەمیان لەخۆیان کردو لووتبەرز بوون لەئاست ئەوەی لێیان قەدەغە کرابوو، لەئایینی خودا هەڵگەڕابوونەوەو ئامادەی پابەندیی بە شەرعەوە نەبوونو، لە ستەمدا ڕۆچوونو سنووری ڕێسای خودایان بەزاندو سوور بوون لەسەر ستەمکارییانو، بەردەوام بوون لە دوژمنکارییان.

ئەوان بەم هۆیەوە شایستەی سزای خودا بوونو دوای هاتنی خەشمی خوداو سزای بەپەلەو پێشوەختی خودا بوون، بەڕاستی سزاکەشیان زۆر توندو بەئازار بوو: ﴿...وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ الأعراف ﴾،

هەروەها سزای خودا بۆ ئەوان سزایەکی بێ وێنەو جودا لە سزاکانی تری سەر گەلانی بوو، ئەوەبوو ڕوخساریانی ناشیرین کردو گۆڕینیی بۆ چەند مەیموونێکی دەربەدەرکراوو سەرشۆڕ، واتە ڕوخسارە بەشەرییەکانی ئەوانی بۆ ڕوخساری ڕاستەقینەی ئاژەڵ گۆڕیو کردنی بەچەند مەیمونێکی ڕاستەقینە.

بێگومان خودا عادل و دادپەروەربووە، کاتێك کردوونی بە چەند مەیموونێکی دەربەدەرو سەرشۆڕ، چونکە دەستدرێژییان لەسەر حوکمەکانی خودا کردووەو لە فەرمانەکانی یاخی بوون، لە دادپەروەرێتیی خوداییشدا وایە، کە مرۆڤی چاکەکار بەچاکە پاداشتی بدرێتەوەو، مرۆڤی خراپەکاریش بە خراپەکەی خۆی پاداشتی بدرێتەوەو، دەستدرێژکاریش لەسەر دەستدرێژییەکەی سزا بدرێت. هەروەها خودا لەوەشدا دانایە، کە ئەو کۆمەڵە دەستدرێژکارەی کردووە بە مەیموون. لەوانەیە حیکمەتی ئەم ڕوخسار گۆڕینەیان ئەوەبێت، کە بێگومان خودا ویستوویەتی ئەوان وەك چەند مرۆڤێکی ئادەمیزادبن‌و وەك چەند کەسێکی ئینسانی ڕاستەقینە بژین‌و کرداری ئینسانیانەی خۆیان بە چاکترین شێوە بەجێ بێنن، بەڵام کاتێك لە فەرمانەکانی خودا هەڵگەرانەوەو ئەو ڕێزلێنانە خوداییەیان ڕەت کردەوە، بەم پێیەش سازش (تەنازول)یان لەسەر مرۆڤایەتی‌و ئینسانییەتی خۆیان‌و ڕێزو کەرامەتیان کردو، ئیدی سیمایەکی ئاژەڵیانەی ماناداریان بەخۆیانەوە لکاند، خوداش سیمایانی گۆڕی بە چەند مەیموونێك‌و کردنی بەچەند ئاژەڵێکی ڕاستەقینە.. ئەمەش هەر لە دەروازەی ڕێکخستن‌و پێکەوە لکاندنی نێوان سیمای مانادارو سیمای هەستەوەرییە.

بێگومان خودا ئەوەی بۆ مرۆڤ دەوێت، کە مرۆڤی ڕێزلێنراو بێت‌و لە بۆتەی مرۆڤایەتی‌و ئادەمیزادێتی خۆیدا بژی‌و، جودا بێت لە ئاژەڵ‌و گیانەوەرانی دی، هەر بۆیەش خودا مرۆڤەکانی بەچەند ئەرکێکی شەرعی ڕاسپاردووەو، داوای لێکردوون پابەندییان بە ئەمانەتی ڕاسپێرراوێتییەوە هەبێت‌و ئەرکەکانیان بە

ئەمانەتەوە جێبەجێ بکەن، وەك فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ الأحزاب ﴾.

واتە: (ئێمە ئەو تایبەتمەندیانەی، کە بە (ئەمانەت) بە مرۆڤمان گەیاندو، ئەو سیفەتە بەرزانەش کە لەئاژەڵی جیادەکەنەوە، خستەڕوو بۆ ئاسمانەکانو زەویو بۆ چیاکانیش، بەڵام ئامادە نەبوون، کە لەئەستۆی بگرن (ئەمانەتەکەش وەك عەقڵو فیکرو سەربەستیو ئیرادەو هتد)، بەڵکو لەوەترسان، کە ناپاکیو خیانەتی تیادا بکەن، کەچی مرۆڤ ئەو ئەمانەتانەی بەرگەگرتو هەڵیگرتن، بەڕاستی مرۆڤ ستەم لەخۆکارو بێ زانیاری بوو، کە وەك تەنێکی خاڵی لە زانیاری بووە).

بەڕاستی شەریعەتی خودایی دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕێزنانی خودا لە مرۆڤایەتیو لە بلندکردنەوەی ئاستی ئینسانێتییەکەی، پابەندیی مرۆڤیش بە شەریعەتی خوداوە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی بەدیهێنانی واتا جوانە ئینسانییەکان لەلای مرۆڤ و، بەرزکردنەوەی بەها مرۆییەکانیش لەلای، بەڵام بەزاندنی سنووری شەریعەتی خوداو هەڵگەرانەوە لە حوکمەکانی، واتە سڕینەوەی سیفەتە مرۆییەکانە لەلای مرۆڤ و لەناوبردنیانە، لەمەشدا مرۆڤ دەکشێتەوە بۆ قۆناغێکی نزمتر کە شایستەی نییەو، هەروەها لەو پلە شکۆداریەش دادەبڕێت، کە خودا داوای لێکردووە بۆی سەرکەوێت، دادەبەزێت بۆ پلەیەکی نزمی ئاژەڵیانەی وەها، کە شایانی نییە.

جا ئەگەر مرۆڤێکی سنووربەزێنی ستەمکارو لەفەرمان دەرچوومان بینی، ئەوە بێگومان لە سیفەتە مرۆییەکانەوە بۆ سیفەتە ئاژەڵییەکان دابەزیوە، ئەم جۆرە مرۆڤەش خاوەنی دەروونو هەستو ئاکارێکی ئاژەڵیانە دەبێت سەرەڕای ئەوەی ڕەنگو ڕوو ڕواڵەتێکی مرۆڤانەشی هەبێت.

ئەوەی لە مرۆڤیشدا پشتی پێ بەسترابێت ڕەنگو ڕوو ڕواڵەتو ڕوخساری جوان نییە، بەڵکو بیروباوەڕو بەهای مرۆیی‌و ئاکاری جوانو ئەو کردەوانەشە، کە لە کانگای تێڕوانینو فیکرو بیروڕاکانیەوە سەرچاوە دەگرن، هەر ئەمەشە، کە پێغەمبەری خودا ﷺ جەختی لەسەر کردۆتەوە، وەك لەو فەرموودەیەدا هاتووە، کە (مسلم) لە (ابو هریرة) ﷺ گێراویتییەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((إن الله لاینظر الی صُورکم وأموالکم ولکن ینظر إلی قلوبکم و أعمالکم))**[1] واتە : (بێگومان خودا بۆ ڕوخساری جوانو ماڵو سامانی زۆرتان ناڕوانێت، بەڵکو بۆ نێو دڵو کارو کردەوەکانتان دەڕوانێت).

بەڕاستی دەستدرێژکارە یاخیبووەکان لە دانیشتوانی شارەکەی سەر کەنار دەریا لەلایەنی سیفەتی مەعنەوی‌و هەستەوەرییەوە بەسروشتو تێڕوانینو ئاکاریان، وەك چەند مەیموونێك بوونو تەنها دیوی دەرەوەی لاشەو سیماو دەنگو ڕەنگیان لە مرۆڤ چووە. بۆیەش بەڕاستی خودا کردوونی بە چەند مەیمونێك تاکو حەقیقەتو ڕوخسارەکەش پێك بگەیەنێتو، باری ڕاستەقینەی شێوەشیان بەپێی ئاکاریان بگۆڕێت، والله اعلم..

١) (مسلم) لە (کتاب البر والصلة والاداب)دا گێراویتییەوە، ژمارە (٤٥) باب تحریم ظلم المسلم، رقم (١٠)، حدیث رقم (٢٥٦٤).

## " گۆڕینی ڕوخساریان به‌ڕاستی بووه‌"

له‌ ڕوكارو ڕواڵه‌تی ماناكانی قورئاندا، خودا به‌ڕاستی‌و به‌واقیعی ڕوخساری سنووربه‌زێنه‌كانی ڕۆژانی شه‌ممه‌ی ناشیرین كردووه‌و بوون به‌چه‌ند مه‌یمونێك ﴿ فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿١٦٦﴾ الأعراف﴾. له‌ بنه‌ڕه‌تیشدا ده‌بێت ئێمه‌ مانا دیاره‌كه‌ی قورئان وه‌رگرین‌و له‌ومانا دیارو ده‌ركه‌وتووه‌ش لانه‌ده‌ین، مه‌گه‌ر له‌ پێداویستییه‌كی ناچاریدا نه‌بێت.

له‌مه‌شدا به‌به‌رستێكی به‌رده‌م ناشیرین كردنی ڕاسته‌قینه‌ی ڕوخساریان به‌دیی ناكرێت‌و، چونكه‌ له‌چوارچێوه‌ی عه‌قڵیشدا ئه‌وه‌ مه‌حاڵ نییه‌، كه‌ خودا ڕوخساری به‌شه‌ریانه‌ی مرۆڤێك بۆ ڕوخسارێكی ئاژه‌ڵیانه‌ بگۆڕێت‌و ببێت به‌ مه‌یموونێكی ڕاسته‌قینه‌، خوداش به‌توانایه‌ له‌ هه‌ر كارێكدا، كه‌ به‌خواستی خۆی بیكات‌و له‌ هه‌مو شتێكدا بالاده‌سته‌.

هه‌روه‌ها ئه‌و خودایه‌ی، كه‌ مرۆڤی به‌و ڕوخساره‌ جوانه‌ مرۆییه‌وه‌ خه‌لق كردووه‌، ده‌شتوانێت بیگۆڕێت بۆ ڕوخسارێكی ئاژه‌لیانه‌ی وه‌ك مه‌یموون. هه‌ندێك له‌ زانایانی ته‌فسیر ڕایان وایه‌ گوایه‌ ناشیرین كردنیان له‌ڕووی مه‌عنه‌وییه‌وه‌ بووه‌، نه‌ك له‌بارێكی ڕاسته‌قینه‌دا، چونكه‌ ئه‌وان ته‌نها به‌گیان‌و دڵ‌و عه‌قڵیان بوونه‌ چه‌ند مه‌یمونێك.

(مجاهد) خودا لێی خۆشبێت، گوتوویه‌تی: (دڵانیان ناشیرین كراوه‌و نه‌بوون به‌چه‌ند مه‌یموونێك، ئه‌مه‌ش نموونه‌یه‌كه‌و خودا له‌سه‌ریان هێناویتییه‌وه‌، وه‌ك چۆن نموونه‌ی (كه‌ر)ه‌كه‌ی بۆ ئه‌وانی تریان داناوه‌، كه‌ چه‌ند كتێبێكی هه‌ڵگرتبێت)[1].

---

(١) تفسير الطبري، تحقيق محمود شاكر، به‌رگی (٢) لاپه‌ڕه‌ (١٧٢).

(سید قطب) یش لەتەفسیرەكەیدا دەربارەی ئایەتی ژمارە (٦٥)ی سوورەتی (البقـــرة): ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴾ ،گووتویەتی: (كارێكی جێی ئاتاجو پێویست نەبووە، كە بەلاشەكانیان ببنە چەند مەیمونێك، چونكە ئەوان بەگیانو بیرو هۆشیان پێشتر وەك مەیموونیان لێ هاتبوو، دیارە ڕەنگدانەوەكانی هەستو تێفكرینیش، چەند سیمایەك دەخەنەسەر ڕوخسار نیشانەكانی دەموچاو، كە كارابیان لەسەر بەژنوبالاو ڕەنگی پێست هەیەو سێبەرێكی درێژیشی لەسەر هەڵدەكەن)[1].

بەڵام هەر خودی (سید قطب) لەم ڕایەی پاشگەزبۆتەوە، كاتێك چیرۆكی (اصحاب السبت)ی لە سوورەتی (الاعراف)دا تەفسیر كردووە، بۆیە لەم جێگەیەی تەفسیرەكەیدا دەربارەی ناشیرین كردنو گۆڕینی ڕوخساری یاخییەكان، گوتوویەتی: (ئەو سزا هەرە توندو بەئازارەش (عذاب بئیس) گۆڕینی ڕوخسارە ئادەمییەكەیانە بۆ ڕوخساری مەیموونیو، خودا پێشی فەرموون (دەبن بە چەند مەیموونێكی ڕیسواو دەربەدەر) (كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ)، ئیدی بوون بەو مەیمونە ڕیسواو بێنرخانە، وەك لەو فەرمایشتەدا هاتووە، كە هیچ ڕەتكەرەوەیەكی نیەو خاوەنی فەرمایشتەكەش (كە خودایە) هیچ شتێكی لێ ئالۆزو گران نابێت)[2].

هەر لەم ڕووەوە بەدواداچوونێكی (ئیمامی طبري) لەسەر ئەو ڕایەی (مجاهد) هەیە، كە ئاماژەمان بۆ كردو هێنامانەوە كە تێبینی لەسەر وتەكەی هەیەو گوتوویەتی: (ئەو وتەیەی كە (موجاهد) دیاری كردووە، وتەیەكی پێچەوانەی ڕووكاری ماناو دەلالەتی قورئانە، چونكە خودا لە قورئانەكەیدا هەواڵی ئەوەی داوە كە كردوونی بە چەند مەیموونو بەرازێكو كۆیلەی ستەمكاران..

---

(١) في ظلال القرآن.. بەرگی (یەكەم) لاپەڕە (٧٧).
(٢) في ظلال القرآن .. بەرگی (٣) لاپەڕە (١٣٨٥).

جا هەر کەسێك نکوولّیی شتێك لەم واتایە بکاتو بڕیار لەسەر شتێکی تر بدات ئەوا داوای بەڵگەی سەلمێنەری لەسەر وتەکەی لێ دەکرێتو، بەرهەڵستیی نکوولّی کردنو بڕیاردانەکەشی دەکرێت، پاشان پرسیاری دەربارەی جیاوازیی نێوان ئاسەواری ڕاستو هەواڵی بەربڵاوو ناسراوی لێ دەکرێت.. ئەم وتەیەی (موجاهد) پێچەوانەی هەموو ئەو بەڵگانەیە، کە هەڵەو درۆو نارێکی هەڵناگرنو کە ڕای تێکڕاییو یەکدەنگیی زانایانیش لەسەرە هەر تەنها بەڵگەیەکیش بەسە بۆ ناڕاستیی ئەو وتەیەی، کە یەکدەنگیو ئیجماع لەسەر بەهەڵەدانانی هەیە)[1].

وادیارە ئەم هەڵوێستەی (مجاهد) ڕاستکردنەوەکەی (طبري)یش لەسەری - خودا لێیان ڕازی بێت- داوای ئەوەمان لێدەکەن، کە لەئاست ڕواڵەتی دەقە قورئانییەکەدا هەڵوێستە بکەینو ئەوە لە قورئان بفامینەوە، کە بڕیاری بۆمان دەدات.

بۆنموونەش لە مەسەلەی گۆڕینی ڕوخساریاندا لەوانەیە کەسێك بپرسێت: (چۆن گۆڕاون بۆ چەند مەیمونێك؟ لەگەڵ ئەم پرسیارەشیدا لەوانەیە ئەوکەسە هەوڵ بدات بەبێ زانیاری، عەقڵی خۆی لەو بەسەرهاتە غەریبییانەدا شپرزە بکات، کە لەڕاستیدا عەقڵ هیچ ئامرازێکی تێدا قووڵبوونەوەی نییە، بەم ڕەنگەش هەندێك کەس پەنادەبنەبەر دەقە هەڵبەستراوە ئیسرائیلییەکان، تاکو لەوێوە شیکارو زانیاریی لەسەر ئەو گۆڕانکارییەی ڕوخسارەکان وەرگرن.

جا بۆ دەرچوون لەو نیگەرانیو هەڵەکارییەو لە دوودڵیو کەوتنە نێو هەڵەو، لەبەرئەوەش، کە سوودێکی زانستی لە زانینی ئەو قسەو باسو شیکارە نەسەلمێنراوو ناجێگرانەوە بەدی نایەت، ئەوا ئێمەش پشتی پێ نابەستینو بەندنابین لەلایان، بەڵکو لەگەڵ (سید قطب)دا ئەو وتەیەی خۆی دەڵێینەوە، کە گوتوویەتی: (بەڵام چۆن بوون بەچەند مەیمونێكو، چییان بەسەرهات دوای بوون بە مەیموون؟ ئایا

(١) (تفسیر الطبري). بەرگی (٢) لاپەڕە (٧٣!).

قریـان تێکـەوتووە وەك هـەر (ڕوخـسار گـۆڕاوێکی دی، کـە لـە ڕەگـەزی خـۆی دەردەچێت؟ ئایا کاتێك بوون بە چەند مەیموونێك زاووزێیان کـردووە؟ لـە قورئانـدا وەڵامی ئەم پرسیارانە دیاری نەکراوەو بەپێویست نەزانراوە.

پێغەمبەریش ﷺ لـە فەرموودەکانیـدا باسـی لێـوە نـەکردوون، ئێمـەش هـیچ ئاتاجێکمان بە قووڵ بوونەوە تێیدا نیە).

## "بێ دەنگ بوون لە بێ دەنگ بووان"

قورئـان بـە دەقـی ئایەتـەکان ئامـاژەی بـۆ ڕزگـاربوونی بانگـەوازکارە چاکەخوازەکانی ئـەو شـارە کـردووە، ئەمـەش وەك ڕێزلێنانێـك بۆیـان، هـەروەها ئاماژەی بۆ سزادانی فەرمان شکێنەکانی شـارەکەش کـردووە، ئەمـەش وەك تۆڵـە لـێ سەندنەوەیەکیان.. بەڵام کۆمەڵی سێیەم (یان ئوممەتی سێیەم) لـە دانیـشتوانی گوندەکـە، کـە (لەئاسـت تـاوانی یاخییەکانـدا) بێـدەنگ بـوون، قورئـان باسـی چارەنووسیانی نەکردووەو لێیان بێدەنگ بووە، ئەمەش وەك سـووکایەتی پێکـردن‌و بێبایەخ کردنیان.

زانایانی تەفسیر لەمەڕ چارەنووسی کۆمەڵی سێیەم چەند ڕایەکی لێك جودایـان هەیە، هەندێکیان لەو بڕوایەدان گوایە لەگەڵ ڕزگاربوان دابوون.

ئێمەش چارەنوسی ئەوانمان لەلا گرنگ نیەو وتەو بیروڕایەکی یەکلاییکەرەوەمان دەربارەی بەسەرهاتیان نیەو، ناشزانین کە ئایا لەگەڵ سـزادراواندا، سـزادراون، یـان لەگەڵ ڕزگاربوانـدا ڕزگـاربوون؟ بـۆ ڕێزگـرتنی عەقڵیـشمان واباشـە، کـە نەچـینە قووڵایی ئەو باس‌وخواسەی، کە هیچ زانستێکمان لەبارەیـەوە نیـە. بـۆ ڕێزگـرتنی زانست‌و زانیارییش هەر واباشە دەربارەی مەسەلەیەك نـەدوێین کـە زانیارییـەکمان

لەسەری نیە، هەروەها بۆ ڕێزگرتنی فەرمایشتی خوداش تەفسیری هیچ ئایەتێك بەبێ زانستو زانیارییەك ناکەین. لەجیاتی ئەوە پابەند دەبین بە بێدەنگیی قورئان لەئاست بێدەنگ بواندا تاکو هەوڵ بدەین چەند سەرنجو ئاماژەیەکی لێ دەربێنین.

(سید قطب) گوتوویەتی: (کۆمەڵی سێیەم- یان ئۆممەتی سێیەم — دەقی قورئانی لێ بێدەنگە لەوانەیە ئەمە بۆ بەکەم گرتنو بێ بایەخ دانانیان بێت — ئەگەرچی بەر سزاکەش نەکەوتبن- چونکە ئەوان بەشێوەیەکی لەبارو پێویست بەرهەڵستیی تاوانکارانیان نەکرد، بەڵکو شێوازێکی نالەبارو ناهەمواریان گرتەبەر، بۆیەش شایستەی پشتگوێ خستنی قورئان بوون، سەرەڕای ئەوەی ئەگەر شایستەی سزاکەش نەبووبن).

لە بێدەنگیی قورئانیش لەئاست بێدەنگبواندا، کە ڕۆڵو بایەخی بەکەم گرتوون، ئەو ڕاستییە وەردەگرین، کە بێگومان ئەوکەسەی لەئاست هەقدا بێدەنگەو، لەکاتی نکوولیو بەرهەڵستییەکدا لێی دادەنیشێتو، لە بواری ئامۆژگاریو بەیادهێنانەوەدا ترسنۆکەو، لە ڕووبەڕووبوونەوەش دەترسێت، بەڕاستی شایانی بەسووك سەیرکردنو پشتگوێ خستنو لەبیرکردنە. جا ئەگەر کەسێك شایستەی یادکردنو وەسفو ستایشکردن بێتو ناوو یادی لەمێژوودا بە نەمریی بمێنێتەوەو لە تۆماری بوونو یادەوەریی زیندووەکاندا بمێنێتو یادی بکرێتەوە، ئەو کەسە بێگومان هەر پیاوێکی ئازاو بوێرو چاونەترسە، قورئانیش ڕێنمایی ئەو جۆرە کەسانە دەکات، کە ئەگەر دەیانەوێت بناسرێنو یادبکرێنەوەو هەمیشە بەچاکی ناویان لەسەر زاری خەڵکی بێت، با ئەو ڕێگەیە بگرنەبەر، کە دەیانگەیەنێتە ئەو سیفەتانە، ئەویش ڕێگەی بانگەوازو ئامۆژگاریکردنی خەڵکی نەفامو بەیادهێنانەوەی سەرپێچیکارانە، ڕێگەی بانگەوازو ئامۆژگاریکردنی خەڵکی نەفامو بەیادهێنانەوەی سەرپێچیکارانە، ڕێگەی کۆشش لەگەڵ خۆکردنو جیهادیشە، هەمیشە لەنێو خەڵکێکی زۆردا کەسێکی وایان تیابووە، کە لە

پەراوێزی ژیان دابووەو دووره پەرێزبووەو نەناسراوو پشت گوێ خراوولەبیرکراو بووەو هیچ کەسێك ناوی نەبیستووەو، هەر لەسەر ئەو حاڵـەتی نەناسـراوێتیو پـشتگوێ خراویو لەبیرکراوییە دەمرێتو کەس هەست بە مردنیشی ناکات، ئـەم جۆرەکەسـە خەڵکی لەدنیاداو لەکاتی ژیانیدا لـەبیریان چـۆتەوە پـێش ئـەوەی ماوەیـەك دوای مردنی لەبیریان بچێـتەوە.

بێگومان مێژوو یادو ناوی ئەو جۆرە کەسە، لە بیرکراوو نادیارانـەی فـەرامۆش کردووە، چونکە مێژوو یادی کەسانی بێسەنگو بێکار ناکات.

دیارە هەر لە کۆمەڵدا پیاوانی گەورە دەژینو دەمرنو، پڕ بەگوێی خـەڵکیش هەواڵیان دەبیسرێتو هـەردەم لەبەرچـاویانن و وجـودو ژیانیـان بـۆ پـڕ دەکەنـەوەو لەنێوانیاندا دەژیـن، دوای مردنیـشیان لـە هـزرو هـۆشو دڵو مێـژووی کۆمـەڵدا دەمێنن، ئەوانیش پیاوانی ئیماندارو خۆراگرو موجاهیدن کـە مێـژوو ناویـانی بـە نەمریی هێشتۆتەوە، دیارە مێژووش تەنها کارگوزارو هەوڵدەران دەناسێتەوە، تەنها جیهادکارانیش یاد دەکاتەوە، ئا ئەمەیە ڕێگەی ناوبانگو نـەمریی، دەی لـەکوێن ڕێبوارانی ڕێگەکە؟

## "گرنگتـرین وانەی ئەم چیرۆکـە"

١- بێگومان ئەم گوندە، یان (شارۆچکەیە)، یان ئـەم شـارە، نموونەیەکـە بـۆ هـەر گوندو شارو شارۆچکەیەکی دی لە ڕووی هەڵویستی خەڵکەکەیەوە لە بەرامبـەر فەرمانەکانی خوادا، چونکە لەمەدا خەڵکەکە بۆ چەند کۆمەڵێك دابەش ببوون، کۆمـەڵێکیان فەرمانـەکانیان دەشـکاندو لێیـان لادەدا، کۆمـەڵێکی تریـان بەرهەڵـستی ئـەم فەرمانـشکێنانەیان دەکـرد، کۆمـەڵێکی تـریش بێـدەنگو بێهەڵوێـست بـوون لـە بەرامبـەر سەرپێـچیکارانو نکوولێیـان لـە فـەرمان

شکاندنەکەیان نەدەکردو ئامۆژگاری یەکیشیان نەدەکردن.

٢- بێگومان خودا خەڵکی هەڵدەسەنگێنێت‌و بـە ئەرکـەکانی تاقییـان دەکاتـەوە، لەنێو خەڵکیشدا کەسانی وا هەیە، کە جیهادو کۆشش لەگەڵ دەروونـی خۆیـان دەکـەن‌و پابەنـدی ئـەرك‌و فەرمانـەکان دەبـن‌و سـەرکەوتوو دەبـن لـە تاقیکردنەوەکەدا، هەروەها کەسانی واش هەن، کە دوای هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون‌و لە سنووری فەرمانەکان لادەدەن‌و، لە تاقیکردنەوەکەدا دەکەون.

٣- جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان (ئاکاری ئەو جوولەکانـەی، کـە بـە فەرمانـە خوداییەکانەوە پابەند نەبوون)و، (ئاکاری ئەو هاوەڵانـەی پێغەمبـەرو هـەموو ئەو موسڵمانانەی، کە جیهادی نەفسی خۆیان کردووەو بەسـەر ئارەزووەکانیانـدا زاڵ بوون).

٤- ئەو ماسی‌و نەهەنگانەی لـە ڕۆژی قەدەغـەکراوی ڕاوکردنـدا بـەرەو هـەڵنان‌و فریودانی دانیشتوانی شارەکە دەچوون، چەند سـەربازێکی خـودا بـوون‌و، خـودا فەرمانی پێکردبوون، کە ڕۆژانی شەممە لێیان نزیك ببنەوەو لە ڕۆژانی تردا لێیان دوورکەونەوە. جا ماسی‌و نەهەنگەکان پابەندی فەرمانی خوداو بەجێگەیەنـەری بوون، هەر خـوداش سـەربازانی خـۆی دەناسـێت ﴿...وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۝٣١﴾ المدثر.

٥- دابەشبونی دانیشتوانی شارەکە بۆ سێ نەتەوەی (دەستدرێژکار)و (بانگەوازکار)و (بێ دەنگان) بەڵگەیە لەسەر چەمکی ڕاستەقینەی نەتەوە لە قورئاندا، ئەمـەش بەو پێودانگەی، کە یەك ئایین‌و، یەك جۆرە پابەنـدیی‌و، یـەك سیـستەم کۆیـان دەکاتەوە.

٦- کەسانی چاکەخواز، کە بەرهەڵستیی خراپەو تاوانی خەڵکی دەکەن، ئـەوا بـەو هەڵوێستەیان ئـەرکێکی شـەرعی بـەجێ دێـنن، کـە خـودا پێویـستی کـردووە

لەسەریان نەك دەست بخەنە کاروباری تایبەتیی خەڵکەوە، یان دستدرێژی بکەنەسەر سەربەستیو خواستەکانیان.

٧- ئەگەر سەربەستییە شەخصییەکانو میزاجو نەریتەکانی تاکەکەس، پێچەوانەی بەرژەوەندیی کۆمەڵ بوون، ئەوا هیچ بەهاو ئەرزشێك بۆ ئەوجۆرە سەربەستیو میزاجانە نامێنێت، چونکە سەربەستیی تاکەکەس لەوێدا تەواو دەبێت، کە بەرژەوەندیی کۆمەڵی لێوە سەرهەڵدەدات، ئیدی هیچ تاکێك بۆی نیە کارێکی وابکات، کە زیان بە کۆمەڵ بگەیەنێتو تووشی سزایان بکات.

٨- ئەنجامدانی خراپەو شکاندنی فەرمانی قەدەغەکراو، هەڕەشەیەکی نەگبەتییەو، مایەی خەشمی خوداو، هۆکاری پێشخستنی سزاو تووڕەیییەتی.

٩- بانگەوازکاران لەکاری بانگەوازو پەندو ئامۆژگاریدا، بە دوو پاڵنەری بنەڕەتی پێ هەڵدەگرن:-

پاڵنەری یەکەم: بەڵگەو پاساو بۆخۆ هێنانەوە لەبەردەم خواداو لەڕێی بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیانەوە.

دووەمیشیان: پاڵنەری ئارەزوو کردنە لە ئامۆژگاریی کەسانی دی، بەڵکو لەخوا بترسنو پاشگەزبنەوە.

١٠- بێگومان پێدەچێت بانگکراوانو ئامۆژگاری کراوان، پەندو ئامۆژگاریی وەرگرنو یاساکانی خودایان بەبیربێتەوەو لەخودا بترسن، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر بانگەوازکارو ئامۆژگاران، ڕێگەیەکی قوڕئانی لە ئامۆژگاریو پەندو بەیادهێنانەوەیاندا بگرنەبەر.

١١- مرۆڤی بانگەوازکار ئەرکی بانگەوازو ئامۆژگاریی لێخوازراوەو، ئەگەر ئەو ئەرکە جێبەجێ نەکات، ئەواخۆی دەخاتە بەردەم لێپرسینەوەو سزای خودا. بەڵام لێپرسراو نییە لەوەی، ئەگەر دوای (بەجێگەیاندنی ئەرکی بانگەوازەکەی)

خەڵکی چاك نەبن‌و هیدایەت نەدرێن‌و بەدەم بانگەوازەوە نەچن‌و کاری پێ‌نەکەن، چونکە ئەمە بەدەست خودایەو، هەر خودا خۆی هیدایەتی خەڵکی دەدات.

١٢- بێگومان وتەو قسەکردن بۆ خەڵکی، گوڕوتین‌و بەهاو کاریگەریی خۆی هەیەو، ناشێت خۆمان لیّ بگرینەوە، یاخود پشتگوێی بخەین، چونکە هەموو بانگەوازێك هەر لەسەر وتەو ئاخاوتن بنیات نراوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە، کە وشەکان لەدڵەوە دەرچن، تا بگەنە دڵان.

١٤- لە نەتەوەدا چەند کەسێك هەن، کە تەنها بێدەنگی‌و نکوڵیکردن بە دڵ بە باش دەزانن‌و گۆشەگیری‌و ئەو ڕەوتە نالەبارەی هەڵاتن (لە مەیدانی ئامۆژگاری‌و بانگەوازو بەیادخستنەوە) بەچاکتر دەبینن.

١٥- بێدەنگ‌و بێ‌هەڵوێستەکان تەنها بەوەشەوە ناوەستن، کە خۆیان لەئاست خراپەو تاوانی تاوانکاراندا قڕو قەپ و بێدەنگی لیّ بکەن، بەڵکو خراپەیەکی تر دەخەنە پاڵ ئەم نالەبارییەیان، ئەوەیە گلەیی‌و گازاندەی توند ئاڕاستەی باوەڕدارە چاکەخوازەکان دەکەن لەسەرکاری بانگەوازو ڕوونکردنەوەی ئامۆژگاری بۆ خەڵکی.

١٦- لەکاتی پەرەسەندنی خراپەو سەرپێچی لەنێو خەڵکیدا، پێویستە لەسەر بانگەوازکارانی، هەر بەردەوام بن لەسەر ئامۆژگاری‌و بەیادخستنەوە، تاکو خەڵکی ڕاستییە شەرعییەکانیان لەبیر نەچێتەوەو، کە شێکی وا دانەیەت، کە حەڵاڵی تیادا بکرێتە حەرام‌و حەرامیشی تێدا بکرێتە حەڵاڵ .

١٧- بەڕاستی لەبیرچوونەوەی حوکمە شەرعییەکان کارەساتێکی گەورەیەو، لەکاری سەرپێچی لێکردنیان ترسناکترە، هەر ئەم لەبیرچوونەوە بەشەکە سەرەتای هاتنی سزای خودایە.

١٨- لەکاتی هاتنی سزای خوادا، هیچ ڕێگایەکی ڕزگاربوون بۆ هیچ کەسێك نییە تەنها بۆ ئەوانە نەبێت، کە ئەرکی خۆیان لە بانگەوازکردنی خەڵکیدا ئەنجامداوە، هەر ئەمەش خۆی کەشتیی ڕزگارییە، سوننەتو دەستوری خوداش هەروایە، کە پاداشتی مرۆڤی چاکەکار لەسەر چاکەکانی دەدرێتەوە.

١٩- سەرپێچی لە فەرمان، کارەسات بەرهەم دێنێت، تاوانکردنیش هەڕەشەی سزادانو هۆکاری پێشترخستنی وێرانیو تیاچوونە.

٢٠- ناشیرین کردنی ڕوخسارو لەشو لاری یاخییەکان لە دانیشتوانی شارەکە، وەك ئەوەی کرابن بە چەند مەیمونێکی ڕیسواو سەرشۆڕکەر، ئەوەش بەشێوەیەکی واقیعیو ڕاستەقینە بووەو، دوای ئەوە قڕیان تێکەوتووەو کەسیان لێ نەژیاوەو زاووزێشیان نەکردووە، ئەمەش نیشانەیەکی ڕۆشنە، کە خودا دەیخاتە بەرچاوی سەرپێچی کارو یاخییەکان، تاکو پەندی لێ وەرگرن.

٢١- پێویستیو فەرزبوونی وابەستەیی، تەنها بەڕواڵەتی دەقی قورئانییەوە، سەرپێچی لێ نەکردنییانو نەشێواندنی، واتە چۆن باسی ناشیرینکردنی ڕوخساری تاوانبارەکان هاتووە، دەبێت وەك خۆی بەپێی دەقە قورئانییەکە باسی بکرێتو پەنا ببرێتەبەر سەرچاوەیەکی دی.

٢٢- مرۆڤایەتیی مرۆڤ، تەنها بەگوێڕایەڵی کردنی فەرمانی خودا دەچەسپێتو دێتەدی، هەرئەمەش بنچینەی ڕێزلێنانی لای خودایەتی، خۆ ئەگەر مرۆڤ یاخی بێتو لە ستەمدا ڕۆبچێتو کافرو بێباوەڕ بێت، ئەوا بێگومان لە پلەو ڕێزی خۆی دابەزیوەو، دەستی لە مرۆڤایەتی خۆی هەڵگرتووەو کەوتۆتە سەر ئاقارێکی بێزراوی ئاژەڵیانەوە.

٢٣- بێدەنگبوانو بێهەڵوێستان هەر شایستەی پشتگوێ خستنو فەرامۆش کردنو لەبیربردنەوەن، چونکە بێخەمو بێباکن لەسەر دینی خوداو لەسەر ئاکاری خەڵکی.

٢٤- ڕێگای ناوو ناوبانگو یادیی نەمریی‌و هەمیشەیی لای خەڵك كاركردن‌و هەوڵو لەگەڵ خۆ تێكۆشان‌و جیهادكردنە، خەڵكیش هەرەكەسانی دڵسۆزو تێكۆشەریان لەیادە، مێژووش هەر ئەم جۆرە كەسانە باس دەكات، ئای چ جیاوازییەكی زۆرو دوور درێژ هەیە لەنێوان (ئەو كەسەی، كە بە نەناسراوی دەژی‌و بە نەناسراوییش دەمرێت)و (ئەو كەسەش، كە لە ژیانیدا ناسراوەو بەكردەوەی چاك‌و هەڵوێستە جوامێرییەكانییەوە، لەژیانیدا چاوو گوێ‌و هزری خەڵكیی پڕكردووەو، دوای مردنیش هەر لەبەرچاوانیانەو هەواڵی دەبیستن‌و باسی دەكەن‌و لە هزرو یادەوەرییان دایە)!!.

# چیرۆکی حەوتەم

## چیرۆکی (طالووت)

ئەم چیرۆکە لە قورئاندا بەم شێوەیەو لەم ئایەتانەدا هاتووە، کە خودا فەرموویە:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلَإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ إِذْ قَالُوا لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا ۖ قَالُوا وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْا إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ قَالُوا أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ ۚ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ ۖ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٧﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَىٰ وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلَائِكَةُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾ فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ ۚ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ

وَالَّذِينَ ءَامَنُوا مَعَهُۥ قَالُوا لَا طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُوا اللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ (٢٤٩) وَلَمَّا بَرَزُوا لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُوا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (٢٥٠) فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَاءُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ (٢٥١) تِلْكَ ءَايَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ (٢٥٢) البقرة ﴾.

واتای ئەم ئایەتەو لێکدانەوەیان لەبواری گێڕانەوەی چیرۆکەکەو بڕگەکانیدا دیاری دەکەین.

## "پوختەی چیرۆکەکە لەڕێی گێڕانەوەکەی قورئانەوە"

ئەم ئایەتانەی قورئان ئاماژە بۆ چیرۆکێك دەکەن، کە بەسەر (بنو اسرائیل) داهاتووەو لە ماوەیەکدا بەسەریان داهاتووە، کە لە خاکی پیرۆزدا لەبەردەم دوژمنانیان چەوساوەو بێدەسەلات بوون، سندوقی تەورات ﴿واتە: ئەو (تابووت)ە﴾ بوو، کە دڵنیایی‌و متمانەی لەخوداوە تێدابوو بۆیان، هەروەها ئەو شتانە بوو، کە لە نەوەکانی (موسا)و (هارون)ەوە بۆیان بەجێمابوو وەك چەند پارچە کەلوپەلێك‌و یاساکانی تەورات.

هەروەها ئەو گەلە هەستیان بە سەرشۆڕیو تاڵیی بەزینو لاوازیی دەکرد، هەستەکەش لەلای هەموویان وەك یەك دروست ببووو، تێکڕا خەڵکی عەوامو پیاوماقووڵو هەموو چینو توێژەکانی گرتبووەوە، بۆیە خواستیان هاتە سەر ئەوەی کە ئەو واقیعە لاوازەیان بسڕنەوەو سەرشۆڕییان بۆ سەربەرزیی بگۆڕنو، بەزینیشیان بۆ سەرکەوتن. زانیبووشیان، کە تاکە ڕێگەی ئەو گۆڕانگارییە تەنها جیهادو جەنگو کوشتارە.

بۆ ئەم مەبەستەش پیاوماقووڵو حاکمەکایان پەنایان بردەبەر پێغەمبەرەکەیانو داوای بەهاناوەهاتنیان لێکردو، داواشیان لێکرد پادشایەکیان بۆ هەڵبژێرێت، کە کاروباریان لەئەستۆ بگرێتو بەرەو سەربەرزیو سەرکەوتنیان ببات، لەپێناوی خوداشدا جەنگو کوشتاری دوژمنانیان بکات، وا دیارە ئەو پێغەمبەرەشیان شانازی نەریتی شلو شێواوو خواستی خاوو خلیچکیان بووو، دەیزانی کاتێك فەرمانی جەنگییان پێدەدرێت خۆیانی لێ کەڕ دەکەنو پاڵی لێ دەدەنەوەو ناجەنگن. بۆیە پێی گوتن: ﴿هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا﴾ (ئەی ئەگەر جەنگتان لەسەر نووسراو لە زەمانی جەنگ نزیك خرانەوە ئایا پەشیمان نابنەوەو جەنگ دەگێڕن؟) بەمانای: (ئایا کاتێك داوای جەنگو کوشتارمان لێکردن ئامادەن جەنگ بکەن یاخود لێی دوا دەکەون؟ بێگومان من دەزانم کە ئێوە خۆتانی لێ دوادەخەن).

ئەوانیش دڵنیایان کردەوە بەوەی، کە دەجەنگنو خۆیان دواناخەن، تاکە هۆیەکیش، کە ڕێگرە لەبەردەم جەنگینیاندا لەئارادانەبوونی پادشایەکە بۆیان، کە سەرکردایەتییان بکات، جا ئەگەر ئەو پێغەمبەرە ﷺ پادشاکەیان بۆ دابنێت، ئەوانیش پەلە دەکەن لە جەنگ لەژێر سایەیدا، هەروەها بۆیان ڕوونکردەوە، کە ئەو هاندەرە گەورەیەی پاڵیان پێوە دەنێت بۆ جەنگ ئەو دۆخی بێدەسەڵاتیو لاوازییەیانە، کە تێیدا دەژینو، دەربەڕیاندنیانە لەخاکی خۆیان، کە (دوژمن لێی

داگیرکردوون)و بەزینەکەشیانە لەبەردەم دوژمنانیانـدان، ئیـدی گوایـە زۆر سـوورن لەسەر بەزاندنی دوژمنانو ڕزگارکردنی خاکەکەیانو، کە ئەم هاندەرانـەش هـەبێت بۆچی ناجەنگن؟.

کاتێك پێغەمبەرەکـەیان ئـەو وتەیـەی لـێ بیـستنو، دیـتی چـەندە بـەجۆشو ئامادەی جەنگن، داوای لـەخودا کـرد پادشـاکەیان بـۆ دیـاری بکـات.. خـوداش سرووشی پێدا ئەوا (طـالوت) ئـەو پادشـایەیان دەبێـت، کـە بـەرەو سـەرکەوتنو سەربەرزیو ڕزگارییان دەبات. کاتێك ئەو گەلە وەڵامی پادشـاکەیان پـێ گەیـشت ڕاچڵەکینو پییان ناخۆش بوو، چونکە بەڕای خۆیان لەو بڕوایە دابوون، کە پادشـاکە لە بنەماڵەی پادشاییو لە خانـەوادەی پادشـایان بێـت، (طـالوت)یـش لـەو ماڵـە دابووو، پاشان کابرایەکی هەژار بووو خاوەنی مـاڵو دارایـی پێویـست نـەبوو، کـە شایستەی پادشایەتی بکات، بۆیـە نارەزاییـان لـەلای پێغەمبەرەکـەیان دەربـڕیو گوتیان: (چۆن دەبێتە پادشا لەسەرمان لەکاتێکدا خۆمان لەو شایـستەترینو، ئـەو خاوەنی ماڵو سامانی زۆریـش نیـە.) ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ﴾؟

پێغەمبەرەکەی (بنو اسرائیل) سەرسام بوو لە هەڵوێستی ئەو گەلەی پێشتر، کە ڕازی دەبوون بە هەر پادشایەكو، کەچی کاتێـك خـودا (طـالوت)ی بـە پادشـا بـۆ هەڵبژاردوون، نارازین..

ئینجا ئەو پێغەمبەرە هەموو ئەو سیفەتانەی بۆ گەلەکەی بـاس کـرد، کـە لـە پادشاکەدا هەیـەو شایـستەی دەسـەڵاتی دەبێـت، هـەروەها ڕایگەیانـد، کـە ئـەو گونجـاوترین کەسـە بـۆ پادشـایی بـەپێی پێـوەری ئیمانـداریتی، کـە خـودا هەڵیسەنگاندووە پێی، سیفەتەکانیش ئەمانـە بـوون ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ ۖ وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ

﴿وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾، واتـه: (بێگومـان خـودا ئـەم پادشـایەی لـەنێو هەمووتانـدا هەڵبژاردووەو پەسەندی کردووەو، زانسـتو زانیارییـەکی زۆرو پـتری لـه زانیـاریی خەڵکی زەمانی خۆی پێ بەخشیوەو، لاشەیەکی بەهێزو گەورەشی پێداوە، خوداش کاری پادشایی دەبەخشێت بەهەر کەسێك، که شایانی بێتو بەخواستی خودا بێت، خوداش فەزڵی زۆرەو زانایە).

بێگومان خودا داناو شارەزایە، که ئەو پادشایەی لـەنێو ئەوانـدا هەڵبـژاردووەو زانستێکی فرەی پێداوەو جەستەیەکی تۆکمەو بەگوڕی پێ داوە، تـاکو ئەرکـەکانی پادشـاییو بـاره گرانـەکانی سـەرکردایەتی لەسـەر شـان دانێـت، ئیـدی بۆچـی بەرهەڵستیی لەسەر دەکـەن؟ بێگومـان خـودا بەخواسـتی خـۆی پادشـایی بەهـەر کەسێك دەدات لەوانەی شایستەی کارەکەن، هەروەها بەخششی خۆی دەدات بەوەی شایانیەتیو دەیناسێت، جا مادام خودا خۆی کاری پادشایەتیی بـه (طـالوت)داوە، کەوابوو ئەم کابرایە پادشایەکی شایستەیە بۆ ئەو کارە. هەروەها پێغەمبەرەکـەیان ویستی هیچ نارەزاییو بەرهەڵستییەکیان لەسەر پادشایەتیی (طـالوت) لەدڵو بـیرو هۆشیاندا نەهێلێتو ئەو بەڵگەو نیشانەیەی خـودا بـۆی دانـاوە پیـشانیان دەداتو هاتنی بەڵگەکان دەلالەته لەسەر ئەوەی، که خودا خـۆی (طـالوت)ی بەپادشـا بـۆ هەڵبژاردوون، ئینجا پێی گوتن: (نیشانەی هەرە دیاری پادشاییەکەی ئەوەیە، کـه سندوقی (تابووت)ه لێ زەوتکراوەکەیان بۆ دەهێنێتەوەو له هاتنەوەی سندوقەکەشدا ئارامیو متمانەتان لەخوداوە بۆ دێـتو ئـەو کەلوپـەلو کەلـەپوورەی لـه نـەوەی (موسا)و نەوەی (هارون)ەوە بەجێماوە بۆ ئێوە دەبێت، سندووقەکەش فریـشتەکان بۆتانی دێننو ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾﴾ ئەمەش نیشانەیەکی ڕوونی تره بۆ ئێوە ئەگەر بـاوەڕ بـەخوداو بـەڵێنی خـوداو سـەرکەوتن دێنن.. مەلائیکەتەکان سندووقەکەتان (که پێشتر هی خۆتان بوو) بۆ دێننەوە بەبێ ئەوەی جەنگو کوشتاری لەسەر بکرێـتو، کـه دەبوایـه دوای سـەرکەوتن بەسـەر

دوژمناندا دەستیان بكەوتایەوە، بەڵام ئەوا مەلائیكەتانی خودا ئەو سندووقەیان بۆ هەڵدەگرنو پێیان دەگەیەننەوە. دیارە مەلائیكەتەكان كاتێك ئەو سندووقەیان بۆ هەڵدەگرنو پێیان دەگەیەنن، بەڵگەیەكی ترە لەسەر ئەوەی، كە خودا قایل بووە بە دانانی (طالوت) بۆیانو، فریشتەكانیش بە (طالوت) قایلن بۆیان.

ئەم سندووقەش دڵنیاییو ئاسوودەییەكی لە خودای پەروەردگاریانەوە تێدابوو بۆیان، لە ئایەتەكەدا وشەی (سكینة) هاتووە: ﴿أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ وشەی (سكينة)ش واتە دڵنیاییو حەوانەوەو قایل بوونو یەقینو باوەڕی تەواو، هەروەها سندووقەكە چەند كەرەسەیەكی لەپاش بەجێماوی خانەوادەی (موسا)و خانەوادەی (هارون)یشیی تێدایەو، لەوانەیە ئەو پاشماوانە شتێكی ماددیی بنو لەهەردوو خانەوادەی (موسا)و (هارون)ی برایەوە بەمیرات بۆیان مابێتەوە.

ئەو نیشانەیەی، كە پێغەمبەرەكەیان بەڵێنی پێدابوون، بەدیهاتو فریشتەكان سندووقەكەیان بۆ هەڵگرتنو بۆیان هێنان.. ئینجا ئەوانیش (بەناچاریی) قایل بوون بەوەی (طالوت) پادشایان بێت. (طالوت) كاری دەسەڵاتو پادشایەتیی گرتەدەستو گەلەكەی سازو ئامادەكرد بۆ جەنگو، دەزگاو كەرەسەی جەنگی بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانیان بۆ ڕێكخستن، كاتێك لەشار دەرچوون بۆ جەنگی چارەنووسسازو یەكلاییكەرەوە، پادشا بەوپەڕی ژیریو وریاییو زیرەكیو داناییەوە هەڵسوكەوتی لەگەڵدا كردنو ئەو سیفەتانەی تێیدابونو، كە (پێشتر پێغەمبەرەكەیان وەسفی بۆ كردبوون) بەدیهات لەبەرچاویانو زانییان، كە خودا زانستو زانیارییەكی فرەو جەستەیەكی پتەوو لێهاتوانەی هەیە. ئەو دەیزانی، كە گەلەكەی لەسەرەتادا چەندە بەتەوژمو گەرموگوڕن بۆ جەنگو، دەیزانی كە ئەمەش هەڵچوونێكی توندو كاتییەو بێگومان لەماوەیەكی كەمدا دەنیشێتەوەو، دەیزانی كە بەڵێنو خۆزگە خواستن وەك ئەزموونی كرداری نییەو، دەیشیزانی كە زۆربەی

حاڵەتەکانی هەڵچوونو جۆشو خرۆش لەکاتی تاقیکردنەوەی کرداریدا دەتوێنەوەو، خاوەنانی وەعدو بەڵێنە خۆزگە پێ خواستراوەکان لەکاتی پەیڕەوکردنی واقیعیدا هەموو ئەو بەڵێنانە دەشکێنن، بۆیە (طالوت) تاقی کردنەوە، تا بزانێت لەسەر چ ئاکارو ڕەفتارێکن..

ئەوەبوو کاتێك لەو هەرێمەیان دەرچوونو نزیك بوونەوە لە خاکی دوژمنو، ناوچەو ماڵو خانووبەرەی خۆیان بەجێهێشتو لەبەرچاویان نەما، (طالوت) پێی گوتن: (خودا بە ڕووبارێك تاقیتان دەکاتەوەو کاتێك پێیدا تێپەڕین لێی نەخۆنەوە، جا هەر کەسێك سەرپێچی لەم فەرمانەم بکاتو لێی بخواتەوە ئەوە لە سوپای مندا نیەو، دوام نەکەوێت، چونکە سەربازێکی ڕێكو پێكو گوێڕایەڵ نیە. بەڵام هەر کەسێك لە ڕووبارەکە نەخواتەوەو پابەندیی فەرمانەکە بێتو گوێڕایەڵ بێت ئەوە لە منو لە نەتەوەو سوپای باوەڕداری منە).

بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەو پێغەمبەرە وەك دیاردەیەك لە دانایيو شارەزایی خۆی، ڕێی ئەوەی پێ دان، کە با هەر یەکەیان پڕ بەچنگیو بەیەك جار نەختێك ئاو لە ڕووبارەکە بخواتەوە، ئەمەش بە ئەندازەی ئەوەی دەمی پێ تەڕ دەکاتو تینوێتییەکەی پێ بشکێنێت.. (وەك گوتراویشە) ئەگەر تۆ دەتەوێت خەڵکی گوێڕایەڵیت بکەن ئەوا بەپێی توانا داواکارییان ئاڕاستە بکە.. ئەم داواکاریو فەرمانەی (طالوت)یش شیاو بووەو لەڕادەی توانایان دا بووە، کە هێندەی دەم تەڕکردنو نەهێشتنی فشاری تینوێتیان، پڕ بەچنگیانو لەیەك جاردا ئەو بڕە ئاوە بخۆنەوە. بەڵام کاتێك گەیشتنە سەر ڕووبارەکە، سەرپێچییان لە (طالوت)کردو تێر ئاویان خواردەوەو بێدڵیی خۆیان نەکرد، تەنها ژمارەیەکی کەمیان نەبێت، کە پابەندیی فەرمان بوونو گوێڕایەڵیی فەرماندەکەیان کرد.

(طالوت) هەموو ئەو کۆمەڵە یاخیو سەرپێچیکارەی بەجێ هێشتو دەستبەرداریان بووو، تەنها بەو چەند کەسە کەمە باوەڕدارو گوێڕایەڵەوە ڕێی

جیهادەکەی گرتەبەر تا گەیشتە ناوچەی جەنگی، کـە جـەنگی یەکلاکـەرەوە بـوو. بەڵام سەربازەکانی سەیری سەربازەکانی دوژمنانیان کردو لە جەنگییان ترسانو لـە ڕووبەڕووبوونەوەشیان سڵیان کردەوەو ترسنۆك بوون، دوژمنە بێباوەڕەکانیشیان، کە (جالوت) سەرکردایەتیی دەکردن، لەوان گەلێك زیاتر بـوون، بۆیـە زۆر کـەس لـەو کەمینەیەی، کە لەگەڵ (طـالوت)دا مابوونەوە، پێیان گوت: (ئەی (طـالوت) ئێمـە ئەمڕۆ هـیچ وزەیـەکمان بەرامبـەر (جـالوت)و سـەربازەکانی تیـا نـەماوەو هـیچ هێزێکیشمان بۆ جەنگین لەدژیان نیە، لەبەر ئەوە لەدژیان ناجەنگین. لەوێشدا چـەند کەسی ترسنۆك بەجێیان هێشتو لە شەڕەکە دەترسانو پادشا، واتە (طالوت) خۆیو کەمینەیـەکی زۆر کـەم لـە سـوپاکەی لەگەڵیـدا مانـەوە، ئـەوانیش ئـەو کەسـە ئیمانداراـنە بـوون، کـە دەیـانزانی بەدیـداری خـودا دەگەنـەوەو، کـە خوازیـاری ڕاستەقینە، بەهەشـتو نیعمەتـەکانی بـوون. ئـەو چـەند پیـاوە کەمـە، کۆمەڵـە ترساوەکەیان فێری چەند بنەمایـەکی سـەرکەوتنو هۆیـە بەتینکـەرەکانی دەکـردو پێیان گوتن: ئای لەمەوبەر چەند جار ڕێکەوتووە، کە بەیارمەتیی خودا کۆمەڵێکی کەم کۆمەڵێکی زۆریان بەزاندووەو، خوداش لەگـەڵ ئـارامگران دایـە: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾.

(طالوت) لەگەڵ ئەو چەند پیاوە کەمە باوەڕدارو خۆڕاگرانـەدا چـوونە مەیـدانی جەنگەوەو داوای سەرکەوتنیان لە خودا کردو، هانایان بۆ بردو لێی پاڕانەوەو گوتیان: ﴿...قَالُوا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ البقرة﴾، واتە: (خودایە ئارامیو خۆڕاگرییـەکمان بەسـەردا بێنەو جێگیرمان، کە لەسەر ئەم جیهادەو، سەرمانخە بەسەر گەلی کافراندا).

خوداش بەڵێنی خۆی بۆ بەدی هێنانو سـەرکەوتنو باڵادەسـتیی پـێ بەخـشین، مادام ئەوان ڕاستیان کرد لەگەڵ خوادا لەو بەڵێنـەی کـە، پێیـان دابـوو، ئـیتر بـە

کۆمەڵو یامەتیی خودا ئەو دوژمنانەیان بەزاند. یەکێك لەو پیاوە بەئارامو ئازایانەش (داود) بوو -سڵاوی خودای لێ بێت- کە لەو کاتەدا نە پێغەمبەر بووو نە پادشا، بەڵکو دوای ئەوە بووە بە پێغەمبەرو بەپادشا (والله أعلم)، داود لەو جەنگەدا بەرەو ڕووی (جالوت) بۆتەوەو کوشتوویەتی، لەپاش ئەوە خودا پلەی پادشایەتیو دانایيو حکمەتیشی پێ بەخشیوەو، بەخواستی خۆی چەندین زانستیشی فێرکردووە.

(طالوت) بەو چەند کەسە کەمە ئیماندارەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەملەکەتی خۆی دوای ئەوەی خاکەکە ڕزگار دەکاتو سندووقەکەش دەسێنێتەوەو، دوژمنان دەبەزێنێتو دەسەڵاتی خاكو وڵات بۆ گەلەکەی دەگێڕێتەوە.. هەروەها دوای ئەوەی پەردە لەسەر ڕووی ڕاستەقینەی (بنو اسرائیل) هەڵدەداتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ مەملەکەتەکەی.. پاشان گەلێك شتی شاراوەی لەسەر ژیانو خوو نەریتیان بۆ ئێمە دەرخستووە.. گەڕاوەتەوە بۆ مەملەکەتەکەی دوای ئەوەی ڕاستیی خواستەکانی جەماوەری زانیوەو، دوای ئەوەی لە چۆنیەتی سەودا لەگەڵ کردنیان شارەزا بووەو، دوای ئەوەی موجاهیدانی ئازاو بەئارامیشی لەنێویاندا ناسیوەو، کە هەمیشە ئەم جۆرە موجاهیدانە لەنێو جەماوەرو کۆمەڵدا ژمارەیان کەمەو بەڵام سەرکەوتووو سەرفرازن.

لەدوای (طالوت)، (داود) حوکمی (بنو اسرائیل)ی وەك پێغەمبەرێكو پادشایەكو جێنشینێکی (طالوت) کردووە.

## " چیـرۆكی ( طالوت ) لە دەقە ئیسـرائیلـییەكان دا"

چیرۆكی (طالوت) لای (بنو اسرائیل) زانراوو دیارەو بـە شـیكارێكی زۆرەوە لـە كتێبی كۆنی (تەورات)و كتێبەكانی تریان دا باس كراوە.

كتێبەكانی (بنو اسرائیل) بەدرێژیی باسیان لە (بنو اسرائیل)و واقیعیان لەپێش هـاتنی (طـالوت)دا كـردووە، هــەروەها بەدرێـژە باســی ســەرهەڵدانی زەمــانی (طالوت)یان كـردووە كـە چـۆن كاروبـاری فـەرمانڕەوایی گرتۆتـە دەسـت و ڕووەو جەنگو كوشتاری دوژمنان ڕۆشتووەو، باسی دەركەوتنی (داود)یشیان كـردووە كـە نێوان خۆیو (طالوت) لەدوای كوشتنی (جالوت) چۆن بووەو چۆن ژیاون.

لەم بارەیەوە چەندین لاپـەڕەیان بـەو دەقـە درێـژە پـێدراوە ئیـسرائیلییانە پـڕ كردۆتــەوەو، حیكایــەتخوانانی ئیـسرائیلی بـۆ موسـڵمانانیان گێراوەتـەوە، چــەند كەسێكی چیرۆك گێـڕەرەوەی موسـڵمانانیش ئـەو دەقـە ئیـسرائیلیانەیان پەسـەند كردووەو لە هەندێك كتێبی داستانو مێـژووو چـیرۆكو تەفسیرەكانیـشدا دیارییـان كردوون، تەنانەت چەند ئایـەتێكی قورئـانی پیرۆزیـشیان بـەو دەقـە هەڵبەسـتراوە ئیسرائیلیانە تەفسیر كردووە.

ئێمەش لێرەدا ڕامان وایـە كـە دەقـە ئیـسرائیلییەكانی تایبـەت بـە چـیرۆكی (طالوت) لەم باسەماندا نەهێنینەوە، تەنانەت گەر لە دەرووی هۆشیاركردنەوەشەوە بێت وەك چۆن لەچیرۆكەكانی پێشووی ئەم كتێبەدا ئاماژەمـان بـۆ كـردن، چـونكە دەقە ئیسرائیلییەكان لەسەر چیرۆكی (طالوت) هێجگار درێژو زۆرنو گـەر باسـیان بكەین چەندین لاپەڕەمان لێ دەگرن، بـەڵام لـەڕووی لـێ ئاگـاداربوونو لـێ وریـا كردنەوەی موسڵمانانیشەوە ئاماژەیەكی خێرا بۆ چەند بڕگەیەكیان دەكەین:-

(گوتوویانە گوایە (بنو اسرائیل) چوونەتە فەڵەستینەوەو بەسەرکردایەتی کوڕە یاوەرو خزمەتگوزارەکەی (موسا) کە (یوشەعی کوڕی نوون)ە بەسەر دانیشتوانەکەیدا سەرکەوتوونو ناچاری کردوون، کە لەکەناری باشووری فەلەستین (لە غەززەو عەسقەلان) نیشتەجێ بن‌و، خۆشیان (بنو اسرائیل) لە باکوورو ناوەڕاستی وڵاتەکەدا بن. ئیدی بۆ ماوەی چوارسەدو شەست (٤٦٠) ساڵ پادشایی‌و هێزو باڵادەستی بۆ (بنو اسرائیل) بووە، چونکە خواپەرستو عابید بوون. بەڵام دوای ئەوە (بنو اسرائیل) بێ باوەڕ (کافر) بوونەتەوەو لە ستەمدا رۆچوونو سنووری یاساو خەرمانی خودایان بەزاندووە، خوداش دوژمنە فەلەستینییەکانیان بەسەردا زاڵ کردۆتەوەو، ئەو دوژمنە سەرسەختانەی پێشوویان بەزاندوویانن‌و کوڕانی پادشاکانیان بەدیل گرتوونو سندووقەکەشیان لێ سەندوونەوە).

ئینجا لەدەقە ئیسرائیلییەکاندا گوتوویانە: ((بنو اسرائیل) کوڕێکیان لەدوای بەسەرهاتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەر بەوەلەد بووە (لەدایك بووە) لێیانو، ناوی (سەمۆیل)یان (شەمۆیل)، یان (شەمعوون) بووەو کاهینێکی خۆیشیان هەبووە، کە ناوی (عیلی) بووەو کابرایەکی دوو ڕووو درۆزن بووەو، خودا (شەمۆیل)ی کردۆتە پێغەمبەریانو، (عیلی)ی کاهینیش مردووە).

هەروەها گوتوویانە: (خەڵکی پیاو ماقووڵو پایەداری (بنو اسرائیل) هاتوونە لای (شەمۆیل)ی پێغەمبەریانو داوایان لێ کردووە پادشایەکیان بۆ بنێرێت تاکو لەژێر سەرکردایەتیی ئەو پادشایەدا لەپێناوی خودادا بجەنگن، ئەویش پەیمانو بەڵێنی تەواوی لەسەر گوێڕایەڵی کردنیان لێ وەرگرتوون، ئینجا تێڵا (عصا)یەكو شاخی ئاژەڵێکی کە (رونێکی پیرۆزکراو)ی تێدا بووە هەڵگرتووەو پێی گوتوون: (ئەو پادشایەی بۆتان هەڵدەبژێرێت درێژیی جەستەی بەقەد درێژیی ئەم تێڵایەیە)).

هەروەها لەو دەقە ئیسرائیلیانەدا گوتوویانە: (پیاوێك کە ناوی (شاوول) بووەو

کە (لە قورئاندا بە (طالوت) ناوبراوە) بەلای پێغەمبەرەکەدا تێپەڕیوەو لەخەڵکی عەوامی گەلەکەی بووەو کاری چەرمو پێستە خۆشکردنی هەبووەو، کەرەکەی لێ ون بووەو بەدوایدا گەڕاوەو، ئیدی کە بەلای (شەمۆیل)دا ڕەت بووەو پێغەمبەرەکەش کاتێك چاوی بەم پیاوە کەوتووەو سەرنجی درێژی بالآی داوە زانیویەتی ئەمە ئەو پادشایەیە کە بۆیان دیاری کراوە، ئیدی بەگەلی (بنو اسرائیل)ی گوتووە: (ئەوا خودا (طالوت)ی وەك پادشایەك بۆ ناردوون). گەلەکەشی بەرهەڵستییان کردووە لەوەدا، چونکە گوایە لە کوڕەزاکانی (یەهووزا) نییە، (واتە لە نەوەی پادشاکان نییە)و هەروەها لە کوڕەزاکانی (لاوی)یش نییە (واتە لە نەوەی پێغەمبەرەکانیش نییە). نیشانەی پادشاییەکەیشی ئەوەبووە، کە (سندووقەکەیان بۆ دەهێنێتەوە).

پاشان لە دەقە ئیسرائیلییەکانیاندا گوتوویانە: (سندووقەکە لەگەڵ ئادەم لە بەهەشتەوە کەوتۆتە خوارەوەو پێغەمبەرانیش یەك لەدوای یەك بەمیرات گرتوویانەتەوە تا گەیشتۆتە پێغەمبەرانی (بنو اسرائیل)و (سەکینە)یان تیادا ناوە. سەکینەش ئاژەڵێك بووە لە شێوەو بارستایی پشیلەیەك داو لەکاتی جەنگدا بەڕووی دوژمنانیاندا قیژاندویەتی‌و هاواری کردووەو، بەمەش دوژمنان بەزیون. بەڵام کاتێك فەلەستینییەکان جوولەکەکانیان بەزاندووەو سندووقەکەیان بۆ ولآتی خۆیان بردووە ئەوە بۆتە هۆی نەفرەت‌و مالوێرانی لەسەریان‌و بەهۆی ئەوەوە سزایان تووش بووە (واتە تووشی فەلەستینییەکان بووە)و لەهەر جێگەو ناوچەیەك دایاننابێت سزاو نەفرەت بەر ئەو ناوچەیەو دانیشتوانەکەی کەوتووە، ئیدی هەموویان ڕێکەوتوون لەسەر ئەوەی، کە سندووقەکە بۆ (بنو اسرائیل) بگێڕنەوە. بەڵام خستوویانەتە سەر عەرەبانەیەك‌و دوو (گا)شیان لە پێش عەرەبانەکەوە بەستۆتەوەو گاکان عەرەبانەکەیان بۆ لای (بنو اسرائیل) ڕاکێشاوەو ئەوانیش هەر کە سندووقەکەیان بەدیی کردووە، ملکەچ بوون بۆ (طالوت)و گوێڕایەڵیی

کاروباری پادشایەتییان کردووە، ئینجا (طالوت) سوپاکەی سازداوەو بەرەو جەنگی (جالوت)، یان (جوولیات) وەك جوولەکەکان وای ناودەبەن ڕۆیشتووەو، بەلای ڕووباری ئەردەن (الشریعة)دا تێپەڕبوونو ژمارەیان چوار هەزار کەس بووەو، (طالوت) نەیهێشتووە لە ئاوی ڕووبارەکە بخۆنەوە تەنها هەریەکەو پڕ چەنگیان نەبێت، کەچی تەنها سێ سەدو دە کەس، یان بیست، یان سی کەسێك نەبێت، کە پابەندو گوێڕایەڵی فەرمانەکەی بوون، دەنا هەموو ئەوانی تر لە ئاوەکەیان خواردۆتەوەو خۆیان لێ تێرکردووە، ئەویش خۆیو ئەو چەند کەسە کەمە ڕووەو جەنگی (جالوت) چوون، لە سوپاکەشدا کوڕێکی بچووكو نەناسراویان لەگەڵدابووە کە (داود) بووە —سلاوی لێ بێت- و کە قۆچەقانییەکی بەردهاوێژی پێ بووەو بەردی پێ گرتبێتە هەر کەسێك پێکاویەتیو لە هەر مرۆڤێك، یان لە هەر ئاژەڵێکی گرتبێت کوشتوویەتی.

لەنێو سوپای دوژمنانەوە (جالوت) دەرکەوتووە، کە پیاوێکی قەوارە گەورەو زل زەبەللاح بووەو داوای زۆرانبازی (مبارزە)ی کردووەو سوپاکەی (طالوت)یش لێی ترساونو هیچ کەسێك بۆ زۆرانبازیی بەرەو ڕووی نەوەستاوە. خوداش لەو کاتەدا سرووشی بە (شەمۆیل)ی پێغەمبەریان گەیاندووە، کە گوایە لە سوپاکەیاندا شوانێکی بچووکی مەڕو ماڵات هەیەو، ئەویش (داودی کوڕی ئییشا)یەو، ئەو کەسەشە کە (جالوت) دەکوژێتو، خودا پادشاییو جێنشینیی پێ دەبەخشێت.

دوای گەڕانێکی زۆرو چڕ شوانەکەیان دۆزییەوەو ئاخاوتنێك لەنێوان ئەو شوانەو (طالوت)دا کراوە، ئینجا بەڕێ کەوتووە بۆ زۆرانبازیی (جالوت)و لە ڕێگەیدا سێ بەردی بینیوەو بەردەکان داوایان لێ کردووە هەڵیانگرێتو لەگەڵیا دواون، چونکە (جالوت)یان پێ دەکوژێت. ئەویش لە قۆچەقانییەکەیدا هەڵیگرتوون.

کاتێك (جالوت) چاوی پێ کەوتووە بە بچووکی بینیوەو گێڕاویەتەوە، بەلام (داود) سوور بووە لەسەر زۆرانبازیو گیانبازیی لەگەڵیداو هەرسێ بەردەکەشی لە

قۆچەقانییەکەیدا داناوەو، ناوی خودای هێناوەو، هەر سێ بەردەکەش بوون بە یەك بەردو، بۆ (جالوت)ی هاویشتووە، بەردەکەش ئەو کڵاوە ئاسنینەی سەر سەریی شکاندووە، کە (ئەمرۆ —خودە-ی پێ دەڵێن) و ئینجا چۆتە سەرییەوەو مێشکی پرژاندووەو لە پشتەوەی سەری دەرچووە لە پشت (جالوت)یشەوە سی (٣٠) کەسی لێ کوشتوون، پاشان بەردەکە پارچە پارچە بووەو، هەر پارچەیەکیشی بەر سەربازێکی سوپاکەی (جالوت) کەوتووەو کوشتوویەتی.

ئیتر گوایە بەم ڕەنگە (طالوت)و سوپاکەی بەهۆی چاکەو هێزو توانای (داود)ەوە سەرکەوتوون، تەنانەت گوایە بەهۆی قۆچەقانیو بەردەکەیەوە سەرکەوتوون. بەم پێیەش پلەو پایەی (داود) لای (بەنو ئیسرائیل) گەورەبووەو خۆشیان ویستووەو پەیوەستی بوون، (طالوت)یش لەبەر ئەمە ڕقی لێهەڵگرتووەو، هەرچەندە بەهۆی ئەوەی (داود) جالوتی کوشتبوو ژنی بۆ هێنابوو.

(طالوت) دوای ئەوە چەند هەوڵێکی داوە بۆ کوشتنی (داود)، بەڵام لەگشت هەوڵەکاندا شکست بووە. بەڵام (داود) چەندین جار توانای بەسەر طالوت دا هەبووەو نەشیکوشتووە، ئیدی ململانێکەی نێوانیان بەردەوام لە توندو تیژی دابووە. بەڵام (داود) وای بەباش زانیوە، کە ڕابکات، بۆیە (طالوت)ی بەجێهێشتووەو لەسەر لووتکەی چیایەك لەگەڵ چەند خواپەرستێکدا دانیشتووەو خودایان پەرستووە، زانایانی (بەنو ئیسرائیل)یش گلەییان لە (طالوت) کردووە لەسەر ئەو هەڵوێستەی، کە بەرامبەر (طالوت) نواندوویەتی، کەچی (طالوت) هەر ستەمکار بووەو زیاتر پێی لەسەر زوڵمو زۆرداری داگرتووەو، تەنانەت هەر کەسێك گلەییەکی لێ کردبێت، کوشتوویەتی، تا وای لێ هاتووە، کە هەزاران کەسی لێ کوشتوون.

پاشان (طالوت) تەوبەی کردووەو لەسەر ئەو کردارانەی پاشگەزبۆتەوەو زۆر گریاوەو، خەڵکیش بەزەییان پیایدا هاتۆتەوە، ئەویش ویستوویەتی کەفارەتی

ڕەفتارە نابەجێکانی بدات، بۆ ئەم مەبەستە ڕێنماییيان کردووە کە بـچێت بـۆ لای ئافرەتێـك کـە نـاوی هـەرە گـەورەی خـودای زانیـوە. ئـەویش چـووە بـۆ لای‌و، ئافرەتەکـەش لەگەڵیـدا چـۆتە سـەر گـۆڕی (شـەمۆیل)ی پێغەمبـەرو لـە خـودا پاڕاوەتەوەو نزای لەلا کردووە، خـوداش ئـەو پێغەمبـەرەی بـۆ ئافرەتەکـە زینـدوو کردۆتەوەو، (شەمۆیل) لـە گۆڕەکـەی هاتۆتـە دەرەوە (بەزینـدوویی)و، (طـالوت) پرسیاری لێ کردووە، کە داخۆ تەوبەکردنی بۆ ڕەوایە!! پێغەمبەرەکەش لە وەڵامـدا پێی گوتووە: (بەو مەرجەی لـەدژی دوژمنـان بجـەنگێت‌و، خـۆت‌و هـەر دە (١٠) کوڕەکەشت لەو جەنگەدا بکوژرێن)، (طالوت)یـش جـەنگ‌و کوشـتاری دوژمنـانی کردووەو کوڕەکانیشی شان بەشانی جەنگیون، تا لەئاکامدا خۆی‌و ئەو دە کوڕەشـی کوژراون. دوای ئەویش، (داود) حوکمی پادشایەتیی کردوون‌و، پێغەمبەرو پادشاش بووە. ماوەی نێوان کوشتنی (جالوت) بە دەستی (داود) تا ئـەو ڕۆژەی کـە (داود) بووە بە پادشا، حەوت (٧) ساڵ بووە)[1].

ئەمـە بـوو پوختـەی چـیرۆکی (طـالوت و جـالوت‌و داود) کـە لـە دەقـەکانی ئیسرائیلیاتدا بەو ڕەنگە هاتوون، کە لە هەنـدێك کتـێبی مێـژووو تەفـسیری زانـا موسڵمانەکانیشدا هاتوون.. ئێمە ئەو دەقانەمان لەسەر ئەم چیرۆکە بەکورتی هێنـا تاکو خەڵکی موسڵمانانی لێ ورياو ئاگـادار بکەینـەوەو، ئامـاژەش بـۆ پـشتگوێ خستنیان‌و وازلێهێنان‌و فەرامۆش کردنیان دەکەین.

بەڕاستی زانا موسـڵمانە پێـشینەکانمان، کـە ئـەو دەقـە ئیـسرائیلییانەیان لـە کتێبەکانیاندا هێناوە، ماندووبوون‌و بڕێکی زۆریان لێ وەرگرتووەو دەیان لاپـەڕەیان پێ ڕەش کردۆتەوە، کە بۆ نموونە هەر (طبري) پتر لـە هەشـتا (٨٠) لاپـەڕەی پـێ ڕەش کردۆتەوە. دیارە خوێنەرانی خۆیشیان پێ ماندوو کـردووە کاتێـك ئـەو دەقـە

١) بۆ نموونە: دەربارەی ئەم دەقە ئیسرائیلییانە بڕوانە: (تەفسیری -طـبري-٥: ٢٩١- ٣٧٨)، هەروەها (الدار المنثور-ی سیوطي١: ٧٤٩-٧٦٤)و(عرائس المجالس-ی ثعلبـي٢٣٢-٢٤٤).

ئیسرائیلیانەیان بۆ خستوونەتە ڕووو، کاتەکانیان پێ بەفیڕۆداون‌و بەربەستیان لەبەردەم وردبوونەوەیان لە ئایەتەکانی چیرۆکەکەو سەرنج دانیان لە دەلالەت‌و پەندو وانەکانیاندا داناوە. ئێمەش تەنها بۆ وریاکردنەوەی خوێنەران بەکورتی ئاماژەمان بۆ ئەو دەقە ئیسرائیلیانە کردو، ڕازیش نابین هیچ کەسێك لە ئێمەوە، یان لە کەسانی تری غەیری ئێمەوە) بیانگێڕێتەوە مەگەر لە هەندێك کات‌و جێگەدا تەنها بۆ وریاکردنەوەو ئاگادارکردنی خەڵکی لێیان بۆیان باس بکات. دەنا ئەگەر وایان بۆ باس کات کە خۆی بەو دەقانە ڕازییەو پشتی پێ بەستوون، یان وایان بگێڕێتەوە، کە خۆی لە ناڕاستییەکانی بێدەنگ بکات‌و هیچ تیشك‌و بیروڕایەکی خۆی لەسەر نەبێت، ئەوە ئێمە وای دەبینین، کە سەرپێچیی لە مەنهەجی ڕاست کردووەو، بەو هۆیەشەوە خۆی دەخاتە بەر لێپرسینەوەو بەرپرسیارێتی لەبەردەم خوادا.

## ( لە ڕووە شارراوەکانی قورئان لە چیرۆکەکەدا )

ڕووە شارراوەکانی قورئان ئەو زانیاریانەن، کە قورئان لە چیرۆکەکاندا ڕوونی نەکردوونەوەو، کە پەیوەستن بەسەردەمی چیرۆکەکە، یان بەشوێنەکەی، یان کەسەکانی، یاخود بەڕووداوەکانییەوە. جا ئەگەر قورئان شاردبنییەوەو، فەرموودە (حدیث)یش شاردبنییەوەو باسیان لێوە نەکردبن، ئیتر ئێمە ناتوانین ڕوونیان بکەینەوە، یان دیارییان بکەین، یان بیانزانین، هەروەها لەو جۆرە باسانەدا وتەی هیچ مرۆڤێکیش پەسەند ناکرێت، کە دەربارەی ڕوون کردنەوەی زانیارییە شارراوەکانی بێت هەتا ئەوکاتەی بەڵگەی ڕۆشن، کە لێیەوە وەرگرتووە دەخاتەڕوو، لەو کاتەشدا لە بەڵگەکەی دەکۆڵینەوە، ئەگەر بەڵگەکە ئایەتێکی مانا دیار، یان فەرموودەیەکی ڕاست (صحیح) بوو ئەوا وەریدەگرین، دەنا ئەو وتەیەی ڕەت دەکرێتەوەو، ڕوونکردنەوەکەشی پەسەند ناکەین.

لە چیرۆکی (طالووت)یشدا چەندین ڕووی نەزانراوی تێدا دەبینین، وەك:-

١- ئەو سەردەمەی، کە چیرۆکەکەی تیادا ڕوودا‌وە، هەموو ئەوەی لێوەی وەرگیرێت ئەوەیە، کە ئەمە بەسەر گەلی (بنو ئیسرائیل)دا لەدوای (موسا) هاتووە، واتە دوای نیشتەجێ بوونیان لە فەلەستین. بەڵام دیاریکردنی ساڵو بەروار، یان ئەو ماوەو حاڵەتەی کە (بنو ئیسرائیل)ی تیادا بوون، کارێکی نەشیاوە.

٢- ناوی ئەو پێغەمبەرەی، کە داوایان لێ کردووە، پادشایەکیان بۆ بنێرێت، لەوانەیە (شەمعوون)، یان (شەمۆیل)، یان (صەمۆیل) بێت، یان لەوانەیە ناوێکی تری هەبووبێتو کەسێکی دی بووبێت. ئێمەش کەس ناخەینە پاڵ پێغەمبەران تەنها بەپێی دەقێکی ڕۆشن نەبێت، بۆ ئەوەی نەبادا پێغەمبەر نەبێتو تاکو باوەڕ بە پێغەمبەرێتیی کەسێکی غەیری پێغەمبەرەکە نەهێنین، ئەمەش هەرگیز ناشێت.

٣- ئەو هۆکارەی پاڵی پێوەناون بۆ ئەو داواکارییەی لە پێغەمبەرەکەیان کردووە.

٤- ڕەچەڵەکی (طالووت)و سەرەتای کاروبارەکەیو، زانیاری لەسەر ژیانی لەپێش بوونیدا بە پادشایان.

٥- شیکارو زانیاریی تەواو لەسەر بەهرەمەندیی زیاد لە هەموو کەسێکی لەبارەی زانستو جەستەو لەشو لارەوە.

٦- زانیاریو شیکار لەسەر بوون بە پادشای (طالووت) بۆیان.

٧- سندووقەکەو بەسەرهاتەکەیو مێژووەکەیو تایە پێوراوەکانی، هەروەها زانیاری لەسەر ئەو دڵارامیو پاشماوەیەی تیای دابوون، واتە ئەو شتە بەجێماوانەی کە هەردوو بنەماڵەی —موسا-و —هارون- لەدوایان بەجێمابوون.

٨- چۆن فریشتەکان ئەو سندووقەیان بۆ هێناونو زانیارییەکانی گەیشتنەوەو هاتنەوەی سندووقەکە بۆ لایان.

٩- ژمارەی ڕۆڵەکانی (بەنو ئیسرائیل) کاتێك (طالووت) بردوونی بۆ جەنگو کوشتاری دوژمنان.

١٠- ناوی ئەو ڕووبارەی، کە (طالووت) فەرمانی پێ کردن ئاوی لێ نەخۆنەوە، کە ئاخۆ ڕووباری (ئەردەن)ە کەوا ئەمڕۆ (ئەردەن)و (فەلەستین) لەیەك جوێ دەکاتەوە، یان ڕووبارێکی ترە، کە باکووری فەلەستین لە باشوورەکەی جوێ دەکاتەوە؟!

١١- ژمارەی ئەوانەی سەرپێچیان کردو لە ڕووبارەکە تێر ئاویان خواردەوە.

١٢- (جالوت) کێیەو، هێزو ڕوخسارو شێوەو بارستایی چۆن بووە؟!

١٣- زانیاریی تەواو لەسەر دوژمنانی –بەنو ئیسرائیل)و ژمارەی ئەو دوژمنانەو جێگەو نیشتمانیان.

١٤- شوێنو مەیدانی جەنگە یەکلاییکەرەوەکەی نێوان (طالووت)و (جالوت).

١٥- چەند زانیارییەکی پێویست لەمەڕ سەرەتای دەرکەوتنی (داود)و زەمانی منداڵییەکەیو ڕەچەڵەکی.

١٦- درێژەی باسەکان لەسەر جەنگی نێوان هەردوو سوپاکە.

١٧- چۆنیەتی کوشتنی (جالوت) بەدەستی (داود).

١٨- (داود) دوای کوشتنی (جالوت) چیی بەسەرهاتووەو، چۆن لەگەڵ (طالووت)داو، بەچ شێوازێك لەگەڵیدا ماوەتەوە؟!

١٩- کۆتایی هاتنی (طالووت)و چۆنیەتی نەمانی..

٢٠- چۆن دەسەڵاتی پادشای لە(طالووت)ەوە بە(داود) سپێرراوە؟!

ئەم بیست (٢٠) خاڵە دیارترینی ئەو ڕووە شارراوەو نەزانراوانەی نێو قورئانەکە ئاماژەی پێ نەداون. ئیدی سەیر لەوەدایە هەندێك ڕاڤەکار (مفسر)و مێژوونووسو نووسەرو فەرموودەناس بەو ڕادە باسکردنەی قورئانو فەرموودەوە نەوەستاونو

چوونەتە سەر دەقەکانی ناوبراو بە (ئیسرائیلیات)و لەو دەقانەدا بەدوای زانینی ئەو ڕووە شارراوانەی قورئاندا گەڕاونو درێژەیان بە ڕووداوەکانی ئـەم چـیرۆکەداوە، بـێ ئەوەی هیچ زانستو زانیاریو سوودو پەندێکمان پێ بگەیەنن.

## " ئەم چیرۆکە پڕە لەوانەو پەند"

نازانین بۆچی هەندێك لـە موسـڵمانان پـەنا دەبەنەبـەر دەقـە ئیـسرائیلییەکانو زانیاریو درێژەی ڕووداوەکانو دەرخـستنی ڕووە شـارراوەکانی چـیرۆکەکەیان لیـوە دەهێننو، چاوپۆشی دەکەن لە وەستان بەشێوازی باسکردنەکەی قورئانەوەو هەندێك لەو وانەو ئاماژەو پەندە جوانانەی لیّ دەرناهێنن، کە تێیدایە؟

بەڕاستی چیرۆکەکە پڕە لە دەرسو ڕێنماییو عیـبرەتو ئامۆژگـاریو، مرۆڤـی موسڵمانیش فەرمانی پیّ کراوە، کە لەئاستیاندا ڕاوەستێتو لێیان وردبێتەوەو پەی بە هەندێکیان ببات، کە چـەندین وانـەی بـۆ بانگـەوازکاران دەربـارەی (چـۆنیەتی مامەڵەو سەودا لەگەڵ خەڵکی)دا تێدایە.

چـەندین وانەشـی بـۆ ئـەو مرۆڤـە چـاکەخوازو ڕاسـتکەرەوانەی تێدایــە، کـە دەیانەوێت ئەو بارودۆخە نالەبارەی ژیانی نەتەوە بگۆڕن.. چەندین وانـەی بـۆ ئـەو موجاهیدو گیان بەختکارانەش تێدایـە، کـە لـە هـەوڵو کۆشـش دان بـۆ گـۆڕینی سەرشۆڕی بە سەربەرزیو، بەزین بەسەرکەوتن.. چەندەها وانەشی بۆ ئـەو کەسـانە تێدایە، کە پشت بە جەماوەر دەبەستنو باوەڕ بە حەماسـەتو هەڵـچوونی کـاتیو سـاتەوەختییان دەکـەن، کـە دەیانـەوێت لەسـەر ئـەو بناغەیـە نەخـشەو پـلانو بەرنامەکانیـان داڕێژنو، کەچی لـەکاتی پێویـستو مەیـدانی عەمەلیـدا جـەماوەر پشتیان لیّ هەڵدەکەنو لێیان دەتەکنەوە.. هەروەها چەندین وانەی لەسەر چۆنیەتی پـەروەردەکردنی تـاكو کۆمـەڵ تێدایـەو، چـەندین وانەشـی لەسـەر ڕێـك کـردنو سووربوونو تاقیکردنەوە تێدایە، پاشان چـەندین وانـەی لەسـەر جیهـادو جـەنگو کوشتارو شێوازی جەنگین تێدایە، کە چۆن مرۆڤی باوەڕداری جەنگاوەر هەر ڕوو لـە خوا دەکاتو داوای کۆمەكو سەرکەوتنی لیّ دەکـاتو، کـە بـەهیچ شـێوەیەك لـە هێزی دوژمنان ناترسـێتو ناتۆقێـت.. ئەمـە جگـە لـەوەی چـەندین وانەشـی لـە

بنەماکانی هەڵبژاردنی حاکمو لێپرسراوانو مەرجەکانی حاکمی گونجاوەوە تێدایە.

بەم ڕەنگە دەبینین هەموو کەسێکی بانگەوازکارو، چاکەخوازو، حاکمو، فەرماندەو، موجاهیدو لێپرسراو، سوودی لێ وەردەگرن، هەمدیسان چیرۆکەکە چەندین ئامـاژەو ڕێنمـاییی لە بابەت ئیمانو بیروباوەڕو، بانگەوازو جیهـادو، چاکسازیو گۆڕانکاریو، پەروەردەو ئاراستەکردنو، سیاسەتو ئیدارەی وڵاتو، حاکمو دەسەڵاتداریێتییەوە لەخۆ گرتووە.. هەر بەم ڕەنگەش دەبینین چەند گەمژەو ساویلکەبوون ئەوانەی سنووری ئەم گەنجینەو کانگایانەی وانەو ڕێنماییيەکانی نێو قورئانیان تێپەڕاندووەو چوونەتە نێو گێژاوی ڕێ لێ ونکەری دەقە ئیسرائیلییەکانو شتە پووچەڵو بێ نێوەرۆكو ئەفسانەکانی جولەکەکانەوە.

خۆ ئەگەر بۆ کەسانی زەمـانی دێرین شیاو بووبێت، کە بچنە سەر دەقە ئیسرائیلییەکان (هەرچەندە هەر شیاو نییە) ئەوە بێگومان لە ماوەیەکی ستەمو بێباکیی فیکریو زانستی دابووە کە تێیدا ژیاون، بەڵام بۆ ئێمە شیاو نیە لەم سەردەمەدا چاو لەو کردارەیان بپۆشین، چونکە ئێمە ئەرکی چاکساییو بانگەوازو گۆڕانگارییمان پێ سپێرراوەو بەرپرسیارێتییە گەورەکانمان لەئەستۆ دایە، تاکو واقیعی نەتەوەی ئیسلام لەو بنارە نزمەی تێی کەوتووە بگۆڕین بەو لوتکەی سەربەرزیو دەسەڵاتداریێتییەی، کە خودا بۆی خواستووە. ئیدی هیچ کاتێکمان بەدەستەوە نییە بۆ سەرکردنە سەر ئەو شتە پووچەڵو گەندەڵە ئیسرائیلییانەو، تەمەنو وەختو لاپەڕەکانمانو مێشكو هزرەکانیشمان گەلێك بەنرخترن لەوەی بەفیڕۆیان بدەین لەو مەسەلانەدا، کە هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نیە بۆمان، خوداش لێمان دەپرسێتەوە لەسەریانو لەسەر ئەو مەسەلەو مەبەستانەش، کە کارمان تێدا کردوون.

لەلایەکی ترەوە بێگومان چەندین ڕاڤەکار (مفسر)و زانای ڕاستگۆی تەفسیر هەنو کە خودا ڕێنماییی بۆ ڕاستیی بەرنامەو، وردبینیو، شێوازی باشی

دەرهاویشتن، کردوونو، توانیویانە باز بەسەر دەقە ئیسرائیلییەکاندا بدەنو لەڕووە شارراوەکانی قورئانیشەوە سوودو کەڵکی باش بەخوێنەران بگەیەنن. لەپێشەوەی هەموو ئەو زانا بەڕێزانەی تەفسیریش، هەردوو پێشەوا (محمد رشید رضا) لە تەفسیری (المنار)و، (سید قطب) لە تەفسیری (في ظلال القرآن)دا..

ئێمەش لەڕێی ئاشنابوونمان بەشێوازی هەردوو زانای تەفسیرنووس، بۆمان دەرکەوتووە کە هەردووکیان لە ڕیزی پێشەوەی تەفسیرنووسان دانو، بەڕاستی خودا زانستو دانایی‌و شارەزاییەکی زۆری پێ بەخشیون، هەردوو پێشەواش بەو هۆیەوە قووڵترین سەرنجو، تیژترین ڕوانینو، ڕاسترین مەنهەجو، وردترین دەرهاویشتنو، ڕاستگۆترین شێوەزارو، دروستترین شێوازیان، هەبووە.

بەڕاستی هەردوو تەفسیرەکەشیان (المنار) و (في ضلال) گەنجینەیەکی سیخناخ لەوانەو پەندو ئامۆژەو ڕێنمایی‌و زانیاریی بەسوودیان لەڕاڤەکردنی قورئانو زانستەکانی قورئانی تێدایە. خودا لە هەردوو زاناو پێشەوا پایەبەرزەو- لەسەرجەم زانایانی تری تەفسیری قورئانیش ڕازی بێتو، کۆششو جیهادیان لێ پەسندکاتو، پاداشتی فرەو نەبڕاوەی هەمیشەییان پێ ببەخشێت.

# "لەگەڵ مامۆستای پێشەوا (سید قطب) لە باسکردنی چیرۆکەکەدا"

لێرەدا پوختەیەك لەو باسەی (سید قطب) دێنینەوە، کە دەربارەی دیاریکردنی وانەو ڕێنماییەکانی چیرۆکەکە نووسیونی‌و خستوونییە ڕوو، ئەو لە پێناسەی ئەو دەرسەی ئایەتەکانی ئەم چیرۆکەی لەخۆگرتووە، گوتوویەتی:-

"ئێمە کاتێك نرخ‌و بەهای ئەم دەرسەو ئەو ئەزموونانەی کۆمەڵانی پێشووو گەلانی ڕابردووش (کە ئەم دەرسە لەخۆی گرتوون) دەزانین کەوا لەناخی دەروونەکانماندا ئەم ڕاستییانە سازو ئامادەکەین، کە بێگومان قورئان کتێبی زیندووی ئەم نەتەوەیەو پێشڕەوی ئامۆژگاریکاریەتی‌و، ئەو قوتابخانەیەشیەتی کە وانەکانی ژیانیی لێوەرگرتووە، بێگومان خودای پاك‌و بێ خەوشیش یەکەمین کۆمەڵی موسڵمانی پێپەروەردە کردووە، ئەو کۆمەڵەی کە خودا وای بۆ نووسیبوو مەنهەجە خوداییەکەی خۆی لەسەر زەوی تیا بچەسپێنن‌و ئەو ڕۆڵە گەورەیەی بەخەڵات بۆ کردن بە بەرۆکدا، دوای ئەوەی بەم قورئانە سازو ئامادەی کردبوون. هەروەها خودای بەرزو باڵادەست خواستی وابووە، کە ئەم قورئانە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ ببێتە پێشڕەوێکی زیندووو بمێنێت بۆ سەرکردایەتیکردنی نەوەکانی ئەم نەتەوەیەو بۆ پەروەردەکردنیان‌و ئامادەکردنیان بۆ گێڕانی ئەو ڕۆڵی سەرکردایەتییە دروستەی، کە خودا خۆی بەڵێنی لەسەر پێ داون، ئەگەر ئەوان بەو ڕێنماییانە ڕێی ڕاست بگرنەبەرو پابەندی پەیمانەکەی بن‌و، هەموو شێوازو دەستوورو مەنهەجێکی ژیانیشیان لەم قورئانەوە بەدەست بێنن‌و، خۆیان پێ بەهێزو باڵادەست بکەن، بەسەر هەموو بەرنامە دەسکردە زەمینییەکاندا، کە بەڕواڵەتی خۆیان هەر هەموویان بەرنامەی جاهیلی‌و نەفامیین.

دیارە ئەم قورئانەش تەنها گوتارێك نییە هەر بخوێنرێتەوە، بەڵكو دەستوورێكی شامیلو هەمەلایەنەیە، دەستوورێكە بۆ پەروەردەكردن، وەك چۆن دەستوورێكە بۆ ژیانی كردەیی (عملی) لەوەشەوە (لەو ئاقارەی پەروەردەكاریو شمولیەتی دەستوورییەوە) ئەزموونەكانی مرۆڤایەتیو بەسەرهاتی مرۆڤە دێرینەكان بە شێوازێكی نیگابەخش دەخاتە بەر دیدی ئەو كۆمەڵە موسڵمانەی، كە پەروەردەو گەشەی پێ دەكات. بەشێوەیەكی تایبەتیش ئەم قورئانە تەجرەبەو ئەزموونەكانی بانگەوازی ئیماندارانەی سەرزەویی لەخۆ گرتووە، هەر لە ئەزموونی (ئادەم)ەوە، -سڵاوی خودای لێ بێت- (تا چەند ئەزموونێكی دیاری چەند گەلێكی ڕابردوو)، كە خودا لە قورئاندا كردوویە بە توێشوویەك بۆ نەتەوەی موسڵمانان بە هەموو نەوەو ڕۆڵەكانییەوەو، ئەزموونی سەبارەت بە دەروونو، سەبارەت بە واقیعی ژیانیش پێشكەش كردوون، تاكو نەتەوە موسڵمانەكە لەسەر بەرچاو ڕۆشنییەك ڕێگاكەی خۆی گەشە بكاتو لەو توێشووە هەرە گەورەیەو لەو سامانە هەڵگیراوە هەمەڕەنگەش بەهرەمەند بێتو بەشی تەواوی خۆییمان لێ دەستەبەر بكات، هەر لەم كانگایەشەوە چیرۆكەكانی قورئان بەو ڕاددە زۆرییەو بەو هەمەڕەنگیو هەمەچەشنییەو، بەو ڕێنماییە نیگابەخشییانەوە هاتوون.

چیرۆكەكانی گەلی نەوەی ئیسرائیل، كە بە (بنو اسرائیل) ناوبراون، زۆرترینی چیرۆكەكانی نێو قورئانی پیرۆزن، لەبەر چەند هۆیەك، كە هەندێكیانمان لە بەشی یەكەمی (في ظلال)دا باس كردووەو، هەندێكی تریشیان لەكاتی چوونە سەر باسی ڕووداوو بەسەرهاتەكانی (بنو اسرائیل)دا ڕوون دەكەینەوە، هەندێكی دیكەشمان لەم بەشەداو لە چەند بۆنەیەكیاندا باس كرد (بەتایبەتیش لە سەرەتایدا).

لێرەشدا هۆیەكی دی لەسەر زۆریی چیرۆكی (بنو اسرائیل) لە قورئاندا دیاری دەكەین، كە بەڕایەكی ڕاستو یەكلاكراوەی دادەنێین، ئەوەیە: (بێگومان خودای گەورە زانیویەتی، كە چەند نەوەیەكی ئەم نەتەوەیە بە هەندێك دەورو زەمانی وەك

ئەوانەی (بنو اسرائیل)دا تێدەپەڕن‌و، چەند هەڵوێستێکی هاوشێوەی وەك هەڵوێستەکانی (بنو اسرائیل)یان بەرامبەر ئایین‌و بیروباوەڕەکەیان دەنوێنن، بۆیە ئامرازە هەڵخلیسکێنەرەکانی سەر ڕێگاکەیانی پیشان داون، کە لە مێژووی (بنو اسرائیل)دا وێنەیان گیراوە، تاکو ببێتە پەندو عیبرەت بۆیان‌و، تاکو وێنەکانیشیان لەو ئاوێنە هەڵگیراوەی دەستی خودای پاك‌و بێگەرددا ببینن بەر لەوەی بکەونە بەر ئامرازە هەڵخلیسکێنەرەکان‌و دووریان خەنەوە بۆ نێو چاڵو کەندو لێژاییەکانی ئەملاو لای ڕێگا ڕاستەکە، یان بەر لەوەی بەدرێژی ڕێگاکە هەر سەرگەرمی پرتەو بۆڵەو بەدکرداریی بن.

بێگومان پێویستە ئەم قورئانە بخوێنرێتەوەو بە هۆشیارییەوە نەوەکانی نەتەوەی موسڵمانان وەریگرن‌و، پێویستە وەهاش لێی وردبنەوە، کە ئەمە چەند فەرمانێکی گەرم‌و زیندوون‌و ئەمڕۆ هاتوونەتە خوارەوە تاکو کێشەکانی ئەمڕۆی پێ چارەسەر بکرێن‌و، تاکو ڕێگای ئایندە ڕووناککەنەوە، نەك هەر ئەوەندە بێت گوایە هەر فەرمایشتێکی جوانە بۆ خوێندنەوە، یان گوایە تۆماری حەقیقەتێکی ڕابردووەو هەرگیز ناگەڕێتەوە.

ئێمە هەرگیز سوود لە قورئان وەرناگرین هەتا بەو چەشنە نەیخوێنینەوە کەوا چەندین ڕێنمایی‌و فەرمانی ژیانی واقیعیمانی تێدایەو بۆ ئەمڕۆو بۆ سبەینێ‌و هەموو کاتێکی ئایندەمانە، وەك چۆن یەکەم کۆمەڵی موسڵمان وەریدەگرت‌و ڕێنمایی تازەو هەنووکەییی لە کاروباری ژیانی واقیعییدا لێ دەست دەکەوت.

جا کاتێك بەم بێدارییەوە قورئان دەخوێنینەوە، ئەوەی پێویستمانە دەیبینین‌و، چەندین شتی سەرسووڕهێنەرو گرنگی وایشی تێدا بەدی دەکەین، کە بە هزری بێئاگادا نایەن.. دەبینین، کە وشەکانی‌و دەستەواژەکانی‌و فەرمانەکانی هەر تازەو زیندوون‌و، دەبزوێن‌و لە جم‌وجووڵدان‌و ئاماژە بۆ مەشخەڵی ڕێگە دەکەن‌و، پێمان دەڵێن: (ئەوە بکەن، ئەوە مەکەن).. هەروەها پێمان دەڵێن: (ئەوە دوژمنە بۆ ئێوە،

ئەوەش دۆستە)، پێشمان دەڵێن: (ئاوا، خۆتان وریاو بێدارکەن لەو مەسەلەیە، ئاواش کەرەسەو ئامرازی بۆ سازو ئامادەکەن)، پاشان پێمان دەڵێن: (ئەمە گوتارێکی درێژو شیکراوەو وردو گرنگەو دەربارەی هەموو کاروبارێکی ژیانە)..

ئیدی بەم جۆرە لە قورئاندا خۆشیو ژیان بەدی دەکەینو پەی بە مانای ئەو فەرمایشتەی خوداش دەبەین، کە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ...﴿٢٤﴾ الأنفال﴾، واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، بەگوێڕایەڵیو پابەندییەوە بەدەم بانگەوازی خوداو پێغەمبەرەوە بچن کاتێك هانتان دەدات بۆ بەرنامەو ڕێبازێك، کە ژیانێکی ئەبەدیو سەرمەدیی بۆ ئێوە پاشەکەوت دەکات). کەوابوو ئەم قورئانە بانگەوازێکە بۆ ژیان، بۆ ژیانێکی هەمیشەیی نوێ کراوە، نەك بۆ ژیانێکی مێژوویی سنووردار، کە لە لاپەڕەیەکی زەردو تۆزاویی ڕابردوو لە لاپەڕەکانی مێژوودا باس بکرێت)[1]. هەروەها (سید قطب) -خودا لێی خۆش بێت- لە وتەیەکی تریداو لە کاتی باسکردنی ئەم چیرۆکەدا ئاماژەی بۆ گرنگترین وانەی لێوەرگیراوی کردووەو، گوتوویەتی:

(پەندی گشتیو هەمەگیر، کە لە هەموو ڕووداوەکانی ئەو چیرۆکەدا دەردەکەوێت، ئەوەیە کە ئەو ڕاپەرینە (ڕاپەرینی عەقیدەو بیروباوەڕە) سەرەڕای هەموو ئەو کەمو کووڕیو لاوازییەی گەلەکەش، کە چیرۆکەکە لەبەردەم ئەزموونی واقیعیدا دەریخستوونو، سەرەڕای ئەوەی کە گەلەکەش پۆل لەدوای پۆل لە قۆناغەکانی ڕێگەکەدا لەو عەقیدەیەش دابڕاون.. سەرەڕای هەموو ئەمانەش کەچی خۆڕاگریی ئەو چەند کەسە کەمە ئیماندارەش لەسەر حەقیقەتەکە، چەندین ئەنجامی گەورەی بۆ (بنو اسرائیل) بەدیی هێناوە، وەك ئەوەی کە سەرکەوتنو

---

([1]) سید قطب، في ظلال القرآن ، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٢٦٠-٢٦١).

سەربەرزیو دەسەڵاتدارێتیی سەر خاكو نیشتمانیان لەدوای بەزینی ناخۆشو، سەرشۆڕیی ئابڕووبەرو، ئاوارەبوونی درێژخایەنو، سەرشۆڕیی ژێر پێی دوژمنانی خۆسەپێنە.

هەر لەڕێی تەجرەبەو ئەزموونکارییشەوە چەند پەندو وانەیەکی تری تایبەتی لەم چیرۆکەدا دەرکەوتوون، کە هەموویان بەهای تەواویان بۆ کۆمەڵی موسڵمانان لە هەموو کاتو ساتێکدا هەیە: وەك:-

١- بێگومان حەماسەتو هەڵچوونی بەکۆمەڵ لەوانەیە سەرکردەکان فریو بدات، ئەگەر بەشێوە ڕواڵەتییەکەی وەری بگرن، بەڵکو دەبێت بیخەنە تەرازووی تەجرەبەکارییەوە پێش ئەوەی جەنگێکی یەکلاکەرەوەی پێ هەڵگیرسێنن.

چونکە کاتێك کەسانی ناسراوو پیاوماقوولی (بەنو ئیسرائیل)و خاوەن بیروراکانیان چوونە لای پێغەمبەرەکەیانو داوای هەڵبژاردنی پادشایەکیان لێ دەکرد، تا سەرکردایەتییان بکات، بۆ جەنگێك لەدژی دوژمنانیان، لەوکاتەدا پێغەمبەرەکەیان ویستی دڵنیا بێت لە ڕاستیی خواستی سووربوونیان لەسەر جەنگو کوشتار، بۆیە لێی پرسین: ﴿...هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا ...﴾ (٢٤٦) البقرة (ئەی ئەگەر نزیك بوون لەوەی خودا بەم زوانە جەنگو کوشتاری بۆ بڕیاردانو ئێوەش نەجەنگنو ئامادەی ئەو جەنگو هەڵچوونەی ئێستاتان نەبوون)؟ ئەوان لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا نارەزاییان بەرامبەر بۆچوونەکەی دەربڕیو هەڵچوونو حەماسەتیان گەیشتە لوتکە، بەڵام ئەم هەڵچوونە زیادەڕەوییە هێندەی نەخایاند، کە بڵێسەی دامرکایەوەو لە چەند قۆناغێکی ڕێگاکەدا وردە وردە کەوتە خوارەوە.

هەرچەندە (بنو اسرائیل) مۆرکێکی تایبەتییان لە شکاندنی پەیمانو پاشگەزبوونەوە لە بەڵێنو، جیابوونەوە لە نیوەی ڕێدا هەیە، بەڵام هەر چۆنێك

بێت ئەم دیاردەیە، دیاردەیەکی بەشەرییەو لەهەموو ئەو دەستەو کۆمەڵانەدا هەیە، کە پەروەردەی باوەڕدارانەیان نەگەشتۆتە ئاستێکی بەرزی ڕاهێنان. لەوانەیە ئەمە تووشی سەرکردایەتیی کۆمەڵێکی موسڵمان لە هەر نەوەیەکدا بێت، بۆیە باش وایە لەو حاڵەتەدا سود لە ئەزموونی (بنو اسرائیل) وەرگیرێت.

٢- بێگومان هەڵسەنگاندنی هەڵچوونی ڕووکەشییو خرۆشانی گڕگرتوانە لە دەروونی کۆمەڵەو تاقمەکاندا، پێویستە تەنها لەکاتی یەکەم تووش بوونو گرفتاریی واقیعیدا نەبیت، چونکە:-

(أ) زۆر کەس لە گەلی (بنو اسرائیل) هەر لە یەکەم ساتی جەنگ لەسەر بڕیاردانیان، ڕوویان لە جەنگ وەرچەرخاند، هەرچەندە لەسەر خواستی خۆیان جەنگیان بۆ بڕیاردراوە، تەنها ژمارەیەکی کەمیان دوای ئەو بڕیارە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا ماونەتەوە، ئەوانیش ئەو سەربازانە بوون، کە لەگەڵ (طالوت)دا بۆ جەنگ دەرچوون.

(ب) لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئەو سەربازانەش لە قۆناغی یەکەمدا لە تاقیکردنەوەی ئاو خواردنەوەکەدا دەرنەچوونو کەوتن، کە یەکەم تاقیکردنەوەی ڕێگەیان بووەو، لە ئاوەکەیان خواردۆتەوە، تەنها ژمارەیەکی کەمیان لەو تاقیکردنەوەیەدا دەرچوون.

(ج) ئەم ژمارە کەمەش، تا کۆتایی جەنگەکە خۆڕاگر نەبوون، ئەوانیش لەبەردەم ترسی ڕاستەقینەو لەبەردەم زۆریی ژمارەی دوژمنو هێزی گەورەیاندا ورەیان وردە وردە ڕووخاوەو دڵەکانیان لەرزیوە.

(د) لەئاست ئەو لاوازیو سەرکزییەدا، تەنها کەمینەیەکی کەمو هەڵبژاردە، پابەندی فەرمانی خودا بوونو، متمانەی بەهێزیان بە بەڵێنی هەبووەو، هەر ئەو کەمینەیەش باری جەنگەکەی یەکلاییکردۆتەوەو سەرکەوتنی بەدەست هێناوەو شایستەی سەربەرزیو دەسەڵاتداریێتی بووە.

بێگومان (بنو اسرائیل) سێ جار پاڵێوراون‌و پوخت كراونەتەوە، پوختەی پوختەی پوختەكەشیان ئەو كەسانەبوون، كە بڕوایان بەخودا لە جیهاددا زیاد كردووەو، خوداش بەڵێنی خۆی بۆ بەدیهێناون‌و سەركەوتنی پێ بەخشیون.

٣- لە دوو توێی تایبەتمەندییەكانی ئەم ئەزموونەشەوە پەندو وانەی سەركردایەتی چاك‌و بە سەلیقەو ئیماندار هەڵگیراوەو، هەموویشی لە سەركردایەتی كردنەكەی (طالوت)دا بە ڕۆشنی دیارەو، ئەم ڕاستییانەشی لێوە دەردەكەوێت:-

(أ) شارەزایی (طالوت) لە دەروونەكانی خەڵكی.

(ب) فریونەخواردنی بەهەڵچوونی ڕواڵەتی‌و ڕووكەشی.

(ج) ڕانەوەستان بە تاقیكردنەوەی یەكەمەوەو چاوەڕێ كردنی هەڵسەنگاندنی زیاتریان.

(د) هەوڵدانی بۆ تاقیكردنەوەی ڕادەی گوێڕایەڵی‌و خواستی پابەندیی لە دەروونی سەربازانیدا پێش دەستپێكردنی جەنگەكە.

(هـ) جیاكردنەوەی كەسانی بێهێزو، بەجێهێشتنیان لەدوای خۆی.

(و) پاشان (كە ئەمە گرنگترینیانە) مل نەدان‌و كۆڵنەدانی، ئەوەبوو ژمارەی سەربازانی جار لەدوای جار لە تاقیكردنەوەكاندا كەم دەبوونەوەو، لە دواییدا تەنها ئەو كەمینە كەمە باوەڕدارو هەڵبژاردەیەی لەگەڵ دامایەوەو، ئیدی (طالوت) بەو چەند كەسە كەمەوە جەنگەكەی گێڕا.

٤- دوا پەند، كە لەسەر چارەنووسی جەنگەكە خۆی حەشارداوە، ئەوەیە بێگومان ئەو دڵەی، كە بە خوداوە پەیوەستە دیدو بۆچوون‌و پێوانەكانی دەگۆڕڕێن، چونكە (واقیعە بچووك‌و سنووردارەكەی) بەچاوێك دەبینێت، كە لەپشت خۆیەوە بۆ (واقیعێكی گەورەو درێژكراوو گەیەنراوی بێ كۆتایی) درێژ دەبێتەوە، هەروەها بۆ بنچینەی گشت مەسەلەو كاروبارەكانیش هەر لەدوای

واقیعە بچووکە سنووردارەکەوە درێـژ بۆتـەوە. چـونکە ئـەو کەمینـە بـچووکە باوەڕدارەی، کە دانی بەخۆیدا گرتو جەنگەکەی گێـڕاو سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنا، لە کەمیی ژمارەیانو، لە زۆریی ژمارەی دوژمنانیشیان وا دەبینران، کـە کەسانی سادەو ساکاری تر بینیبوویـانو گوتبوویـان:- ﴿لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾ (ئێمە دەرەقـەتی (جـالوت)و سـەربازەکانی نایـەین.. ئێمە وزەو توانای ئەو پادشا زەبەللاحەو ئەو هـەموو سـەربازە بـێ شـومارەمان نیە؟)، بەڵام ئەو کەمینە باوەڕدارە هەمان حوکمو دیدوبۆچوونی کەسانی سادەو ترسنۆکیان بەسەر واقیعەکەدا نەدا، بەڵکو حوکمێکی تریان بەسەردادا، ئەوەبوو گوتیان: ﴿كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ البقرة﴾ (ئـای چـەند کۆمـەڵی کـەمو بـاوەڕدار هـەبوون، کـە چەندین کۆمەڵی زۆری بـێ شـوماری بێباوەڕانیـان بەیارمـەتی خـودا بەزانـد، خوداش لەگەڵ باوەڕدارانی بەئارامو خۆڕاگر دایە)!!

پاشان دوای دەربڕینی ئەو ڕاسـتییە، ڕووی نـزاو پاڕانـەوەیان کردۆتـە خـودای پەروەردگاریانو بەم نزایـە داوایـان لـێ کـردوە، کـە سـەریان خـاتو جـێگیرو خۆڕاگریـان کـات: ﴿قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ البقرة﴾.

بەم ڕەنگەش دیدو بۆچوونو تەرازووەکانی هەڵسەنگاندنی کاروبارو مەسەلەکان، لەکاتی پەیوەسـت بـوونی ڕاسـتەقینە بـەخوداوە، دەگـۆڕێن بـۆ ئـەو تێگەیـشتنە ڕاستەی، کە هەر بە ئیمانەوە بەندە، لەکاتێکیشدا دەگۆڕێن، کە ئیمانی ڕاستەقینە لەدڵدا دروست دەبێت، هەروەها بەم ڕەنگەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێت، کـە سـەوداو مامەڵە لەگەڵ بەڵێنی بەدی هاتووی خودا، کە لەدڵاندا دیارە، ڕاستگۆیانە ترە لـە

سەوداو مامەڵە لەگەڵ واقیعێکی بچووکی دیاری بەرچاوان.

ئێمە لەمە زیاتر ناتوانین ئەو پەندە نیگابەخشانەی تر دەرهاوێژین، کە ئەم چیرۆکە لەخۆی گرتوون، چونکە (وەك تەجرەبەش فێری کردووین) دەقەکانی قورئان بە هەر دڵێك هێندە پەندو وانەی سرووش بەخش (ایحاءات) دەدات، کە لە تواناو باری دایەو، کە بەگوێرەی ئاتاجە دیارو دەرکەوتووەکانیەتی.

ئیدی لە سامانی هەڵگیراوو پاشەکەوتکراوی دەمێنێتەوەو دڵانی تری لەسەر دەکاتەوەو لە هەموو جۆرە هەڵوێستو واقیعێکدا بەرادەی قیسمەتو بەشی خۆیان دەروازەی ئەو سامانەیان بۆ والاّ دەکات)[1].

## "لەگەڵ مامۆستای پێشەوا ( محمد رشید رضا ) لەلێکدانەوەی چیرۆکەکەدا"

ڕامانی (سید قطب) لەئاست ئایەتەکانی ئەم چیرۆکەدا ڕامانێکی حەرەکەت خوازیی بانگەوازکارانە بووەو،چەندین وانەی لەبارەی ئیمانو بانگەوازو حەرەکەت کاریو پەروەردەو جیهادەوە لێ دەرهاویشتووە.. بەلاّم ڕامانی (محمد رشید رضا) لەئاست ئایەتەکانی ئەم چیرۆکەدا ڕامانێکی ڕێساخوازیی کۆمەڵایەتییانە بووەو گرنگترین ڕێسای کۆمەڵایەتیی دەربارەی ژیانی گەلانو کۆمەڵگاکان لێ دەرهێناوە.

ئێمەش لێرەدا بەکورتی گرنگترین ئەو ڕێسایانەی، کە دەریهێناون، دەخەینە ڕوو..

---

١) سید قطب، في ظلال القرآن ، بەرگی یەکەم، لە لاپەڕەکانی (٢٦٠-٢٦٣) بەدەستکاریو کورتکردنەوەوە.

مامۆستا ناوبراو لە تەفسیرەکەیداو لە باسێکیدا بەناونیشانی (السنن الاجتماعية في القرآن والأمم والإستقلال) گوتوویەتی:-

" من لە ئایەتەکانی ئەم چیرۆکەوە ئەو ڕێساو حوکمە کۆمەڵایەتییانە دیاری دەکەم، کە دەکەونە بەر هزری خۆمو کە بەشێوەی جیاکراوەو لەچەند خاڵێکدا شییان دەکەمەوە، بۆ ئەوەی ـ ان شاء الله تعالى ـ موسڵمانان هوشیارکاتەوەو لەبەر بکرێنو بپارێزرێنو لەبیرنەکرێن.. ڕێساکانیش ئەمانەن:

ڕێسای یەکەم : ئەگەر دەستدرێژیی کرایە سەر سەربەخۆیی نەتەوەکانو، دوژمنان زەبری کاریگەریان لێ وەشاندنو، مافەکانیان قووت دان، ئەوا هەستو نەستی ئەو نەتەوانە بۆ بەرپەرچدانەوەی ستەم دەخرۆشێتو، هەوڵ بۆ یەکێتییەك دەدەن، کە پێشەوایەکی دادپەروەر نوێنەرایەتیی بکات، بۆیە بەدوای ئەو جۆرە پێشەوایەدا دەگەڕێنو خوازیاری دەبن، وەك چۆن (بەنو ئیسرائیل) دوای ئەو زەبرەی، کە خەڵکی فەلەستین پێی گەیاندنو دەربەدەریان کردن، داوای ئەو جۆرە پێشەوایەیان دەکرد.

ڕێسای دووەم: بێگومان هەستکردنی نەتەوە بە پێویستیی پاراستنی مافەکانیو پارێزگاریی لە سەربەخۆییەکەی، هەستێکە زیاتر لەلای پسپۆڕانو بیریارو خاوەن بیروڕاکان دروست دەبێت، ئەم جۆرە خەڵکەش بوون لەنێو (بەنو ئیسرائیل)دا، کە هەستێکی ئاوایان لەلا گەڵاڵە ببووو دوای ڕاوێژو تەگبیریان داوایان لە پێغەمبەرەکەیان کرد، کە پادشایەکیان بۆ سەرکردایەتیکردنی جەنگ بۆ بنێرێت ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ... ﴿٢٤٦﴾ البقرة﴾ لەو ڕستەیەدا سەرنجی وشەی (ملأ) بدە، کە مانای کەسانی (پایەداری کۆمەڵایەتیو دنیا دیتەو پیاوماقووڵو ئەهلی بیروڕا) دەگەیەنێت.

ڕێسای سێیەم: هەر کاتێك ئەو هەستکردنەش بەپێویستیی پاراستنی مافەکانی

نەتەوەو، جەنگین لەدژی دوژمنان لەلای کەسانی تایبەتمەند گەلاڵە ببێت، ئەوا هێندەش ناخایەنێت، کە سەراپای خەڵکی عەوامیش دەگرێتەوە، تەنانەت کاتێك لە قۆناغی بیرکردنەوەو هەستکردنیشەوە بۆ قۆناغی کارکردنو دەرکەوتن دەردەچێت، ئەوسا شکستیی ئیددیعاکاران دەردەکەوێتو، تەنها ڕاستگۆییی ڕاستگۆیان سوودبەخش دەبێت.

ڕێسای چوارەم: لەوانەیە نەتەوەکان لە هەڵبژاردنی سەرۆکیاندا ناکۆك بن، ناکۆکیش هۆکاری پەرتەوازەییو کەرت بوونە، بۆیە هەر دەبێت کەسێکی یەکلاکەرەوەی ناکۆکیو چارەسازی کێشەکەیان هەبێت، کە نەتەوەکە پێی قایل بن، وەك چۆن (بنو اسرائیل) داوایان لە پێغەمبەرەکەیان کردووە، کە پادشایەکیان بۆ هەڵبژێرێت، ئەو پێغەمبەرەش یەکلاییکەرەوەی ناکۆکییەکەیان بووە. یەکلاییکەرەوەی موسڵمانانیش ئەنجوومەنی (حلو عقد)ە، کە کەسانی شیاوی شەرعناسو شارەزا پێکی دەهێنن.

ڕێسای پێنجەم: بێگومان خەڵکی کۆك نین لەسەر پەیڕەوکردن، یان گوێڕایەڵیکردنی ئەو فەرمانەی، کە بە(عەقڵی خۆیان) بە پێچەوانەی بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیانی دەبینن.. هەر لەبەر ئەمەش (بەنو ئیسرائیل) هاوڕای پێغەمبەرەکەیان نەبوون لە دانانی (طالوت)دا بە پادشایان، بەڵکو بە پاساوێك بەرهەڵستیی فەرمانەکەیان کرد، کە تەنها لە گومانی بەرهەڵستکاراندا بە پاساو دادەنرێت.. لە سەیرو سەمەرەی کارو هەڵسوکەوتەکانی خەڵکیشدا ئەوەیە هەریەکە لەوان خۆی بەڕاست دەزانێت لە کاروباری سیاسەتو یاسای کۆمەڵایەتیی نێو نەتەوەو دەوڵەتاندا.

ڕێسای شەشەم: نەتەوەکان لە قۆناغی جاهیلییاندا وای بۆ دەچن گوایە شایستەترین کەس بۆ پادشاییو پێشەوایەتی، کەسانی خاوەن سامانی زۆرە، وەك لەوتەی

بەرهەڵستکارانی کاری پادشایەتیی (طالوت)دا هاتبوو، کە گوتبوویان: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًاۚ قَالُوٓاْ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِۚ ...﴿٢٤٧﴾ البقرة﴾ ئەم بۆچوونەش لە ڕێسا گشتییەکانی نەتەوە جاهیلەکانە.

ڕێسای حەوتەم: ئەو مەرجانەی بۆ هەڵبژاردنی پادشا، کە بەڕاست دادەنرێن لە وتەکانی پێغەمبەرەکەدا بەدیی دەکرێن، کە وەڵامی بەرهەڵستی گەلەکەی لەسەر پادشایەتیی (طالوت) پێی گوتن: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِۖ وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٧﴾ البقرة﴾..

لەم وەڵامەدا چوار مەرج هەیە:-

(أ) توانـاو ئامادەباشیی سرووشتییانەی لەش‌و لاری کەسەکە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ﴾..

(ب) زۆریی ئەو زانستەی هەیەتی‌و، کە کاروباری پێ بەڕێوە دەبات: ﴿وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ﴾.

(ج) ئەو سیفەتە زۆرانەی، کە لە جەستەیدا هەبووە دەربارەی تەندروستی‌و، کامڵی‌و تەواویی هەموو هێزە هەمەجۆرەکانی لاشەیەتی، بەتایبەتیش ساغیی فیکرو هۆشیاری‌و، جەستەو..هتد.

(د) بەخشینی خوداو کۆمەك پێکردنی لەو هۆکارانەی تردا، کە خۆی

لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ﴾.

رێسای هەشتەم: ئەم ڕێسایەش لەو فەرمایشتەی خوداوە سەرچاوەی گرتووە، کە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ﴾ خواستی خوداش بەپێی سوننەتە گشتییەکانی خۆیەتی لە گۆڕینی بارودۆخی نەتەوەکاندا، ئەوەش بەندە بەوەی، کە ڕۆڵەکانی ئەو نەتەوانەش لە دەروونی خۆیاندا گۆڕانکاری بکەن، هەروەها بەندە بەوەش، کە خودا بە خواستی خۆی دەسەڵاتی ستەمکاران نەهێڵێتو لێیان بسێنێتەوەو فەرمانڕەوایەتیی سەر زەویش بدات بە پیاوچاکان.. ئەم ئایەتانەو هاوشێوەکانی تریشی، لە هەموو سەردەمێکدا بە عەمەلیو لەبەرچاوی خەڵك لێك دراونەتەوەو، ئیتر بینەرانو تەماشاکاران لەکوێن؟

رێسای نۆیەم: بێگومان گوێڕایەڵیی سەربازان بۆ فەرماندە لە هەر کارێکی ڕێ پێدراوو قەدەغەکراودا، مەرجێکە لە زەفەر پێبردنو ڕێك بوونی کاروبار. یاساکانی سەربازییش لەم سەردەمەداو تەنانەت لەلای خۆرئاواییەکانیش لەسەر گوێڕایەڵیی سوپا بۆ فەرماندەکانی، لە هەموو کارێکی پێ خۆشبوونو ناخۆشبوونو پەسەندو ناپەسەند، داڕێژراون.

رێسای دەیەم: بێگومان کەمینەیەکی کەم لەسەربازانی باوەڕدار بەهۆی ئارامگرتنو خۆڕاگریو گوێڕایەڵیی فەرماندەوە، بەسەر زۆرینەیەکی زۆر لە سەربازانی بێباوەڕدا (کە ئارامو یەکێتیو گوێڕایەڵیکردنی فەرماندە)یان تێدا نەمابێت، سەردەکەون، چونکە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگران دایە، واتە سوننەتی خودا وایە، کە سەرکەوتن بەندە بە خۆڕاگریو جێگیربوون لەسەر هەقەوەو، کەسانی ترسنۆكو ترساویش پاڵپشتو یاریدەدەری دوژمنانیانن لەدژی خۆیان، ئەمەش لە هەموو سەردەمێکدا بینراوە.

ڕێسای یانزدەهەم: بێگومان باوەڕهێنان بەخوداو، بڕواکردنیش بە دیدارو گەڕانەوە بۆ لای خودا، گەورەترین هۆی ئارامیو خۆڕاگرییە لە بارودۆخی ڕووبەڕووبوونەوەی شەڕی دەستەو یەخەو کوشتاردا.

ڕێسای دوازدەهەم: بێگومان نزاو پاڕانەوە لە خودا لەکاتی کوشتاردا بەسوودە، وەك لە دەلالەتو مانای فەرمایشتەکەی خوداشدا هاتووە:﴿ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ بەستنەوەی ئەم ڕستەیە بە ئامرازی پەیوەندی (ف) بە ئایەتەکەی تایبەت بە نزا کردنەوە ﴿...رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ البقرة﴾و، کە بەدوایدا یەکسەر ڕستەی ﴿ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ هاتووە، مانایەکی هێجگار ماقووڵی هەیە، چونکە نزاو دووعاکردن بەڵگەی باوەڕهێنان بەخوداو بڕواکردن بە پێگەشتنەوەیەتی.

ڕێسای سیازدەهەم: خودا، کە هەندێك لە خەڵکیی بەگژ هەندێکی تریاندا کردووە (واتە ململانێی لەنێوان باوەڕداران و بێباوەڕاندا خولقاندووە)، ئەمە لە ڕێسا گشتییەکانیەتیو، هەر ئەمەشە کە زانایانی حیکمەتناس لەم سەردەمەدا بە (ململانێی مانەوە) گوزارشتی لێ دەکەنو، دەڵێن کە جەنگ ڕەوشتێکی سروشتییە لە مرۆڤدا، چونکە لە لقەکانی ڕێسای گشتیی ململانێی مانەوەیە.. لەو فەرمایشتەی خوداشدا ﴿...وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ... ﴿٢٥١﴾ البقرة﴾، ئەوە بەدیی دەکەین، کە ئەمە دەقێکی تایبەت بە جەنگو کوشتار نییە، بەڵکو دەقێکی گشتییە بۆ هەموو جۆرە ململانێیەکی نێوان خەڵکی کە ئاتاجی بە پاڵەپەستۆکردنو باڵادەست بوون هەیە.

هەندێك کەسی خۆ هەڵقورتێن لە زانستی ڕێساکانی کۆمەڵگەی بەشەریی، وای بۆ دەچن گوایە: (ئەو ململانێی مانەوەیەی، کە بە (ڕێسایەکی گشتیی ناودەبەن) لە ئاسەواری مەتریالیستەکانی ئەم سەردەمەیەو، کە گوایە ستەمو زۆرداریییەکەو ئەو ماددەپەرستو مەتریالیستانە دایانهێناوەو حوکمی پێدەکەنو، گوایە پێچەوانەی ڕێبازی ئایینە).. خۆ ئەگەر ئەوانەی، کە ئەم بۆچوونو بیروڕایەیان دەربڕیوە مانای مرۆڤیان بزانیایە، یان خۆیان بناسیایە، یاخود لەم ئایەتە تێبگەیشتنایە ئەوا ئەو جۆرە وتەو بیروڕایانەیان دەرنەدەبڕی.

ڕێسای چواردەهەم/ فەرمایشتی خودا ﴿لَفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ﴾ پشتگیریی ئەو ڕێسا دەربڕاوەی زانایانی کۆمەڵناسیی دەکات، کە لەسەر هەڵبژاردنی ئاسایی دەریدەبڕن، یان لەسەر مانەوەی باشترین خەڵك، ڕێگای ئەم ئاکامەش پێداویستییە باسکراوەکانی پێشووە، وەك چۆن خودا پێشتر باسی ئەوەی فەرمووە، کە بەگژ یەکتراکردنی خەڵکیو هاندانی باوەڕداران لەدژی بێباوەڕانو بەرگریکردن لە هەقو بەرژەوەندی، بەربەستە لە تێکدانی سەرزەویو خراپەو بەدکاری، بەمانای ئەمە هۆی مانەوەی هەقو مانەوەی چاکەیە. ئەم ڕاستییەش لە فەرمایشتێکی دیکەی خوادا جەختی لەسەر کراوە، کە حیکمەتی ڕێگەدان بە موسڵمانان بۆ کوشتار ڕوون دەکاتەوە، وەك لە سوورەتی (حەج)دا فەرموویەتی: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٍ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ

أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴿٤١﴾ الحج﴾، واتە: (مۆڵەت بەو ئیماندارانە دراوە، کە جەنگیان لەدژ دەگێڕن بجەنگن‌و بەرگری لەخۆیان بکەن، تەنانەت گەر بە کوشتاریش بێت، چونکە ستەمیان لێکراوە، بێگومان خوداش توانای لەسەر کۆمەك‌و سەرخستنیان هەیە، ئەوانەی کە بەناهەق لە خاك‌و نیشتمانیان دەرکران، تەنها لەسەر ئەوە دەرکراون، کە گوتوویانە: (الله) خودا پەروەردگارمانە. جا ئەگەر خودا هەندێك لە خەڵكی نەکات بەگژ هەندێکی تریانداو باوەڕداران لەدژی بێباوەڕان هان نەدا (تا بەرگری لە شوێنە پیرۆزەکانیان بکەن) ئەوا چەندین پەرستگای ڕاهیبانی مەسیحییەکان، کە بە (دێر-و -صوامع) ناسراوەو، چەندین پەرستگای گشتیی مەسیحییەکان، کە بە کلێسەو (بیع) ناسراوەو، چەندین پەرستگای جوولەکەکانیش، کە بە کنێسەو (صلوات) ناسراوەو، چەندین پەرستگای موسڵمانانیش، کە بە مزگەوت (مساجد) ناسراوەو، کە هەموویان ناوو یادی زۆری خودایان تیادا هێنراوە کاول دەکران، بێگومان خوداش ئەو کەسانە سەردەخات، کە سەرخەری ئایینی خودان. بەڕاستی خودا زۆر بەهێزو بالآدەستە. ئەو کەسانەی سەرخەری ئاینی خودان ئەگەر پایەدارمان کردن لە زەویدا نوێژەکانیان هەمیشە بەچاکی دەکەن‌و زەکاتی ماڵی خودا دەدەن‌و فەرمان بەچاکە دەکەن‌و ڕێگریی لە خراپە دەکەن‌و سەرەنجامی هەموو کاروبارێکیش لە بەرژەوەندیی ڕێبازی خوادایە). ئەمە ڕێ پێشاندانێکە بۆ ململانێی مانەوەو بەرگریی لە هەق، بێگومان هەر ئەمەش بە مانەوەی باشترین خەڵك‌و، پاراستنی چاکترینیان کۆتایی دێت)[1].

---

١) بڕوانە: (تفسیر المنار)ی (شیخ محمد رشید رضا) بەرگی دووەم، لاپەرەکانی (٤٩٢-٤٩٨) بە نەختێك دەستکاری‌و کورتکردنەوەوە.

## "هەندێك وشـەو دەستەواژەی پڕ واتـای نێو ئـایەتەکان"

لێرەدا هەڵوێستەیەکی کورت لەئاست چەند وتـەو دەسـتەواژەیەکی ناسـكو پـڕ واتای ئەدەبیی ئەو ئایەتانەدا دەکەین، کە چیرۆکی (طـالوت)یـان بـاس کـردووەو، هەوڵیش دەدەین ئەو مەسەلانە دووبارە نەکەینەوە، کە هەردوو پێشەوا (محمد رشید رضا)و (سید قطب) دیارییـان کردبـوو، بـەڵکو هەنـدێك تێـڕوانینو دەلالـەتی دی دەخەینە پاڵ دیدو بۆچوونو ئاماژەکانی ئەوان:

١- لـە پرسـیاری ﴿أَلَمۡ تَـرَ ﴾، کـە یەکـەم وشـەی چـیرۆکەکەیەو بـەمانای (ئایـا نەتڕوانیوە بۆ...) لێرەدا ڕوانینەکە زانستیانەیە نەك (ڕوانینی چاو)، واتە: (ئایا چیرۆکی ئەو پیاوە کـامڵو ناسـراوانەی (بـەنو ئیـسرائیل)ت نـەزانیوە..؟ ئـەم داواکردنی تێگەیشتنەش دەلالەتە لەسەر هاندان بۆ زانینو بانگەواز بۆ کردنیو، وەك ئەوە وایە پێی فەرموویێت: ﴿چیرۆکی ئەو پیاوە ناسراوو قسە ڕۆشـتوانەی (بەنو ئیسرائیل) بزانە﴾.

٢- لە دەستەواژەی ﴿أَلَمۡ تَـرَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾یشدا مەبەست لـە وشـەی (مـلأ)ەکە، واتە: (گەورە پیـاوانو ڕیـش سـپییانو پیاومـاقوڵانی ئـەو هـۆزە، (راغبی اصفهانی) لەم بارەیەوە گوتوویـەتی: (ٱلۡمَلَإِ ) کۆمەڵـە کەسـێکن، کـە لەسەر ڕایەك ڕێ دەکـەونو چـاوانی خـەڵکی لـە دیـمەنی جـوانی یەکـدەنگیو کۆبوونەوەیان پڕ دەکەنو، ڕەونەقو بەهای بەرزیش دەخەنە دڵو دەروونیانەوە)[1].

ئیمـامی (ڕازی)یـش گوتوویـەتی: (ٱلۡمَلَإِ )، واتـە پیـاوانی ڕێـزدارو

---

١) (المفردات فـي غريب القران)ی (راغب-ی اصفهانی)، لاپەرە (٤٧٢).

دەستـرۆیشتووی نێو خەڵکیو، ریـشەکەی لـە (مَـلإ)ەوەیـە، وانـە لـە وشـەی (پڕ)ەوەیە، چونکە ئەم جۆرە پیاوانە چاوانی خەڵکی لە شانو بەهای تایبـەتیان پڕ دەکەنو خەڵکی (بەپڕی چاو، واتە (تێر لێیان دەڕوانن‌و چاویان بـە تایبـەتی بۆ دیتنیان تەرخان دەکەن). گوتراویشە ئەو کەسانەن، کە لە هەر شـوێنێکدابن ئەو شوێنە پڕ دەکەن (وەك ئەوەی هەر ئەوانی لیّ بێت).

(زجـاج)یـش گوتوویـە: (الملأ- الرؤسـاء) واتـە: (مـلأ) بـە سـەرانی هـۆزو سەرۆکانی تری خەڵکی دەگوترێت، بۆیەش ناوبراون، چونکە دڵان پڕ دەکەن لـەو شتانەی پێویستیانە"[1].. تا ئێرە وتەی ئیمام (رازی) بوو.

بێگومان هەر گەلو هۆزو نەتەوەیەکیش پیاوانی گەورەو ریـش سـپیو قـسە رۆیشتووو سەرەك هۆزو گوێڕایەڵکراویان تێدابووە، وجودی ئەم جۆرە کەسانەش دیاردەیەکی سروشتیی نێو گەلانە.. قورئانیش لە زۆربەی ئایەتەکانیـدا وشـەی (ملأ)ی بۆ سەرکردەو سەرانی کافرەکان بەکارهێناوە، واتە بۆ ئەو کافرانەی، کە گەلەکانیان بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی بانگـەوازەکانی پێغەمبـەرانو چـاکەخوازان هانـداوە، هـەر پێغەمبـەرێکیش، کـە تووشـی بـەرەنگاریی گـەورە پیـاوانی هۆزەکەی بۆتەوەو جەنگیان لەدژ گێڕاوەو ئازاریـان داوە، خـوداش بـەهۆی ئـەو نەریتە نابەجێیەیانەوە لەناوی بردوون، قورئان وشەی (ملأ)ی هەژدە (١٨) جـار بۆ کافران بەکارهێناوە، جێی باسیشە خودی وشەکە بیستو دوو (٢٢) جار لە قورئاندا هاتووە.

٣- وشەی (إِذۡ قَالُواْ)، (إِذۡ) ئامرازێکە بـۆ کـاتی ڕابـردوو بـەکاردێتو ئاوەڵکـار (ظرف)ێکە بۆ ڕابردوویەك لە زەمەن، (إذا)ش ئاوەڵکارە بـۆ زەمـەنی داهـاتوو (ڕانەبردوو). لەبـەر ئەمـە قورئـان ئـامرازی (إِذۡ) بـەکاردێنێت بـۆ گوزارشـت

---

١) التفسير الكبيـر - للرازي (٦: ١٧٠).

(تعبیـر) لە ڕووداوە ڕانـەبردووەکانی نێـو چـیرۆکەکانی پێـشینان، جـا ئەگـەر (خوێنەر) لەهەر شوێنێکدا ئەو ئامرازەی خوێندەوە تێـدەگات کـەوا لەدوایـەوە گێڕانەوەی چەند ڕووداوێکی ڕابردوو هەیە.

بەڵام قورئان ئامرازی (إِذْ) بۆ گوزارشت لە ڕووداوەکانی ئایندە بـەکاردێنێت، کە لەکاتی (هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتـەی ئامڕازەکـەی تێدایـە) هێـشتا ڕووی نەداوە.

ئامرازی (إِذْ) لـە قورئانـدا دوو سـەدو سـیو نـۆ (٢٣٩) جـار هـاتووە[1]. لەکاتێکدا ئـامرازی (إذا) چوارسـەدو بیـستو سـێ (٤٢٣) جـار لـە قورئـان هاتووە[2].

٤- نەناسراوێتیی پێغەمبەرەکـەیان لـەم چیرۆکەدا، کـە فەرموویـە (لنبـي لهم) (بەپێغەمبەرێکی خۆیان گوت)، مەبەستێکی تێدایەو، نیگایەکی قەشەنگیـشی بۆ تەماشاکارانی چیرۆکی (طـالوت) تێدایە، وەك ئەوەیە پێیان ڕاگەیەنێت، کـە لەناوی ئەو پێغەمبەرە نەکۆڵنەوەو هەوڵی ناسینیی نەدەن، پاشان وەك ئەوەشـە قورئان پێیان بفەرمووێت: (ئێمە بەئانقەست ناوەکەیـمان فـەرامۆش کـردووەو سیفەتەکەیـمان شاردۆتەوە، خۆ ئەگەر بـمانویستایە ناوی دیاری بکـەین، ئـەوا دەمانکرد، هەروەها ئەگەر بـمانزانیایە، کە لە ڕوونکردنـەوەی نـاوو شـۆرەتیدا خێرو سوودێك هەیە، ئەوا ڕوونـمان دەکردەوە، بۆیە ئێوەش بەوەندە قایل بن‌و، هەر ئەوەی هێناومانەتەوە بەسە).

٥- لە وتەی ئەوانیشدا ﴿ٱبۡعَثۡ لَنَا مَلِكٗا نُّقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ﴾ (پادشایەکمان بۆ بنێرە تاکو لە جەنگی ڕێگای خودامان دا سەرکردەمان بێت) لەم وتەیەیانـدا

١) (معجم الادوات والضمائر في القرآن) للدكتور- اسماعيل عمايره، ص (١١-١٦).
٢) هەمان سەرچاوە، ص (١٧-٢٦).

گرنگیی بوونی سەرکردەیەك دەردەکەوێت، کە سەرکردایەتیی نەتەوە بکات‌و ئاڕاستەیان بکات بۆ جیهاد، هەروەها پێویستت بوونی دامەزراندنی ئەمیرێك بۆ جەنگ‌و جیهادیش دەردەکەوێت. زانا (سیوطي) لە کتێبی (اکلیل)ەکەیدا گوتوویەتی: (لەم وتەیەی پیاوانی (بنو اسرائیل)دا ئەوەش دەردەکەوێت، کە بێگومان نێرراوان‌و، پۆل‌و دەستەی موجاهیدان هەر دەبێت ئەمیرێکیان بۆ دابنرێت، کە لە فەرمانەکاندا بگەڕێنەوە بۆ لای‌و جڵەوی سەرکردایەتی‌و پێشرەویی بدەنە دەست)[1].

٦- پێغەمبەرەکەشیان زیرەك‌و دانا بووە کاتێك پێی گوتوون: (ئەی باشە ئەگەر بەم زوانە کوشتارتان لەسەر نووسرا ئایا دەجەنگن: ﴿هَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُواْۖ ﴾؟ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەو پێغەمبەرە سیفەت‌و هەڵسوکەوتی ئەوانی زانیوە‌و، شارەزای سروشت‌و خوو نەریتیان بووەو، ئاگادار بووە لە ئەگەری سەرهەڵدانی نەریتەکانی ترسنۆکی‌و، پاشگەزبوونەوەو، شکاندنی بەڵێن‌و ڕوو وەرچەرخان لە کوشتارو، سستی کردن لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەو پاڵ لێدانەوەیان. ئەم درێغی کاری‌و کەمتەرخەمییانەش هەمیشە ڕەگی لەناخی سروست‌و دەروونی جوولەکەکان‌و، لە ئاکارو ڕەفتارەکانیاندا داکوتاوە.

٧- شارەزایی پێغەمبەرەکەیان لە دەروونی ئەوان ڕاست دەرچووو، ئەوەی لەبارەشیانەوە دەیزانی، بەدیی هات، ئەوەبوو ڕوویان لە جەنگ‌و کوشتار وەرچەرخاند دوای ئەوەی زۆر پەرۆش‌و گەرم‌و گوڕبوون لەسەری، وەك خودا لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ (کاتێك کوشتاریان لەسەر نووسراو بڕیار درا، ڕوویان لێ وەرچەرخاند تەنها

---

١) (الأكليل في استنباط التنزيل)ی- سیوطي- ص (٤٥).

ژمارەیەکی کەمیان نەبێت).

هەر لەم شارەزاییەوە ئەوەش وەردەگیرێت، کە (جگە لەوەی هەردوو مامۆستاش (رشید رضا)و (سید قطب) دیارییان کردووە، نەبردنە سەری بەڵێنو خۆزگەکانو پێچەوانە بوونیان لەگەڵ کارو راپەڕاندندا، زۆریشن ئەو کەسانەی بەڵێن دەدەنو خۆزگە دەخوازنو هەڵدەچنو دەخرۆشێنو کەچی زۆربەی هەر زۆری ئەو بەڵێنو خۆزگەو ئاوات خواستنانەیان لەسەر زەمینەی تاقیکاریو لە مەیدانی جێبەجێکردندا وردوخاش دەبن.

ئیمامی (قرطبي) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویەتی: (ئەمە پیشەو نەریتی ئەو گەلو نەتەوانەیە، کە بەنازو نیعمەت فریویان خواردووەو، کە مەیلیان هەر لەسەر خۆشیو حەوانەوەو ماندووبوونەو، لە کاتەکانی خرۆشانو هەڵچووندا ئاواتەخوازی جەنگنو، ئەگەر جەنگیش هاتە پێشەوە دەترسنو دەچنەوە قاوغەکەی خۆیان)[1].

قورئانی پیرۆزیش رەخنەی لە هەندێك لەو موسڵمانانە گرتووە، کە ئاواتە خوازی جیهادو پەرۆشی جەنگو کوشتارنو داوای هەڵگیرسانی دەکەنو، کاتێك خوداش بارودۆخی جەنگیان بۆ دەخولقێنێتو ئەوەی ئاواتیان بۆ دەخواستو داوایان دەکرد، پێویستی دەکات لەسەریان، وا دەردەکەون کە ترسنۆك بوونو بێدەسەڵاتو لاوازن، خودا لەمبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلَا أَخَّرْتَنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَىٰ .. (٧٧) النساء ﴾.

---

١) (الجامع لأحكام القرآن)ی- قرطبي (٣: ٢٤٥).

واتە: (ئایا نەتدیوە ئەو کەسانەی، کە پێیان گوتراوە، (ئێستا دەست بپارێزن‌و کاتی جەنگ نییە، بەڵکو لەم بارودۆخەدا زیاتر هەر نوێژ بکەن‌و زەکاتی مالّی خودا بدەن، بەڵام کاتێك بارودۆخی جەنگیان بۆ هێنرایە پێش‌و کوشتاریان لەسەر نووسرا، دەستەیەکیان لە خەڵکە دوژمنە جەنگاوەرەکە دەترسان‌و ئەم ترسانەشیان بەرِاددەی لەخواترسانیان‌و تەنانەت لەوەش زیاتر بووو، ئینجا دەشیانگوت: (خودایە تۆ بۆچی جەنگت لەسەر نووسیین، خۆزگە بۆ ماوەیەکی تر لەم کاری جەنگەت دوادەختستین) تۆش ئەی پێغەمبەر بەو جۆرە کەسانە بڵێ: (خۆشییەکانی ژیانی دنیا کەم‌وکورتن‌و، ئەوەندە نین، کە بخرێنە پاڵ خۆشییەکانی رِۆژی دوایی، بەڵکو هەر ژیانی رِۆژی دوایی‌و پاداشتەکانی قیامەت چاکترو خۆشترو نەبرِاوەیە بۆ ئەو کەسانەی، کە لەخودا دەترسن‌و پارێزگارن.

هەر لە دەرووی ئەم جۆرە نەریتەی نێو دەروونی ئینسانییەوە، پێغەمبەری خوداش ﷺ بانگهێشتمان دەکات بۆ ئەوەی، کە بەڵێن‌و خۆزگە خواستنی زۆر لەسەر جیهاد دەرنەبرِین‌و زیادەرِۆیی لە دەرخستنی ئارەزووکردن لە کوشتاردا نەکەین، بەڵکو پێش روودانی لەسەرخۆو لەخۆبوردووبین‌و ئاواتەخوازی رِووبەرِووبوونەوە لەگەڵ دوژمن نەبین، بەڵکو سەلامەتیمان بۆ بنووسرێت، بەڵام خۆ ئەگەر شەرِ یەخەی گرتین‌و بارودۆخەکەی هاتە پێشەوەو رِووبەرِووبوونەوە سازو تەواو رێکخراو جەنگ هەڵگیرسا، ئەوا لەوکاتەدا رِاستگۆیی‌و خۆرِاگریی‌و دان بەخۆداگرتن بەدیی دێن.. وەك لەو فەرموودەیەشدا، کە (مسلم) لە (عبداللهی کورِی ابو اوفی) وەگێرِاویەتیەوە، کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە هەندێك رِۆژانی بەرەو رِووبەرِووبونەوەی دوژمندا چاوەرِوانیی دەکرد، تاکو خۆر لار دەبۆوەو، ئینجا رِووی گوتارێکی دەکردە خەڵکی‌و دەیفەرموو: (**یا أیها الناس لا تتمنوا لقاء العدو، وأسألو الله العافیة، فاذا لقیتموهم فاصبروا،**

**واعلموا امن الجنة تحت ظلال السيوف)**[1].. واتـه: (ئـەی خەڵکینـه هیـوای گەیشتن بەدوژمن مەخوازن، بەڵکو داوای سەلامەتی لەخودا بکەن، بەڵام ئەگەر رووبەڕوویان بوونەوەو بارودۆخی جەنگ هاتە پێش ئەوا بەئارام بن‌و، بشزانن کە بێگومان بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکان دایە).

٨- ئەو پادشایەی کـە خـودا بۆیـانی هەڵبـژارد، نـاوی لـە قورئانـدا (طـالوت)ە، لەکاتێکدا ناوی پادشا لە بەسەرهاتەکانی (بنـو اسـرائیل)و کتێبـە لـێ نـەقڵ کراوەکانیاندا (شاووڵ)ە، ناوی پادشای دوژمنەکانیشیان لە قورئاندا (جالوت)ەو، لـە بەسـەرهاتەکانی (بنواسـرائیل)و ئـەو کتێبانـەش کـە لێیانـەوە وەرگـیراوە (جوولیات)ە. هەندێك لەحیکایەتخوانانی ئەو بەسەرهاتانەو لەمێژوونووسـانیش گومانیان لەراستیی ئـەو دوو نـاوەی نێـو (قورئـان) هەیـەو تێبینیـان لەسـەر راستییەکەی یان پەسندنەکردنی دەربڕیوە، چونکە گوایە لەگـەڵ هـەردوو نـاوە لێنراوەکەی (بنو اسرائیل)دا ناگونجێت.. بۆیە ئەوان ناو لێنانەکەی جوولەکە لـە ناولێنانەکەی قورئان لەپێشتر دادەنێن‌و، ڕای یەکلاکەرەوەشیان بۆ پیشان داوە.

بەڕاستی ئا ئەمەیە گومڕایی‌و سەرلێشێوانی دوورو درێژ.. ئەمە لەکاتێکـدا ئەوەی لە قورئاندا هاتووەو کە پێچەوانەی ئەوەیە، کە لە بەسەرهاتەکانی (بنـو اسرائیل)دایە دەقی ڕاست‌و جێی دڵنیایی‌و سەلمێنراو دەخەینە پێش ئەوەی، کە جێی گومانی گۆڕانکاری‌و شێواندن‌و ساختەکارییە.

مێژوونووس‌و توێژەرەوان کۆکن لەسـەر ئـەوەی، کـە بەسـەرهاتەکانی (بنـو اسرائیل) جێی متمانەو دڵنیایی‌و جێی بڕواپێکردن نین، تەورات‌و ئەو کتێبـە کۆنانەش، کە بە (العهد القديم، ناسراون‌و، کە پێش هاتنی مەسیح نووسـراون‌و

---

١) (مسلم) لە (كتاب الجهاد والسير) بە ژمارە (٣٢)ی –باب كراهة تـمني العدو، رقـم –٦- داو بە –حديث رقم –١٧٤٢-دا گێڕاویەتییەوە.

کتێبە بەش بەشەکانی تەورات‌و، (تەلمود)یش، کە شەریعەت‌و سوننەتەکانی جوولەکەیان تێدایە، هەموویان کەوتونەتە بەر شالاوی دەسکاریی‌و داڕشتنەوەی جوولەکەکان، کە بە وتەو بیروڕای خۆیان پڕیان کردوونەتەوەو فەرمایشتی خودایان تێکەڵی قسەی خۆیان کردووەو، هەروەها هەق‌و شتە ڕاستەکانی خودایان تێکەڵی درۆو دەلەسەو ساختەکاری‌و گومڕایی خۆیان کردووە.

بەڵام بێگومان خودا خۆی قورئانی پیرۆزی لە هەر دەسکاری‌و شێواندنێکی خەڵکی پاراستووە، لەبەر ئەوە پێویستە پشت ببەسترێت بەوەی لە قورئاندا لەسەر چیرۆکی پێشینەکان‌و لەسەر ناوەکانی کەس‌و شوێنی ڕووداوەکانی ئەو چیرۆکانە هاتووەو، بەتایبەتیش کاتێك ئەو دەقەی قورئان پێچەوانەی ناوەڕۆکی دەقەکانی بەسەرهاتی پێشینەکانە، کە لەسەرچاوە ناراست‌و دەستکاریکراوەکانی (بنو اسرائیل)دایە، ئێمەش بەدڵنیاییەوە دان بەو ڕاستییەدا دادەنێین، کە ناوی پادشاکەیان (طالوت) بووەو ناوی پادشای دوژمنەکانیشیان (جالوت) بووە. هەر لەمبارەیەشەوە لێکۆڵینەوەی هەندێك لە توێژەران ڕەت دەکەینەوە، کە لەبواری زمانەوانییەوە وشەی (طالوت)یان ورد کردۆتەوەو خۆیان بەو بیروبۆچوونە گەیاندوە، گوایە وشەکە عەرەبییەو لە ڕیشەی وشەی (طول/ درێژ)ەوە هاتووەو، گوایە هەردوو پیتی (و)و (ت)ەکەش بۆ پێ لەسەرداگرتنی ماناکەیە، کە لە عەرەبیدا بە (مبالغە) وەسف کراوە، وەك چۆن ئەم پیتانە (و،ت) بۆ وشەکانی (طاغوت)و (ملکوت)و (جبروت) زیادکراوە، تاکو دەلالەت لەسەر ڕاستیی بیروبۆچوونەکەیان بکات، کە لەڕاستیدا چەند وەسفێکی ئەفسانەیی درێژە، کە بۆ بالای (طالوت) دانراوەو لەبۆتەی گریمانکاری دایە.

ئێمە هەموو ئەو بۆچوونە ئەفسانەگەرییانە ڕەت دەکەینەوە، چونکە ناوی (طالوت) ناوێکی بیانی‌و (غەیرە عەرەبییە).. ناوە بیانییەکانیش هەموویان

سەربەخۆ (جامد)ن‌و، هیچ ڕیشەیەکی لێ دەرهاوێژراویان نییە، چونکە (عەرەبی) نین، ئیدی چۆن بەرێزمانی عەرەبی لە دەرهاوێشتنی ماددەی وشەیەك بکۆڵینەوە، کە (عەرەبی) نییەو، کە لەپێش گەلی عەرەبیشدا بەکارهاتووەو، کە لەنێو گەلانی تری غەیرە عەرەبدا باو بووە؟!

هەروەها ناوەکانی (ئادەم)و (ئیبلیس)و (نوح)و (ئیبراهیم)و (یەعقوب)و (لوط)و (طالوت)و (جالوت)و (داود)و چەندین ناوی تریش، بیانی‌و سەربەخۆن، نەك عەرەبی‌و ریشەداربن‌و لەریشەی وشەی ترەوە دەرهێنرابن.

٩- (بەنو ئیسرائیل) ناڕەزاییان لەسەر پادشایەتیی (طالوت) بەدوو بیانوو هەڵچنی بوو ﴿وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ﴾. بەدیدو تێڕوانینی ئەوان پادشایەتی‌و پێشەوایەتی‌و فەرمانڕەوایەتی‌و دەسەڵاتداریتی، بەپێی میراتگریی پشتاوپشت‌و حوکمی بنەماڵەچێتییە، جا لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك لەباب‌و باپیرانی (طالوت) پادشا نەبوون ئەوا هیچ ماف‌و پشکێکی لە پادشاییدا نەبووە.

ئایا ئەوەیە تێڕوانینی مەتریالیزم (مادیە)ی نەفامی بۆ پادشایی‌و پێشەوایەتی‌و فەرمانڕەوایی‌و دەسەڵاتداریتی.

١٠- وەڵامدانەوەی پێغەمبەرەکەشیان لەسەر ئەو ناڕەزایی‌و بەرهەڵستییەیان بەوەی، کە مەرجە بنچینەیی‌و پەسندکراوەکانی پادشاو فەرمانڕەوای بۆ ڕوونکردنەوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾.

زانایانیش لەم فەرمایشتەی خوداوە، کە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی (بنو اسرائیل) هێناویەتی، پووچەڵی‌و نەشیانی (تیۆری حوکمی پشتاو پشت لە پادشایەتی‌و فەرمانڕەوایی‌و دەسەڵاتداری)دا یان سەلماندووە، بۆ نموونە ئیمام

(ڕازی) گوتوویەتی: (ئەم ئایەتە دەلالەتە لەسەر نارەوایی ئەو وتەیەی، کە دەڵێن (پێشەوایەتی پشتاو پشتەو بۆ ماوەییە))[1].

(سیوطی)یش گوتوویە: (بێگومان پێشەوایەتی تەنها میراتگرییەکی پەیوەست بە نەوەکانیماڵی پێغەمبەرو پادشا نییە، بەڵکو پەیوەستە بە مەرجەکانی زانستو هێز، کە ئەگەر لە خانەوادەیەکی فەرمانڕەواش بوو‌بێت، قەیناکاتو بۆی دەشێت، تەنانەت بۆ ئەو کارەش لەپێشترە)[2].

١١- لەپێشتر دانانی زانستێکی زیاتر لەسەر توانایەکی زیاتری جەستەیی، ئەمەش بەهۆی حیکمەتێکی نایابەوە، کە پێشەوا (الرازی) دیاریی کردووەو گوتوویەتی: (چونکە ئاکارە جوانە دەروونییەکان لەپێشترو بەڕێزترو تەواوترن لە سیفەتە جەستەییەکان)[3].

١٢- هەندێك لە زانایان ڕایان وایە، کە مەبەست لەو سیفەتو ئاکاری جەستەییە زیاترەی، کە خودا بە (طالوت)ی بەخشیوە سیفەتی زیاتری ماددییە، واتە لەڕووی باڵابەرزیو تۆکمەیی جەستەو ڕێکیو جوانیی ڕوخسارەوەیەوە، ئەمەش هیچ کەموکورییەکی تێدا نییە، بەڵام هەندێك زانا ڕای یەکلاکەرەوەیان لەسەر ئەوە دەربڕیوە گوایە مەبەست لەو سیفەتو ئاکارە زیاترە لەڕووی مەعنەوییەوەیەو زیاتر ماناکانی هێزو چاکەو ئازایەتی دەگەیەنێت. (ڕازی) گوتوویە: (مەبەست لەوە هێزە، ئەم ڕایەش لای من ڕاسترە، چونکە ئەو سیفەتەی کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن سوودبەخشە هەر هێزو زەبرە نەك باڵابەرزیو جوانیی ڕوخسار)[4].

---

١) التفسير الكبير، للرازي ٦: ١٧٣.
٢) الاكليل للسيوطي، ص (٤٥).
٣) التفسير الكبير، (١٧٤).
٤) هەمان سەرچاوە، (٦: ١٧٤).

(قرطبـی)یش گوتوویەتی: (گـوتراوە ئـەو سـیفەتە زیادەیـەی جەسـتەش لـە زۆریی سیفەتو واتا بەرزەکانی چاکەو ئازایەتی دایە نەك مەبەستی گـەورەیی‌و زەبەللاحیی لاشە بێت، ئایا ئەو هۆنراوەیەی شاعیری عـەرەب (عباسـی کـوڕی مرداس)ت نەخوێندۆتەوە، کە تێیدا گوتوویەتی:

ترى الرجل النحيـف فتزدريـه
وفي اثوابـه اسـد حصـور
ويعجبـك الطريـر فتبـتليـه
فيخلف ظنـك الرجـل الطريـر
وقد عظـم البعيـر بغيـر لـب
فلـم يسـتغن بالعظـم البعيـر"[1].

واتە: (کاتێك مرۆڤـی لـەڕو لاواز دەبینیـت بەکـەم‌و بێبایـەخی دادەنێیـت، کەچی لە بەرگی خۆیدا شێرێکی نێچیر شکێنە.. کاتێـك مرۆڤـی بـەژن ڕێـك‌و سمێڵ سووریش دەبینیت سەرنجت ڕادەکێشێت‌و پـێی سەرسـام دەبیـت، کەچـی هەر ئەم پیاوە قۆزو بەژن ڕێکەش گومانت دەگۆڕێت.. ئێ خۆ حوشتریش بـەبێ عەقڵ‌و ژیریی گەورە بوە، بەڵام بەبێ ئەوەی ئەو گەورەیییە هـەموو ئاتـاجێکی بۆ پڕ بکاتەوە).

١٣- لە هاتنەوەی سـندووقەکە بـۆ لای (بنـو اسـرائیل)، کـە فریـشتەکان بۆیـان هەڵگرتبوون بێئـەوەی بیـانبینن، موعـجیزەیـەك لـە موعجیزەکـانی خـوداو، نیشانەیەك لە نیشانەکانی بـەدی دەکرێـت.. خـودا هـەر خۆیـشی کـارگوزارو سەربازانی دەناسێت: ﴿...وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ... (٣١)﴾ المدثر.. ئـەم

---

١) تفسیـر القرطبـي (٣: ٢٤٦).

فەرمانە خوداییە نائاساییو لە عەقڵ بەدەرەش وەك موعجیزەیەك بۆ ئەو پێغەمبەرە ئەنجام دراوە، کە هەواڵی پێدان ئەوا خودا (طالوت)ی کردووە بە پادشاتان.. دیارە ئەم فەرمانەش ڕێزو کەرامەتێکە لە خوداوە بۆ ئەو پادشا چاكو جیهادکارە (واتە بۆ طالوت).. هەروەها پشتگیرییەکی خودایە بۆی لەڕێی ئەو بەڵگەو نیشانە ڕۆشنەوەی، کە دەلالەتە لەسەر ئەوەی بێگومان خودا شوێنکەوتوانو سەربازانی خۆی سەردەخاتو بەرگرییان لێ دەکاتو، چەندین ئایەتو کەرامەتو ڕێزی وایان بۆ بەدی دێنێت، کە (هەندێك جار) وا لە خەڵکی دەکەن پشتگیرییان بکەن.

١٤- (طالوت) کاتێك ڕێی نەداوە بەگەلەکەی تا لەئاوی ئەو ڕووبارە بخۆنەوە، کە پێیدا تێپەڕیون سەرەڕای ئەوەی لە بنەڕەتدا ئاو خواردنەوەکە حەڵاڵو ڕێ پێدراوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، هەندێك جار ئەمیر، یان حاکم بۆی دەشێت، کە شتێکی حەڵاڵو ڕێپێدراو بۆ ماوەیەك ڕاگرێتو ڕێ بە خەڵکی ژێر دەسەڵاتی خۆی یان ڕێ بە چەند کەسێکی دیاریکراو نەدات، کە ئەو شتە ڕەوایە بەکاربێنن. دیارە ئەو بەم کردارە (ڕەوا) نارەوا ناکات، چونکە حەرام کردنو حەڵاڵکردن تەنها مافی خودا خۆیەتیو هیچ کەسێك لە ئادەمیزاد مافی حەڵاڵو حەرام کردنو یاسادانانی نییە. بەڵام مافی کۆتو پێوەندکردنی (ڕەوا)ی لە هەندێك جاردا هەیەو لە هەندێك جاری تردا مافی قەدەغەکردنیشی هەیە، ئەمەش بۆ ڕێکخستنی بارودۆخی ژیانی ئەو ڕۆژگارەو بۆ پەروەردەکردنی دڵو دەروونی خەڵکی.. بۆیە گوێڕایەڵیکردنی فەرماندەو ئەمیر لەو قەدەغەکردنەدا، یان لەو ڕاگرتنو کۆتکردنی (ڕەوا)یەدا، بەپێی شەرع لەسەر خەڵکی فەرزەو، سەرپێچی لێکردنیشی بەپێی شەرع حەرامە، وەك لە دەقی چەند ئایەتو فەرمودەیەکیشدا هاتووە.

١٥- ئاماژەو دەلالەتێك هەیە لەڕێگرتنی (طالوت) لە سوپاکەی، کە لە

ڕووبارەکە ئاو نەخۆنەوە، تەنها ئەوە نەبێت، کە ڕێی دان هەریەکەیان پڕ چنگێ ئاو بخواتەوە، لەم ڕێگرتنەشدا ئەو دەلالەتو ئاماژەیە ئەوەیە: ئەو ئەرکی زیاد لە تواناو وزەی خۆیانی پێ نەسپاردوون، بەڵکو بەپێی توانایان بووە، پاشان ئەو ستەمی لە ڕاسپاردنیان بەو ئەرکەدا لێ نەکردوونو هەموو دەروازەو ڕێچکەیەکیشی لێ دانەخستوون، بەڵکو تەنها لە شتێك ڕێی لێ گرتوونو، شتێکی تریشی بۆ ڕەوانەکردون.. لەم ئەرك پێ سپاردنەشدا (ژیریو دانایيو، شارەزاییی لە دڵو دەروونەکانو زانینی چۆنیەتی پەروەردەکردنی کەسانی دیو، چۆنیەتی سەرکردایەتی کردنیشیان) ڕەنگ دەداتەوە.. چونکە ئەو بێگومان (خواردنەوە لە ئاوی ڕووبارەکە)ی لێ قەدەغە کردوون.. خواردنەوەش (شرب) ئەوەیە مرۆڤ سەر بنێت بە ئاوەکەوەو تێر تێری لێ بخواتەوەو بەبێ هیچ ئامرازو قاپێك دەمی پێوە نێتو ڕاستەوخۆ بەدەم بیخواتەوە. واتە (طالوت) ئەم جۆرە خواردنەوەیەی لێ قەدەغە کردنو تەنها ڕێی ئەوەی دان، کە یەك جار بەدەستو (بەچنگ) لێی بخۆنەوە، ئەو بڕە ئاوەکەی پڕ چنگیش تەنها بۆ ئەوەیە، کە تێنوێتییان پێ بشکێننو نارەحەتیان نەهێڵێت.

١٦- سەرنجێکی جوانو نایابی تریش لەو وتەیەیدا بەدیار خراوە ﴿ وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ ﴾ هەر کەسێك تامی ئاوەکە نەچێژێت ئەوە بێگومان لەمنەو لە سوپای من دایە).. داخۆ ڕازو نهێنیی گوزارشت لە (خواردنەوەی ئاو بەتام کردنەوە) چی بێت؟ بۆچی لە گوزارشتی ئاو خواردنەوە (شرب)یش لای داوە بۆ (تامو چێژکردنی)؟ (راغبي اصفهاني) لەبارەی مانای تامو چێژ (طعم)ەوە گوتوویەتی: (طعم)، واتە: خواردنی خۆراك، لەهەر بەشێکی خۆراکیش بخورێت بە (طعم و طعام) ناودەبرێت، بێگومان بۆ چێژ وەرگرتن لە ئاو خواردنەوەش بەکاردێت، وەك لەو وتەیەی پادشاکەدا هاتووە: ﴿ وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُۥ

مِنِّيٓ ﴾[1]، هەروەها وەك لەو فەرمایشتەی خوداش دا هاتووە، کە فەرموویەتی:

﴿ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟ إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ... (٩٣) المائدة ﴾، ئەم ئایەتە دەربارەی چەند هاوەڵێك (صحابە) هاتۆتە خوارەوە، کە لەپێش حەرام کردنی مەیدا خواردوویانەتەوەو لەپێش ئەوەشدا مردوونو، ئینجا برایانی دوای خۆیان پرسیاریان لەمەڕ چارەنووسی دوای حەرام بوونەکە دەکرد، کە داخۆ تۆ بڵێی خودا سزایان بدات؟ ئەوەبوو دەیانگوت: خودا چی لەو برایانەمان دەکات، کە پێش حەرام کردنی (مەی مردوون، کە ئەو مەیە لەسکیاندا بووەو، ئایا سزا دەدرێن)؟ ئەم ئایەتەش گوناەو تاوانەکەی سڕیونەتەوەو لەسەری لابردوونو بە گوازارشتی تام کردن (طعم) هاتووە (فِيمَا طَعِمُوٓا۟ )، واتە: (ئەو کەسانە هیچ گوناهێکیان لەسەر نەماوە، کە باوەڕیان هێناوەو کاری چاکیان کردووەو پاشان مردوون، گوناهی ئەو مەیەی تامیان چەشتووە لەسەریان نەماوە ئەگەر پێش حەرام کردنەکە خواردبێتیانەوە)[2].. دیارە ئەوانەش، کە لەژیاندا ماونو لەوەو پێش تامیان کردووەو خواردوویانەتەوەو دوایی باوەڕیان هێناوەو چاکەیان کردووەو تۆبەیان کردووە، خودا لێیان دەبووڕێت، مەبەست لە وشەی (طعم) تام کردنە وەك لە ئایەتەکەی تایبەت بە چیرۆکی (طالوت)دا هاتبوو، بەمانای هەر کەسێك تامی ئاوەکە نەچێژێت ئەوە لەمنە، تەنها ئەوەندە نەبێت، کە پڕ چنگی دەستێکی لێی بخواتەوە، بەڵام بۆچی لە دەربڕینی خواردنەوە بۆ چێژکردن لای داوە؟

---

١) (المفردات)، ص-٣٠٤.

٢) بۆ نموونە- بڕوانە (الدر المنثور ٣: ١٧٣).

(قرطبـــي) گوتوویە: (نـەیگوتووە، هــەر کــەس نەیخواتــەوە (مــن لم یـشربه)، چونکە لە نەریتو عادەتی عەرەبەکانیشدا وایە ئەگەر شتێکیان لە ڕستـەیەکدا دووبارە کردبێتەوە بە بێژە (لفظ)ێکـی دی گوتوویانەتــەوە، زمــانی قورئــانیش ڕەوانتــرین زمانە)[1].

بەڵام (رازی) لەمبارەیەوە دوو لێکدانەوەی نایابی هەیە:-

"یەکەمیان: ئەگەر مرۆڤ زۆرتینـووی بێـتو پاشــان ئـاو بخواتــەوەو، بیــەوێت وەسفی ئەو ئاوە بە خۆشو تامدار دەربڕێت، دەڵێت: (بەڕاستی ئــەم ئــاوە وەك هەنگوینە)، واتە بەتامە هەرە شیرینو خۆشــەکان وەســفی دەکــات..

وتەی ئەو پادشـایەش (وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ ) بــەمانای (ئەگەرچـی تێنـوێتیی هێندەی بۆ هێنابن، کە ئاوەکە لەدەمیاندا وەك ئەو خۆراکە وەســف کــراوە شـیــرینانەش بێت ئەوا هەر پێویــستە خــۆی لــێ بپــارێزنو فەرمانەکـەی نەشکێنن).

دووەمیان: هەر کەسێك ئاو بکاتە دەمیەوەو لەدەمیدا ڕایبــاتو پاشــان فــڕێی بداتــە دەرەوە ئــەوە شــایەتیی لەســـەر دەدرێــت، کــە تــامیی کــردووەو چەشتوویەتیو، بەڵام وای بــۆ دانانرێــت، کــە خواردبێتیــەوە، جــا کاتێــك (طـــالوت) گوتوویـــەتی ﴿وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ ﴾ ئــەو ڕێ لێگرتنـــەی بـــۆ نەخواردنەوەو بۆ لــەدەم داڕادان بــووە، ئاشکراشــە ئــەم فەرمانــە گــرانترە چونکە هەر کەسێك ئاو بخواتەوەو پێش خواردنەوەکە لەدەمیدا ڕای بــدات هەست بەجۆرێك لە نەخۆشیو حەوانەوە دەکات"[2].

---

١) (الجامع لاحكام القران ٣: ٢٥٣).

٢) (التفسير الكبير للرازی ٦: ١٨١).

(راغب-ی اصفهانی)یش لێکدانەوەیەکی لەمبارەیەوە هەیەو گوتوویەتی:
((طالوت) لەو فەرمانەیدا ﴿وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ﴾هۆشداریی داوە کە قەدەغەیە دەمی بۆ بەرن تەنها پڕ چنگێك نەبێت بە خۆراکێکەوە، هەروەك ئەوەی قەدەغە بووە بیخۆنەوە تەنها بەچنگێك نەبێت، چونکە ئاو ئەگەر لەگەڵ شتێکی وەك خۆراکدا، کە بەدان بجورێت تامێکی دەبێت (واتە ئاوەکە تامدار دەبێت) ئەگەر لەگەڵ خۆراکێکدا بخورێت، خۆ ئەگەر (طالوت) بیگوتبایە: (هەر کەسێك نەیخواتەوە) (ومن لم يشربه) ئەوا شیاوبوونی خواردنەوەی پێویست دەبوو ئەگەر لەگەڵخۆراکێك یان شتێکی تردا بوایە، دەنا بەهیچ کلۆجێك خواردنەوەی ناشێت، تەنها بە ئەندازەیەکی لێدەرخراوی وەك پڕ چنگی دەستێك نەبێت"[١].
لەوانەیە (هەندێك جار، یان لە هەندێك ناوچەدا) ئاوەکە خۆراکاوی بێتو لەوانەشە (ئاو خۆرەوەکە) وا لێبکات پێویستیی بە خۆراك (تا ماوەیەك) نەمێنێت، ئەگەر جگە لە ئاو هیچ شتێکی تری شك نەدەبرد، ئیدی لەو حاڵەتەدا ئاوەکە جێی خواردنەوەو خۆراکیشی بۆ دەگرێت.. هەمان رووداو تووشی هاوەڵی بەرێز (ابو ذري- غفاري) ﷺ بووە لە کاتی گەڕانی بەدوای پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئەوەبوو کافرەکان لەلای کەعبەدا لێیاندابوو، ئەویش لەدەستیان هەڵاتبوو لەلای ئاوی زمزم خۆی حەشار دابووو ماوەی مانگێك لە حەشارگەکەیدا مابووەوەو هەر لەسەر ئاوی زمزمو بەو ئاوە دەژیاو، جێی خۆراكو خواردنەوەی بۆ گرتبۆوە، وەك (مسلم)یش گێڕاوێتییەوە، کە (ابو ذر) دەربارەی بەسەرهاتی موسڵمانبوونی خۆیو، کاتێك پێغەمبەری خودا چو بۆ لایو لێی پرسیوە: (لە کەیەوە لێرەیت؟) ئەویش گوتوویە: (من سی شەوو سی رۆژە لێرەم)، لێی پرسیوە (ئەی کێ خۆراکی پێداویت؟) گوتوویەتی: (هیچ

---

١) (المفردات)ی راغب – ص (٣٠٤).

خۆراکێکم نەبووە، تەنها ئاوی زمزم نەبێت، هەر بەوەش قەڵەو بووم، هەتا گۆشتو ماسوولکەکانی سکیشم زیاتر کشاون، ئیتر لەسەر جگەریشم هەست بە لاوازیی‌و کەم‌وکوڕیی برسێتییەك ناکەم)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (بێگومان ئەم ئاوە بەپیت‌و بەرەکەتە، ئەمە خۆراکی تێرکردن‌و چێژ پێدانیشە)[1].

کەوابوو لەو وتەیەی (طالوت)دا ﴿وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ﴾ دەرچوونە لە خواردنەوەوە بۆ خواردن، ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

یەکەمیان: چونکە ئاوەکە جێی خۆراکیش دەگرێتەوە بۆ ئەو کەسەی، کە جگە لە ئاو هیچ خۆراکێکی دەست ناکەوێت..

دووەمیش: چونکە مرۆڤی تینوو هەست بەو ڕاستییە دەکات‌و نەفسی خۆی ئاراستەی بۆ دەکات –والله أعلم-

بۆیە (طالوت)یش ڕێگەی بەکارهێنانی ئاوەکەی لێگرتوون، سا ئیتر بۆ خواردنەوە، یان بۆ چێژ لێوەرگرتنی وەك خۆراك، خواردنیش بوویێت تەنهاو تەنها پڕ چنگێك نەبێت (تاکو تێنوێتییە زۆرەکەیان بشکێنێت‌و دەمیشیان تەڕ بکات).

١٧- لە وتەی پادشاکەدا ﴿إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦ﴾.. لەم وتەیەدا (طالوت) ڕێگەی بەسوپاکەیداوە، کە لوێچێك لە ئاوی ڕووبارەکە بخواتەوە. لەمەشدا زیرەکی‌و هۆشمەندیی (طالوت) دەردەکەوێت، چونکە ئەو ڕێی خواردنەوە لە ڕووبارەکەی لێگرتوون، بەڵام زیاتر ئاتاجیان پێیەتی، ئەویش بەو بڕە ئاوەی پڕ چنگێك بەهانایانەوە هاتووەو پێویستییەکەی بۆ پڕ کردوونەتەوە.

---

١) مسلم، کتاب فضائل الصحابة:٤٤ باب من فضائل ابي ذر رقم (٢٨) حديث رقم ٢٤٧٣.

چونکە ئەو کەسەی ڕێ بەکارێك دەدات، یان ڕێی لێ دەگرێت، دەبێت ئاگاداریی پێویستییەکانی ئەوانە بێت، کە لەگەڵیدانو تێبینیی لایەنی دڵو دەروونیان بکاتو، بەشێوەیەکی بابەتیانەو واقیعییانەو بەنەرمو نیانی ئەرکو فەرمانەکانیان پێ ڕاسپێرێت. (جا ئەگەر دەتەوێت گوێڕایەڵیت بکرێت، بەپێی توانای خەڵکی داواکارییان لێ بکە. هەروەها لەو ڕێگرتنی ئاو خواردنەوەیە لە ڕووبارەکەو لەڕێ پێدانی چنگە ئاوێکدا، سوودێکی تەندروستیش بەدیی دەکرێت، چونکە ئەو کەسەی زۆر زۆر تینوویەتیو، تەنگانەی تێنوێتیی زۆریی بۆ هێناوە، ئەگەر لەو حاڵەتەدا کتو پڕ ئاوێکی زۆر بخواتەوە، ئەوە بێگومان زیانو ئازارێکی زۆری پێ دەگەیەنێت، بەتایبەتیش ئەگەر تینوێتییەکە بەهۆی کارێکی سەختەوە، یان وزە خەرج کردنێکی زۆرەوە بێت، وەك ڕاکردن، یان گەشتو سەفەری درێژ، یان هەڵگرتنی بارێك.

لەبەرئەوە ئەم جۆرە کەسانە دەبێت دوای ئەو کارە سەختانە، نەختێك پشوو بدەنو پاشان بەچەند جارێك یەك لە دوای یەك لە جامە ئاوەکەیان بخۆنەوە.

سەبارەت بە وشەی چنگە ئاو (غرفة)ش (راغب-ی اصفهاني) گوتوویەتی: (الغرف: واتە هەڵگرتنی شتێكو بەکارهێنانی، بۆ نموونە دەگوترێت: (غرفت الماء والمرق) واتە: ئاوو شلەکەم بەدەست هەڵگرت، وشەی (غرفة)ش ئەوەیە، کە دەکرێت بە خانەیەك، وشەی (غرفە)ش بۆ (یەك جارە). وشەی (مغرفة)ش بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانیەتی"[1]..

(طالوت)یش مەبەستی کەمکردنەوە بووە کاتێك ڕێی داون، کە تەنها یەك جار بەدەست لە ئاوی ڕووبارەکە بەکاربێنن، چونکە (غرفة) ئەو نەختە کەمەیە، کە بە چنگ وەردەگیرێت.

---

١) المفردات: ٣٦٠.

١٨- لەو فەرمایشتەی تری خوادا ﴿فَشَرِبُوا۟ مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ﴾، (ئەوان لە ئاوەکەیان خواردەوە، تەنها ژمارەیەکی کەمیان نەبێت)، لەم فەرمایشتەدا بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەوەی، کە زۆربەیان سەرپێچییان لە فەرمانەکە کردووەو لە ئاوی ڕووبارەکەیان خواردۆتەوەو ژمارەیەکی کەمیان لەسەر فەرمانەکە خۆڕاگربوون.. واش دیارە ئەوان حەزو ئارەزوویان لە سەرپێچیکردنەکە هەبووە تاکو لە ڕۆیشتن بۆ کوشتار بەردەوام نەبن..

ئیمامی (رازی) ئاوڕێکی لەم ئاماژە دەروونییە داوەتەوەو گوتوویەتی: (ئەوان کاتێك زانیویانە، کە هەر کەسێك تێر لە ئاوی ڕووبارەکە بخواتەوە ڕێگەی بەشداریی کردنی جەنگو کوشتاری پێ نادرێتو لە دڵیشیاندا ڕقێکی توندیان لەو جەنگە هەبوو. هەر دەبوایە ئەو ئاواتی سەرپێچیو ئاو خواردنەوەشیان ئەنجام بدایە تاکو بەو ڕەنگە دۆست لە دوژمن جیابکرێتەوەو، گوێڕایەڵیش لە یاخی جیابکرێتەوە)[1].

١٩- کەمکردنەوە (تقلیل) لە ئایەتەکانی ئەم چیرۆکەدا مەبەستدارەو، سێ جار دیاریکراوە، وەك:

(أ) لە فەرمایشتەکەی خودا﴿... فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟ إِلَّا قَلِيلًا ... ﴿٢٤٦﴾ البقرة﴾ (کاتێك جەنگیشیان لەسەر نووسرا- کە داوایان دەکرد- ژمارەیەکی کەمیان نەبێت زۆربەیان ڕوویان لێ وەرگێڕا).

(ب) لە فەرمایشتەکەی خوادا ﴿فَشَرِبُوا۟ مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ﴾ (ژمارەیەکی کەمیان نەبێت، زۆربەیان لە ئاوەکەیان خواردەوەو سەرپێچی فەرمانەکەیان کرد).

---

١) (التفسیر الکبیر)ی –رازی- ٦: ١٨٢.

(ج) لــە فەرمایــشتەکەی خــوادا﴿... كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ ٱللَّهِ ... ﴿٢٤٩﴾ البقرة﴾، (ئای چەند کۆمەڵی کەمی باوەڕدار، چەندین کۆمەڵی زۆریان بەیارمەتی خودا بەزاندوە).

لێرەدا سێ جار ژمارەی کەمی دیاریکردووە، تا دەلالەتو بەڵگـەبن لەســەر پاڵاوتنی هەرە باشەکانی نێو گەلەکەو، لەهەر جارێکیــشیاندا ژمارەیـەکی زۆر دواکەوتوونو سەرپێچییان کردووەو، تەنها ژمارەیەکی کەم ماونەتەوە.

٢٠- گومان (ظـن) لەم فەرمایشتەدا: (قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ) دوو مانا هەڵدەگرێت:

(أ) دەشێت مانای دڵنیایی تەواو بگەیەنێت، بەو مانایەی ئەوان دڵنیـابوون لـە گەیشتنەوەو گەڕانەوەیان بۆ لای خودا، بەڵام بۆ —مەجازو مانای تێپـەڕتر- بێژەی گومان (لفظ الظـن)ی لەسەر دڵنیابوون (يقين) بۆ دانـراوە لەبـەر ئـەم حاڵەتی لەیەکچوونەی، کە لەنێوان گومانو دڵنیاییدا (بۆ جەخت کردنە سەر بیرو بڕوابوون) هەیە.

(ب) دەشێت گومانەکە لەسەر ڕواڵەتی ماناکەی خۆی بــمێنێتو، مانـای ئـەو گومانکردنە بگەیەنێت، کە بەلای یەکلاکاریدا دەیشکێنێتەوە، بـەڵام چـۆن گومان لە بەدیدار گەیشتنی خـوادا دەکـەن، لـە کاتێکـدا خۆیـان پاڵاوتـەو دەســتەبژێری نێــو خــەڵکیو پوختــەی پوختەکــەن؟ هــەروەها دیــارترینی کەسانێك، کە باوەڕی گــەورەیان هەیــە, مەبەسـت لـە بەدیـدار گەیـشتنی خوداش زیندووبونەوەی دوای مردن نییە, یان بــەدیهاتنی بــەڵێنی خــودایی, چونکە لای ئەوان ئەمە باوەڕی تەواو و یەقینێکییانە، کە هــیچ گومـانێکی تێدانییە. بەڵکو مەبەست لەم کوژرانیانــە لەگــەڵ (طـالوت) لەســەر زەویو مەیدانی جەنگەکەدا، ئەمەش گومانێکی یەکلاکراوەیانە، بەڵام یــەقینێکی

ڕەهاو بنەبڕ (قاطع) نییە, چونکە لەوانەیە مرۆڤی جیهادکـار لـە مەیـدانی جەنگدا بکوژرێت‌و بـمرێت, لەوانەشە تەمەنی، تا ماوەیەکی تر درێژتربێت.

(ئیمامی ڕازی) لەبارەی ئەم ئەگەرەوە گوتویەتی: "کاتێـك خۆیـان دانـا بـۆ کوژران، ئەوە لەبازنەی گومانیاندا جێگیـربوو، کە لە مردن دەرباز نـابن, ئـەوا بەڕاستی‌و بێگومـان لەبارەیانـەوە فەرمایـشتەکە واهـاتووە، کـە ﴿يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَـٰقُواْ ٱللَّهِ﴾" [1].

هەر لەسەر ئەم مانایە (قرطبـی)یش گوتوویەتی: (دەشێت ئەوە گومان بێـت نەك زانین، بەمانای ئەوانەی لەو بـیرو خەیاڵـەدا بـوون، کـە خۆیـشیان لەگـەڵ (طالوت)دا دەکوژرێن‌و بە شەهیدیی‌و وەك چـەند شـەهیدێك بـەخودا دەگـەن، ئیدی گومانەکە لەسەر کوشتنەکەیان پەیدابووە) [2].

٢١- نـزای کەمینـەی بـاوەڕدار ﴿...قَالُواْ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ البقرة﴾، هـەر تـەنها تایبەت بەخۆیان نییە، بەڵکو دەشێت گشت تـاقمێکی بـاوەڕداری جیهادکـاری بەئارام، کە ڕووبەڕووی دوژمنانیان دەوەستن، ئـەم نزایـە بکـەن. هـەر بۆیـەش (سیوطي) گوتوویەتی: (لەمەوە دەردەکەوێت، کە ئەم نزاکردنە لەکاتی جەنگ‌و کوشتاردا کردارێکی خۆشویستراوە (مستحبه)) [3]. بـەمانای ئـەم نزایـە فـەرز نییە، بەڵکو لە پلەی حەز لێکردن‌و خۆشویستراوی دایە.

---

١) (التفسیر الكبیـر)ی (الرازی)، (٦: ١٨٤).

٢) تفسیر القرطبـي (٣: ٢٥٥).

٣) (الاكليل)-ی سیوطي. ص(٤٥).

له ڕێکخستنی هەر سێ بڕگەکەی ئەم نزایەدا: (ئارام گـرتن)و (جێگیربـوونی پێکان له بەرەی کوشتاردا)و (سەرکەوتن)دا، دیاردەیەکی سـەرنجڕاکێش هەیـەو هەر بڕگەیەکیش لەسەر ئەوەی پێش خۆی بنیـاتنراوەو بەشـێوە ڕێکخـستنێکی قۆناغبەندی (مرحلي) ڕێکخراوە، چونکە لەکاتی بەرەنگاربوونەوەی دوژمناندا، یەکـەم جـار مرۆڤـی جیهادکـار پێویـستیی بـە (ئـارام گرتنـە بـە چـەمکە هەمەلایەنییەکـەی‌و مەیدانـە هەمەچەشـنەکانییەوە، جێگیربـوونی پێکـان‌و نەفیش تەنها بەئارام گرتن دەبێت. ئیدی ئەگـەر هـەردوو پـێی موجاهیـد لـە شوێنی جیهاددا جێگیر بـوو، ئـەوا ئـەو موجاهیـدەش لـە جەنگـدا ئامـادەی خۆبەختکردن‌و گیانبازی دەبێت‌و بەوەش داوای سەرکەوتن لـە خـوداوە بەسـەر دوژمناندا دەکات. هـەر لـەو نزایەشـدا گرنگیـی حاڵـەتی دەروونـی‌و لایـەنی مـەعنەویش بەدیار خراوە، خراوەتە پێش حاڵەتی دەرەکیـی ماددەگەراییـەوە، هەر بۆیەش ئارام گرتنەکەی خستۆتە پێش جەنگەکەوەو، پـێش جێگیـربوونی پێیەکان تێیدا، لەنێوان هەردوو هەڵوێستەکەشدا (خواردنەوەی پـڕ چـنگێك لـە ئاوی ڕووبارەکە)و تیر لێ خواردنـەوەو بـەکارهێنانی تـەواوی) پێـك گەیانـدن‌و ڕێکخستنیان لەنێواندا بەدی دەکەین لەکاتێکدا ئـەوان داوای ئـەوەیان لـەخودا دەکرد، کە ئارامییان بەسەرداببێنێت تاکو هـەموان لـەژێر بـاڵی سـێبەرەکەیدا بەهرەمەند بوونایە. لەوانەشە لەمەدا ئاماژەیەکی دی هەبێت لەسەر ئەوەی کە: (هەرکەسێك بەسەر دنیاو پێویستییەکانیدا زاڵ بێت‌و خۆشی‌و تـام‌و چـێژەکانی دنیا نەیکەنە بەندەی خۆی‌و لەپێناوی خوادا ڕێگە لە دەروونی خۆیشی بگرێت‌و نەهێڵێت چێژ لە هەندێك کەرەسەو شتە ڕێ پێدراوەکانی دنیا وەربگرێت، ئـەوا خـوداش قـەرەبووی ئـەوەی بـۆ دەکاتـەوەو کۆمـەك‌و یارمـەتیی خـۆی پـێ دەگەیەنێت.. ئـەوەتا ئـەو کەمینـە بـاوەڕدارە خۆیـان لـە خواردنـەوەی ئـاوی ڕووبارەکە گرتۆتەوەو، بەم ڕەنگە بەسـەر دنیـاو شـتە ڕێ پێدراوەکانیـشیدا زاڵ

بوون. خوداش ئەو ئارامییەی بۆ قەرەبوو کردوونەوەو ئارامیی پێ بەخشیون و بەسەریاندا ڕژاندویێتی.

٢٢- دەرکەوتنی (داود) لەنێو سوپا موجاهیدەکەو، لە مەیدانی جەنگەوە کاری خۆی دەست پێکردووەو لە ڕێگەی سەرکردایەتیو پادشایەتیو حیکمەتو بەرپرسیارێتییەوە پلەو پایەی بەرزبۆتەوە. لەمەشدا ئاماژەیەك هەیە بۆ ئەوەی، کە هەر کارکردنە فەرمانەدەکانی پێ دەردەکەوێت، مەیدانەکەش بەهرەکان دەردەخات.. ئەوەبوو (طالوت)و (داود) لە ناوەڕاستی خەڵکەکەوە دەرکەوتنو پێش ئەوانیش مەیدانو کارکردنو واقیع بۆ خەڵکی پیشان دراوە.. ئەمەش بێگومان ڕێگای دۆزینەوەو ناسینی سەرکردە شایستەکانە. هەر ئەو سەرکردانەش سەرکردایەتیی نەتەوەی ئیسلامی بۆ ڕێگای سەرکەوتنو بالادەستی دەکەن.

# کۆتایی

لێرەدا کۆتایی بە باسی ئەم چەند چیرۆکە لە چیرۆکەکانی (بنو اسرائیل) لە قورئاندا، دێنین، دیارە ئێمە باسی هەموو چیرۆکەکانیانمان نەکردووە، چونکە ئەمە لە مەبەستی نێو ئەم کتێبەماندا نییە، بێگومان لەم کتێبەدا حەوت چیرۆکمان باس کرد، کە ئەمانەبوون:-

١- چیرۆکی دایکی موسا- سلاوی لێ بێت-و ئەو ڕووداوانەی، کە لەدوای هاتنەدنیای موسا بەسەریاهاتو، کە چۆن خودا بۆی پاراستو، کاروبارو ڕەوتی ڕووداوەکانیشی وەها بۆ ڕێکخست، کە لەژێر چاودێریی خۆی دابوو، هەر خودا خۆیشی سەرپەرشتیی دەکردو، پاشان تەرخانکردنی ڕۆڵی دایکیو خوشکەکەیو فیرعەونو هاوسەرەکەی فیرعەون لە سەرپەرشتیی ئەو ئەرکەدا.

٢- چیرۆکی پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی فیرعەونو ئەو ئەرکانەی لە دەرخستنی باوەڕەکەیدا پیشانی داوەو، چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی فیرعەونو بانگەوازکردن بۆ شوێنکەوتنی (موسا) - سلاوی خودای لێ بێت - ئەوەی هانیداین، کە ئەم بەسەرهاتەش بخەینە نێو چیرۆکەکانی بەنوئیسرائیلەوە، سەرەڕای ئەوەی کابراکە لە خێڵی فیرعەونیش بوو، ئەوەیە شوێنکەوتووی (موسا) بووەو چۆتە نێو ئاینەکەیەوەو خۆی لە گەلەکەی بەریو بێتاوان کردووە.

٣- چیرۆکی قارون، کە لە هۆزەکەی (موسا) بووەو، بەڵام بە ماڵو سامانی خۆی فریودراوەو لە زوڵمو ستەمدا بەکاری هێناوەو، کە ئەوەش بووەتە هۆی لەناوچوونی.

٤- چیرۆکی وێڵ بوونی (بنو اسرائیل) لە بیابانی (سینا)دا، کاتێك فەرمانەکەی موسایان ڕەتکردەوە، کە داوای لێکردن بە جیهادو کوشتار بچنە خاکە پیرۆزەکەوەو کەسەرکەوتنی لەلایەن خوداشەوە بۆ مسۆگەر کردبوون. ئەوە بوو

خوداش لەسەر ئەو یاخی بوونو فەرمان شکاندنەیان بە وێڵ بوونی نێو بیابان سزای دانو، ئاوارەبوونی بۆ نووسینو بێبەشیی کردن لە پلەی بەرزی جیهادو لە بەخششی رزگاریو لە نیعمەتی چوونە نێو خاکی پیرۆزەوە.

٥- چیرۆکی مانگاکەی (بنو اسرائیلو) دەلالەتکردنو بەڵگەبوونی ئەو چیرۆکە لەسەر سرووشتو خوونەریتیانو، چۆنیەتی ڕوانینیان بۆ حوکمو فەرمانەکانی خودای پەروەردگاریانو، چۆنیەتی سەوداومامەڵەیان لەگەڵ پێغەمبەری خۆیان (موسا)دا - سڵاوی خودای لێ بێت -.

٦- چیرۆکی (خەڵکانی ڕۆژی شەممە)و دابەش بوونی ئەو خەڵکەی ئەوسای (بنو اسرائیل) بەسەر سێ جۆرە ئومەت (نەتەوە)دا، کە (سنوور بەزێنانی فەرمانی خودا)و (چاکە خوازانو ڕێگرانی خراپە)و (بێدەنگبوانو بێهەڵوێستان) بوون، پاشان ناشیرین کردنی ڕوخسارو ڕەنگو ڕووی سنوور بەزێنانو یاخییەکان بەچەند مەیموونێکی ڕیسواو سەرگەردان کراوو، ڕزگاربوونی چاکەخوازو بانگەوازەکانو، بێدەنگ بوونی قورئان لە چارەنووسی بێدەنگبوان.

٧- چیرۆکی (طالووت)، کە وەك پادشایەکی دادپەروەرو، سەرکردەیەکی لێهاتووو، جەنگاوەرێکی موجاهید، بۆلای (بنو اسرائیل) هاتووەو لەو واقیعە خراپەیان ڕزگاری کردوونو، دۆخی سەرشۆڕییانی بە سەربەرزی بۆ گۆڕیونو حاڵەتی بەزینیشیانی بە سەرکەوتن بۆ گۆڕیون، ئینجا خوداش سەرکەوتنی بۆ (طالووت)و ئەو کەمینە باوەڕدارەی لەگەڵیدا مابوون بەسەر دوژمنانیاندا بۆ نووسیون، کە (جالوت)و گەلەکەی بوون.

وەك تێبینییش دەکەین ئەم حەوت چیرۆکە کەوا هێناومانن، پێنجیان لە سەردەمی (موسا)ی پێغەمبەریانو ڕزگارکاریان دابووە، کە هەر پێنج چیرۆکەکەی هەوەڵی کتێبەکەن.

ئێمە هەموو چیرۆکەکانی (موسا)مان لەگەڵ (بنواسرائیل)دا باس نەکردووە، چونکە بۆ نموونە چیرۆکی موسا هەیە لەگەڵ ئەو سیحربازانەی کە باوەڕیان پێهێنا. وەك لە سوورەتەکانی (الاعراف)و (طه) و(الشعراء)دا باسکراوە.

هەروەها بۆ نموونە چیرۆکی موسا لەگەڵ (بنو اسرائیل) لەپێش دەرچوونیان لە (میسر)و بەرهەڵستیکردنی (بنو اسرائیل) لەسەر ئەوەو پاشان ڕێنماییکردنیان لەلایەن موساوە لەسەر ئارام گرتنو جێگربوون، وەك لە سوورەتەکانی (الاعراف)و (یوسف)دا هاتووە.

هەمدیسان چیرۆکی (موسا) - سلاوی لێ بێت - لەگەڵ ئەو گەلەی (بنو اسرائیل)دا، کاتێك لە دەریاکە دەرچوون بەیارمەتی خوداو، داوایان لە موساش کرد، کە بتێکیان بۆ دابنێت تابیپەرستن، چونکە گەلێکیان دیبوو، کە بتیان دەپەرست، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتووە.

پاشان چیرۆکی ئەو گەلەی (بنو اسرائیل) لەگەڵ (موسا)دا، کاتێك خودا بە فەزڵو بەخششی خۆی باڵندەی شەلاقە (سلوی)و گەزۆی بۆ ناردنو کانیاوەکانیشی بۆ تەقاندنەوەو داواکاریی ئەوانیش لەموسا، کە لە خودا داواکات هەر یەك خۆراکیان بۆ نەنێرێت، بەڵکو لە ڕووەکی پاقلەیی‌و خەیارو سیرو نیسكو پیازیشیان لە زەوییەوە بۆ فەراهەم بێنێت، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا هاتووە، هەروەها چیرۆكو بەسەرهاتیان لەگەڵ (سامیری)و گوێرەکە ئاڵتونەکەی، کە لێیان بزر بوو، سزای خوداش لەسەریان بەهۆی پەرستنی گوێرەکەوە، وەك لە سوورەتەکانی (بقرة، طه، الأعراف)دا هاتووە.

هەروەها چیرۆکی (بنو سرائیل) لەگەڵ موسا کاتێك بە (شتێکی جەستەیی) خەتاباریان کردو، بەهۆی ئەو شەرمو حەیاو خۆپارێزییەوەش ئازاریان دابوو، کە خوداش بەرگری لێکردو، بە کراسەکەیەوە لە ژوورەوەکە دەرچووە، تاکو ڕاستیی مەسەلەکەیان بۆ بسەلمێتو لێی ئاگاداربن.

ئەمە جگە لە چەندین چیرۆکی تر.. ئێمەش چیرۆکەکانی (بنو اسرائیل) لەگەل پێغەمبەرانی دواتریان، وەك (داود)و (سولەیمان)و (زەکەرییا)و (یەحیاو عیسا)شدا باس نەکردووە – سلاوی خودایان لیٚ بێت- بەلاّم (إن شاء الله) ماوەمان هەبێت لە لێکۆلێنەوەیەکی (لەمەودوامان لەسەر چیرۆکە قورئانییەکان)دا دەگەڕێینەوە سەریان.

بەلاّم هەلوێستەیەکی ترمان لەگەلّ چەند چیرۆکێکی پێشینەکان لە قورئاندا ماوە، کە ئەوانیش چیرۆکی غەیری پێغەمبەرانن و، بەلێنی بەرهەمهێنانی لێکۆلێنەوەیەکی تر دەدەین، کە لە بەرگەکانی تردا ئامادە دەکرێن و داوای کۆمەك و یارمەتیش لە خودا دەکەین، کە کاری ئەو لێکۆلێنەوانەمان بۆ مەیسەر بکات و، هیواداریشین لەزووترین کاتدا بێت و (إن شاء الله) ئەلقەی دووەمیش لە ئەلقەکانی ئەم لێکۆلێنەوەیەی، کە بەناوی (مع قصص السابقین في القرآن)ەوە دەستمان پیٚکردووە، تەرخانی دەکەین بۆ چیرۆکەکانی نێو سوورەتی (کهف)، کە ئەمانەن:

١- چیرۆکی هاوەلاّنی نێو ئەشکەوتەکە.
٢- چیرۆکی کابرای خاوەنی دووباخەکە.
٣- چیرۆکی (موسا) لەگەلّ پیاوە سالّحەکە (خضر) سلاوی خودایان لیٚ بێت.
٤- چیرۆکی (ذو القرنین).

نزاش لای خودا دەکەین، کە بە کۆمەکی خۆی کارمان بۆ ئاسان بکات و، یارمەتیمان بدات لەسەر لیٚ وردبوونەوەی قورئانەکەی و، باش لیٚ تێگەیشتنی و تەفسیرکردنی و بلاوکردنەوەی زانستەکانی و واتاو حوکمەکانی. هەروەها داوا لە خودا دەکەین قورئانی پیرۆز بکاتە بەهاری دلّەکانمان و، ڕۆشنایی سینەکانمان و، ڕەوینەوەی خەم و خەیالاّتمان و، نەمانی پەژارەو خەفەتەکانمان و، لە ساتەکانی

شـەوگارو لــە کاتــە گرنگـەکانی ڕۆژگـاریش (وەك بــەیانیانو ئێــواران)دا بــواری خوێنەرانی قورئانو لێوردبوونـەوەی ئایەتـەکانیمان بـۆ بڕەخـسێنتو ئـەوەی لێـی تێناگەین فێرمان بکاتو، ئـەوەی لـەبیرمان چـۆتەوە بـەبیرمان خاتـەوەو بیکاتـە بەڵگەیەك بۆمان لە ڕۆژی قیامەتدا هەروەها لە خـودا دەپاڕێینـەوە، کـە بەچـاکی کاروبارومان لـێ وەرگرێتو سوودی بە خۆمانو کەسانی تر پێ بگەیەنێتو بیکاتە تەرازووی چاکەکان لە ڕۆژی قیامەتدا... پەناش بەخودا دەگرین لە فیتنەی گفتـارو لە فیتنەی کردارو، لە بەخۆنازینو ڕووپاماییو لووتبەرزی، هەروەها پـەنا بـەخودا دەگرین لەوەی گومڕابین، یان نەفام بین.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم.

# ســـەرچاوەکان

١- الإسرائيليات في التفسير والحديث، للدكتور محمد حسين الذهبي دار الايمان- دمشق. الطبعة الثانية، ١٤٠٥هـ -١٩٨٥م.

٢- الاكليل استنباط التنزيل، الجلال الدين السيوطي. دار الكتب العلمية —بيروت.

٣- املاء مامن به الرحمن من وجوه الاعراف والقراءت في جمع القرآن لابي البقاء العكبري، دار الكتب العلمية، بيروت- ١٣٩٩-١٩٧٩م.

٤- البداية والنهاية. لابن كثير مكتبة المعارف- بيروت الطبعة الثانية ١٩٧٤م.

٥- تفسير القرآن العظيم- لابن كثير . طبعة المكتبة التجارية الكبرى ، بمصر.

٦- التفسير الكبير لفخرالدين الرازي، دار الكتب العلمية- طهران.

٧- تفسير القرآن الحكيم- المنار- لمحمد رشيد رضا، دار المعرفة- بيروت — الطبعة الثانية.

٨- جامع البيان عن تأويل آي القرآن لابي جعفر ابن جرير الطبري، تحقيق محمود شاكر، دار المعارف بمصر بدون تأريخ.

٩- جامع البيان عن تأويل آي القرآن، وبهامشة تفسير القمي، لابن جرير الطبري،دار الفكر، بيروت- ١٣٩٨هـ-١٩٧٨م.

١٠- الجامع لاحكام القرآن لابي عبدالله القرطبى. دار الكاتب العربي القاهرة: ١٣٨٣هـ —١٩٦٧م.

١١- جعفر محمد الصادق- لعبدالعزيز سيد اهل. سلسلة التعريف بالاسلام، الكتاب الثاني عشر ١٣٨٣هـ ١٩٦٤م.

١٢- الدر المنثور في التفسير بالمأثور، لجلال الدين السيوطي، طبعة دار الفكر- بيروت. الطبعة الأولى ١٤٠٣هـ- ١٩٨٣م

١٣- صحيح الإمام مسلم. بعناية محمد فؤاد و عبدالباقي، دار الفكر –بيروت ١٤٠٣هـ ١٩٨٣.

١٤- عرائيس المجالس في قصص الانبياء- لابي اسحاق الثعلبي، المكتبة الثقافية- بيروت.

١٥- فتح الباري بشرح صحيح البخاري، للحافظ ابن حجر ابن العسقلاني. طبعة محي الدين الخطيب ومحمد فؤاد عبدالباقي. دار المعرفة – بيروت.

١٦- فيض القدير شرح الجامع الصغير، لعبد الرؤوف المناوي، دار الفكر- بيروت.

١٧- في ظلال القرآن، سيد قطب، دار الشروق- الطبعة الثالثة، ١٣٩٧هـ ١٩٧٧م.

١٨- الكليات، معجم في المصطلحات والفروق لابي البقاء الكفوي. اعداد عدنان درويش و محمد المصري، منشورات وزارة الثقافة والارشاد القومي سوريا ١٩٨١م.

١٩- معجم الادوات والضمائر في القرآن، للدكتور اسماعيل عمايرة، والدكتور عبدالحميد السيد، مؤسسة الرسالة – بيروت ١٤٠٧هـ/١٩٨٦م.

٢٠- المفردات في غريب القرآن للامام راغب الأصفهاني تحقيقه محمد سيد كيلاني طبعة م مصطفى الحلبي بمصر١٣٨١هـ/ ١٩٦١م.

# نێـوەڕۆك

